ناوی کتێب: **کچانی دووکەڵ و ئاگر**

بابەت: **ڕۆمان**

نووسەر: **ئاڤا هوما**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: **شەفیقی حاجی خدر**

پیتچنین: وەرگێڕ

هەڵەچنی: **دەستەیەک**

نەخشەسازی بەرگ: **هێمن کانی سانانی**

نەخشەسازی ناوەڕۆک: **محەمەد جەبار**

تیراژ: ١٠٠٠ **دانە**

نۆرەی چاپ و ساڵ: **چاپی یەکەم/ ٢٠٢١**

**شوێنی چاپ: سلێمانی- کارۆ**

نرخ: **(٦٠٠٠) دینار**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٣١٧)ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە.



**لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانە و ئەرشیفی مومتاز حەیدەری**

## ئەم ڕۆمانە براوەی خەڵاتی (ناتلیس)ـە

ئەم خەڵاتە لە ئەمریکا لە ١٩٨٨ەوە هەیە، دەدرێتە ئەو کتێبانەی بۆ پرسی دادپەروەریی ژینگە و کۆمەڵایەتی تەرخانن.

پێشکەشە بە:

- ژنی کورد،

بۆ پشکووتن لە کێڵگەی بەیار و قاقڕدا؛

- بە فەرزاد کەمانگەر،

چونکە جیاواز بیریدەکردەوە؛

هەروەها

- بە ئیحسان

بۆ بەرەنگاربوونەوەی تۆفان لەتەک مندا و بۆ من

چی ئەکەی ئەوکاتەی کە مردن سەربازی دەوڵەت بێ و تۆیش لە کێو،

درەختی قەڵەم بی؟

چی ئەکەی ئەو وەختەی کە شانۆت پەنگر بێ و گوێگرت تفەنگ بێ؟

-هەر ئەبوو وا بکەی،

هۆنراوە بە نووکی بڵێسە بنووسی و

دۆزەخیش بۆ ترس و بێدەنگیت دابخەی!

شێرکۆ بێکەس (١٩٤٠-٢٠١٣)

دیوانی (دەربەندی پەپوولە)

## چی لەبارەی ئەم ڕۆمانە نووسراوە؟

١- کچانی دووکەڵ و ئاگر گێڕانەوەیەکی سەرنجڕاکێشانەی ئاگاهی و توانستە، زیرەکانە باری کەسایەتی و سیاسەت ئاوێزان دەکا، چیرۆکی ژانوناسۆر و تراوما لەگەڵ یەکێ لە چیرۆکەکانی خۆشەویستی و تاسەمەندی ڕاستەڕێ دەخا. ڕۆمانەکە بۆ ڕەتکردنەوەی ژیانێکی ڕۆمانسیانە لەبن باری چەوساندنەوە، ڕەسەن و هەژێنەرە. خۆی ئەمە چیرۆکێکی بەرجەستە و نابەرجەستەی جێبرینە، هی توندوتیژی و ژانوناسۆری گوازراوەی نەوەکانە، هی چەوساندنەوەی جێندەر و دوورخرانی سیاسەت و بێدەنگکردنە، لێ هەر خۆیشی ڕۆمانێکی بزوێنەر و هیوای هەنوکەیی و قۆناغی گواستنەوە و خۆڕزگارکردنە."

پرۆفیسۆر عەباس وەلی، نووسەری کتێبی : کورد و دەوڵەتی ئێران: دروستکردنی ناسنامەی کوردی.

٢- (کچانی دووکەڵ و ئاگر) چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشیماڵباتێکە، خەیاڵ و ئەندێشەی ئێمە لەسەر ئەو ململانێیە دەکاتەوە، کە وەک کورد بژیت. داستانێکی دنەدەر بە ڕوانینێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ نێو ناخی ناسنامەی کوردی و سیاسەت و ژیانی ژنان. بۆ خەبات لە پێناو مانەوە و ئازادی، لەیلا، شاکەسە بوێرەکە، هی لەبیرچوونەوە و فەرامۆشکردن نییە. ئاڤا هوما لە داستانەکەیدا سەدای ڕاستەقینەی خەون و ئارەزووی ژنانی کوردە بۆ ئازادی."

پرۆفیسۆر (شەهرەزاد موجاب) نووسەری کتێبی: ژنانی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت: کورد.

٣- ڕۆمانە نۆبەرەکەی ئاڤا هوما بە هیچ لەوانە ناچێ کە خوێندوومنەتەوە. شیعرئامێز و بوێرانەیە، گۆرانیئامێز و لێبڕاوانەیە، نمایشێکی بەهێزی چەوساندنەوەی گەلی کوردە، چیرۆکێکی سەرکەوتووانەی یەکێک لەو ژنانەیە کە بۆ یەکسانی، بۆ سەربەخۆیی و دادی کۆمەلایەتی دەجەنگێ و چیرۆکێکە توانەوەی خۆشەویستییە. لەڕێی گێڕانەوەیەکی لێهاتوو قووڵی مرۆیانەی شاکەسەکەی نووسەرەوە ئێمەش لێ تێدەگەین، هەروەها بە قووڵی درک بە هەستی ژیان بەبێ ئازادی دەکەین. هەروەها لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاسیزم، لەوەی وەک کۆچبەرێکی نوێ دێیتە وڵاتێک کە هی ئەو نییە. ئاڤا لە کتێبەکەیدا دەپرسێ: 'گوێ لە چیرۆکی کێ گیراوە؟ ژیانی کێ ڕزگارکراوە؟ دڵنەوایی لەدەستدراوانی کێ کراوە؟' کچانی دووکەڵ و ئاگر چیرۆکێکە، پێویستە ببیستین. دەکرێ شێوازی بینینی جیهانمان پێبگۆڕێ، ئیدی ببێتە مایەی ڕزگارکردنی گیان و دڵدانەوەی یەکدی.

کارۆل شابن، نووسەری کتێبی بەرەو دۆزەخ ( *Into the Abyss*)

٤- هیچ ئەرکێک بۆ مرۆڤایەتی لەوە لەپێشتر نییە، بەوەی بە تەواوی یەکدی بناسین. لە ژیانی هاوچەرخماندا ئێمە گەواهیدەرین بەسەر پشتکردنە کورد. ئەو پشتێکردنەش ڕووی نەدەدا ئەگەر هاتبا و جیهان بە چڕی ئەوانی وەک چۆن خۆمان دەناسین، بناسیبایە. ئەو دیارییە نامرادانەیە ئەوەیە کە لە ڕێی ئاڤا هوماوە هاتۆتە

بەردەستمان، چیرۆکنووسێکی زیرەک و ئازایە، یەکەمین ژنە رۆماننووسی کوردی ئینگلیزنووسە کە لە رێی یەکێک لە چیرۆکەکانی مالّبات، ئەوەمان بۆ نمایش دەکا چۆن چل ملیۆن کورد لە سەنگی محەک دان. ئەم کتێبە بخوێنەوە. دەنگی خۆت هەلّبڕە. خۆ ئەگەر بمانەوێ بمێنینەوە. ئەوا دەبێ چیدیکە دەست بە عەقلّیەتی 'ئێمە و ئەوان'ەوە نەگرین.

جۆی کۆگاوا، نووسەی رۆمانی ئۆباسان (*Obasan*)

٥- بزوێنەر.. سینەمائاسا... کچانی دووکەلّ و ئاگر داستانێکی راکێشەری سیاسییانەیە و چیرۆکێکی هەژێنەری کچێکی غەریبەی کوردە، کە دژ بە تەوژمی پێلەکانی سێکسیزم و رقلێبوونەوەی رەگەزیی مەلەدەکا. ئەو جێبرینانەی ئاڤا وەک کوردێکی مێینە لەژێر دەسەلاّتی ئێرانییەکان هەلّیگرتووە و ئێستاش لە 'دلّڕەقی تاراوگەدا' دەژی، گەواهیەکە لەسەر هەموو رووپەڕەکانیدا دیارە.

کێڤین ماک کیرنان، نووسەری کوردی باش و کوردی خراپ.

٦- لە کاتێکدا خەبەر و باسی کورد لە عێراق و سوریا زۆر لە دەنگوباسدا هەبوو، حکوومەتی ئێرانی دیوارێکی بێدەنگی لە دەوری ئەو ژمارە زۆرە کوردەی لای خۆی وەرێنابوو. ئەم رۆمانە ناوازەیە بە چیرۆکی نایابی خۆی لە هەراشبوون و باسکردنی چەوساندنەوە و مەرگ ئەم دیوارەی سمیوە. کتێبەکە زۆر بە جوانی نووسراوە، خۆی باشترین کاری داستانی ئەندێشەیە کە لە رۆژهەلاّتی نزیکەوە سەریهەلّدابێ.

بالّوێز پیتەر گالبرێت، دانەری کتێبی کۆتایی عێراق

## پێشباری وەرگێڕ

تازە ڕۆمانەکە چاپکرابوو، 'ئاڤا هوما'ش چاوپێکەوتنێکی لە بەشی کوردی ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا سەبارەت بە ڕۆمانەکە لەگەڵ کرابوو، لێرەش لە ڕۆژنامەیەک ڕاپۆرتێکی لەسەر کتێبەکە و نووسەرەکەی بڵاوکردبووەوە، هێشتا باش ئاگاداری بابەتەکە نەببووم، سەر لە بەیانییەک کتێبناس مامۆستا مومتاز حەیدەری زەنگی بۆ لێدام، دوای چاکوچۆنی، پرسی ئاخۆ چیم بە دەستەوەیە، منیش گوتم لەسەروبەندی کۆتایی شاکارە مێژووییەکەی 'هێلێک بەنێو لم' دام، ئەویش یەکسەر باسی ئەم ڕۆمانە و نووسەرەکەی کرد، دیاربوو هەم گوێی لە چاوپێکەوتنەکە گرتبوو، هەم ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیەکەشی خوێندبووەوە، لەسەر داوای ئەویش هەواڵێک لە ڕۆژنامەی خەبات بڵاوکرابووەوە. پێیگوتم بەڵکو منیش هەروابکەم. هەروەها بە پەرۆشەوە ئەوەشی خستەسەر کە هەوڵ بدەم پەیوەندی بە نووسەرەکەوە بکەم و کتێبەکە پەیدابکەم و بیخوێنمەوە و وەریبگێڕم، ئەو زۆر ڕاشکاوانە گوتی لە پرۆسەی چاپکردنی ڕۆمانەکەدا پاڵپشتم دەبێ.

بەڵێ منیش بەگوێم کرد و ئەویش بەڵێنەکەی بردەسەر.

ئەوەی ڕاستی بێ هێشتا کتێبەکەم نەدیبوو، بەڵام هەر چەند لە بارەییم دەخوێندەوە تامەزرۆتر دەبووم. بەهۆی ئەو بەربەستانەی پەتای جیهانیی کۆڤید١٩ خستبوویە بەردەم هێڵەکانی گواستنەوەی ئاسمانی، ئاسان نەبوو کتێبەکە لە ئەمریکاوە بە کاغەز بگاتە دەستم، بۆیە لەسەر ڕاسپاردەی مامۆستا مومتاز پەیوەندیم بە نووسەرەکەیەوە کرد و پاش ڕاگۆڕینەوە لەبارەی مەیلی هەردوولامان لەسەر ئەوەی ڕۆمانەکە بە زمانی کوردیش

چاپبکرێت، بە سوپاسەوە لە ڕێی کاک چالاک محەمەد لە سوێدە کتێبەکەم بە پی دی ئێف کەوتەبەردەست... منیش کەوتمە سەر خوێندنەوەی... کاتێ لێیبوومەوە پەیوەندیم بە خاتوو ئاڤاوە کردەوە و دوای دڵنیاییبەخشین لەوەی دەتوانین قایلنامەی دەزگای چاپی ئینگلیزی بەدەستبێنین، جارێ وەرگێڕانی ڕۆمانەکەمان دا. قسەمان لەسەر ئەوەش کرد هەر کاتێ دەستەواژەیەک، ئیدیۆمێکم لێ عاسێ بێ، ئاگاداریبکەمەوە و بۆم ڕوونبکاتەوە، هەروەها دوای وەرگێڕانەکەش ئەو جارێکی دیکە بەسەر کوردییەکەی مندا چووەوە و کۆمەڵێ تێبینی گرنگی بۆ نووسیمەوە، ناوەبەناویش لەبارەی ناوەڕۆک و چۆنیەتی دەربڕینە کوردییەکە گفتوگۆمان دەکرد.

هەڵبەتە ئەم ڕۆمانە بۆ ئینگلیززمان و لە ڕێی ئەوانیشەوە بۆ خوێنەرانی جیهانی ڕۆژئاوا نووسراوە، تا ئێستاش هەم بەربژاری کۆمەڵێک خەڵات و پاداشت بووە هەم زۆریشی لەسەر نووسراوە، مقۆمقۆیەکی ئەدەبیی باشی لێکەوتووتەوە. لە یەکەمین ساڵڕۆژی دەرچوونی ڕۆمانەکەدا، خەڵاتی نۆوتلیسی ئەمریکی پێدرا. ئەوەی ڕاستی بێ بووەتە باڵیۆزێکی ژان و ناسۆری کورد لەوێ.

ئەوەی ڕاستی بێ ئەو دڵمەندییەم بۆ وەرگێڕانەکەی، وێڕای ئەو بەباڵوێزبوونە بۆ جیهانی دەرەوە، بەیەکەوە بەستنەوەی ڕووداوی زیندانی و شەهیدکردنی فەرزادی کەمانگەر و داکۆکی لە زمانی کوردی و پاشخانی زیندانی سیاسیی باوک و برای پاڵەوانی ڕۆمانەکە و پرسی فێمینیستی و ئەو گیانی بەرەنگارییەی لە دوتوێی شاکەسەکە و دەستەخوشکەکەی دایە، ئاخر هەریەکە و بە شێوازی جیاجیا، پاشان ئاوارەیی و ژیانی هەندەران، ئینجا لەوێش بەرنەدانی ئەو ڕێگەیەی خۆی و ماڵباتەکەی لەسەر گۆشکراوە، هەروەها ئەو بەیەکەوەگرێدانەی کەسەکانی نێو ڕۆمانەکە، هەر لە کۆبانێی

ڕۆژئاوا و تێپەڕبوون بە هەڵەبجەی شاری قوربانی گازی کیمیاوی لە باشوور تا مەریوانی خۆراگر، بەیەکەوەبەستنەوەیەکی کوردستانییانەی بی هاوتایە... بە تەکنیکێکی نایاب ڕۆمانێکی نازدار بگرە شاکارێکی لێدەرچووە. هەڵبەتە بەدەر لە بەرجەستەکردنی ژانوناسۆر، وردەکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی چوارپارچەی کوردستانیشی تێدا نەخشێنراوە، بە خەباتی چەکداری و سیاسی و ژێر زەمینیشەوە. شتێکی حاشاهەڵنەگریشە ناسنامەبوونی زمان لە ڕۆمانەکەدا، هەوێنەکەی لە خەبات و تیکۆشانی شەهید فەرزادی کەمانگەرەوە وەرگرتووە، نایابتر و ناوازەتری کردووە، دەریخستووە توانستی نووسەر چەند بەرفرەوان و وەستایانەیە. ئەمە ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی ئەم ڕووداوە جەرگبڕانەی لەهەر شار و گوندێکی ئەم نیشتمانە بەش بەشکراوە و نەتەوە خێرلەخۆنەدیوەکەمان چەند کلۆلانە لە قوژبنە تاریکەکاندا قەتیس ماوە و تیشکی نەخراوەتەسەر بۆیە ئەو ئازایەتیەی ئاڤا نواندوویەتی مایەی ئەو پەڕی دەستخۆشی و پەسندانە.

کاتێ لە گفتوگۆی بواری ئەدەبی باسی وەرگێڕان دەکەین، وێڕای هەژاربوونی ڕەفەکانی کتێبخانەی کوردی لەبارەی وەرگێڕانەوە، ئەوا هەرچی وەرگێڕانی پێچەوانەیە زۆر لەوەش کلۆڵترە، چونکە بە داخەوە دەتوانین هەر بە پەنجەی هەردوو دەست بیانژمێرین. ئەوەش ڕاستە ئەم کارەی ئاڤا هوما ناچێتە نێو چوارچێوەی وەرگێڕانی پێچەوانەوە، بەڵام بۆ دەربڕینی ژان و ناسۆر، بۆ نیشاندانی مراز و خواستی ڕۆشنبیر و هەقخوازانی کورد، بۆ گەیاندنی دەنگی کورد بە جیهانی دەرەوە، بە هەق ئەو ڕۆڵەشی لێهاتووانە بینیوە.

ئەم وەرگێڕانەم بە حوکمی چرووپڕی ناوەڕۆکەکەی و زمانە ئەدەبی و سیاسییەکەی شتێکی ئاسان نەبوو. لێ ئەوەی کارەکەی بۆ ئاسانکردم هاوکاری ئەو خۆشەویستانەم بوو کە لەم وەرگێڕانەمدا هاوکارییان کردووم، پێ لەو ڕاستییە دەنێم ئەگەر دەقە ئینگلیزییەکەی مولکی ئافا هوما بێ ئەوا کوردییەکەی کارێکی دەستەجەمعی من و هاوکارەکانمە.

هەریەک لەو هاوڕێ خۆشەویستانەم شێخ شەمال، مستەفا شێخ محەمەد، دکتۆر ئەحمەد ئەمین، بارام سوبحی، لوقمان شلانی کە دەستنووسەی یەکەم و دووەمیان خوێندمەوە و هەڵەی تایپ و ڕێنووسیان بۆ دەسنیشان کردم، هەروەها لە کۆمەڵێ دەستەواژە و وشەی ناڕوونیش ئاگاداریان کردمەوە. چون کتێبەکە لە لایەن ژنێکەوە نووسراوە و شاکەسی ڕۆمانەکەش هەر ژنە، لەگەڵ نووسەر باسی ئەو مەترسییەمان کرد نەبادا بە جوانی لە هەندێ شوێن نەمتوانیبێ هەست و نەستی ژنانەی شاکەس و دەستەخوشکەکەی وەک خۆی، وەک لە دەقە ماکەکەدا هاتووە دەرببڕم، بۆیە هانامان بردە بەر کەژاڵ ئەحمەدی شاعیری دیاری کورد، ئەویش بە سوپاسەوە دوای بەسەرداچوونەوە کۆمەڵێ تێبینی گرنگی بۆ نووسیم و منیش لەبەرچاوم گرتن.

ویڕای ئەمەش هێشتا هەر دڵم ئاوی نەخواردەوە، پێویستم بە کەسێک بوو وەرگێڕانەکەی من لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەکە بەراورد بکا، ئەم کارەش کاک زاگرۆس ڕێباز خۆنەویستانە لە عۆدەی خۆی گرت، نەوەک هەر ئەم کارەی بە جوانی کرد و کۆمەڵێ دەستەواژە و ئیدیۆمی بۆ ڕاستکردمەوە بەڵکو بە حوکمی ئەوەی زمانی فارسیشی باش دەزانی، هەندێ لەو دێڕە شیعرانەی کە نووسەر لە زمانی فارسییەوە وەریگرتبوون نەخاسمە دێڕە هۆنراوەکانی مەولانا

ڕۆژئاوا و تێپەڕبوون بە هەڵەبجەی شاری قوربانی گازی کیمیاوی لە باشوور تا مەریوانی خۆراگر، بەیەکەوەبەستنەوەیەکی کوردستانییانەی بی هاوتایە... بە تەکنیکێکی نایاب ڕۆمانێکی نازدار بگرە شاکارێکی لێدەرچووە. هەڵبەتە بەدەر لە بەرجەستەکردنی ژانوناسۆر، وردەکارییەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسییانەی چوارپارچەی کوردستانیشی تێدا نەخشێنراوە، بە خەباتی چەکداری و سیاسی و ژێر زەمینیشەوە. شتێکی حاشاهەڵنەگریشە ناسنامەبوونی زمان لە ڕۆمانەکەدا، هەوێنەکەی لە خەبات و تیکۆشانی شەهید فەرزادی کەمانگەرەوە وەرگرتووە، نایابتر و ناوازەتری کردووە، دەریخستووە توانستی نووسەر چەند بەرفرەوان و وەستایانەیە. ئەمە ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی ئەم ڕووداوە جەرگبڕانەی لەهەر شار و گوندێکی ئەم نیشتمانە بەش بەشکراوە و نەتەوە خێرلەخۆنەدیوەکەمان چەند کلۆلانە لە قوژبنە تاریکەکاندا قەتیس ماوە و تیشکی نەخراوەتەسەر بۆیە ئەو ئازایەتیەی ئاڤا نواندوویەتی مایەی ئەو پەڕی دەستخۆشی و پەسندانە.

کاتێ لە گفتوگۆی بواری ئەدەبی باسی وەرگێران دەکەین، وێڕای هەژاربوونی ڕەفەکانی کتێبخانەی کوردی لەبارەی وەرگێڕانەوە، ئەوا هەرچی وەرگێڕانی پێچەوانەیە زۆر لەوەش کلۆلترە، چونکە بە داخەوە دەتوانین هەر بە پەنجەی هەردوو دەست بیانژمێرین. ئەوەش ڕاستە ئەم کارەی ئاڤا هوما ناچێتە نێو چوارچێوەی وەرگێڕانی پێچەوانەوە، بەلام بۆ دەربڕینی ژان و ناسۆر، بۆ نیشاندانی مراز و خواستی ڕۆشنبیر و هەقخوازانی کورد، بۆ گەیاندنی دەنگی کورد بە جیهانی دەرەوە، بە هەق ئەو ڕۆڵەشی لێهاتووانە بینیوە.

ئەم وەرگێڕانەم بە حوكمی چرووپڕی ناوەڕۆكەكەی و زمانە ئەدەبی و سیاسییەكەی شتێكی ئاسان نەبوو. لێ ئەوەی كارەكەی بۆ ئاسانكردم هاوكاری ئەو خۆشەویستانەم بوو كە لەم وەرگێڕانەمدا هاوكارییان كردووم، پێ لەو ڕاستییە دەنێم ئەگەر دەقە ئینگلیزییەكەی مولكی ئاڤا هوما بێ ئەوا كوردییەكەی كارێكی دەستەجەمعی من و هاوكارەكانمە.

هەریەک لەو هاوڕێ خۆشەویستانەم شێخ شەماڵ، مستەفا شێخ محەمەد، دكتۆر ئەحمەد ئەمین، بارام سوبحی، لوقمان شلانی كە دەستنووسەی یەكەم و دووەمیان خوێندمەوە و هەڵەی تایپ و ڕێنووسیان بۆ دەسنیشان كردم، هەروەها لە كۆمەڵێ دەستەواژە و وشەی ناڕوونیش ئاگاداریان كردمەوە. چون كتێبەكە لە لایەن ژنێكەوە نووسراوە و شاكەسی ڕۆمانەكەش هەر ژنە، لەگەڵ نووسەر باسی ئەو مەترسییەمان كرد نەبادا بە جوانی لە هەندێ شوێن نەمتوانیبێ هەست و نەستی ژنانەی شاكەس و دەستەخوشكەكەی وەک خۆی، وەک لە دەقە ماكەكەدا هاتووە دەرببڕم، بۆیە هانامان بردە بەر كەژاڵ ئەحمەدی شاعیری دیاری كورد، ئەویش بە سوپاسەوە دوای بەسەرداچوونەوە كۆمەڵێ تێبینی گرنگی بۆ نووسیم و منیش لەبەرچاوم گرتن.

ویڕای ئەمەش هێشتا هەر دڵم ئاوی نەخواردەوە، پێویستم بە كەسێک بوو وەرگێڕانەكەی من لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەكە بەراورد بكا، ئەم كارەش كاک زاگرۆس ڕێباز خۆنەویستانە لە عۆدەی خۆی گرت، نەوەک هەر ئەم كارەی بە جوانی كرد و كۆمەڵێ دەستەواژە و ئیدیۆمی بۆ ڕاستكردمەوە بەڵكو بە حوكمی ئەوەی زمانی فارسیشی باش دەزانی، هەندێ لەو دێڕە شیعرانەی كە نووسەر لە زمانی فارسییەوە وەریگرتبوون نەخاسمە دێڕە هۆنراوەكانی مەولانا

جەلالەدینی بەلخی بۆی هێنامەوە سەرساغە و ڕاستەوخۆ لە فارسییەوە کردیەوە کوردی.

لەگەڵ نووسەری ئەم ڕۆمانە نازدارەدا وەها ڕێککەوتین، ئەو چەند دێرە شیعرە کوردییانەی کراونەتە ئینگلیزی، بگەڕێنینەوە سەر دەقە ماکەکەی خۆی، تا دەقی وەگێڕاو وەرنەگێڕینەوە. هەروەها لە هەندێ دەربڕین و شوێن و لە ناوهێنانی ناوچەکانی کوردستاندا، گەڕاینەوە گیانی دەق نەوەک دەربڕینە ئینگلیزییەکە.

ئەم وەرگێڕانە کۆمەڵێ پەراوێزی لەخۆگرتووە، هەندێکیان پەیوەندن بە وشەدانەوە، هەندێکیشیان بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکانی ناوەکانن و بەشێکیشیان هێنانەوەی ناو و کورتە دەربڕینە کوردیەکانن، کە لە دەقی کتێبەکەدا بە پیتی لاتینییەوە نووسرابوون. ئەو پەراوێزانەم بۆ بەرچاوورونی خوێنەر بەپێویست زانی، دەنا دەقە ئینگلیزیەکە بێ پەراوێزە.

هەڵبەتە جێپەنجەی کاک هێمن کانی سانانی هونەرمەند کە تابلۆیەکی خۆی تایبەت بۆ ئەم کتێبە کردە بەرگ و دیزانی بەرگەکەی نەخشاند لەگەڵ کاک محەمەد جەباری دەسترەنگین کە مشووری لایەنە هونەرییەکەی ناوەوەی کتێبەکەی خواردووە، نابێ نادیدە بگرم.

لە کۆتاییدا ناکرێ وەک وەرگێڕانەکانی دیکەم ناوی کنێر جەمیلی هاوژینی خۆشەویستم و کاکەڕای کوڕم وەک هاوکاری بەردەوام نەهێنم.

هیوادارم دوای ئەم وەرگێڕانەش هەروەک چۆن ئینگلیزییەکەی بووەتە مایەی خوێندنەوە و مقۆمقۆ ئاوا خۆماڵیکردنەوەکەشی ببێتە مایەی خوێندنەوەی بە تێرامان و سەرنج.

## هەقە قسەیەکی ڕاستگۆیانە بکرێ

**مومتاز حەیدەری**

نووسەر و ڕۆژنامەنووس، خاوەنی کتێبی حەیدەرینامە و قاموسی ناوە نەمرەکان.

- ❖ ڕۆمانەکە خۆی خۆی دەناسێنی.
- ❖ ڕۆمانێک لە ناخەوە ئازارە خوێناوییەکانی نەتەوەیەک بە سۆزێکی مرۆیی ناخهەژێن و بوێری دەخوێنێتەوە.
- ❖ پێشەکی نووسەری ڕۆمانەکە بۆ چاپە کوردییەکە و پێشبەند و سەرنجنامەی نووسەر، خۆی لە خۆیدا بە گەوهەرێکی ئەقلانەی داستانێکی: مرۆیی- نەتەوەیی دەناسرێ، بگرە بە مانفێستی مرۆیی، نەتەوەیی و ئەدەبی دەژمێردرێ. کەواتە ڕۆمانەکە شاکارێکی زیندووی جیهان ئامێزە، هەر واشە.
- ❖ ئاڤا هوما باڵوێزی کورد لە هەندەران، خاوەن پەیامی ئازادیی ئەقڵ و سەربەخۆیی نیشتمان.
- ❖ لووتکەی پەیامی ئاڤا هوما: "فێربووم پێزانینم بۆ ئەوە هەبێ: کە مرۆڤێکم، ژنێکم، کوردیشم".

❖ من لێرەدا – لەو دەرفەتە بەرتەسکەدا- بە هیچ جۆرێک ناتوانم ناوەڕۆکی ئەم شاکارە، کە زادەی ئێش و ئازاری هەرە دژواری هەمەلایەن و فرەڕەهەندی نەتەوەیەکی ستەمدیدەی دەیان ملیۆن کەسە، دەوربکەمەوە و قسەیەکی هەق لەبارەیەوە بێژم، بەڵکو تەنیا وەک چەند ئاماژەیەکی بە پەلە، کە لە سەرەتاوە ئاماژەم پێیانکردووە یان چەند دێڕێکی هەمدیسان ئێجگار بە کورتی و تیژتێپەڕی بنووسم.

❖ دیارە دەقی ئەدەبی زیندوو نموونەی داستانی گلگامێش و ئەوانەی دواتر، بەرهەمە مەزن و هەمیشە زیندووەکانی: فیۆدۆر دۆستۆڤیسکی، لیۆ تۆلستۆی، هەمەنگوای، جاک لەندەن، شۆلۆخۆف، ستاندال، ماکسیم گۆرکی، جۆرج ئامادۆ، مارکیز، نیکۆس کازانتزاکیس، جەنگیز ئیتماتۆڤی کازاخی، لێرمۆنتۆڤ، غالب توعمە فەرمان، نەجیب مەحفوز و هی دیکە... هەڵبەت ئێمەی کوردیش لە پاش ئاییینی زەردەشتییەوە، کە نەبووە هۆی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کورد، تا ئەم ڕۆژگارە تێکڕای نیشتمانی نەتەوەیی -کوردستان- بە خاک و ئەقڵ و جەستە و کلتووریەوە داگیرکراوە، بگرە بەوپەڕی درندەییشەوە پەیام و زمان و ئاوات و دوارۆژی زیندەبەچاڵ کراون، بۆیە لە ڕەوتی ئەدەبیی جیهان، نمونەی ڕۆمان زۆر دواکەوتووین، جا ڕۆمانی *کچانی دووکەڵ و ئاگر* بە نموونەی شاکارێکی مەزنی ئەدەبی دەژمێرێ و بەڵکو بە پەیامێکی زێدە جەرگهەژێن لەقەڵەم دەدرێ، لە

هەمان کاتدا ڕوو لە سەدان چیرۆکنووس و ڕۆماننووس دەکا، کە نەتەوەی کورد خاوەن هەزاران نموونەی "فەرزاد کەمانگەری"ن، کەچی بەداخەوە زۆر بەدەگمەن لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیاندا ڕەنگیداوەتەوە...!؟

بە هەرحاڵ، ئەگەر جەنگیز ئیتماتۆڤ لەمەڕ گەورەیی مامۆستایەکی کازاخیدا ڕۆمانی "یەکەم مامۆستا"ی بەرهەمهێنابێ، ئەمەش قەڵەمی مێینەیەکی زێدە ستەمدیدە و چەوساوی هەمەچەشن- ئاڤا هوما-یە *ڕۆمانی کچانی دووکەڵ و ئاگری* نووسیوە، ئەوە بۆ کورد بە شاکارێکی سەدەی سایکس -پیکۆ، لۆزان، سەعدئاباد، سەنتۆ، کیمیاباران و ئەنفالی هەرەدڕندەیی تێکڕای داگیرکەرانی یەک کوردستان دەژمێردرێ.

هاوکات ئەو دەستپێشخەرییەی وەرگێڕی زمانپاراوی بەتوانا شەفیقی حاجی خدر زێدە مایەی دەستخۆشی و پێزانینە...

❖ **کوردینە... نووسەر و ڕۆشنبیرینە: بەرەو هەڵسانەوەیەکی ئەقڵانە و نەتەوەیی سەرتاسەری بە یەکگرتوویی هەنگاو هەڵگرن...!**

**هەولێر- کوردستان**

**٢٠٢١-٣-٢٦**

## پێشەکی نووسەر بۆ چاپە کوردییەکە

کاتێک وەک کیژە کوردێک لە ئێران هەراش بووم و گەیشتمە تەمەنی هەرزەیی، زانیم ژیانم چ کردەیەکی وێرانەکەرانەیە. من بە چیرۆک و سەربردەی مەرگەساتبارانەی بێدەنگ و چۆنیەتی ئەوەی کەوا ماوم، گەورە و پەروەردە بووم. چۆن سەربازانی دەوڵەت، تەنانەت میلیشیای خۆبەخشیش، دەهاتنە سەر شار و گوندەکانمان تا بمانکوژن، نەوەک هەر ئەوەندە بەڵکو لە کوشتنیش زیاتر دەرحەقمان بکەن. ئەوان گازی ژاراویان بەسەردا پڕژاندین، گوندەکانمانیان ئاگر دا، دەستدرێژیان کردە سەر ژنان و لاقەیان کردن، لەبەر چاوی منداڵەکانیان باوکەکانیان تیرباران کرد. ئیدی ئەمە و لەمەش زیاتر قەوما. هەرچەندی بڵێی هێشتا هەر کەمە و خامە دەرەقەتی نووسینی نایەت.

ئەوانەی وەک ئێمەش کە لە دەست لەناوچوونی جەستەیی قوتاریان بوو، تووشی دارمانی کلتووریی بوونەوە. ئەو دەسەڵاتە سەردەستانەی حوکمڕانیان بەسەرداکردین، پێیان گوتین، ئێوە هەر نین، خۆ ئەگەر هەشبن، ئەوا ئەوەن، کە ئەوان ناومان لێدەنێن و ئەوان ڕێگەمان پێدەدەن بژین. ئێران ناوی موفسیدولئەرزی لە ئێمە نا، واتە: گەندەڵەکانی سەر ڕووی زەوی. ئەوانەش بە ڕووی جەورروستەمی دەوڵەتدا وەستانەوە، مۆری تیرۆرستییان لەنێوچاوان درا.

کاتێکیش دایباب هەموو هەوڵ و تەقەللایەکیان بۆ ئەوە بوو ڕۆڵەکانیان لە دەست چەوساندنەوە و تەپەسەرکردن و سیاسەتی سووکایەتیپێکردن بپارێزن، ئیدی ئێمە بەرەبەرە بەشێک لە میراتی دێرینەمان لە دەست دەدا و کەلێن و بۆشایی زۆر لە نێوان نەوەکان پەیدادەبوو، زۆریش زەحمەت بوو بە یەکەوە ببەسترێنەوە، بە جۆرێک بوو، شیرازە پچڕا. ئاخر زمان و مێژوومان قەدەغە کرا، سووکایەتی بە ژان و ناسۆرمان کرا و لە دژی ئێمەیان بەکار هێنایەوە، ئێمە لە لایەن چەوسێنەرانمان هەم حاشاییمان لێدەکرا و هەم پێناسەش دەکراین، وا بە نزمی سەیردەکراین، کە لە خوار ئاستی مرۆڤەوە بین، بە شێوەیەکیش کردیان بەڵکو شکۆمەندی و شانازیمان هەلاهەلا بکەن.

چەند گەورە دەبووم و شت فێردەبووم و خۆم دەناسی، ئێران هەروەک تاوانێکی زیندوو ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردم. لە چاوی دەسەڵاتدارە تیۆکراتە ئسولییەکانی ئێران، ژن و کوردبوون هەڕەشە بوون، دەبووایە سەرکوت بکرێن. لێ گەلۆ، سەرباری ئەوەی کوردێکی مێینە بووم، نووسەرێکی سێکولاریش بووم، کەسایەتییەک، کە بە ڕووی چەوساندنەوەدا وەستابووەوە، ڕۆژنامەنووسێک بڕوای بە یەکسانی جێندەر و نەژاد هەبوو، خوێنەرێکی تاسەمەند و پەرۆش بۆ دۆزینەوەی هەموو شتێک لە ژیاندا. ئەمانەش سەرپێچی بوون و سزاکەیان زیندان و لەسێدارەدان بوو. تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ، بە هەزاران کەس لە یاخیبووان و ڕۆشنبیران لە سێدارە دراون یان لە ڕیزی مردواندان و بە "موحارەبە" تاوانبار کراون، ئەوەش تاوانێکە گوایە دژی خوایە.

ویڕای ئەوە- یان لەوانەیە - هەر لەبەرئەو هەموو شتەش بێ، من لە نێو خۆڵەمێشدا ڕاچەنیم و بە تەکانەوە برەوم بە خۆم دا. زۆر کورد ئەم شتەیان هەڵبژارد. ئەم بێ دەوڵەتییە ئێمەی کوشت، لێ لە هەمان کاتیشدا ئێمەی هەڵساندەوە. مایەی سەرسوڕمان نییە، دروشمی هاوبەش و باو بەتایبەتی لە ڕۆژئاوا ببێتە ئەوەی دەگوترێ: بەرخۆدان ژیانە.

لەوکاتەوەی بە دوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕام تا خۆم لە دەستی ئەو دەوڵەتە ڕابپسکێنم، کە هەرگیز هی من نەبووە، بە پەرۆشەوە عەودالی سەربەستی بووم. بۆ ئەوەش جیهانێکی دیکە بدۆزمەوە، جیهانێک واتای هەبێ، بەرگری و بوونی هەبێ، بۆ ئەوەی بگەمە ئاستی و بە هێورەیی، ئیدی هانام بردە بەر وێژە.

وێژە، ئەنوا و پەناگەی منە، پاڵپشتی ژیانمە، بەڵام بۆ گەڕان بە دوای خۆدۆزینەوەمدا، ئەوا سەلماندنێکی بێ ئاکام بوو. لە نێو ئەدەبیاتی ئینگلیزییدا بە دوای ڕەنگدانەوەی خۆمدا گەڕام، لێ هەرگیز کەسێکم نەدۆزییەوە لە دووریشەوە لە من بچێ. ئاخر هیچ کەسێک پێگەی ژنی کوردی لە نێو وێژەدا جێ نەکردووەتەوە. خۆی دەبوایە هەر خۆمان بەم کارە ڕاببین. ئەوە بوو زەمالەی خوێندنی ماستەرم لە زمانی ئینگلیزی و نووسینی داهێنەرانەدا لە زانکۆی ویندسەری کەنەدی بەدەستهێنا.

من خۆم لە تاراوگەدا فێرکرد تا بە زمانی زگماکی دایکم بخوێنم و بنووسم هەروەها فێری دیرۆک و سیاسەتیش بووم. بە دوای چیرۆک و بەسەرهاتی ئەو ژنە کوردانەدا گەڕام، ئەوانەی لە هەمان کاتدا دژی چەوسانەوەی جێندەری و نەژاد جەنگان و دەنگی خۆیان

هەڵبڕی: ژنانی وەک لەیلا زانا و پەرلەمانتارەکانی دیکە، ئەو سەرۆک شارەوانی و سەرکردانەی لە لایەن گەلەوە هەڵدەبژێردران، کەچی هەر دوای ئەوە ڕاستەوخۆ لە زیندان دەئاخنران، ئەوانەی کەوتنەبەر سادیستترین ئەشکەنجەی سێکسی، کەچی هێشتاش لەو دیوی شیشەبەندی زیندانەوە پەیامی بوێری و لێبڕاوانەیان بۆ جیهانی دەرەوە دەنێرن. لە وێژەی کوردی و ژیانی ڕاستەقینەی کورداندا، ژن و پیاوی بە هێزی وەک فەرزاد کەمانگەری لە سێدارەدراو هەن، کە بوونە دنەدەری ئەم ڕۆمانەم؛ هەروەها یەکێکی وەک سەلاحەدین دەمیرتاشی زیندانیکراو، کە بە ئۆبامای کوردان ناسراوە، ئەوەی ژیانێکی ئاڵۆز و دژوار ژیا.

کەواتە، ساڵی نووسینی من لە تاراوگە دەستیپێکرد. کردەنیازی ژیانم گەیشتە سەر ئەو دووڕیانەی خەمخۆرییم بە کردەوە بگۆڕم. من بڕوام بەوە هەیە، هێزی کاری داهێنەرانە لە هاوسۆزییەوە هەڵبقوڵێ و بۆ دادپەروەریی و دەنگهەڵبڕین ببێتە کردار.

بۆ من، بوون بە نووسەرێکی کورد شتێکە وەک لەدایکبوونەوە و بەرخۆدان. ژیانی شڵۆق و ناجێگیریی کوردان بە نێو مێژوودا هاتووەوە و بەردەوامیشە. خۆ ئەگەر ئەوەی دەیزانم چۆن بکرێ بیکەم، ئەوا بە لای کەمەوە، دەتوانم ئەوە نیشان بدەم تەنانەت لە سەردەمی دەوڵەتی نەتەوەشەوە، دۆزی بێ نەتەوەیی کورد و ئێمە زۆر ئاڵۆزین، گرنگین، ناکامڵین، خۆشمەحشەرین و وەک هەر گرووپێکی مرۆیی سەر ئەم زەمینە مایەی سەرنجڕاکێشانین. لەوانەیە ئەگەر مرۆڤایەتی خۆمان بە بیر خۆمان بهێنینەوە -

کوردبوونمان بۆ هەموو کەس بسەلمێنین- ئەوا دەتوانین سیاسەتگەلێکی سەراتاپاگیرانە ببێتە ڕەنگدانەوە.

من خوێن و ئارەقەم بۆ ئەو ڕۆمانە نۆبەرەیەم – کچانی دووکەڵ و ئاگر_ ڕشتووە، کاتێکیش ئەو هەڵسەنگاندنە بایەخدارەشی بۆ هات، لە خۆشیان شاگەشکەبووم. ئاخر نووسین و بڵاوکردنەوە و لەسەر نووسین و پەسندان لە باکووری ئەمریکا کارێکی زەحمەتە بۆ هەر کەسێک، بەڵام خۆ بۆ کەمینەکان و کۆچبەران زۆر سەختترە. ئەوە بوو دە ساڵ خۆم بۆی تەرخان کرد، کار و شەونخوونییەکی زۆرم کێشا تا گەیاندمە ئەم ڕۆژە.

لێ گەلۆ، ئەوە بۆ من حەسرەت و دڵشکانێکی زۆر بوو، کە ئەو گەلەی من لەبارەیانەوە نووسیم، ناتوانن بە زمانی خۆیان بیخوێننەوە. ئاخر دەمەوێ کورد خۆیان لە جیهانی وێژەدا خۆیان بنوێنن، ئێستاش دەبینن کە ئەوان دەخوێندرێنەوە، لە سایەی وێژەوە لە پاڵ چیاکان دۆستی دیکە پەیدا دەکەن. من خاکەڕایانە بە شێوەیەکی بڕوانەکراو زۆر شەرەفمەندم، کە شەفیقی حاجی خدر کتێبەکەی منی خۆماڵی کردووەتەوە. نازانم چۆن پێزانینی خۆم بۆ ئەو دەرببڕم، کە چەندین سەعاتی دوورودرێژ کاری لەسەر وەرگێڕانی کتێبەکەمدا کردووە، ئەو کتێبەی شەپۆلی ڕۆژگاری پەنجا ساڵەی مێژووی نوێی کوردانی هێناوەتە گۆ. نووسین بۆ من ئەویندارییە و وەرگێڕانیش بۆ کاک شەفیق. هەروەها دەمەوێ پێزانینم بۆ هەموو ئەو دۆست و پشتوپەنایانە دەرببڕم، کە بە چاوی تیژ و وردبینییان یارمەتی ئێمەیان داوە، لە کاتێکدا کارەکەمان هەر دەستنووس بووە. نووسین و دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی کتێبێکی

باش کاری هەرەوەزیانەی دەوێ، منیش بەختەوەرم کە ئەو دەستەیەم هەبوو.

هیوام وایە خوێنەرانی کوردی کچانی دووکەڵ و ئاگر هەست بکەن، کە لەسەر ئاستی جیهانییدا دەبینرێن و دەبیسترێن.

## چەند سەردێڕێکی ژیاننامەی نووسەر

- ئاڤا هوما نووسەر و ڕۆژنامەنووس و چالاکوانی تایبەت بە پرسی ژن و پەیوەندییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.
- دوو بڕوانامەی ماستەری لە زمانی ئینگلیزی نووسینی داهێنەرانەی لە زانکۆی ویندسەر Windsor بەدەستهێناوە.
- کۆمەڵە کورتەچیرۆکێکی بە ئینگلیزی و بەناوی Echoes from the otherland لە ٢٠١٠ لە تۆرنتۆ چاپ و بڵاوبووەتەوە.
- هەمان کۆمەڵە چیرۆک بە ناوی (دەنگدانەوەی سەرزەمینێکی تر) لەلایەن (ڕەوەز) وەرگێردراوە و لە دەزگای سەردەم چاپکراوە.
- ئەم کۆمەڵە کورتە چیرۆکەی بەربژێری خەڵاتی فرانک و کۆرنەری نێودەوڵەتی و PENپێنی کەنەدەی بوو.
- نووسەر لە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە.
- ئێستا لە ئەمریکا دەژی.
- دوای دە ساڵ لە نووسینی یەکەمین کۆمەڵە کورتە چیرۆکەی (کچانی دووکەڵ و ئاگر) دەبێتە ڕۆمانی

نۆبەرەی، کە ناوبانگێکی ئەدەبیی گەورەی لە ئەمریکا و کەنەدا بۆ خۆی پەیدا کردووە.

# پێشبەند

ژنێک بە تەنیا لە سەر چیا و لە بولێڵی ئێوارەدا.

چەکمەیەکی نادیار خرایە سەر قوڕگم، هەناسەی تەنگ کردم و بڕستی لێبڕیم، کەچی هێشتاش نەمدەویست بڕۆم و بچمە بەردەمی دایبابم. یاخود نەمدەویست ڕووبەڕووی ئایندە خنکاوەکەم ببمەوە. هەر لە پەنا گاشەبەردەکەدا، دەستم لە چۆکان وەرێنابوو و ئازارەکەشم لێ بووبووە ئاگرێکی هاروهاج هەموو جەورەستەمێکی لرف دەکرد.

تۆ بڵێی باوکم زانیبێتی ئاخۆ چی لە ئارادابوو؟ حەزم دەکرد پێی بڵێم، ناسۆرەکەمی لەگەڵدا باس بکەم. ئەرێ، شانم لە بن ئەو زۆرداریيە ڕۆژانەیەی ژیان، ژیانی ژنێک لە لەعنەتاوا[1]، لە شوێنێکی نەفرەتلێکراو و داهێزرابوو. شەکەتییەکە، حەسانەوەی نەدەناسی.

ڕۆژ لە پشت گۆلی زرێبار ئاوا بووبوو. دەرزەنێک شەبەنگی سووربباو لە ئاسۆوە کرابوونەوە.

---

[1] لەعنەتاوا: لە دەقەکەشدا هەروا هاتووە *La'nat Awa*. ڕژێمی ئێران لەسالانی ٨٠ی سەدەی رابردوودا تەرمی کوردانی لە هەندێ گۆڕستانی تایبەت بنگڵ دەکرد و ناوی لەو گۆڕستانانە دەنا لەعنەتاباد، زۆر لەو گۆڕستانانە کە زۆریان گۆڕی بەکۆمەڵن لە ناوچەکانی سنە لە نزیک بێجار و قروە هەروەها لە کرماشان ئێستاش بەو ناوانە ماون.

مەبەست لە بەکارهێنانی لەعنەتاوا لێرەدا ئەمەیە. نووسەر چەندین وشە و ڕستە و دەستەواژەی هەر بە کوردی نووسیون، هەندێک جاریش واتاکەی لە ڕستەی دواتردا بە ئینگلیزی لێکداونەتەوە. هەندێکیان پێویستیان بە وەرگێڕان نەکرد.

له دامێنیش، ڕێگەیەکی تەسکی قیرتاو هەروەک تەنوورەیەکی کەسک بە ڕیزێک گوڵی سوور و گوڵە سپییە کێویلکەکان چواردەوریان دەورەی نەخشاندبوو. گوڵە شلێریش کەشخە و درێژ، بە ڕازاندنەوەی ئەو بانە سەختەی کوردستان، دادەڕسایە[٢] سنوورەکان. حەزمدەکرد شلێر بوومایە، بەڵام خۆ من باخێک بووم لە ژان، لە قێز، لە ئازار؛ نیشتمانە داگیرکراوەکەم زێدی مەرگ بوو.

هەڵسامەوە، بە هەناسەبڕکێوە پشم بۆ هاتەوە. چیدی خۆم نەشاردەوە. هاوارمکرد "بەسە بەس".[٣]

ئیدی هەر بە گورگەلۆقە سەربەرەوژێر بوومەوە، خۆشم پێ نەدەسەنگرایەوە. وێڕای سەرماوسۆڵەی ئەنگۆرەکە، ئارەقەشم کردبوو. (با)ش لە دەسماڵە سەرپۆشەکەی دەدام، ئیدی خێراتر دەبووم. هەروەک ئەوەی باڵم هەبن، باڵەفڕکێم بوو.

کاتێک غارم دەدا، هاوارێک لە سینگم دەرپەڕی. بەرەو ڕێگای سەرەکی، بەرەو جیهانی پیاوان ملی ڕێم گرتەبەر. شەقامەکان هی ئەوانن. پیاوانی قەزاوەتچی. پیاوانی دووڕوو. ناموسیان بەندە بە ژنە پیاوەکان. ترومبێل بە دەوری پێچەکەدا گرەیان دەهات، پڕبوون لە شوفێری بەدمەست، کاتێک منیان بینی لە گردەکە دەهاتمە خوارەوە، دەستیان بە هۆڕنلێدان کرد. ئەوان لەو ڕێگەیدا زۆر خێرابوون، خێرا لە چاو دەستوبردیان بۆ قەزاوقەدەر، زۆریش خێرا بۆ کەچە ترومبێلەکانیان. ترومبێلێکی سپیی مۆدێل نوێ لەسەر ڕێگە پێچاوپێچەکە لایدا، تۆز و خۆڵی پەیداکرد. بایەکەشی لە گوێم دا.

---

[٢] داڕسان: ئاڵنگاری، تەحەداکردن.

[٣]. دەق نووسیویەتی: "*Basa bas,*".

پێدەچوو لێخوڕی ترومبێلە سپییەکە لە کەسێکی وەک من، لە هاوسەفەرێک بگەڕێ. منیش لە بەردێک هەڵنگوتم، گوڵە مێلاقە سوورەکەی ناو گیام پانکردەوە. کاتێکیش سەرپەلۆم برد و بە لادا هاتم، چیرۆکە نەبێژراوەکانی ناخم وەک پەڕە لە کتێبێک بدڕێنێ و فڕێیبدەیە تەنەکەی خۆڵەوە، لێم هەڵدەوەرین. هەینێ شتێکم بەسەردا زاڵ بوو و تینی دامێ چیرۆکەکانم بە دەنگی بەرز بچڕم، هەر لە بەراییەوە تا کۆتایی هەڵیانڕێژم، هەر لە بەراییەوە تا کۆتایی دووریان خەمەوە. لە هیکەوەش سەری ئەو هەموو کوردەم دەبینی لە بن زنجیری تانکەکاندا دەپلیشانەوە.

بە خێراییەکی شێتانە لە نشێوەکە دەهاتمە خوار و هەر لە هاواریشم دەدا، ئاخر نەمدەتوانی خۆم بگرمەوە، ئای لەو ژنە شێتوشورە.

دوا تەکان ئیدی باڵم گرت.

## بەندی یەک

مێشکی پێنج ساڵانەی من نەیدەتوانی ئەو نەخشەیەی لەسەر پشت و ملی باوکم بە هۆی جێ قامچییەکانی سەردەمی زیندانییەکەیەوە کێشرابوو، بناسێتەوە. باوکم کە لە کەمەرەوە بە پەشتەماڵێک وەرپێچرابوو، باکی بەوە نەبوو ئاخۆ دڵۆپە ئاو بە خەتەکانی سەرپشتیدا دەچنە خوارەوە یان نا، ئەوە بوو دەستی دایە جلکی نوێ و دایبی کۆرپەلە و بە دەنگێکی بەرزیشەوە ڕوونیکردەوە دەبێ بگەڕێتەوە نەخۆشخانە.

هێشتا دایکم و چیا،[4] برای تازە لەدایکبووم نەگەڕابوونەوە ماڵ، منیش لەبەر تامەزرۆییم بۆ بینینی، ئۆقرەم لەبەر بڕابوو. ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە لەنێو خانەیەکی تایبەت و هەمیشەیی یادەوەریمدا هەڵکەنراون. بابە خۆی لەبەرکردەوە، بە پەلەپرووزێ پانتۆڵ و بووکەڵەکەی خستمە نێو کیسەیەکی نایلۆن و لە باوەشی کردم. منیش دەستم لە ملی وەرێنا، فرمێسکیشم لە گۆشەیەکی چاو و دڵۆپە ئارەقیشم لەسەر هێڵی چەماوەی کاکۆڵی ببینی. ئاخر هەوای ماڵ خنکاو بوو، هەرچەندە مانگی ئازاریش بوو. کەچی هێشتا زۆپاکە دەئایسا.

بە قاقایەکەوە پانییەدەستم بەسەر ئێسکی ملیدا هێنا و گوتم: "سەرت دەگرێ." "ژیشک، پێستێکی ناحەز." ئەویش منی داگرت بەسەر ڕایەخەکەی سەر پەیژەکان، کە وەک حەلەزۆنێکی تەواو

---

[4] لە دێری دواتردا ناوی چیا بە ئینگلیزی ڕووندەکاتەوە، لە کوردییەکەدا پێویست ناکا دووبارە ببێتەوە. ئەمە چەندین جار دووبارە دەبێتەوە.

پێچاوپێچ بەرەوخوار بە ڕاڕەوەکەدا شۆڕدەبووەوە تا گەیشتە بەردەم هۆدەکەی بنهۆم[٥] و پاشان لە دەرکەی ماڵی جوانەی دا.

جوانە بە خەندەیەک کە تەواوی ڕوخساری گرتبووەوە، دەرکەی کردەوە. "براکەم[٦]، پیرۆزە". خۆ ئەو پووری ڕاستەقینەی من نەبوو، بەڵام ئەو و باوکم یەکدیان بە برا و خوشکێ بانگدەکرد. جوانە، فیستانێکی درێژی شۆڕەی ڕەنگ کەسکی لەبەردابوو، چاکەتێکی ڕەشیشی بەسەردا کردبوو، پرچیشی لە پشتەوە وەک کلکی ئەسپ بەستبوو، سوورایی لێوی لە ڕەنگی چاوە سوورەکانی باوکم دەچوو. کاتێکیش دەڕۆیشت قایشە زێرینەکەی دەزرینگایەوە، هەروەک ئەوەی پوولەکە بەر یەک بکەون. منیش ئەوەم بەدڵ بوو، هەمیشە پۆشتەوپەرداخ بوو، ئاخر ئەو لە زۆرینەی ژنانی مەریوان جیاوازتر بوو.

"کوڕێژگەیەکی تەندروستە. دەکرێ ئەو شەو بێینەوە ماڵ." ئینجا باوکم منی دایە دەست جوانە. "ئەرێ دەکرێ ئاگات لە لەیلا بێ؟"

منیش لە نێوانی هەردووکیاندا، بۆنی سابونی گوڵەخەزێمی باوکم و بۆنی یاسەمینی جوانەم هەڵمژی کە لەگەڵ یەک تێکەڵ بوون.

"هەڵبەتە، سڵاو خوشکی گەورە!" ئەو وای گوت و قدیلەی بن هەنگڵانیشی کردمەوە. باوکیشم سوپاسی کرد و جانتاکەمی لە تەنیشت شیپانەی دەرکە دارینەکە دانا.

"ئەرێ گوێت لە هەواڵەکان بوو؟"

جوانە پرسی: "هانا...؟"

---

[٥] بنهۆم: بنخان، ژێرزەمین. واتە ئەو ژوورەی دەکەوێتە بن خانووەکە. لێرەدا ئەوەی مایەی تێبینییەوە وشەکە لەگەڵ هۆم homeی ئینگلیزیش دەستەخوشکن، کە واتای ماڵ و نیشتمان دەگەیەنێ. لەوانەشە بنەچەکەیان یەک بێ.

[٦] brakam

"نەخێر... ئەمڕۆ گوێت لە ڕادیۆ گرت؟"

ڕادیۆکەی ئەو هەمیشە پێ بوو، بەردەوام هەر دەنگە ئاشناکەی لێوەدەهات. ڕادیۆکەی جوانەش هەر پێبوو، بەڵام لە هی ئەو تەنێ دەنگی موزیک دەبیسترا، بە زۆریش دەنگی ئارام و هێمنی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی. جوانە دەستێکی لە هەوادا ڕاوەشاند، هەواڵە نەبیستراوەکانی بە لاوە نا. " بڕوام پێبکە، خۆ دەتوانم ڕۆژێک بێ مەرگەسات بژیم، ئالان تۆش دەتوانی. نەورۆز وا لە ڕێیە. کوڕیشت هاتوتە دونیا. براکەم، ئێمەش پێویستمان بە پشوویەک هەیە، وا نییە؟"

دەموچاوی باوکم لە هەوڵێکدا بۆ شاردنەوەی دڵۆپە فرمێسکی گۆشەی چاوی ڕێکهەڵهات. ئەو ڕووی خۆی وەرگێڕا و بە نێو ژووورە بچکۆلەکەدا تێپەڕی و گەییە داڵانە تاریکەکەی ژێر زەمینەکە بێ ئەوەی متەق بکا.

"ئالان، دەی چاکەتەکەت دانێ"، جوانە داوای لە باوکم کرد شانەکانی نەوی بکا. تەنانەت دوای پێوەدانی دەرگەش، بایەکی سارد هاتە ژوورەوە و ئەویش خۆی لە ئاست داواکەی جوانەدا کەڕ کرد.

منیش ئەو ڕاستییە بچووکەم دووپاتکردەوە، کە ڕۆژێک پێشتر لە جوانەوە فێرببووم "بە زۆری من لە ئاو دروستکراوم." خۆی هەر ئەو بوو وای لێکردم بتوانم لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە فێری خوێندنەوە ببم. ئاخر شلێر، کیژەکەی ئەویش دەیتوانی وشەکان لەکاتی خوێندنەوەدا گۆ بکا، هەر بیست ڕۆژیش لە من باخۆشتر[٧] بوو.

---

[٧] باخۆشتر: باخوشتر، گەورەتر

جوانە منی لە تەنیشت شلێرەوە دانا؛ کە بە ڕاهێنان لەسەر ئەلفبێتکەی کوردییەوە سەرقاڵ بوو، دایکی فێری کردبوو: ئا وەک ئازادی، هێ وەک هێمنی، نوون وەک نیشتمان[٨]، هەموو ئەمانەشیان لە کورد سەندوون.

کاتێکیش بەر لە چەند مانگێک، جوانە لە زیندان بەردرا، خۆی و کیژەکەی، کە بە دوای شوێنێکی بە کرێی هەرزاندا دەگەڕان، هاتنە هۆدە بنهۆمەکەی ئێمەوە. باوکم گوتی دەکرێ ئەوان بە بێ پارەش لە خانووەکەی ئێمەدا بمێننەوە، چونکە ئەو ڕێزێکی زۆری بۆ مێردە کۆچکردووەکەی ئەو، واتە بۆ هاوزیندانییەکەی خۆی هەبوو، ئەو چەپخوازە چالاکەی لە سێدارە درا. لەو کاتەوەی جوانە هاتۆتە چاوەخانە بنهۆمەکەی ئێمەوە، دیوارەکانی بە ڕەنگێکی کەسکی کاڵ بۆیە کردبوو، ئیدی گژوگیا چیدی لەوێ شین نەدەبوو، حەوشەکە ڕێکوپێک و پەنجەرەکە خاوێن و بژوون، ئاخر کەسێک هەبوو لێی بخەوتێ.

منیش لە خۆشیی پەیدابوونی هاوڕێیەکی نوێ، شاگەشکە بووبووم؛ کەچی دایکم حەزی بە چارەی جوانە و شلێر نەدەکرد و حەزی نەدەکرد لە بنهۆمی ئێمەدا بن؛ ئەو لە جوانە بەدگومان بوو، دەیپرسی، ئاخۆ چۆن بەردراوە؟ وێڕای ئەوەی حوکمی مەرگی بەسەردا درابوو، چونکە پیاوێکی بە چەقۆ کوشتبوو. باوکیشم بۆی ڕوونکردمەوە؛ لە قانونی ئێراندا، ژیانی پیاو دوو هێندەی ژیانی ژن بەهاداره. کەواتە دەبووایە جوانە لە تۆڵەی کوشتنی کابرای لاقەکەردا بکوژرابایەوە، کەچی لە کۆتاییدا حوکمەکە هەڵگەڕایەوە.

دایکیشم ئەوەی خستەسەر: "هەر خوا دەزانێ چۆن بووە!"

---

[٨] وشەکانی ئازادی و هێمنی و نیشتمان بە کوردی نووسراون واتاشیان بە ئینگلیزی لێکدراوەتەوە.

کاتێکیش لە باوکم پرسی ئاخۆ لاقەکردن چی دەگەیەنێ، زمانی تێک ئاڵا و کەوتە تەتەڵە.

وەڵامەکەی ئەوە بوو بڵێ: "دەی بڕۆ یاری لەگەڵ بووکەڵەکەت بکە." منیش مەراقم بوو بزانم ئاخۆ حکومەت بۆ هەموو ئەو کەسانەی خۆشم دەوێن، سزا دەدا.

ئیدی جوانە شەکرلەمەی بۆ هێنام و گوتی: "بە زۆری لە ئاو پێکهاتووە، وا نییە؟ بەڵام ئەدی باقی جەستەت لە چی پێکهاتووە؟ چوکلات؟

بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە، ئەو شەکرلەمەیەی بە تامی پرتەقاڵ بوو، لە دەمدا بوو وتم: "نەخێر". ئیدی بە دەمی پڕەوە منگەیەکم لێوەهات.

"هەنگوین؟"

منیش سەرم بادا.

"ئەرێ بۆ هێندە شیرینی؟"

منیش خەنیمەوە، دامێنی تەنوورەکەی خۆشم گرتبوو. ئەویش ڕوومەتی ماچ کردم ئارەزووم بوو هەمیشە جوانە هەر لەوێ بێ، چونکە بابە هێندە سەرقاڵی بەزەیی بەخۆداهاتنەوە بوو نەیدەتوانی سەری بخورێنێ، تەنها خەمی دایەش ئەوە بوو بە جیهانی دەرەوەی خۆی بڵێ ئاخۆ چەند شازە، چەند نایابە، داپیرەشم هەر خەریکی نوێژ و پاڕانەوە بوو بۆ نەوەکەی.

جوانە دەستێکی لەسەر کەمەربوو، لێی پرسیم: "لەیلا، ئەرێ هیچیت خواردووە؟"

"ماستم دۆزیەوە. بە شەکرەوە خواردم."

جوانه خێرا لەسەر تەباخە یەکچاوەکەی، ئەو شۆربایەی[9] مابووەوە گەرمی کردەوە، سووپێک لە گۆشت گوێرەکە و نۆک، هەرچەندە من هیچ گۆشتم تێدا نەبینی.

"ئەرێ کەی دایک و زراسکەکە دێنەوە ماڵێ؟ پێتوایە غەریبیان کردبم؟"

شلێر کە تازە لە نامەکەی بووبووەوە سەری هەڵبڕی و گوتی: "خۆ هێشتا زراسکەکە ناتناسێ؟"

منیش گوتم: "بەڵێ، دەمناسێ! براکەم لە نێو سەد کیژیشدا دەمناسێتەوە." جوانەش هەندێ نانی ورد کردە نێو شۆرباوەکە. منیش سوپە تامخۆشەکەم هەڵقوڕاند و لەسەر قسەکەم بەردەوام بووم: "ئەو دەنگی من دەناسێتەوە، ئاخر کە لە سکی دایکمدا بوو، گۆرانیم بۆ گوت." جوانەش سەلماندی، کە بە دڵنیاییەوە دەمناسێتەوە.

شلێر تا ئەو ڕادەیەی بیزانم، تاکە منداڵ بوو دایکی خۆی بە ناوی خۆیەوە بانگ دەکرد: "جوانە بۆ نەورۆز خەریکی دروونی کراسێکی نوێیە بۆ من و بۆ تۆ."

جوانەش گوتی: "ئەڤینا من[10]، تۆ سەرسامییەکەت لەباربرد."

شلێر منی بردە لای مەکینەی دروومانەکە، کە لەوپەڕی گۆشەی هۆدەکە دانرابوو، لەوێ لای ئاوساردکەرەوەیەک، کە ڕۆڵی بەفرگرەی ناوماڵی دەبینی. لەسەر مەکینە دەستییەکە، قوماشەکە هەروا دانرابوو، بێ ئەوەی شەقڵێکی هەبێ، بە گوڵی سوور و سپی نەخشێنرابوو.

---

[9] Shorabaw

[10] Avina min

"جوانە دوای ئەوەی لە شوشتنی ئەو دەفرانە بووەوە کە لەسەر دەسشۆرەکە مابوونەوە گوتی: "ئەرێ بۆ شلێری ڕووناکەیتەوە ئاخۆ ئێوە لێرە چۆن نەورۆز پیرۆز دەکەن؟

خۆی ئەمە بۆ شلێر یەکەمین سەرەسالّی نوێ بوو لە دەرەوەی زیندان بێ. منیش بە جۆشەوە باسی ئەو هەموو دیاریانەم بۆ کرد —زۆر جاران شتێک پارەی جەژنانە، یان لەوانەیە یاریی منالّان بێ - هەروەها چۆن هەزاران کەس لەناو جەرگەی شاردا کۆدەبنەوە، جا پڕ دەبێ لە شیرینی و ڕەشبەلّەک و ئاگر، کاتێکیش سەروسەکوتی پاسدار بەدەردەکەوێ، ڕەشبەلّەک هەلّدەوەشێتەوە، دەهۆل دەدڕێ و تەقەی دەبڕێ.

منیش چوومە لای جوانە و گوتم: "ئەرێ بۆچی باوکم دەگریا؟ خۆ ئەو حەزی لە نەورۆزە."

ئەویش سەرمی بە سینگی خۆیەوە نا. مەمکەکانی بە پێچەوانەی هی دایکم، بچکۆلە بوون. جوانە گوتی: "ڕۆژێک دێ بە خۆت بۆت دەدرەکەوێ."

منیش پرسیم: "ئاخر کەی؟"

"کاتێک هەراش دەبی و دەبیتە کیژوکالّ." ئینجا بە شێنەیی دەستێکی بە پشتەملی من داهێنا و ڕوومەتەکانی ماچ کردم.

منیش خۆم کێشایەوە و بە دامێنی بلوزەکەم لیکەکەی سەر ڕوومەتم سڕیەوە. "خۆ من گەورەم".

جوانە پێکەنی، ئەو پێکەنینەی لە هەناویەوە هاتەدەر، وەک تەباخێکی گازیش تەقییەوە. ئەو کوریشکانەی دەوروبەری چاوە ڕەشەکانی و دەمە باریکەکەی وای نیشاندا لە دایکە پیرتر بێ، ئەگەرچی بابە دەیگوت ئەو گەنجترە. دایکە پێستێکی نەرم،

شەویلاگی بەرز و چاوی هەنگوینی بوو. بۆیە سەیر نەبوو، زۆر جاران خەڵکی وایاندەزانی، شلێری پرچڕەش و چاوجوان کیژی دایکمە و منیش هی جوانە.

من لەسەر قسەکەم مکوڕ بووم: "دەی ئێستا پێمبڵێ."

"کاتێک باوکت هێشتا منداڵ بوو، شتێکی سامناک قەوما... پێموایە هێشتاش هەر خەمباری ئەو کاتەیە، بە تایبەتیش ئێستا زارۆکی خۆی پەیدابوون" دەستبەجێ شلێر لە شوێنی خۆی هەڵسایە سەرپێ، ئەوەی درکاندی بۆ ئەمڕۆ بەس بوو. "من دەیزانم چۆن هەندێ گوڵ بچنین و چەپکە گوڵێکی لێ دروست بکەین تا پێشوازی و بەخێرهێنانەوەی هانا و چیای مەلۆتکەی پێ بکەین."

من و شلێر بە ئۆخژنێکەوە هاوڕاییمان نیشاندا، ئەوسا جوانە پرچی خۆی بە لەچکێکی سپی داپۆشی، دەستی دایە جانتا دەستییەکەی و بە پێشمان کەوت بۆ دەرەوە. ئێمە لەو دەوروبەرە بە دوای چەپکە گوڵێکدا سووڕاینەوە، هەر بە پێ بەرەو پارک ڕۆیشتین تا گوڵە تازەپشکووتووەکانی نێرگز و میلاقەی بەهار بچنینەوە. کاتێکیش گوڵەکانمان لێکردنەوە، هەستم بە ئازارێک لە ناخمدا کرد، ئازارەکە زۆر سەخت بوو. کەچی هیچم بە جوانە و شلێر نەگوت. کاتێکیش باوەشێک گوڵمان کرد، لای میوەفرۆشێک وەستاین، لەوێ پیاوێکی کەلۆس[11] شلکی پێفرۆشتین، شلکەکان ئەوەندە پڕ و خڕپن بوون بە ئاستەم لە نێو لەپمدا جێگەیان دەبووەوە.

شلێریش بەر لەوەی یەکێکیان بخاتە نێو دەمی، گوتی: "شلک میوەی هەرە خۆشەویستی منە."

---

[11] کەلۆس: بێ ددان، ددانکەوتوو.

"شیرینەکەم، ئێمە زۆر بە بەختین. کوردستان باشترین شلکی هەیە."

ئەزیش هاتمەدەنگ: "لای منیش، هەنار."

"لەیلا، هەر دەبێ ئەوە لە خوێنتدا بێ. ئاخر باوکت خەڵکی هەڵەبجەی پایتەختی هەنارە."

"منیش دەمەوێ بچمە ئەوێ! لەوێ سەد هەنار دەخۆم."

کاتێ جەنگ کۆتایی پێ دێ بە نیازە بتانباتەوە بۆ ئەوێ. هیوادارم بە زوویی ئەو ڕۆژە بێ."

قەپاڵێکم لە شلکەکە دا، ئاوەکەی بە چەناگەمدا هاتەخوارەوە و لە جوانەم پرسی: "ئەدی شارەکەی تۆ چی هەیە؟"

جوانە بە دەسرۆکەکەی لالێوی سڕیمەوە و گوتی: "زەیتون. کۆبانێ زەیتونی نایابی هەیە."

هەرسێکمان سەیری پەپوولەکانمان کرد، پەپوولەکانی سەرەتای بەهار، ئەوانەی هەر لە خۆوە و لە هیکەوە لە هەمبەر بادا باڵەفڕکێیان بوو، باڵەکانیان وەک ئاونگ دەدرەوشانەوە.

"ئۆو، ئەرێ ئەو هەموو ساڵانە ئێوە لە کوێ بوون؟" جوانە دەستێکی بە سینگییەوە گیرساند، سەری لە خۆشی و ئەوقماندا هەژاند، ئاو لە چاوە گەشەکانیدا دەبریسکایەوە. "ئای خوایە ئەو هەشت ساڵەی بۆمباباران چی بەسەرهێناون؟ چی لەو هەموو هەنگ و سەرکەتەشییانە[١٢] کردووە؟"

---

[١٢] سەرکەتەشی: پووشبەقوونە، پووشکە بە کنگ، چووکڵەکنگە، زەلقنک dragonfly

"منیش پەپوولەم"، شلێر بە دەم ئەم قسانەوە قۆڵەکانی لە هەواوە سەرەو ژوور لەیەک دەدان. "نەخێر، ئەوەی ڕاستی بێ... نامەوێ ببمە پەپوولە. من دەخوازم ببمە هەڵۆ."

"هەرچەندە قەل هەزار ساڵ دەژی، لێ من دەمەوێ ببمە هەڵۆ." من و شلێر ئەو شیعرەمان دەگوتەوە کە جوانە فێریکردبووین، ڕۆژێکیان قەل ڕازی ژیانی بۆ هەڵۆ درکاندبوو: بە نزمی بفڕە و لەسەر خاشاک بژی، ئیدی هەزار ساڵ دەژی. هەڵۆش ئەوەی ڕەتکردەوە و گوتی: "چۆن بژی شەرتە نەوەک چەند بژی[١٣]." چەند زۆر بژی شتێکی گرنگ نییە، هونەرەکە لەوەدایە چۆن بژی.

جوانە ئێمەی بردە لاڕێیەکی نزیک پارکەکە، لەو شوێنەی پەپوولەی زیاترمان ببینین. "کیژینە، ئەوەتان لەبیر بێ، ئێوە دەتوانن ببنە هەرشتێک بتانەوێت. لێمەگەڕێن کەس واتان لێبکا بڕوا بە شتێکی دیکە بێنن. خۆ دەبینن، ئەم پەپولانە سوک و ئاسان کرم بوون."

پێم وا بوو بە هەڵە لێی تێگەیشتبم، لێم پرسی: "کرمی کرم؟ کرم دەبێتە پەپوولە؟"

شلێریش قسەی دایکی ڕاستکردەوە: "تەنیا تەتەڵەمیران[١٤]، نەوەک هەموو کرمێک."

لەنێو ئەو شتانەی ئەوێ ڕۆژێ لێی تێنەگەیشتم ئەوەبوو ئاخۆ شلێر چەند ڕاست بوو. ئاخر هیچ کاممان نەیدەزانی ئێمە کرمە تەتەڵەمیرانین یان کرمی ئاسایی. هەروەها نەشمان دەزانی ئاخۆ ئەو ڕۆژە ڕەش و تەنگەبەرانەی کە سەرەونخوون بوونەتەوە،

---

[١٣] *"Chon beji sharta nakou chanda beji,"*

[١٤] تەتەڵەمیران: دەرویشەمارە، ئەو کرمەی دەبێتە پەپوولە caterpillar

دەستپێکی مەرگن یان ڕێگەیەکی پێویستی باوەڕنەکراوی دۆخی گواستنەوەن بۆ شتێکی دیکە.

چیا و دایبابم بۆ شەوێ نەگەڕانەوە ماڵێ، بۆیە من هەر لە ماڵەکەی بنهۆمێ مامەوە. جوانە پەلی منی گرت و خستمیە بن بەتانی و ئەویش چاوەکانی بە دەسماڵەکەی داپۆشی. شلێریش لە لاکەی دیکەوە درێژ بوو. منیش ڕاکشام، بەڵام هێشتاش مێشکم هەر لای ڕۆندکەکانی باوکم و هەنارەکان بوو، هزرم لای ئەوە بوو ئاخۆ برا زراسکەکەم گۆرانی لە نێو دڵدا هەیە.

لە جوانەم پرسی: "ئەرێ پوورێ، دەتوانم گەمە بە یارییەکان بکەم." جوانەش دیاربوو بە نەرمی دەیپرخاند، ئیدی بە هێواشی خۆم لە بن بەتانییەکە خشاند، یاریم بەو ئەسپ و فیلانە کرد، کە جوانە لەسەر گۆشەی ڕەفەکەی دانابوون. ئەو ئەم شتانەی لە پارچە سەمونی وشک و ڕەق و ئێسکی نێو زیندان دروستکردبوون تا لێیان فێرببێ و ڕۆژانی خۆی پێ بەسەرببا. کەچی هەرزووش وەڕەز بووم و سەیری ئەو ناوەم کرد، ئەوە بوو چاوم کەوتە سەر تەلەفزیۆنێکی ئەستوور، کە لەسەر مێزێک لەولای تەختی نوستنەکەوە دانرا بوو.

پێشتریش کاتێک باوکم سەیری هەواڵەکانی نەدەکرد، لای خۆی دایدەنیشاندم و فیلمە کۆنەکانی لێدەدان، بە یەکەوە سەیرمان دەکرد. ئەوکاتە لە وشەکانی نێو فیلمەکان نەدەگەیشتم. لە مێشکی خۆمدا دەمەتەقێم دروست دەکرد. ئیدی ئەو شەوە، دەستم بە دوگمەی هەڵبوونی تەلەفزیۆنی جوانەوە نا.

دیمەنێکی مۆتەکەی سامناک و تۆقێنەری بێوێنەی لەسەر بوو: خەڵکی بە دەموچاوێکی بزرکاوە لەو مەیدانە لەسەر زەوی

دانیشتبوون، هەر جەستە بوو لە پاڵ دیوارەکە بەسەریەکەوە کەڵەکە بووبوو. مەل، مانگا، مەڕ، پشیلە، سەگ... ئەو هەموو ئاژەڵە بەسەر یەکدا کەوتبوون و مردبوون، هەروەک ئەوەی گوڵ بن لە چیمەنێکەوە لێکرابنەوە.

"ئەم بەیانییە سەدام حوسێن بە بۆمبای گازەوە لە هەڵەبجەی داوە. لە ماوەی تەنها چەند خولەکێکدا، ٥٠٠٠ کەسی مەدەنی بە بۆمبارانی غازی ماستارد و گازی دەمارکوژ، کە لە ئاسمانەوە دابارین، مردوون."

خەڵکیش لەو کاتەی بێ هوودە لەبەر شالاوی چەکی کیمیایی هەڵدەهاتن، لە شوێنی خۆیان ڕادەقەنان[١٥] و دەکەوتن. ئاخر دەیانەویست خۆشەویستەکانیان دەرباز بکەن، ئەوانیش ئێستا مردوون؛ کۆرپەلە و منداڵ و هاوژین، هەر هەموویان فەوتان و مردن. ئەوان بە چاوی کراوە و دەمی داچەقاوەوە مردن. مێش و مەگەز لانەیان لە نێو کونەلوت و ڕوومەتی سوتاوەوە دروست کردبوو. گۆشتیان ڕەش هەڵگەڕابوو. هیچ هەنوانێک نەبوو تا خەڵک لە هەورە چڵکنە زەردباوەکەی گازی دەمار و تۆکسینی بکوژیان بپارێزێ، نەخێر، تەنانەت پەناگەیەکیش بۆ خەڵکی سڤیل.

هورژمێکی ترس پەڕیە هەناوم، وای لێکردم بێ ئۆقرە هەڵبلەرزم، بەڵام خۆ من لە جێی خۆم وشک بووبووم، لە دیمەنەکانی سەر شاشە نزبووبوومەوە[١٦]. ژنێک تا ئەو کاتەی هەلیکۆپتەرێکی بۆ ڕۆڵە بچکۆلەکەی سەریەک بنێ و بیداتەدەستی تا یاری پێبکا، خنکا. کیژێک هەر بە بزەوە گیانی دەرچوو، وەک ئەوەی لە ناوەڕاستی نوکتەیەکی بێ تام بێ. پێدەچوو هەندێکیان بە هێواشی لەنێوچووبن.

---

[١٥] ڕاقەنان: بەلاداهاتن و کەوتن.

[١٦] نزبوونەوە: تێرامان بەبێ جووڵە، بە چاوی مۆلەق و حەپەساوەوە سەیری شتکردن.

ژنێک وەک پەت لوول بووبوو، هەرچی خوێن و ڕشانەوە بوو دەریدا بوو، بەسەر خۆیدا کردبوو، ڕوخساری لە ترس و سامناکییدا تۆقێنەر بوو. هەزاران بەڵێ هەزاران تەرم. ئەوانی دیکە لە دەرەوەی شار کەوتبوون، ئاخر هەوڵیاندابوو بگەنە شاخ، بە ئەندێشەی خۆیان بۆ شوێنێکی سەلامەت هەڵدەهاتن.

"ئەی هاوار، هەموویان مردن!" بەم قیژەیەمەوە جوانەم ڕاهەژاند، فرمێسکم بەتانییەکەی تەڕکرد. ئەویش بە پەلەپڕوزێ هەڵسا، بۆ چەند چرکەیەک لە تەلەفزیۆنەکە ڕاما، پاشان بازیدا و کوژاندییەوە، ئینجا توند منی گوشی و بەتانی پێدادامەوە. شلێریش هێشتا لە تەنیشت ئەو لە شیرین خەودا بوو.

"ئەرێ پووری، ئێمەش دەمرین؟"

جوانە دەستی بە سەر پرچمدا هێنا و فرمێسکەکانی سڕیمەوە: "شیرینەکەم، کڕبە[١٧]. تۆ سەلامەتی. تۆ لێرە لەگەڵ مندا هیچت لێ نایە."

"ئەدی، بابە گوتی تەلەفزیۆن درۆیە."

"بەڵێ، ئەوان درۆ دەکەن. ئەوان وان." ئیدی دەستی بە پشتمدا هێنا، بە دەنگێکی نەرمەوە گۆرانی "لای لای لای لایەی... بۆ گوتمەوە. دەنگە بە سۆزەکەی وردەوردە ئارامی کردمەوە تا خەو بردمیەوە.

ئەوێ شەوێ، خەونم بەو پەپوولانەوە بینی کە پێشتر بینیبووم؛ کە چۆن گەیشتبوونە هەڵەبجە، هەر بۆ ئەوەی لەوێ بە گازەکە

---

[١٧] کڕبوون: بێدەنگبوون. پێموایە لەم بەرڕەوتەدا کڕبوون هێزی دەربڕی لە بێدەنگبوون یان وسبوون پترە.

بمرن. به ملیۆنان له پەپووله به مردوویی لەسەریەک کەڵەکە بووبوون، گردێکیان له باڵی ڕەنگاوڕەنگ دروستکردبوو.

## بەندی دوو

ئەستێرەکان بە دامەنە درێژ و پانوپۆڕەکەی ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە، ئەوەش بێ ئەوەی گوێبدەنە ئەو داخ و حەسرەتەی لە هەناوی من و چیادا پێچیان دەدا، لەو کاتەی لەسەر پەیژەکانی باخچەی منداڵاندا چاوەڕێمان دەکرد، چاوەڕێی فەرامۆشکردنمان، چاوەڕێی فەرامۆشنەکردنمان، چاوەڕێمان دەکرد بێن و هەڵمانگرن و بمان بەنەوە. ئێمە بە بێزاری و سەرما لە حەوشەی باخچەکە مابووینەوە، چاومان لەسەر قیرەکە بوو، هەریەکەمان پاڵمان بە شانی ئەوی دیکەوە دابوو. باخچەی منداڵانیش بۆ چیایەکی تەمەن چوارساڵە بەهەشتی کەیفوسەفا بوو، بە ڕووی قۆدیلەیەک تەپڵی لێدەدا و لەبەر خۆیەوە ورتەورتی گۆرانییەکی لێوەدەهات. بە گۆرانییە هەراسانەکەی پێکەنیم، بەڵام خۆ ئەم خەندە و خۆشییە، ئەو گرێ و پێچەی نەدەڕەواندەوە، کە هەناوی دەگوشین.

کاتێکیش دایکی شلێر هات تا بیباتەوە، شلێر زمانی لێ دەرهێنام. منیش هەردوو دەستم بە دەموچاومەوە نا، وام نمایشکرد ئەوان دەستیان بە شیشەبەندی زیندانەکە گرتووە و منیش لە بنەبانێی زیندانەکەدا دەگریێم. شلێر وەک نیشانەیەکی بێباکی ڕووی خۆی وەرسووڕاند، بەڵام خۆ دەمزانی ئەگەر بە منداڵی زیندانێ بانگی بکەی، وەک ئەوە وایە دەرزی لێبدەی. منداڵان گاڵتەی خەپەییشان پێدەکرد، لێ ئەو باکی پێ نەبوو. لە تۆڵەشدا پشتی تێکردم.

هەفتەیەک دوای ئەوەی چیا لەدایک بوو، دایکیشم لە نەخۆشخانە گەڕایەوە ماڵێ، وای لە جوانە و شلێر کرد لە هۆدەکەی بنخانی بڕۆن، چونکە گوتی ئەو ناتوانێ متمانە بە قەحپەیە[18] بکا. ئەوانیش بە بێدەنگی لەوێ باریانکرد، هەرچەندە باوکم هەوڵیدا دایکم ڕازی بکا و وا لە جوانە بکا "دەڵە سەگەکە" پشتگوێ بخا. ئەگەر هاتبا و لە هەراشبوونمدا هەر ئەو بژاردەیەم لەبەردەمدا بووایە، ئەم بم یان ئەو، ئەوا بڕیارم دابوو باشترە ببمە قەحپەیەکی وەک جوانە لەوەی ببمە دەڵەسەگ. من لە دایکم پاڕامەوە بەڵکو لە بڕیارەکەی پەژیوان بێتەوە، لێ ئەو لێی قەدەغەکردم جارێکی دیکە قسە لەگەڵ شلێر یان لەگەڵ دایکیدا بکەم. کاتێکیش قوتابخانە دەستیپێکردەوە، دایکم لێنەگەڕا لەگەڵ شلێر لە پۆلێک بە یەکەوە بین، بەڵام خۆ من دەبووایە چەند خولەکێکی کەم خۆم بدزمەوە تا لەگەڵ جوانە بمێنمەوە، ئەو ژنەی هێشتاش هەر خۆشم دەوێ، خۆی ئەمە هەڵەی من نەبوو، کە دایکم ئەوانی لە هۆدەی بنخانەکە دەرکرد.

من یاریم لەگەڵ ئەو کەزیە سوورەم دەکرد، کە لەبن سەرپۆشەکەم هاتبووەدەرەوە، ئەو گرێچنەی لە جیاتی بۆ سەر ملانم شۆڕبێتەوە، بۆ سەرەوە هەڵکشابوو، کەچی لە دواییدا ئەوەندە درێژ بوو تا بۆ پشتەوە بپێچرێتەوە. پێیان گوتبووم، دەبێ ئەو کەزی و بسکانەم لە پشت سەرپۆشەکەمدا بشارمەوە. ئاخر لە ئێستاوە خوا چاودێریم دەکا، چونکە ببوومە نۆ ساڵان، ئیدی ئەگەر وا نەکەم و پرچم نەشارمەوە، خوا لە دۆزەخدا بە کەزیەکانم هەڵدەواسێت.

---

[18] ghahba

"ئەریٚ چیا، خۆ ئەگەر خوا سزای کچان نەدا تا دەگەنە سالٚی سێیەمی خوێندن، باشە ئەدی بۆ من هەر لە سالٚی یەکەممەوە حیجاب[١٩] بپۆشم." مانتۆ – ئەو شتە فشۆلٚ و چاکەتە درێژە کە لە سالٚی دووەمەوە لەبەرم دەکرد- بۆ من قورس و ناخۆش و نائاسودە بوو، وای لێدەکردم لە کاتی غاردان و یاریدا بۆم ئاستەنگ بیٚ. ئەو حیجابە بە تۆپزی کۆتێکی تافی منداڵییم بوو. "باشە بۆچی هەر بە لای کەمییەوە سەرپۆشەکەشمان ڕەنگی شادی تێدا نەبیٚ؟ هەروەک ئەوەی کەسک بیٚ؟" ئێمەی کیژوکاڵ ئەگەر هاتبا و پێلاو یان گۆرەوەیی ڕەنگینمان دەپێکردبا، تووشی چەرمەسەری دەبووین، خۆ ئەگەر کەزیەکانمان لەبن سەرپۆشەکانمان لە پشتەوە دەرهاتبا یاخود سەرپۆشەکەمان بایی خۆی درێژ و شۆڕ نەبووایە تا سینگوبەرمان داپۆشیٚ، کە هێشتا گەورەش نەبووبوون، ئەوا سەرئێشەیان بۆ دروست دەکردین.

چاوە بادەمییەکانی براکەم، کە هەموو کەس پێیان دەگوت چاوشینی گەش و خۆشیاندەویست، چونکە بە هۆیەوە سەریان بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە کاتیٚ ئەو ئەستێرەکانی دەژمارد "پێنج، شەش ، نۆ...".

"ئەریٚ چیا، پێکەنین چی خراپی تێدایە؟ باشە بۆ چی کیژە باشەکان پێنەکەنن؟"

پێویست نەبوو براکەم نە پرچی بشارێتەوە نە جەستەی، تەنانەت کە گەیشتە نۆ سالٚیش، نە هەرگیز. لە ڕۆژدا، ئەو دەرفەتەم هەبوو سەری باخچەی منداڵان بدەم، ئاخر دیواری بە دیواری

---

[١٩] hijab

قوتابخانەکەمانەوە بوو. دڵنیا دەبوومەوە لەوەی ئەو دڵخۆشە، کەس شەڕی پێنەدەفرۆشت، چونکە ئەگەر یەکێک وەهای بکردبایە، دواتر لێمدەدا. هەموو منداڵانیش ئەوەیان دەزانی.

ئەوە بوو تا دەهات هەم سارد و هەم تاریکتریش دادەهات، هێشتاش هیچ ئاماژەیەک لە دایبابمانەوە نەبوو. ڕاڕەوەی قوتابخانەکە چۆڵ بووبوو؛ ئەوە یەکەمین جار بوو ببینم ئەوێ بێ هەراوزەنای قوتابی و مامۆستایان بێ. بەڕێوبەرەکە ئێمەی وەخراوی بردە ژوورەوە بۆ نووسینگەکەی خۆی. ئێمە لە تەنیشت دۆلابی فایلەکانەوە دانیشتین، لەو کاتەی ئەو بەسەر ڕۆخی کورسییە پلاستیکەکەدا شۆڕ ببووەوە، ئەو پەڕەکاغەزی فایلەکەی ئێمەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد. بە پەستییەوە بۆڵەبۆڵێکی لێوەهات. "سەیرە! نە ژمارەی تەلەفۆنی ماڵ نە وەڵامی تەلەفۆنی فریادڕەسیش هەیە." ئیدی ڕووی خۆی وەرگێڕا تا سیما نیمچە بە بەزەییەکەی بشارێتەوە.

لەو نێوەدا دەرگەوانی قوتابخانە لە نیوەی ڕاڕەوی دەرگەی هۆدەی بەڕێوبەرەکە، کە سەتڵێکی پڕی لە پەڕەکاغەزی فڕێدراوی پێبوو، بەدەرکەوت و گوتی: "من دکتۆر ئالان سامان، باوکی ئەوانە دەناسم." ئەو پیاوێکی بەژنکورتی ڕەقەڵەی کەپوو گەورەی قولاپی بازئاسا بوو، سمێڵێکی فشی ڕەشی سەیری پێوەبوو، خەریکبوو هەموو ڕوخساری داپۆشێ. لەسەر قسەی بەردەوام بوو: "دەکرێ ئەمانە بگەیەنمەوە ماڵی خۆیان."

بەڕێوبەرەکە دوای ساتێک لە تێرامان، کە خۆیشی پەرۆش بوو بڕواتەوە، قایلبوو. ئیدی بە دوای دەرگەوانەکە کەوتین بۆ گەراج،

لەوێ ئێمەی خستە ترومبێلە داشقە باربەرە بۆرەکەی، کە بۆنیتی پێشەوەی پێوەنەمابوو. "بەرخۆڵەکان[20]، ئەوە لەبیرنەکەن، کاتێ گەیشتنە لای ماڵتان یان گەڕەکەکەتان لە جامی پەنجەرەکە بدەن. دەی بە باشی دابنیشن و نەجووڵێن." منیش ئەوەم پێخۆش بوو، کە بە بەرخۆڵە بانگی کردین.

بەڕاستی خۆ ئەوێ شەوێ، هەر شەقامێکی تەنگەبەر کە پێیدا ڕۆیشتین، قیرتاوکراو بێ یان نا ، نائاشنا دەهاتە بەرچاو. پەنجەرەی نزیکەی هەموو ئەو ماڵانەی بە بەردەمیاندا ڕەت دەبووین، ڕۆشن بوون و تارمایی بیچمی کەسانێک لە پشت پەردەکانەوە دەجووڵا، دیاربوو ئەندامانی ماڵبات بە یەکەوە فراوینیان دەخوارد یان سەیری تیڤیان دەکرد. من دەستە ساردەکەی چیام خستبووە ناومشتم و چیرۆکم بۆ دەگێڕایەوە، کۆپلەی دیمەن و جووڵەی ئەکتەرەکانم لە مێشکی خۆمدا بەرجەستە دەکرد.

"لەوێدا کیژێک هەبوو، ئارەزووەکانی دەبوونە ڕاستی. هەر دەمودەستیش وای لێدەهات. ئارەزووی ئەوەی بوو برا بچکۆلەکەی زۆر بەهێز بێ، ئیدی لەپڕ بووە زەبەلاحێکی کەتە." لەو کاتدا چیا بە پەرۆشەوە سەیری کردم. "جارێکی دیکە، بینی لە پشتەوە گورگێک بۆ براکەی دێ. ئیدی بە گریانەوە "ئای لەو بیژمۆتە!" کاتێکیش خۆی و براکەی بە دوای کەلاکی گورگەکەدا گەڕان، بینیان باوکیان لە بن گورگەکە لەسەر زگ کەوتووە."

"نااااا!"

---

[20] Barkholakan

ئێستا من باسی یەکێک لە خەونە جڕناوفڕنا دووبارەبووەکانم دەکەم. "پشتی بابەکە هەمووی هەر شوێن قەپاڵی گورکەکە بوو، هەروەهاـــ"

چیا دەستە بچکۆلانەکەی لەنێو دەستم دەرهێنا و دەموچاوی پێ داپۆشی.

"- هەروەها ئەو لە هۆش خۆی کەوتبوو، خوێنی گورگەکەش بەسەر دەموچاوی، بەسەر کەپوویدا دەهاتە خوار و دەمیشی تەواو کرابووەوە، وـــ"

ئەو کە هێشتا دەستەکانی بە دەموچاویەوە گرتبوو هاواری دەکرد "لەیلا!"

"چییە؟"

"لەیلا، بابەی مەکوژە! تکایە مەیکوژە." ئیدی لە پڕێکەوە ترومبێلەکەی لە قۆرتێک دا، ئێمەی هەژاند و بە پشتەوەدا کەوتین.

"هەی گەمژە، من بابەم نەکوشتووە. من سمتە بچکۆلانەکەتم دەربازکردووە." بە قووڵی لەو کۆڵانە کپ و بێدەنگە ڕامام، دەتگوت لولدراوە و بەرووی خۆیدا ئاوەژوو بووەتەوە، هەستێکی وەها خانووەکان تێکچەقیبن، زیاتر پێکەوەنووسابن. گوێم لە دەنگی بانگی شێوان بوو لە مزگەوتێکی نزیکەوە دەهات، حەزم لێ بوو ترومبێلەکە ئێمە بە پیر ئەو دەنگە ببا. حەزم لەو بانگە بوو، ئاخر پێنج جار لە ڕۆژێکدا بیرم دەخاتەوە کە خوا گەورەیە- گەورەترە لە بابە و دایکە، لە من و لە چیا یان لە بەڕێوبەر و دەرکەوانەکە. لە مێشکی مندا خوا مانگێکی دەم بە خەندە بوو، من و چیای خۆشدەویست.

بۆ مایەی سەرسامیم ترۆمبێلە باربەرەکە بە خواستی ئارەزووم وەستا و لە کۆتاییدا گومبەزە ڕەونەقدارەکە لە پشت ڕیزە خانووەکانەوە، لەوسەری بانی ماڵی ئێمەوە بینی. ئەوسا لە جامی پەنجەرەی ترۆمبێلەکەم دا و لە پڕێکیشەوە ترۆمبێلەکە وەستا و ئێمەی بەرە پێشەوە برد. پیاوە سمێڵزلەکەش لە خۆشیان لە شوێنەکەی خۆی دابەزی و بە توندییەوە دەرکەی پێوەدایەوە و بانگی کرد: "کامەیان؟"

منیش نیشانم دا، ئەویش پەنجەی لەسەر زەنگەکە داگرت. هیچ وەڵام نەبوو. ئینجا بە مست لە دەرگە ئاسنینەکەی دا، کە لە دیوارێکی بڵند گیرابوو، بۆ ئێمە نەدەکرا بەسەریدا هەڵبگەڕێین. لە دەرگەدانەکە دادی نەدا، لەگەڵ دووبارەبوونەوەشدا، کەس بە پیر دەنگەکەوە نەهات. ئینجا کابرا چەند هەنگاوێک کشایەوە، لەبەر خۆیەوە ورتەیەکی لێوەهات. "ئای لەوانە، تۆ بڵێی چ دایک و باوکێک بن... ئاخر کێ دەتوانێ بەم جۆرە منداڵەکانی فەرامۆش بکا؟ سوێند دەخۆم ئەوان لە هەتیوخانە بان حاڵیان باشتر دەبوو." بە پێلەقان لە دەرکەی ماڵی ئێمەی دایەوە، خانووەکەشمان لە خشت دروستکرابوو.

بە لێڕامانەوە تەنکە ڕدێنەکەی خۆی خوراند. "من دەبێ بە پەلە بڕۆم. ژنەکەم زۆر پێویستی بە دەرزیەکەیەتی. ئەو نەخۆشیی شەکرەی هەیە. بەر لەوەی دابخرێ، دەبێ بە غار خۆم بگەیەنمە دەرمانخانە."

منیش پشتم تێکرد. ئارەزووم خواست بەڵکو بڕوات و جێمانبێڵێ.

"بەرخۆلەکان، لێم ببوورن. دەی لێرە لە بەردەم دەرگەکە لە پاڵ یەک بوەستن و مەبزوون، باشە؟ هاکا دایک و باوکتان بگەڕێنەوە ماڵێ. من دوای کەمێکی دیکە دەگەڕێمەوە، ئەگەر هات و تا ئەو کات هێشتا نەهاتبنەوە، لەگەڵ خۆم دەتانبەمەوە ماڵی خۆمان."

دەستێکی بە سەری چیادا داهێنا و گەڕایەوە لای ترومبێلەکەی خۆی و هەر بردەبردیشی بوو: "سا لەسەر ئەو حاڵەش، ژنەکەشم پێمدەڵێ باوکێکی خراپم."

من دانیشتم، پشتم بە دیوارەکەوە نا. چیاش هەمان شتی کرد. هەم سەرما و هەم برسیشمان بوو. دەستمان لە چۆکمان وەرێنابوو، لە زیخ و چەوی سەر ڕێگا نزیببووینەوە. بۆنی گزۆزی ترومبێلەکە کەپووی پڕکردبووم. زگیشم پێچی دەکرد، لە برسان قۆڕەی دەهات.

پێکەنینمان هات.

لە پڕێکەوە و بە بێ ئەوەی شتێک لە گۆڕێدا بێ چیا گوتی: "بابەی ڕزگار بکە."

"چیا، چ گەمژەی."

ئەو بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان پرسی: "ئەرێ بۆ جاری داهاتوو لە پەلاماری گورگان دەربازم دەکەی؟"

"ئەرێ، خۆ کوشتم."

داوای لێ کردم: "دەی یەکێک لە چیرۆکە خۆش و شۆخییەکانم بۆ بگێڕەوە؟"

"ئێستام پێ وەختی جەفەنگ نییە." بە دەم ئەم گوتنەمەوە پەنجەی ئاماژەم بۆ لێوی سەرووم برد و لاسایی دەرگەوانەکەم کردەوە. "ئەوان لە هەتیوخانە بان حاڵیان باشتر دەبوو."

"ئەرێ هەتیوخانە چییە؟"

"دەی." ئیدی پەنجەم بۆ مانگە خەندەدارەکەی تاقی ئاسمان ڕاهێشت و ئەویش سەری بە ئاراستەی قامکەکەمدا جوولاند.

لە بری وەڵامەکە گوتم: "ئەرێ پێت چۆنە لەبری ئەوە چیرۆکێکی مەولانات[21] بۆ بگێڕمەوە." چیا حەزی لەو جۆرە چیرۆکانە بوو. منیش حەکایەتی توتییەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەوەی شوشەی ڕۆنی گوڵی ساحێبەکەی خۆی شکاندبوو. ماخۆکەی هێندی بەسەری پیرە توتیەکەیدا کێشابوو، چی تووکی گیانیەتی هەڵوەریبوو. توتی بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ بە گرژیی و مۆنی مایەوە. وەختێکیش کابرایەکی کەچەڵ بە بەردەمیدا ڕەتبوو، لێی قیژاند: "ئەدی ئەتۆ هیزەی ڕۆنی کێت بە عەرزێ داداوە؟

چیا پێکەنی و سەرە بچوکەکەی خستە سەر شانە ئێسکەدارەکەی من. تەنانەت هێشتا زۆر سەخت بوو بۆ من، کە چاوەکانم زەق بن. ئاخر پێمگوتبوو گورگەکەم کوشتووە، بەڵام ئەدی چی لەبارەی دزەکانەوە؟ چی دەبوو گەر هاتبا و ئارەزووم نەهاتبایە دی و نەمتوانیبا کەس ببەزێنم، چونکە ببوومە نۆ ساڵان، ئەو تەمەنەی دەبوو کیژان خۆیان داپۆشن؟

---

[21] مەبەست مەولانا جەلالەدینی بەلخییە.

دایکم که له ویستگەی پاسەوە بەسەر گردەکەدا هەڵگەڕابوو، بە هەناسەبڕکێوە گوتی: "ئەوە ئێوە لێرە چی دەکەن؟"

"ئێ... ئێمە."

"دەی هەر ئێستا .. بۆ ژوورەوە." ئیدی دەستی دایە جانتاکانمان و قفڵی دەرگە ئاسنینەکەی کردەوە. من هێشتا شوێن جێپێی کابرای دەرگەوانم بەدی کرد، کە بە بۆیەی دەرگە ئاسنینەکەوە مابوو. ئینجا خێرا لە ڕێی گەراجی حەوشە تاریکەکەی پێشەوە بەسەر پلیکانەکاندا سەر کەوتین، دوو پەیژەمان بە یەکجار دەبڕی، بەڵام خۆ لەوەندە زیاتر نەماندەتوانی بڕۆین، ئاخر بابە ڕەق و تەق لە ڕاڕەوەکە وەستا بوو.

دایکم بانگیکرد: "ئالان. ئالان". جانتاکانیشمان بە دەستییەوە قورس دیاربوون.

بابە بە تیلەی چاو سەیری کردین و خۆی تی دا، کەمێک بە ئاستەم ڕێگەیەکی تەسکی بۆ ئێمە کردەوە. بردەبردێکی لێوە هات. "تەعەق. هەروەک ئەوە."

بە ئەنقەست پێم لە بوتڵە ئارەقێک هەڵدا، کە لەو گۆڕە کەوتبوو، وەهاشم نیشاندا لەپڕ پێم تێهەڵنگوتووە. لەو کاتەوەی مامم، براگەورەکەی بابم لە ڕاپەڕینی پاردا کوژرابوو، بۆنی ئارەق لە ماڵی ئێمە شتێکی ئاشنا بوو.

دایکە باوەشێکی بە چیادا کرد، هەڵیگرت و بردییە ژووری نوستن، کە لە لای دەروازەی چوونەژوورەوە هەڵکەوتبوو. نهۆمە سەرەکییەکەی ئێمە لە دوو هۆدەی نوستنی بەیەکەوەنووساو پێکهاتبوو: یەکێکیان من و چیا لێبووین، ئەوی دیکەش بۆ دایباب،

هەرچەندە بابەش لەوێ نەدەخەوت، بەڵکو بە تەنیا جێگە و بالینگانی بردبووە هەورەبانەکە.

کاتێکیش دایکم لە ژووری نووستن گەڕایەوە، ڕووی تێکردم و پرسی: "ئەرێ ئەوە چ قیامەتێکە لێرە ڕوودەدا؟" منیش نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. "باشە، بەو شەوە ئێوە لە دەرەوە چیتان دەکرد؟

ئینجا ڕووی لە باوکم کرد، هێشتا هەر لە ڕاڕەوەکە وەستابوو. "سەرەتا بە پەلەپرووزێ دایکم بگەیەنرێتە نەخۆشخانە، پاشان منداڵەکانم بەو دەردە ببردرێن و وەها درەنگ بکەون و هەنوکەش تۆ؟" ئینجا بایدایەوە سەر من: "باشە بۆچی لە دوای هاتنەوەت لە مەکتەبێ، خۆتان نەگۆڕی؟" ئەوسا سەرپۆشەکەی لەسەری هێنایەخوار و هەندێک باوەشێنی پێ لە خۆی کرد، دیسان ڕووی لە بابە کردەوە: "ئەرێ بۆ خاتری عیزرائیل، چیت لێقەوماوە؟"

"پەککوو... تیرۆر،" بابە بە نەرمی ئاخێکی هەڵکێشا، شەهیدکران. نێوچاوانی خستە سەر ناوکەوەکە، قۆڵ و ئەژنۆی هەروەک ساوایەک وێک هێنانەوە.

دایکەش ئاخێکی هەڵکێشا و کەوتە سەر چۆک. "دیمێنشیا"[22]ی دایکم خراپتر بووە. ئەمڕۆ لە ماڵ هاتبووە دەر، غاری دابووە سەر شەقام. بە هۆی ئەوەوە سێ ترومبێل خۆیان بە یەکدا دا، یەکێکیش خۆی پێداکێشابوو."

بابەش بە بردەبردێکەوە: "بە ڕۆژی ڕووناک، تەقەیان لێکردن. تاق."

---

[22] دیمێنشیا، dementia خەڵەفاوی، تێکچوونی عەقل.

"کێ؟ ئەوە تۆ باسی کێ دەکەی؟ گوێت لە من بوو چیم گوت؟ ترومبێل لە دایکمی داوە. کێ تەقەی لێکراوە؟" دایکم هەڵسایەوە بە هۆڵەکەدا چووە ناندینەکە. "دەزانی چی؟ تەنانەت پێشم مەڵێ. من دەیزانم چییە. گرەو دەکەم دیسان سیاسەتە. سەرکردەیەکی دیکە لەناوبرا، یەکێکی دیکە." دایکە دەرکەی یەخچاڵەکەی کردەوە؛ من دڵنیابووم هیچی تێدا نادۆزێتەوە. "چونکە ئەمە هەموو شتێکە، کە تۆ خەمی لێدەخۆی. تۆ زیاتر بایەخ بەوە دەدەی لە ژن و منداڵت." دەرکەی یەخچاڵەی پێوەدایەوە، نیگایەکی خەجاڵەتبارانەی تێکردم و گەڕایەوە ژووری نوستنی خۆی.

هەستمکرد ڕووداوەکانی شەوەکە منیان کەرت کردبێ و ئەندامەکانمی لە بنەوە دەرهێنابێ. خۆ من شایستەی هەموو شتێکی بەد بووم، کە بەسەرم هاتن، ئاخر خۆ هەرگیز بە تەواوی جەستە و سەر و پرچم دانەپۆشیبوو. هەندێ جار بازندەکانم بە دەرەوە بوون. هەندێ جاریش تیسکەکانی پرچم لەبن سەرپۆشەکەمەوە دەهاتنەدەرەوە.

بابە هەوڵیدا قیتبێتەوە، کەچی کەوتەوە. هۆدەی دایکەش تاریک بوو، بەڵام گوێم لە ورتە دەنگی نەرمی بوو، سرتەیەک کەس گوێگری نەبوو.

بە پێدزیلکەوە خۆم گەیاندە ناندین. چوومە پشت کەوانتەری قاپوقاچاغ، ئاخر لەوێ لەتکە قەیسیی وشککراوم شاردبوونەوە، ئەوانەی بە پارەی جەژنانەی ڕۆژی لەدایکبوون و نەورۆز کڕیبوونم. بە هێواشی لەتکە قەیسییەکم خوساند و بە کەوچکی چا خوێم بەسەرداکرد. هەر بە تەنیاش دەنگی یەخچاڵەکە و سیرسیرەی

جیڕجیڕۆکەکانی حەوشەی دواوە دەهات. ئینجا ئامانەکەم[٢٣] بە سەرپەرۆکێکی وشکی سەر چا گرت و لە کەوانتەرە پیسەکەدا شاردمەوە.

دواتر بەبێ خشپە چوومەوە هۆدەی نووستنەکەمان، دیاربوو چیا بە ئارامی خەوی لێکەوتبوو، منیش خۆم خشاندە سەر بەشی سەرەوەی چارپایەکە. هێشتا بابە لە هۆڵەکە هەر بردەبردی دەهات. بووکەڵەکەم بە مشوورخۆری خرابووە بن بەتانییەکەم. خۆی باوکم ویستبووی ناوم لێبنێ نیشتمان،[٢٤] لێ دەرکەوت ئەم ناوە لەنێو لیستێکی دووروودرێژ لە ناوی دیکە بە تەواوی لە لایەن حکومەتەوە قەدەغەکراوە. لێ خۆ کەس نەیدەتوانی ڕێم لێبگرێ تا بە بووکەڵەکەم بڵێم نیشتمان. بە پەنجەکانم پرچی بووکەڵەکەم دادەهێنا و بە سرتەیەکیشەوە پێم دەگوت، باوکی فاتیما کامێرایەکی لەگەڵ خۆی هێناوەتە قوتابخانە، منیش بەوپەڕی تاسەوە حەزم لە کامێرایەک بوو. لێ خۆ حەوجەی ئەوە نەبوو نیگەران بێ؛ نەخشەم هەبوو هەندێ پارەم دەستکەوێ و کامێرایەک بکڕم.

من لە بووکەڵەکەم پرسی: "گەلۆ واتای شەهیدکرا دەزانی؟" بووکەڵەکەم گوێی لە چرپەکەم گرتبوو، چاوە دەنکە فاسۆلیا ڕەشەکەی بێدار بوو. "گوێبگرە، دەبێ لەوە دڵنیابی، کە پیاوان کەزیەکانت نەبینن." ئەوە بوو لە نێوەڕاستی وتەکانمدا نیشتمان خەوی لێکەوت.

---

[٢٣] ئامان: قاپ، دەفر.

[٢٤] لەڕستەی دوای ئەوە ڕاڤەی وشەکەی کردووە، لێرە پێویست ناکا.

بۆ ڕۆژی پاشتر قوتابخانە نەبوو، دەکرا من و چیا تا درەنگانێکی بەیانی لە خەو هەڵنەستین. دایکە بۆ نانی بەیانی و نیوەڕۆ پەتاتەی کوڵاندبوو، بەیانی زووش بە سەر بابەدا پازیدابوو، کە هێشتا لە ڕاڕەوەکە کەوتبوو، چووبووە سەرکار. دوای ئەوە لە خەو هەڵسام، لە کەوانتەرەکەدا بە دوای گەنجینەکەمدا گەڕام. بە ڕۆژی ڕووناک چەوری لەسەر ڕووی کەوانتەرەکە و تەونی جاڵجاڵۆکەش کە بە بنمیچییەوە بوو دەبریقایەوە. هێشتاش بەشە لەتکە قەیسییەکەم ساغ و سەلامەت بوو. هەموو ئەوەی پێویستم بوو، ئەوە بوو باوک هەڵبستێ و لە ماڵ بچێتەدەرەوە. لە ناندینەوە بۆ ژووری دانیشتن ڕاوێچکەم دەدان و چاویشم هەر لەسەر حەشارگەکەم بوو. زۆری نەخایاند چیاش لە خەو ڕابوو، لەگەڵ یارییەکانی کەوتە گەمە.

"هێی!" دەنگێکی وای لێوەهات کاتێ لە گەمەکەدا هەوڵیدا ترومبێلەکەی بوەستێنێ و خۆی بە ئەوی دیکەدا نەدا، بەڵام دواتر "بووووووم."

"ئەرێ ئەوە دەزانی دەنگی ترومبێلەکانی تۆ لە دەنگی ئەسپ دەچێ." بەدەم ئەم قسەیەوە منیش دەستم بە دروستکردنی وێنەیەک کرد، بە لای کەمییەوە بۆ من لە ئەسپ دەچوو.

ئەویش کە نەیدەتوانی پیتی ڕا و سین دەربڕێ، گوتی: "ئەشپی تۆ لە ملیشک دەچێ!" [25]

منیش گوتم؛ "دەی زمانی خۆت بگرە. بڵێ ڕڕڕڕڕڕڕ."

---

[25] ئەوەی ڕاستی بێ، نووسەر هەر باسی دەرنەبڕینی پیتی ر (r)ی کردووە، لە وشەی horseی ئینگلیزیدا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەسپی کوردی پیتی (ر) تێدا نییە، وامکرد نەتوانی (سی)دەربڕێ و بیکاتە (ش)، و تێکەڵکردنی ڕا و لامیش لەو وشانەی لە وەرگێڕانە کوردییەکەشدا هەن وەک خۆیم هێشتنەوە.

"ل ل ل ل ل ."

"ئای چەند شیرینی!:" سەر ڕومەتیم ماچکرد.

سەروبەندی نیوەڕۆ و لە کۆتاییدا بابە توانی لەسەر ناوکەوەکە هەڵسێتەوە، ئاوێک بە خۆیدا بکا. بۆنی سابونی گوڵەخەزێم، کە بە توندی لە جەستەوەیە دەهات، کەپووی پڕکردم، ئەو چووە ناندین تا چایی دێم بکا، هێلکە بکوڵێنێ و پاشان حەبێکی ئەسپیرنی بەسەردا بخوا. پەشتەماڵەکەی تەنیا لە ناوقەدەوە بەرەو خوار داپۆشیبوو، دیسان نەخشەی سەر پشتی دەرکەوتەوە. من سەیری ئەو ڕایەڵانەی جێشوێنی قامچییەکانی سەر پشتیم کرد. ئەم دیمەنە وەک ئەوە وابوو هەناوم بە تیغێکی سیلڤەر کەرت کەرت بکەن. سەیری دوڕ چاوی چیام کرد، ئەویش سەیری هی منی کرد، بەڵام خۆ ئێمە هەرگیز باسی ئەو هێڵە برەڕانەی گۆشتی پشتی باوکمان نەدەکرد.

ئەو چووە سەرەوە بۆ هەورەبانەکە و دوای چەند خولەکێکی کەم هاتەوەخوارەوە، دیاربوو خۆی گۆڕیبوو، پانتۆلە فشۆڵە ڕەنگبۆرەکە و بنکراسێکی بێ قۆڵی لەبەرکردبوو. تێبینی ئەوەم کرد هێشتا هەندێ شتی هەر لە هۆدە هاوبەشەکەی لەگەڵ دایکم هێشتبووەوە. لە شوێنە هەمیشە خۆشەکەی خۆی لە بەرانبەر کتری چالێنانەکە کە هەر هەڵمی لێهەڵدەستا، لەوێ لەسەر مافوورێکی دەستکردی دایکی دانیشت و بالیفێکیشی دایە بەر پشتی. ئەو بەڕەیەی لەو شتە کەمانە بوو، بۆی مابووەوە. مافوورەکە بە وردی و جوانی چنرابوو، بە گرێی داوی ڕەنگ سوور و سپی و شین لەسەر خورییەکی نازدار نەخشێنرابوو. بەڵێ، ڕەنگە

زۆروزەبەندەکانی بەرەکە، مۆبیلیاتی نارێک و لەیەکنەچووەکەی ماڵەکەمانی داپۆشیبوو.

بابە سفرەی لەسەر مافوورەکە ڕاخست و پەتاتە و زەڵاتەی دەرخواردی ئێمە دا. ڕوخساریشی وشک و بزڕکاو بوو، بەدەر لەوە دیاربوو لە دوێنێ شەو باشتر و ڕێکتر بوو.

بابە بە دەم جوێن و خەیاڵڕۆیشتنەوە لێی پرسیم: "ئەرێ هیچ خەونی شەولەبانانەی دیکەت بینیون؟ منیش سەرم بۆ لەقاند و وەڵامم دایەوە، بەڵام ئەو ڕادیۆکەی تا ئاستی گوێی بەرزکردەوە و میلەکەی بادا. زرەدەنگی کەوتە بەر تەپڵەی گوێم. ئاخر حکومەت ئاماژەی ڕادیۆ بیانییەکانی جام کردبوو.

بە سرتەیەکەوە گوتم: "دەنگی ڕادیۆی بابە وەک ئەحمێکە لە گەرووپەکی هەوکردووە دەربچێ."

چیاش بەم قسەیە دایە لە قریوەی پێکەنین.

بابە ئاگاداریکردەوە: "بێدەنگ!"

دەنگێکی سارد لە ڕادیۆکەوە هات: "دوێنێ سادق شەرەفکەندی، سکرتێری گشتیی حیزبێکی کوردیی نەیاری حکومەتی ئێران لە چێشتخانەی میکانۆس لە بەرلینی ئاڵمان، لەناوبرا." بابەش بە دەستە تووکنەکانی دەموچاوی خۆی داپۆشی؛ دەمارەکانی پشتی دەستی بەل بووبوون. "ئەمەش هەر سێ ساڵ بە دوای سەرکردەی پێشخۆی هات، کە لە ١٩٨٩دا لە ڤیەننادا کوژرا. بڕواش دەکرێ بکوژەکان کاریان بۆ حکومەتی ئێرانی کردبێ..."

دەنگی ڕادیۆکە بە کزی دەهات. منیش ئحمێکم کرد، ویستم ڕادیۆکە بکوژێتەوە و باوکم لە دەست هەواڵەکان بپارێزم. ئەویش گوێی لە من نەبوو، هەروەک چۆن قرِوقەپ، بێ جووڵە بە شەویلاگێکی ڕێکهەڵاتوو، ڕوخسارێکی خۆڵەمێشی لێی دانیشتبوو، ئاماژەیەکم بە چیا دا، ئیدی بە یەکەوە هاتینە حەوشەکە. دارگێلاسە ڕەقوتەقەکە پرتەقاڵی و زەرد هەڵگەڕابوو. ئێمەش خواخوامان بوو زوو دەستمان بە میوەکە ڕابگا و بەر لە شوشتنەوە بیخەینە دەممان، پێش ئەوەی کرم و باڵندە پێورەبن و بیخۆن، ئەم کارەشمان وەک دارِسانێکی بچووک دەزانی، بەڵام خۆ هیچ بەرێکی پێوە نەمابوو.

چیا شاپێکی لە خۆڵەکە هەڵدا و گوتی: "ئەرێ بابە چییەتی؟"

"نازانم."

"لەیلا، بۆچی دەیانەوێ بمانکوژن؟"

"پێم وا بێ ئەوان وڵاتەکەی ئێمەیان دەوێ."

ئەو مستە بچکۆلانەکەی بەرزکردەوە: "ئاخر ئەگەر وڵاتەکەی خۆمانیان بدەینێ، ئەدی ئێمە بۆ کوێ بڕۆین؟"

"بەڵکو ئەودیوی دونیا."

چیا سەری هەڵبڕی و برۆکانی قیتکردنەوە: "خۆ ئەگەر لەژێر خاکدا بژین، ئەوا بابە دڵتەنگ نابێ."من بە چرپە و بە خەندەوە گوتم: "دەمەوێ بوتڵەکانی بابە "بڕێژم و پڕیان بکەم لە ئاو. ها، ئاگادار بە، هەرگیز لە قوتابخانە باسی بوتڵەکانی نەکەی، باشە؟"

منداڵان لە سەرەتای چوونە باخچەی ساوایانەوە ژیانێکی دووفاقی دەژیان، ئاخر مامۆستاکان و کاربەدەستانی حکومەت لێیان دەپرسین ئاخۆ هیچ چالاکییەکی نائیسلامییانە لە ماڵەکانیاندا دەکرێن. چیاش سەری لەقاند.

من گوتم: "دەی با دارەکە ئاوبدەین، تا سەرلەنوێ گێلاسمان بداتێ."

کاتێ چیا غاریدا سۆندەی ئاوێ بێنێ، لاق و باسک و ڕوومەتە خەپۆکەکانی دەلەرینەوە. منیش هاتمە سەر ئەو ڕایەی کە هەموویان دەیانگوت: "تۆ هەر ماڵی ئەوەی گەزێکت لێدەم و بتخۆم."

ئەویش برۆی هێنایە یەک: "گازلێگرتن خراپە."

منیش سۆندەکەم لێوەرگرت و دەستم بە گێڕانەوەی ئەو فیلمەی نێو مێشکم کرد، کە بە تەمابووم دەریبهێنم. "هەبوو نەبوو، پاشایەک هەبوو، جارێکیان بە کوڕەکەی خۆی گوت؛ تۆ دەبێ بچی خوشکەکەی خۆت بکوژی. ئەو کیژێکی خراپە."

چیا سەری بەرزکردوە و مۆڕەیەکی لێکردم: "جا کچێکی خراپ بوو؟"

"کیژێکی خراپ نەبوو، بەڵام وەزیرەکە دەیویست سەری لێبکاتەوە؟"

"بۆ؟"

"بەڵکو ئالزهایمەری هەبووبێ."

چاوە هەنگوینییەکانی لە بەر گرێکوێرەی مەتەڵەکە ڕەش هەڵگەڕان. "ئالزهایمەر چییە؟"

کەوانتەرە شڕووڕەکە دەرهێنا، بە جوانی لە دوو پاکەتدا دامانناند، ئینجا لە بەردەم دەرکەی ماڵمان چاوەڕێی ڕێبوارانمان کرد.

چیا بە خۆی و چاوی گەش و فسەزمانی لە قسەکردن، هەرزوو بووە فرۆشیارێکی نایاب. ئەو بە بوێرییەوە بانگی خەڵکی دەکرد و دەیگوت: "دەفری مالیساو[٢٧] بە سێ تمەن". ئیدی ڕێبواران خۆیان پێنەدەگیراو دەستێکیان بە سەریدا دەهێنا و پوولەکانیان دەخستە جانتاکەی من.

تەنانەت بەو بەهرە فرۆشیارییەی چیاش، کۆڵانەکەمان ئارام بوو، بۆیە بازاڕمان کز بوو. ناوجەرگەی شار پڕبوو لە فرۆشیاری گەڕۆک، لە منداڵانی بۆیاغچی، جەنجاڵ لەو گەنج و پیرەپیاوانەی بەڕەیەکیان لەسەر جادە ڕاخستبوو؛ جلوبەرگ و کەلوپەلی دیکە، میوە و جگەرەیان بە ئاشکرا دەفرۆشت و بە دزیش یاریی کاغەز و مەشروبات و نەواری گۆرانی شادیان دەفرۆشت، بەڵام شەقامە لاوەکییەکان بە زۆری هێدی و خامۆش بوون.

دایکی سێ منداڵ هەندێ لەتکە قەیسی لێکڕین و ئامۆژگاری کردین لە شەقامەکە شۆڕببینەوە و بۆ لای مزگەوتێ، لەوێ لەبەرانبەر دارتووە قەدئەستوورەکان دابنیشین. ئێمەش خۆمان کۆکردەوە و بەرەو ئەوێ ڕۆیشتین، دەرکەی ماڵیشمان بە گاڵەنەدەراوی لە دوای خۆمان بەجێهێشت.

کاتێک بۆ ئەوێ دەڕۆیشتین، دەستە ژنێکمان بینین لە بەردەم ماڵێکی گەورە ڕاوەستابوون. ئەوان لەگەڵ شوشتنی تەشت و مەنجەڵی گەورەی دانەوێڵە و گیا و داودەرمان پێدەکەنین، پێدەکەنین

---

[٢٧] Malisaw مالیساو: واتە لەتکە قەیسی.

و له پشتمله باسی خه‌ڵکی دیکه‌یان ده‌کرد. هه‌ندێکیان له نسێیه‌که پاڵیان دابووه‌وه، هه‌ندێکی دیکه پشتیان له خۆره تین نه‌رمه‌که کردبوو تا له‌شان و ملیان بدا. هه‌وڵمدا وێنه‌ی دایکم وه‌ک ئه‌ندامێکی ئه‌و ده‌سته‌یه بکێشم، لێ نه‌متوانی.

ئێمه له به‌رانبه‌ر مزگه‌وتێدا دوکانه‌که‌ی خۆمان دانا، زۆریش به ته‌لارسازی مزگه‌وتێ سه‌رسام بووم: گومبه‌زێکی شین، مناره‌یه‌کی نایاب، دیواری له خشت و په‌نجه‌ره‌ی جام ڕه‌نگین. پیاوان به جلوبه‌رگی فۆلکلۆرییه‌وه، ئه‌وانه‌ی دوای نوێژی عه‌سر له مزگه‌وتێ ده‌رده‌چوون، شتیان له ئێمه ده‌کڕی و به چیایان ده‌گوت که قشتیله و شیرینه. من دوای به‌کارهێنانی هه‌ر بادیه‌ک[٢٨] له ئاوی نافووره‌ی حه‌وشه‌ی مزگه‌وته‌که ده‌مشوشت. مزگه‌وته‌که جیهانی پیاوان بوو، ئه‌وه‌ش یه‌که‌مین جارم بوو پێ بخه‌مه ناوی. ناوکه‌وه‌که‌ی، ئه‌وه‌ی بنمیچێکی زۆر به‌رزی هه‌بوو، به چه‌ندین ڕیز ڕایه‌خ که زۆربه‌یان ڕه‌نگیان سوورباو بوو، ڕاخرا بوو. میحرابه‌که‌ی نێویشی ڕووه و که‌عبه‌یه له مه‌ککه، که سه‌دان پیاو به ڕێز به‌وپه‌ڕی خاکیبوونه‌وه بۆی ده‌نوشتێنه‌وه. کتێبه‌کانیش به جوانی له‌سه‌ر ڕه‌فه‌کانی دانراون، له‌وێدا سندوقێکیش بۆ به‌خشین هه‌یه، که پێموابوو جه‌زبه‌ی چاوه‌کانی چیا ڕزقی بڕیبوو. تا ئه‌وکات له سه‌به‌ته گه‌وره‌که‌ماندا هه‌ر شه‌ش قه‌یسی تێدا مابوو، ئه‌و خورده‌یه‌ی له به‌رکم دابوو، قورسی کردبووم.

کاتێکیش گه‌ڕاینه‌وه ماڵ، چیا پرسی: "ئه‌رێ بۆ چی له کاتی خۆرنشیندا ئاسمان وا سوور و جوان ده‌بێ؟"

---

[٢٨] بادی: ده‌فرێکی هه‌ندێک قووڵ، بۆ شله‌مه‌نی وه‌ک دۆ و ئاو و خۆشاو به‌کاردێ.

کەوانتەرە شرووڕەکە دەرهێنا، بە جوانی لە دوو پاکەتدا داماننان، ئینجا لە بەردەم دەرکەی ماڵمان چاوەڕێی ڕێبوارانمان کرد.

چیا بە خۆی و چاوی گەش و فسەزمانی لە قسەکردن، هەرزوو بووە فرۆشیارێکی نایاب. ئەو بە بوێرییەوە بانگی خەڵکی دەکرد و دەیگوت: "دەفری مالیساو[٢٧] بە سێ تمەن". ئیدی ڕێبواران خۆیان پێنەدەگیراو دەستێکیان بە سەریدا دەهێنا و پوولەکانیان دەخستە جانتاکەی من.

تەنانەت بەو بەهرە فرۆشیارییەی چیاش، کۆڵانەکەمان ئارام بوو، بۆیە بازاڕمان کز بوو. ناوجەرگەی شار پڕبوو لە فرۆشیاری گەڕۆک، لە منداڵانی بۆیاغچی، جەنجاڵ لەو گەنج و پیرەپیاوانەی بەڕەیەکیان لەسەر جادە ڕاخستبوو؛ جلوبەرگ و کەلوپەلی دیکە، میوە و جگەرەیان بە ئاشکرا دەفرۆشت و بە دزیش یاریی کاغەز و مەشروبات و نەواری گۆرانی شادیان دەفرۆشت، بەڵام شەقامە لاوەکییەکان بە زۆری هێدی و خامۆش بوون.

دایکی سێ منداڵ هەندێ لەتکە قەیسی لێکڕین و ئامۆژگاری کردین لە شەقامەکە شۆڕببینەوە و بۆ لای مزگەوتێ، لەوێ لەبەرانبەر دارتووە قەدئەستوورەکان دابنیشین. ئێمەش خۆمان کۆکردەوە و بەرەو ئەوێ ڕۆیشتین، دەرکەی ماڵیشمان بە گاڵەنەدەراوی لە دوای خۆمان بەجێهێشت.

کاتێک بۆ ئەوێ دەڕۆیشتین، دەستە ژنێکمان بینین لە بەردەم ماڵێکی گەورە ڕاوەستابوون. ئەوان لەگەڵ شوشتنی تەشت و مەنجەڵی گەورەی دانەوێڵە و گیا و داودەرمان پێدەکەنین، پێدەکەنین

---

[٢٧] Malisaw مالیساو: واتە لەتکە قەیسی.

و له پشتمله باسی خه‌ڵکی دیکه‌یان ده‌کرد. هه‌ندێکیان له نسێیه‌که پاڵیان دابووه‌وه، هه‌ندێکی دیکه پشتیان له خۆره تین نه‌رمه‌که کردبوو تا له‌شان و ملیان بدا. هه‌وڵمدا وێنه‌ی دایکم وه‌ک ئه‌ندامێکی ئه‌و ده‌سته‌یه بکێشم، لێ نه‌متوانی.

ئێمه له به‌رانبه‌ر مزگه‌وتێدا دوکانه‌که‌ی خۆمان دانا، زۆریش به ته‌لارسازی مزگه‌وتێ سه‌رسام بووم: گومبه‌زێکی شین، مناره‌یه‌کی نایاب، دیواری له خشت و په‌نجه‌ره‌ی جام ڕه‌نگین. پیاوان به جلوبه‌رگی فۆلکلۆرییه‌وه، ئه‌وانه‌ی دوای نوێژی عه‌سر له مزگه‌وتێ ده‌رده‌چوون، شتیان له ئێمه ده‌کڕی و به چیایان ده‌گوت که قشتیله و شیرینه. من دوای به‌کارهێنانی هه‌ر بادیه‌ک[٢٨] له ئاوی نافووره‌ی حه‌وشه‌ی مزگه‌وته‌که ده‌مشوشت. مزگه‌وته‌که جیهانی پیاوان بوو، ئه‌وه‌ش یه‌که‌مین جارم بوو پێ بخه‌مه ناوی. ناوکه‌وه‌که‌ی، ئه‌وه‌ی بنمیچێکی زۆر به‌رزی هه‌بوو، به چه‌ندین ریز ڕایه‌خ که زۆربه‌یان ڕه‌نگیان سووورباو بوو، ڕاخرا بوو. میحرابه‌که‌ی نێویشی ڕووه و که‌عبه‌یه له مه‌ککه، که سه‌دان پیاو به ڕێز به‌وپه‌ڕی خاکیبوونه‌وه بۆی ده‌نوشتێنه‌وه. کتێبه‌کانیش به جوانی له‌سه‌ر ڕه‌فه‌کانی دانراون، له‌وێدا سندوقێکیش بۆ به‌خشین هه‌یه، که پێموابوو جه‌زبه‌ی چاوه‌کانی چیا ڕزقی بڕیبوو. تا ئه‌وکات له سه‌به‌ته گه‌وره‌که‌ماندا هه‌ر شه‌ش قه‌یسی تێدا مابوو، ئه‌و خورده‌یه‌ی له به‌رکم دابوو، قورسی کردبووم.

کاتێکیش گه‌ڕاینه‌وه ماڵ، چیا پرسی: "ئه‌رێ بۆ چی له کاتی خۆرنشیندا ئاسمان وا سوور و جوان ده‌بێ؟"

---

[٢٨] بادی: ده‌فرێکی هه‌ندێک قووڵ، بۆ شله‌مه‌نی وه‌ک دۆ و ئاو و خۆشاو به‌کاردێ.

"ئممممم،،،، پێم وایە کاتێ خۆر بە ماچێک شەوشادی لێدەکا، ئاسمان لە شەرمان سوورهەڵدەگەڕێ."

چیا ئاوڕێکی دایەوە کەلێنی دوو دانەکانی لە نێو دەمیدا بە دیارکەوت.

بەدەم غاردانەوە بۆ ماڵەوە پێمگوت: "دەی ئەگەر دەتوانی بمگرە. تۆ پۆلیس و منیش دز."

هەناسەبڕکێی ئەو پۆلیسە کە ڕوخساری وەبن وردە دڵۆپە ئارەق کەوتبوو، نزیکبوو بمگاتێ و بمگرێ، بەڵام خۆ من تاوانبارێکی ڕاکردووی وا بووم نەمگاتێ.

لە ماڵێ هەندێ ماستی ترشم لە یەخچاڵەکە دیتەوە و هەندێ شەکرم بەسەرداکرد. ئیدی ماست و شەکرمان بە نان خوارد تا زگمان لە هاواری برسیبوون بپارێزین، لەو کاتەشدا پارەکەمان ژمارد، پارەکان لەسەر مێزەکە وەک هەڵمات غلۆردەبوونەوە. من هەژماردم. خۆ ئەگەر ئێمە بەشێکمان بۆ کڕینی قەیسی زیاتر بەلاوە نابا و ئەگەر ئێمە ڕۆژانی دیکەش وەک ئەمڕۆ بەختمان هەبووایە، ئەوا پێنج ساڵی دەخایاند تا بمانتوانیبا بە قەد پارەی کڕینی کامێرایەک، پوولمان کۆکردبایەوە. ئەو پێنج ساڵەم وەک بڵێی هەتاهەتایە بێ هاتەبەرچاو، هەرگیز پێینەگەم.

"ئێمە دەبێ زیاتر خۆمان ماندوو کەین." من وەهام بڕیاردا و گەڕاینەوە دەرێ و تا ئەو قەیسییانەی مابوونەوە بفرۆشین. بەڵام خۆ ئەو ڕۆژە ڕووناکەی ڕاڕەوی کۆڵانەکە ببووە تونێلێکی تاریک. لەوێدا تەنانەت کڕیارێکیش بەدی نەدەکرا. من و چیا بە بەزینێکی بێدەنگ بە کلکی بارگیرمان دادا و گەڕاینەوە، هەستمان کرد ئەوەندە

ماندووین ناتوانین نه قسه بکەین نه بشجوولێین. سەرم بە سەری چیاوە نا و چاوم داخستن. هەردەبێ لەوێدا خەومان لێکەوتبێ، چونکە ئێمە بە ڕووخساری ئاگریناوی دایکە خەبەرمان بووەوە، بە خۆی و لەبەر تیشکی مانگ لەسەر سەرمان وەستابوو.

دایکە دەهری بووبوو. "دیسان بەم شەوە لە دەرەوەن؟ ئەرێ مێشکتان لە دەست داوە؟ ئەدی بابە بێ کەڵکەکەتان لە کوێیە؟ ئەدی ئەو قاپ و کوپانە چین پێتان؟ ئەو قەیسیانەتان لە کوێ هێناون؟ ئۆو، ئای خوایە!" لەگەڵ قیژەیدا من هەڵبەزیمەوە. دڵۆپە ئارەقەی لە نێوچاوان دەکەوتنە خوارێ. بەرلەوەی وەڵامی بدەمەوە، شاپێکی تێسرەواندم.

ئینجا چووەوە ماڵ، دەرگاکەکەشی بە کراوەیی هێشتەوە تا ئێمەش بە دوایدا بچینەژوور. نەشمدەزانی لەو کێشەیە چۆن قوتار بم، بەرلەوەی بچمە ژووری هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی. پشتەوەم هەڵشێلا، لێدانەکە ئەوەندە بە ئازار نەبوو، بەڵێ بە ڕاستی بە ئازار نەبوو، نەوەڵا، بەڵام ترسام مەبادا ئەمە لێ لێ بێ، هێشتا لۆلۆ مابێ. دایکە یەکسەر چووە بن دووشی حەمامێ. چیاش خۆی بە یاریکردن لەگەڵ ورچەکەیدا خەریککرد، ئینجا کاتێ گوێی لە شوڕەی ئاوی شێرەی دووشەکە بوو، نێوچاوانی خۆی بە گیزەرە خەڵووزییەوەکەوە نا.

"خاتوون! پێویستە ڕوونکردنەوەم بۆ بدەی." دایکە بەدەم ئەم قسەیەوە، ڕۆبێکی لەبەرکردبوو، پرچی بەسەر شانیدا بڵاوبووبووەوە، دڵۆپە ئاوی بەسەر ملاندا بەربوونەوە و چووە سەر قەنەفەکە و دەستی بە شێلانی قاچەکانی کرد، کە هەمیشە

ئازاری دەدا. چیاش خۆی خستە باوەش. "چاوشین گیان،" وای پێکوت و گووپە سوورەکانی ماچ کردن. "دیارە دیسان تات لێیە."

منیش ڕامگەیاند: "ئەو بە ساختە وادەکا. بە خۆی سەری خۆی لە نزیک هیتەرەکە ڕاگرت تا ــــ"

دایکە چاوێکی لە جامە ماستەی سەر ناوکەوی ناندینەکە بڕی و گوتی: "تۆ هەر ئەوەندە دەزانی ماڵێ بۆ من پیس و بێلەزەت بکەی؟ ئەرێ تۆ چ جۆرە کیژێکی؟"

"تای لێ نییە.. نە."

دایکە جارێکی دیکە دەستی لەسەر هەنیەی چیادا دانا. ئینجا بە ئاخ هەڵکێشانێکەوە گوتی: "دەی پێم بڵێ ئەوە بە تەمای چ جۆرە کارێکی شێتانە بووی؟"

باشە چۆن شتەکەم بۆ دایکم ڕوونکردبایەوە؟ ئەو هەرگیز لە ئارەزووم بۆ کامێرا نەدەگەیشت؛ ئەو هەر بە خۆپەرست بانگی دەکردم، پێی دەگوتم کەوا شتی زۆری دیکەی پێویست ماون هەمان بێ.

لێ بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە، زەنگی تەلەفۆن لێدرا. دەستبەجێ دەسکی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بە بناگوێی خۆیەوە نا و بە دەنگێکی نەرم جیاواز لە دەنگەکەی خۆی کە لەسەری ڕاهاتبووین، دوا.

ئینجا گوتی "دەی بڕۆنە سەر جێی خۆتان."ئینجا وایەری تەلەفۆنیشی لە پلاکەکە دەرهێنا و بە سینگی خۆیەوەی نووساند،

ئەوسا بە پەلەپڕوزێ چووە هۆدەکەی خۆی و دەرکەکەی لە دوای خۆیەوە پێوەدایەوە.

## بەندی سێ

دەستم نابووە بەر چەناگەم و بە سەرسوڕمانەوە لە یەکەم بەفری ساڵم دەڕوانی، کە وەک تارای بوکێنی شاری مەریوانی داپۆشیبوو، مەراق بووم بزانم ئاخۆ کەس دەتوانێ زەماوەندی لەگەڵدا بکا. زەماوەندێکی بێ زاوام وێناکردبوو، جلی بوکێنی لە گوڵی هەمەچەشن و هەمەڕەنگ. لێ خۆ من تەنیا قەڵەمێکی ڕەشم هەبوو.

دایکم بە دەم لێڕامانمەوە: "ئەرێ چییە بۆ خاتری خوا، دیسان زیندەخەون؟ ئێمە دەبێ لە ماوەی پێنج خولەکدا خۆمان تێکنێین و بڕۆین."

منیش چاکەتەکەم لەبەرکردبوو. "سەرپۆشەکەم دیار نییە."

چیا لە ناندین بە دەم چاو هەڵگلۆفتنەوە گوتی "بلسیمە!" ساڵی یەکەمی قوتابخانەی بوو، ئێستا دەیتوانی پیتی "ڕ" گۆ بکا، بەڵام دەشیزانی چۆن بەو کورتە فسەزمانییەی خۆی شیرین بکا. گۆرەوەیە تاک بە تاکەکانی خۆی لەبن دەرکە کراوەکەی یەخچالەکە، کە بە هەتاوە کزەکەی زستان ڕووناک ببووە، دەرکەوتن.

"دایکە! بلسیمە!" بەم شێوە بەدەم ڕێگەوە بۆ ژووری دایکە هاواری دەکرد.

دایکەش گوتی: "چیا، شوکری خوای بکە. خەڵکێکی زۆر نە خۆگەرمکەرەوەیەکیان لە ماڵدا هەیە و نە هەنوانێکیشیان هەیە تا لە

باوبۆرانی زستانی بپارێزرێن. دەی، ئاگاداربە کێشەی دیکە لە قوتابخانە نەنێیتەوە؟ بابی خۆم کێشەم هەن. دایکم ئیدی بۆ هەتا هەتایە من ناناسێتەوە."

دوێنێ چیا لە قوتابخانەدا هەڵوێستێکی نواندبوو. لەوکاتەی مامۆستاکەی داگژابووە هاوپۆلێکی تەنها لەبەرئەوەی نەیزانیوە بە فارسی قسەبکا، چیا بەگژیداچووبووەوە.

چیا بە پشتەدەستی چاوەکانی هەڵگلۆفتن و ڕووی تێکردم: "لەیلا، تەنیا یەک پرسیارم هەیە. ئەرێ مانای چوونە مەکتەبێ چییە، ئەگەربێ و مامۆستا وەڵامی پرسیارەکانی ئێمە نەداتەوە؟" ئەو پرسی ئەرێ بۆچی قوتابیان نەتوانن بە زمانی دایکیان بنووسن و بخوێننەوە. "باشە چی تێدایە ئەگەر بە کوردی بخوێنین؟" وەڵامە ستانداردەکەش، کە "یەک وڵات و یەک زمان" کوڵی دڵی دانەدەمرکاندەوە و بەڵکو دەبووە مایەی پرسیاری دیکە بۆی.

کاتی خۆی لەگەڵ چوونە مەکتەبم تووشی ترس و تۆقاندن هاتم، هەنووکەش نۆرەی چیایە، ئەوەش میراتێکە بۆ هەموو خوێندکارانی کوردستان و میللەتە غەیرە فارسەکان لە ئێران: لە دەستپێکی ساڵی یەکەمەوە ناچاردەکراین بە زمانێکی نوێ بخوێنین و بنووسین، کە بە تەواوی لەو زمانەی قسەمان پێدەکرد، جیاواز بوو. کاتێکیش تێدەگیراین، لێدان خۆبگرە هاتم. شەوانەش بامان دەدایەوە سەر زمانەکەمان، سەر میراتەکەمان. ئیدی وردە وردە لەوە تێگەیشتین زمانی دایک زمانی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی نەبوو. لە تافی لاوییەوە – نامۆبوون لە مێژوو و وێژەی کوردی-

نامۆبوون لە ڕەگوڕیشە، لە ناسنامەمان و هەڵبەتە لە دایبابیشمان دەستی پێدەکرد و لەگەڵ هەر ساڵێکی هەراشبوونماندا هەڵدەکشا.

دایکم، دەستێک لەسەر کەمەر، بانگی کردم "هێشتا ئامادە نیت؟" ئەویش سەرچاکەتێکی شۆڕی مەخمەڵی نایابی لەبەرکردبوو، شێوە سادەکەی جۆری دروونە نایابەکەی نیشاندەدا. هەر دەبێ لە تەنەکۆرا، لەو ڕیزە بازاڕەی فرۆشتنی جلی دەستی دووی ڕۆژئاواییەکانەوە بە هەرزان کڕیبێتی. بەڵێ، هەر بە ڕاستیش دایکم جوان بوو.

چیا ڕووی لە من کرد و و گوتی: "لەیلا؟ نانی شبەینێش نییە؟"

" چیدی خۆ دە شیلەی وەرمەردە. گەورەبووی، بە جوانی قسان بکە."

دوێنێ شەو خەریکی داهێنانی پرچم بووم، کردبوومە کەزی و بە قردێلەیەکی کەسک بەستبوومەوە، ڕقم لەوە بوو داپۆشم.

بابە بە خۆی و ڕادیۆکەی دەستی، لە پەیژەکان هاتەخوارەوە. چاوەکانی بەل و شەکەت بوون. ڕادیۆکە جاڕی دا: "- حکومەتی ئێران چوار گوندی کوردانی خاپوور کردن و تەختکردنی پێنج گوندی دیکەشی لەبەرنامەدایە."

دایکیشم گوتی: "ئالان، منداڵەکانت نانی بەیانیان دەوێ. دەی لەیلا، خێراکە."

منیش بە جۆشەوە لە سەرپۆشەکەم دەگەڕام، ترسام مەبادا پاسی ناوشارم لەدەستبچێ. گەڕەکی نزیکمان قوتابخانەی سەرەتایی کوڕانیان بۆ چیا هەبوو، بەڵام هی کچان دوو سەعات

دووربوو. لە کۆتاییدا چیا سەرپۆشەکەی دامەوە، هەمووشی گلۆچ بووبوو. "هەی مشکەکە[29]"، دیسان لە بن سەرینەکەتدا شاردبووتەوە؟"

ئەویش گوتی: "ئەگەر رقت لێیەتی مەچۆ مەکتەبێ!"

"چیا ، گوێبگرە." پێدەچوو لەوە نەگەیشتبێ ئاخۆ چۆن کچێک لەم جیهانە هەم جوان و هەم ئاوەزمەندیش بێ. "تاکە رێگە بۆ ئەوەی کامێرایەک بە دەستبێنم، ئەوەیە کارێکم هەبێ، بۆ ئەمەش پێویستم بەوەیە لە قوتابخانە دەربچم. دەی تۆ لە شاردنەوەی کەلوپەلەکانی مەکتەبێم وازبێنە و منیش ئەمرۆ وێنەیەک دەکێشم، لە قوتابخانە رەنگی دەکەم، جا نیشانتی دەدەم. باشە؟"

من و دایکم بە سواری پاسە شینە کاڵبووەوەکە بەرەو شار، بۆ مەکتەبەکەی من و بۆ نووسینگەی راوێژکاریی، شوێنی کاری دایکم رۆیشتین. مەراقیشم بوو بزانم ئاخۆ چ جۆرە ئامۆژگارییەک دەداتە ژنێکی دیکە، کە خێزانێکی هاوشێوەی ئێمەی هەیە. من لە ریزی کورسییەکانی پێشەوە رامابووم، ئەو ریزەی پیاوەکانی لەسەر دانیشتبوون؛ ئاخر ئافرەتان بۆیان نەبوو لە ریزی پێشەوە دابنیشن. لای پەنجەرە و لە ریزی دواوە دانیشتم، لە جامەکەوە سەیری ئەو خانووانەمان دەکرد، کە ئاووهەوای وەرزیی زیانی لێدابوون، ئەو ئەپارتمانانەی لە قاتی سەرەوە لە پاڵ یەکدابوون، بێ ئەوەی بیچمێکی جوان و دیاریان هەبێ، بەم جۆرە ئەوان زۆر جیاوازبوون لە تەلارسازیی ئەو خانووە کۆن و دێرینانەی بەشی باکووری شارەکە.

---

[29] meshkaka

لە ماوەی گەشتە دووروودرێژەکەدا، دایکە دەبوایە قسەی لەگەڵ هەر ئافرەتێک بکردبایە، ئەوەی دەکەوتە تەنیشتی. هەمیشە سەری گفتوگۆش وەها دەکرایەوە؛ تا دێ نرخی کەلوپەلەکان بەرزتر دەبنەوە، ئینجا تا نیوەی ڕێگاکە، ژنەکە سەروبنی ژیانی دایکمی دەزانی، بەوەی ئاخۆ خاوەنی خانووەکە چەند لە دووری شار دەژی و چەندیش سەرقاڵە تا کرێی مانگانەی خانووەکانی خۆی خڕدەکاتەوە.

ئەمڕۆ دایکم ئەمەی بەو ژنەی لە تەکی دانیشتبوو گوت: "من مێردم بە پیاوێک کردووە، دکتۆرای هەیە و کەچی ناتوانێ فلسێکیش بۆ ماڵ و منداڵی پەیدابکا و لە هۆدەیەکیش بە تەنیا دەڕازێ، دەڵێ منداڵی دیکەشی ناوێن. ڕۆژێک دێ تووڕەیی خوامان بە سەردا بڕژێ."

هەرچەندە دایکم ئەوەی نەدرکاند، گەلۆ چما بابە کاری دەست ناکەوێ، نەیگوت زیندانییەکی سیاسیی بووە، ئاخر ناچێتە عەقڵی کەس خوێندنی باڵا تەواو کەیت و کاریشت دەست نەکەوێ.

"من یەکێکم لەوانەی دەبێ قووتی چوار کەس دابین بکەم و ناشتوانم کاربکەم و هەموو ئیشوکاری ماڵەوەش ڕابپەڕێنم." تا ئەو قسەیەی تەواوکرد، پاسەکە ئەوەندەی خەڵک تێخزا کەس نەیدەتوانی بشجووڵێ، ئیدی دەمەتەقێی دووبەدووش نەکردە بوو.

منیش بەردەوام لە جامی پەنجەرەکەوە هەر سەیری دەرێم دەکرد. زۆر لە ترومبێلەکان لەبەر بەفری ڕێگەوبان زنجیریان لە تایەرەکان بەستبوو. لە چەند گۆشەیەکەوە دەمبینی، فرۆشیاری گەڕۆک شێلمی گەرمیان دەفرۆشت. هەر جارێکیش فرۆشیارەکە

سەری مەنجەڵەکەی هەڵدەدایەوە تا شێلم و ئاوکە[30] سوور و شیرینەکەی بۆ کڕیارێک تێبکا، هەڵمێک بە بەر هەوا ساردەکەدا هەڵدەچوو. دەمی منیش لە شوێنی خۆی پڕ ئاو دەبوو.

ئەو ژنە، کە جلێکی میللییانەی لەبەردابوو، بە پەرۆشەوە گوێی لە قسە نەبڕاوەکانی دایکم گرتبوو، پرسی: "ئەرێ ئەمەیان کچی تۆیە؟"

چاوم بە چاوی ژنەی کابانی ماڵێ کەوت. خاڵێک لەسەر لێوی سەرەوەی هەبوو. "خۆ ئەگەر لە مەکتەبێ بۆ نیگارەکەم قەڵەمی ڕەنگردنم دەستبکەوێ، جوانترین چادری ژنان دەردەچێ". منیش کەمێک خۆم تی دا تا نیگارەکەم ببینێ، بەو هیوایەی بەهرەی نیگارکێشانم ڕوانینە توندەکەی نەرم بکاتەوە.

"خۆ کچەکەی تۆ بایی ئەوەندە گەورەیە یارمەتیت بدات. نەوەکەی من لەویش بچووکترە هەموو کاروباری خاوێنکردنەوە و شێولێنانی لە ئەستۆ گرتووە. خۆی دەبێ دواتر هەموو شتێک بۆ مێردەکانیان بکەن. باشە بۆچی بۆ دایکە بەستەزمانەکانیان ناکەن؟" ژنەکە بە شان هەڵتەکاندنەوە وەها دوا و و دایکیشم سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاند.

دوای ئەوەی لە پاسەکە دابەزیم، بەدرێژایی ڕێگە تا مەکتەبێ غارمدا، بەدەم کوتانەوەی ڕێگا شڵپەم لە ئاوەکەوە هێنا، بێباک لەوەی گۆرەوییەکانم تەڕدەبن یان نا. پاشان لە ژووری دەستشۆردن کە بە تەنیا مامەوە، قەپاڵێکم لەو پارچە نانە گرت کە شاردبوومەوە. دیواری دەستشۆرەکە پڕبوو لە نووسینی نەفرەتکردن لە خومەینی و خەلخالی و ڕەفسەنجانی، تێیدا ناویان بە

---

[30] ئاوکە: واتە ئاوی خواردنەکە کە ڕەنگی خواردنە وەردەگرێ، شلە.

بکوژ و خوێنمژ هاتبوو. دەبووایە دەرگەوانەکەش بە بۆیە نووسینەکانی ڕەشبکردایەوە. لە سەرووی گۆشەیەک دەستوخەتی جوانی شلێر دەناسرایەوە، منیش هەندێ جوێنی دیکەم بۆ زیادکرد، ئارەزووم خواست ئەوانە قامچیکوت بکرێن، ئەشکەنجە بدرێن و دووبارە و سێ بارە لە قەنارە درابوونایە، چونکە ئەوان شایستەی مردن بوون. پاشان نیگاری هەوەسبازانەم بینی، وێنەی کرمێک یان لەوانەیە تیرێک بووبێ، منیش کردمە پەپوولەیەکی جوانی سپی بە پنتی ڕەشەوە.

زەنگی قوتابخانە لێدرا، منیش ڕامکرد تا خۆم بگەیەنمە هەموو ئەو کچانەی لە حەوشەکەوە ڕیزکرابوون، بە ئەدەبەوە گوێیان لەو ئایەتانەی قورئان دەگرت، کە قوتابییە هەراشەکان بە تەجویدەوە دەیانخوێندنەوە، ئەو ئایەتانەی ئەو سۆزەیان تێدابوو، کە یارانی خودا هەرگیز ناسۆر و ترس نابینن. شلێریش لە پشتەوەی من لە ڕیزدا بوو. دایکی ئەو تاکە کەس بوو، زۆر جاران بە شادمانییەوە دەمبینی، یان بە لای کەمەوە ئارام بوو، هەرچەندە ژیانیشی زەحمەت بوو.

نە من و نە شلێر دەستەوانەمان لە دەستدا نەبوون، کاتێکیش بەڕێوبەرەکەمان وانەی ڕەوشتی پێدەداین، دەستەکانمان هەڵدەگلۆفت، دڵیشمان لێیان پڕ بوو، دەستەکانمان دەنایە بن هەنگڵمان. شلێریش سەرپۆشێکی فش و کورتی لەسەرنابوو، بە دڵنیاییەوە بە هۆیەوە کێشەی بۆ دروست دەبوو. بە سرتە و زۆر بە کورتی گوتی: " دیواری هەموو ئاودەستەکانم دە ڕەسمی کێر وەرداوە"

منیش خەنیمەوە و لە شەرمانیش سوورهەڵگەڕام، زانیم ئەو وێنەیە بوو، کە من بە کرم یان بە تیر تێی گەیشتبووم. ئیدی هیوام دەخواست بەڵکو کەس نەزانێ من باڵم لە چوکێک ناوە. ملی شلێر لەسەرما سوور هەڵگەڕابوو، خۆم گەیاندێ تا چمکی لەچکەکەی بۆ گرێبدەمەوە.

ئەویش کشایەوە. "نەخێر، خۆ ئەگەر حیجابی تەواو بپۆشم، ئەوکات پێم وا دەبێ بڕوام پێیەتی."

"باشە لەوە ناترسی گیوی خان سزات بدا؟" ڕاستییەکەی ئەوە بوو، مامۆستای پەروەردە[31] وانەی بە هیچ پۆلێک نەدەدا، ئەو هەیتەیەکی فەرمی حکومەت بوو. ئەرکی ئەو ئەوە بوو، وا لە کچەکان بکا ڕاپۆرت لەسەر ئەو مامۆستا و قوتابییانە بنووسن، کە بە تەواوی ڕێساکانی دین و سیاسەت جێبەجێ ناکەن. ئەمەش ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر بوو، کە تاکە شتێکی هاوبەشی هەموو دەڤەرە کوردیەکان ئەوەبوو، پڕ بوون لەو جۆرە کارمەندە هەواڵدزانە؛ هەر بە تەنیا لە شارە چکۆڵەکەی ئێمە، کە کەوتبووە سەر سنووری کوردستانی باشوور، نزیکەی شەش لەو کەسانە کارا بوون. شۆفاری بێژماریش لەناو شاردا هەبوون، هەر لە شوفێری تاکسییەوە تا فرۆشیارێکی گەڕۆک. تەنانەت ئەوماڵباتانەی ئەندامیشان لەداردرابوو یان کەسێکیان بە هۆی ئازار و ئەشکەنجەوە کەمئەندام بووبوو، بۆ شتێ پارە شۆفارییان بەسەر ئەوانی دیکەوە دەکرد.

---

[31] وشەی فارسی parwareshi بە ڕێنووسی ئینگلیزی بەکارهێناوە.

لە تەمەنی دوازدە ساڵییدا، شلێری یاخی یەکێک بوو لە ئامانجە هەرە دووبارەبووەکانی گیوی.

شلێریش بە جوێن و قسە ناشیرینەکانی منی هێدمەگرتی کرد و گوتی: "بە نەفرەت بێ! ئەو نە من دەترسێنێ و نە دایکیشم." دەستەخوشکەکەم، کەوتبووە دۆخی داڕسان و یاخیگەری، بەڵام هێشتاش ئاگری لە چاوان نەدەباری.

منیش بۆ پاڵپشتی بە گوێمدا چرپاند: "سەرباری ئەمەش هەناسەیەکی بۆگەنی هەیە." بە دزییەوە بڕوام وابوو، کە مامۆستاکە لە پێناو دەسەڵات بۆ ئەوەی کەڵەگایی بکا دڵی خۆی بە زێراب گۆڕیوەتەوە.

شلێریش دەموچاوی خۆی بە شاڵەکەی داپۆشی و لە قرتەی پێکەنینی دا، ئینجا دەستی بە سکییەوە گرت و خۆی گرژکرد.

"ئەرێ تۆ باشی؟ قاوەڵتیت کردووە؟" پەشیمان بوومەوە، نانەکەم لەگەڵدا بەش نەکردبوو.

ئەویش نیگەرانییەکەی منی ڕەواندەوە. "من باشم."

دوابەدوای سروودی نیشتمانیی ئێران، دروشمی "بمرێ ئەمریکا، بمرێ ئیسرائیل" گوترایەوە. تەنها لەوێدا ڕێگە بە کچان دەدرا هاواربکەن، تەنانەت هانیشدەدران تا بە دەنگی بەرزەوە بیڵێنەوە. من و شلێریش بە هەموو هێزێکمانەوە بە هاوارکردنەوە دروشمەکەمان دەگوتەوە تا هەم هەندێ گەرم ببینەوە و هەم بۆ ئەوەش بەشداری ئەو پێشبڕکێ نافەرمییەش بکەین ئاخۆ دەنگی کاممان بەرزترە. خۆی ئەوە کردەیەکی داڕسانانەمان بوو بەوەی لە جیاتی

دروشمەکان، هەروا لە هەراوهوریا بدەین و دەممان تەواو بەشبکەینەوە و سەربزێویی ژێربەژێری خۆمان بەتاڵکەینەوە.

دوای ئەوە، بە ڕیزی یەک لە دوای یەک بەرەو پۆلەکانمان بووینەوە. "من نیگارە نوێکەمت نیشان دەدەم، بەڵام دەبێ سەرەتا قەڵەمرەنگ پەیدا بکەم."

شلێر کە لە ڕیزی پشتەوە لەگەڵ کیژێکی بەژندرێژ دانیشتبوو، تا باشتر بواری هاری و هاجی هەبێ، گوتی: "نەشمدیوە و پێمجوانە."

مامۆستای دین، ئەو کەسەی بێ برانەوە وانەیی لەسەر گوناح و ژیانی ئەو دنیا دەوتەوە، ترساندبوومی، بە دەوری پازدە ڕیزەکەدا دەسووڕایەوە، لەسەر هەر ڕەحلەیەک سێ کچی عەزیەشینی سەرپۆشسپی ئەو کیژانەی بەرگی شین و سەرپۆشی سپی دادەنیشتن. منیش دەفتەرەکەم هێنایە سەر ڕۆخی مێزەکەم تا نیشانی بدەم ڕاهینان و وانەی ماڵەوەم جێبەجێ کردووە.

ئەو بە دەنگێکی نەرمتر لەو دەنگەی دەرسی پێدەداین پێی گوتم؛ "دەی، بە دایکت بڵێ ناوبەناو سەرپۆشەکەت بشوا و ئوتوشی بکا، باشە؟" ئەو بۆنی گوڵاوی لێدەهات، پێشم وابوو دەبووایە هەموو ئەو گوڵانە بمرن تا بۆنێکی بۆ ئەو لێ دروست بکەن. ئەو لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "پێشی بڵێ ڕۆخی سەرپۆشەکەت بدرویتەوە." قوتابیەکانیش لەسەر مێزەکانی خۆیان ئاوڕیان لە من دایەوە. منیش تفی خۆم قوت دایەوە، هەستمکرد، گەرماییەک ئەوکم دەزووڕینێتەوە[32].

[32] زووراندنەوە: چووزاندنەوە

کاتێکیش بەرەو تەختەڕەشەکە ڕۆیشت، سمتە زلەکانی مامۆستا لە بن مانتۆ قاوەییە تۆخەکەدا دەلەرانەوە. لەو نێوەدا و لە ماوەی وانەکەدا هەموویان بە دزییەوە نیگایان تێبڕیم تا ئەو کاتەی شلێر لە شوێنی خۆی هەڵسا و لە مامۆستاکە نزیک کەوتەوە تا شتێکی بە سرتەوە پێبڵێ.

مامۆستایەکە گەڕایەوە سەر دەنگە تیژەکەی وانەگوتنەوە؛ "ناتوانی چاوەڕێ بکەی؟" شلێرییش بە دەمارگرژییەکەوە چاوێکی بەو ناوەدا گێڕا، دیسان شتێکی چرپاندەوە گوێی. ڕوخساری ڕێکهەڵاتبوو، دەموچاوی سپی هەڵگەڕا. ئینجا مامۆستاکە گەڕایەوە سەر وانەکەی و سەرەنجام گوتی: "باشە، بڕۆ."

شلێر ڕۆیشت و بردەبردێکیش سەبارەت بە خوێن لەنێو پۆلەکەدا هاتەئارا تا ئەو کاتەی پاش چەند خولەکێکی کەم دەرکەوتەوە، سەری بەردابووەوە. ئیدی هەرا لە پۆلەکە پەیدابوو؛ لەو کاتەی جەنگە هەشت ساڵییەکە کۆتایی پێهاتبوو، لەو کاتەوەی زەنگی هۆشداری هێرشی فڕۆکەکان لە بڵندگۆکانی شارەکەوە بەرزدەبووەوە، ئیدی هەر بابا بوو بەرەو کونەتەیارە و ژێر زەمین هەڵدەهات، هەندێ جار لەو پاشاگەردانییەدا خۆشمان بەیەکدا دەدا، ئیدی لەو ساوە هەراوزەنای وامان لە پۆلەکەدا نەبینیبوو. خەریکبوو لەسەر مێزەکانی خۆمان بەردەبووینەوە، ئاخر ئەوەندە بۆ پێشەوە خۆمان شۆڕکردبووەوە بەڵکو ئەو سرتەیەی لەبەردەم ژوورەکەدا دەکرا ببیستین.

"دەکرێ ئەوان لە ئیدارەدا یارمەتیت بدەن." ئەوە قسەی مامۆستاکە بوو بۆ شلێر، لەو کاتەی شلێر بە گریانەوە لە پۆلەکە بە غار بۆیدەرچوو. منیش دەستم دایە جانتاکەی و بەدوایدا چووم.

شلێر باڵەکانی ڕاستوچەپ لە خۆی ئاڵاندبوون، لە ناوقەدیشەوە خۆی چەماندبووەوە دەمی تەتەڵەی کرد، گوتی: "بڕوام بە جوانە نەکرد کاتێ هەوڵیدا پێمبلێ."

منیش لێمپرسی: "تۆ چیت کردوە؟" لێ دەستبەجێ لە پرسیارە بێسەروبەرەکەم پەشیمان بوومەوە.

ئەویش بە ڕوویەکی گرژەوە چاوێکی لێکردم. "من هیچم نەکردووە. من ڕقم لە مامۆستاکەیە. ڕقم لەم شوێنەیە. هەرگیز جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە ئەم زبڵخانەیە. من هێندەم گوێ لە باسی ئەو دونیا گرت، نەخۆش کەوتم. کێ ئەوەی دەوێ؟ خۆ ئێرە خۆی بووەتە دۆزەخ؟" ئینجا شلێر جانتاکەی خۆی لە من وەرگرتەوە کتێبەکانی مەکتەبی یەک یەک دەرهێنان و بە دیواری ڕاڕەوەکەی دادان. کتێبی ئایینی بەر تابلۆیەکی گەورەی ئایەتوڵڵا خومەینی کەوت. منیش لە جێی خۆم حەپەسام.

شلێر تفی بە کتێبەکاندا کرد، ئەوانەی لەسەر ناوکەوەکە پەرشوبڵاو بووبوونەوە، ئینجا بە غار لە پەیژەکان چووە خوارەوە. منیش لە پەنجەرەی ڕارەوەکەوە سەیرمکرد و بینیم دەرگەوانە سیسهەڵگەڕاوەکە هەوڵدەدا دەروازەی چوونەدەرەوەی لێبگرێ. خۆێ ئەوە بەشێکی ئەرکی ئەو بوو، لێنەگەڕێ کچان لە دەرکە بچنە دەرەوە و کوڕانیش بێنەژوور، مەگەر دایباب یان کارمەندی حکومەت بن. شلێریش لەگەڵی کەوتە مشتومڕ، دەستی لە هەوادا

ڕادەوەشاند. ئەویش مەچەکی شلێری گرت، بەڵام توانی پاڵی پێوە بنێ و خۆی ڕاپسکێنێ بە دەرگەکەدا تێیتەقاند لەودیو پێچی جادەکەوە بزر بوو. لەسەر ڕێگە قوڕاویەکە شوێنپێی پێڵاوە ڕەشە لاستیکەکەی دیاربوو.

مامۆستا لە دەرکەی ژووری پۆلەکەوە بانگیکرد: "دەی سامان[٣٣] وەرەوە ژووری." منیش بەرەو سەر مێزی پۆلەکەم دەگەڕامەوە، هەوڵیشم دەدا بەسەر هێدمەگرتنی ئەو دیمەنەدا زاڵبم، ئاخر بینیم کتێبی قوتابخانە بەر بیچمی خومەینی کەوت. خۆ سووکایەتیی بە ڕابەری مەزن تاوان بوو، بەلای کەمییەوە سزاکەی زیندان بوو.

کیژێک لە تەنیشت من دانیشتبوو، ئانیشکێکی لێدام. "ئەرێ پەڵەی خوێنت لەسەر مانتۆی شلێر بینی؟"

درۆمکرد و گوتم :"بەڵێ".

من باقی ڕۆژەکەم لە مەکتەب و لە ڕێی گەڕانەوەشم بۆ ماڵێ هەر هەڵدەلەرزیم، لە ڕیزی دواوەی پاسەکە دانیشتبووم و سەیری دیمەنەکانی دەرەوەم دەکرد. هەموو دوای نیوەڕۆکە لە قوتابخانە سەبارەت خوێنبەربوونەکە هەر پستەپست بوو. لە هەوڵێک بۆ هەڵهێنانی تەلیسمی کچان و خوێنبینین، وەهام دانابوو هەندێ لە کچان جاروبار دەڕشانەوە. هەرچەندە ئەمەش لە هەموو کیژێک نەدەقەوما، تۆ بڵێی ئەوە بێ؟

خەڵکانێک لەبن شەپقە و ساقۆکانیان پیاوە بەفرینەیان دروستدەکرد و یاریان لەگەڵدا دەکردن. هەندێکیشیان لەسەر بانی

---

[٣٣] مەبەست لە ناوی سامان پاشناوە، واتە ناوی خانەوادەیی.

ئەپارتمانەکانیانەوە تێکەڵی یەک بووبوون و خۆیان لەبەر کزەتاوی زستان هەڵخستبوو، گولەبەڕۆژەیان دەقرتاند و شۆخییان دەکرد.

"خودایە، سۆزدەدەم ببمە کچێکی باش." کاتێ پەنجەی تووتەم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و بەڵێنی خۆم دا، بوومە قەشمەرجاڕی سەرنشینە بێحەوسەڵەکانی ناو پاسەکە.

لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە، ئەو پارچە نانەی لەناو جانتاکەمدا بوو، لەگەڵ چیادا بەشمکرد. دوای ئەوەی هەموومان خوارد، ئەو دانی بەوەدا نا، کە بابە بەو هەڵوێستە جوانەی لە قوتابخانە نواندبووی شانازیی پێوە کردبوو، بەرلەوەی بیباتە مەکتەبێ لەفەیەکی گەسی بۆ هێنابوو.

منیش نوقرچێکم لێگرت. "تۆ نازاندوویەکی[٢٤] لاساری. تۆ دزی. تۆ هەر شتێکی هەمبوو، خواردت. تۆ شایستەی ئەوەی خوێن بڕشێنیەوە نەوەک من." ئێستا ئەو بایی خۆی هەراش بووبوو، بە ئاسانی لەبەردەستم دەرباز دەبوو، هەر پێشدەکەنی. ئای چەند نادادی بوو، کە ئەو لەو ڕوخسارە جوانەی لە دایکەوە بۆی مابووەوە، سوودی وەردەگرت. ئەمەش منی شێت دەکرد و هەموو کەسێکیشی بە خۆیەوە سەرسام دەکرد، تەنانەت بابەش.

لێ دوایی ئەو بەڵێنەم بیرکەوتەوە کە بە خودام دابوو، کە نابێ ڕێگە بە ئەهریمەنی تووڕە و تەمبەڵی بدەم تا لەو خوێنبەربوونەی لە قوتابخانەوە دەستیپێکرد بمپارێزێ. "ئەوە بوو پێم گوت: "من لێت خۆشدەبم کە نانی منت خوارد و لە بابەش دەبوورم کە تۆی زیاتر

---

[٢٤] ئەو کەسەی (بەتایبەتیش مندال)، کە زۆر نازی درابێتێ و خووی بە نازپێدانەوە گرتبێ.

له من خۆشدەوێ. ئەوسا دانیشتم و سەرم بەسەر کتێب و دەفتەرەکانی خۆمدا شۆڕکردەوە.

چیاش بە خۆی و دەفتەرەکەیەوە لە تەک من دانیشت و دەستی بە پڕکردنەوەی لاپەڕەکانی کرد. ئەو وەک من جوانەی نەبوو تا فێرە ئەلف و بێی بکا، بەڵام دەشیزانی پیتەکان گۆ بکا. کاتێکیش دایکە هاتبووەوە، بەسەر کتێبەکانمانەوە خەومان لێکەوتبوو. ئەوسا لە شوێنی خۆم ڕابووم، تا بیسەلمێنم یارمەتیدەرم، تا بیسەلمێنم کچێکی گوێڕایەڵم، بە ساقۆ و سەرپۆشەکەی قوتابخانەشمەوە جلوبەرگی ئامادەکراوم بۆ شوشتن کۆکردەوە، ئەوەشم دەرخست چۆن جلشۆرەکە پێبکەم. بە شانازیی و سەرکەوتنەوە بە چیام ڕاگەیاند بەم زووانە جلوبەرگی خاوێنمان دەبێ. خۆ ئەوەشم نەدەزانی دواتر لەسەر ئەوە لێم دەدرێ، ئاخر تایتی سپیکردنەوەم لە جیاتی تایتی خاوێنکردنەوە خستبووە نێو جلشۆرەکە و هەندێکیان وەک مەشخەڵی ئاگر هێڵی نارنجیان بەنێودا هاتبوو.

دوای ئەوە بۆنی میوەی گەنیو وایلێکردم بچمە نادین و کیسەکە دەرکێشم. لە یەکێ لە کیسە کۆنەکان دڵۆپە ئاوی پیس دەهاتەدەرەوە، بەوە هێڵێکی بەسەر ناوکەوەکەدا هێنا کە مێشومەگەز لە خۆشیان دەورەیان لێدا. بە بێزبوونەوە کیسەکەم لە ناوەڕاستی نادینەکە بەجێهێشت و پرتەقاڵێک و ئارووییەکم لەنێو کیسەی میوەکە کە لەسەر کەوانتەرە دانرابوو، دەرهێنا و لەبن کراسەکەم شاردمنەوە. بەڵام بەر لەوەی بیانخەمە نێو جانتای مەکتەبمەوە، دایکم گرتمی. "ڕۆژانە تەنیا جارێک،" ڕاستەوخۆ بەم قسەیە کاتێ لە هۆدەکەی خۆی هاتەدەرەوە، ڕووی تێکردم، ئێستا

خۆی گۆڕیوە بە فیستانە شینە فشوفۆڵەکەیەوە، کە تا سەر پاشپانی پێی هاتووە، سەرکۆنەی کردم کە زبڵم لە ناوەڕاستی ناندینکەدا بەجێهێشتووە.

کاتێکیش بابە لە هەورەبانەکە هاتەخوارەوە، ئێمە هەرسێکمان پەنیرمان خستبووە نێو پارچە نانە تەنکەکەی لەواشە و دەمانخوارد. ئەو بە فەرمانکردنەوە گوتی: "ئەو چەکە واژۆ بکە بۆ ئەو ڕەفانەی داواتکردبوون."

دایکە کە پارووی لە دەمدا بوو گوتی: "پوولّ نییە." ئیدی دەمی زیاتر کردەوە تا قەپاڵی دیکەی لێبگرێ.

منیش پەلی چیام گرت و پێم باشبوو بیبەمە سەرەوە بۆ هەورەبانەکە، ئاخر لەوێ لەوانەیە لەو دەمەقاڵییە دووربکەوینەوە کە هەستم دەکرد لە ئانوساتی تەقینەوەدایە. چیاش بە هێواشی پارووەکەی قووتدا، بێ ئاگا لەوەی ئێستا نا کەمێکی دیکە دەبێتە ڕۆژی حەشر.

"ئاخر تۆ قەرزاری کابرای."

"من پوولّم نییە." دایکە وەهای قیژاند : "قرۆشێکم نییە، هەر هیچ."

من چیام بردە ژووری نوستنمان و دەرکەم لەسەر خۆمان پێوەدا. ئەویش هیچ نارەزاییەتییێکی نیشان نەدا بەرانبەر بەوەی ژەمە خواردنەکەم پێ بڕی.

"کەواتە، ئەدی بۆ چی داوای ئەو شتانەت کردبوو؟ ئەوان بۆ پارەدانەکە ملی من دەگرن، نەوەک ملی ژنێک."

دایکەش بە دەهریبوونەوە وەڵامی دایەوە: "باشە ، هەی ملحیز، بۆچی تەنیا جارێک تۆش پارە نادەی؟" لەوکاتەوەی بابە جێگەی خۆی جیاکردبووەوە و بە تەنیا لە هەورەبانەکە دەنوست، دایکە ئاوا سووکایەتی پێدەکرد.

هەستم بە ترس و تۆقینێک لە نێو هەناوم کرد و بە لەپی دەستیشم گوێچکەکانی چیام گرتن.

ئینجا بابە دەنگی بەرزکردەوە: "ئەرێ بۆ خاتری خوا هەموو ئێوارەیەک دەچییە کوێ و ئەو منداڵە بچوکانە جێدێڵی؟ وا دەزانی نایزانم؟ پێتوایە گەمژەم؟"

چیا سەیرێکی کردم. زانیم لەپی دەستم ڕێگر نەبوو لە بیستنی قسەکە، بەڵام نەمدەزانی چیدی بکەم.

"من بۆ کوێ دەچم؟ تۆ نازانی من بۆ کوێ دەچم، وایە؟ هەشت ساڵە. هەشت ساڵی نەفرەتی جەنگە." دەنگی دایکە لە دەرکەوە دەگەیشتە لامان: "من دەبووایە لە ڕیزی دوورودرێژدا بۆ یەک دوو کیلۆ برنج یان شەکر بۆ تۆ و منداڵەکانت بوەستم. لەوێ دەوەستام و شەرم لەگەڵ ملهوڕەکان دەکرد ئەوانەی نۆرەبڕیان دەکرد. ئەو دەمارە شینانەی قاچم دەبینی؟ "دەیبینی؟" وام خەیاڵدەکرد دامەنی کراسەکەی هەڵبکێشێ. "ئەمە ئەنجامەکەیەتی. خۆ ئەگەر ڕۆژانە نەچمە چارەسەری سروشتی ناتوانم بە پێ بڕۆم. ئەدی بۆ خاتری ئاسمان، تۆ هەموو ڕۆژەکەی بە چییەوە خەریکی؟ هەر کیلم کیلم دەستبەتاڵ دەسووڕێیتەوە؟"

بابە نەڕاندی. "دەی ئەو دەمە گەورەیەت دابخە، هەی قەحپەی هیچ و پووچ. من ئەو ڕەفانە و تەواوی ماڵەکە ئاگر تێبەردەدەم و لەگەڵ خاک و خۆڵ تێکەڵیان دەکەم."

خەیاڵی ئاگرتێبەربوونی ماڵ تۆقاندمی. دەستم گەیشتە هێدفۆنێک و بە دەستی لەرزۆکەوە لە گوێی چیام ئاخنین و سەرەکەی دیکەم لە ڕادیۆ ڕەشە کۆنەکە ڕاکرد و ڕادیۆکەشم پێکرد. دەنگم دایێ، بە لەپی دەستیشم توند هەردوو گوێچکەی خۆمم گرت، توند گیرساندم. چیا پێکەنی. منیش دڵنیا نەبووم چی وای لێکرد شاگەشکە ببێ، ڕوخساری من یاخود بیستنی شتێک لە ڕادیۆکە.

منیش لەگەڵ چیا پیکەنیم بەڵکو خۆم لەخشتە ببەم و بە شتێک بخافڵێم. شتێک بەر دیوارەکە کەوت. پەرداخ یان فەخفووریەک بوو، وردوخاش بوو. پێچی سەیر و نامۆ زگیان وە ژان دەهێنام. چیا بە کراسە خەتدارە شین و سپی و پانتۆڵەکەیەوە لە جاران نازدارتر دیاربوو. هەم پێکەنینەکەم هەم بەرزتر و هەم ناحەزتر دەهاتەدەرەوە، بەڵام چیا دەیبینی نەمدەتوانی پڕبە دەمم پێبکەنم، بۆیە کە بینیم هەرخۆمانین ئیدی ئازادانە دامانە قاقای پێکەنین. من بەو قاباقایانەوەی زیاترم خۆشدەویست، لێ کاتێ گەزێکم لە گوپە خرپن و سوورەکانی گرت، تێدەگەیشتم تای بەرزە. دەشمزانی ئەم ئێوارەیە لای شۆڤاژەکە نەبووە تا سەری پێوەبنێ. کە بینیم تای بەرزبۆتەوە منیش گازەکەم توندتر لە ڕوومەتی گیرکرد، پێموابوو بەمجۆرە تایەکەی دەرەوێنمەوە. لێ فرمێسک لە چاوەکانی زا. ئینجا لێوی خۆم گەست. من خوشکێکی خراپ بووم، پەڵەی سوورم لەسەر ڕوومەتی جێهێشت.

ئای خوایە، نەکەی لە سزاکەیدا خوێن بڕشێمەوە.

من پەنجەی ئاماژەم خستە سەر گۆشەی لێوم، دەمی خۆم لێککردەوە، زمانی خۆم سوڕاند و دەرمهێنا، دەموچاوێکی ترسناکانەم دروستکرد. چیاش پێکەنی و فرمێسکیش لە چاویدا دەباری. ڕوومەتە تەڕەکانیم ماچکرد، ئینجا چوومە سەر دەست و قاچم، بەویشم گوت ڕادیۆکەی توند بە دەست بگرێ و خۆی هەڵداتە سەر پشتم.

"ئێستا زۆر گەورە بوومە، دەرۆستم نایەی."

"گوێ مەدەرێ. دەی وەرە سەرپشتم."

بابە لە تووڕەییان هێشتا هەر دەینەڕاند. دایکەش جوێن و ڕق و سوکایەتی بە سەردا ڕژاند. منیش لەسەر چوارپەل دەڕۆیشتم و لەبەر خاتری چیا دەمحیلاند، هەستمدەکرد قورسە. هێشتاش هێدفۆنەکەی هەر لە گوێدا بوو. لەسەر پشتم کەوت و لەسەر ناوکەوەکە غلۆر بووەوە، پێکەنینیش هەر حیسابی لەسەر نەبوو.

بەینی لاقەکانم بە شێوەیەکی نائاسایی تەر بووبوون. دەستم دایە دەرپێکەم و ئەو پەڵە ڕەنگ سوورەم بەدیکرد کە بە ناوپیستێری[35] دەرپێکەمەوە بوو، دەستە ئارەقاوییەکەم لەرزی.

نیگارەکەم بە پەنجە سوورەکەم ڕەنگ کرد.

---

[35] ناوپیستێر: ئەو بەشەی دەرپێ یان دوولینگە کە ناوگەڵ دادەپۆشێ.

## بەندی چوار

گوڵ، خونچەی دابوو؛ چرۆی کەسک کە لە نیسان و ئایاردا سەری دەرهێنابوو، ئەو ناوەی سەوز کردبوو، سەرەو هەوراز قیت بووبوونەوە و کرابوونەوە. منیش لە دوا ڕۆژی خوێندنی ناوەندییم بە زیندەخەوێکەوە بەرەو شوێنی کاری دایکم دەچووم، بەو خەونەی خەریکە بچمە زانکۆ، کارم دەستبکەوێ، کامێرایەک بکڕم و دەست بە فیلمسازیی خۆم بکەم. سینگم پڕ بۆن و بەرامەی ئەکاسیا و دەمیشم پڕ لە دەنکە تووی سپیی شیرین بوون، ئەوەی کوڕوکاڵ، ئازادانە لەسەر جادە لێی وەسەر داری دەکەوتن و هەرچی بەوێدا ڕۆیشتبا بەشیان دەدا. دارەکان بە شێوەیەکی بێ جیاوازی لە بەردەم زۆربەی ماڵەکاندا وەک یەک بەرز و پەرپووت بوون.

دایکە هێشتا سەرقاڵی دوا مەعمیلی بوو، دەبووایە لە نووسینگەی ڕاوێژکارییەکە لەسەری بوەستم. دیوارەکانی بە ڕەنگی بۆرە بۆیەکرابوون، پەنجەکەرەش بە سەر دووڕیانی سەرەکیی ناوبازاڕیدا دەڕوانی، کە ڕۆخ جادەکانی بۆ پەلەپەلی پیادەڕۆکانی تەنگ بوو. لەسەر کورسییەکی خولاودا لە بەردەم مێزێکی قاوەیی گەورەدا دانیشتم، کە کۆمەڵێک کاغەزی لەسەر بوون، بارستە کاغەزەکەش سەنگێک لە شێوەی کۆتریان لەسەر دانرابوو. بیرم لەو شتە کردەوە، کە شلێر هەفتەی پێشتر نیشانی دابووم، خەتکێشییەکەی سیمای حاڵگرتنی دەرویشانە. لەوەتەی شلێر قوتابخانەی بەجێهێشتبوو، بە دەگمەن دەبینرا، جوانەش کە ئێستا بۆتە یەکێک

لەبازاڕگەرمترین بەرگدرووەکانی شار، هەر بەنێو جادەوبانەکانی کوردستاندا دەگەڕا، سەری لە شوێنەوارە دێرینەکان دەدا، گوێی لە موزیک و بەندوباڵۆرە جۆربەجۆرەکانی دەڤەرەکە دەگرت، سەیری ڕێوڕەسمی جیاواز جیاوازی دەکرد، کە هەتاویش با، بەسەر گردەکاندا هەڵدەگەڕا تا کەوی دەندوک سوور ببینێ. جارێکیان بە دەرفەتم زانی و لەگەڵیدا چوومە خانەقایەک، چوومە خەڵوەتگەی سۆفییان. هێشتاش هەست بە ڕیتمی دەف دەکەم، دەبینم چۆن دەروێشەکان بازنەیەکیان پێکهێناوە، باسکیان لەیەک ئاڵاندووە، تا یەکێکیان ئەو پەرژینە مرۆییە دەشکێنێ و لە نێوەڕاستیاندا حاڵ دەیگرێ.

دایکە دوای ئەوەی مەعمیلێکی کەتەی قەبارە نائاسایی بەرەو دەرکەی دەرەوە ڕێنوێنی کرد، بارستە فایلێکی لە بن هەنگڵی دانا. سەرباری ئەوەی جەستەشی گۆد[٣٦] بووبوو، ئەو منی وەک گۆچانێک بەکارهێنا و ویستی ڕێ بکا.

"تۆ پێویستە گۆپاڵێک لە دەست بگری" بە دەم ئەم قسەیەوە فایلەکانم لێوەرگرتن و کەوتینە سەر شەقام، کە جمەی دەهات.

ئەو بە دەم گوتنی: "من هێشتا ئەو پیرە نیم" بە هەناسەبڕکێیەکەوە سڵەمییەوە.

منیش گوتم: "مەعمیلەکەت هەر دەڵێی پیاوە لە بەرگی ژناندا."

"ئەو نێرەموکە، کەسێکی زۆر نایابە، هەر بە تەواوی بێ وێنەیە."

---

[٣٦] گۆد: سڕ، کاتێ خوێن بۆ ئەندامێکی لەش ناڕوا.

من له سەروبەندی ئەوەدابووم، لێی بپرسم ئاخۆ نێرەمووک چییە، که دەنگێکی ناسیاو لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکه لەسەر شەقامەکه بەر گوێمان کەوت. بەر لەوەی ئاوڕ بدەمەوە و ڕوخساری ببینم، دەنگه گڕەکەم ناسییەوە. بابه به پێچەوانەی خەڵکەکەوە دەهات، قاچێکی نوشتاندبووەوە به ستوونی کارەبای وەنابوو، دەستەیەک تەسبیحی به باسکییەوە وەکردبوو، بانگی دەکرد: "تەنیا به بیست تومەن."

خۆڕسکانه بانگم کرد، بەڵام کاتێک ئەو زوو ڕووی لێوەرگێڕام، منیش قڕوقەپم لێکرد. دایکەش بێ باکانه لەسەر ڕۆیشتنی خۆی بەردەوام بوو.

به نووزەیەکی نارەزاییانەوە گوتم: "فایلەکان قورسن. جانتای مەکتەبێشم قورسه. تۆش هەر قورسی. ناتوانم چیدی بڕۆم." ئینجا سواری پاسێک بووین، به یەکەوە لەسەر کورسییەکی چەرمینی دڕاو و له بێدەنگییەکی وەڕەزدا دانیشتین.

سەرەنجام پرسیم: "ئەرێ لاقت چۆنه؟"

ئەو به لاچاوێکەوە تەماشایەکی کردم. "له کەیەوە خەمم لێدەخۆی؟"

خۆی پرسیارێکی ڕەوا بوو کردم، بەڵام باری تۆمەتبارکردنەکەی سووک نەکرد.

"دایکه، من دەمەوێ بزانم. ئاخر زۆر شت دەربارەی تۆ هەیه دەمەوێ لێیان تێبگەم."

ئەویش ئاوڕی لێدامەوە: "به ڕاستی؟ چیت دەوێ؟

من دەمزانی ئەو و بابە کاتی خۆی لە زانکۆی تاران لەو کاتەی خوێندکار بوون یەکدیان بینوە و وەک زۆر کوردی دیکە ئازاری مێژوویی هاوبەشیان هەبووە. لێ ئەوە سەخت بوو بیهێنمە پێشچاوی خۆم، ئاخۆ چ شتێک بە یەکەوە کۆیکردوونەتەوە. "باشە کە یەکەم جار بابەت بینی، چ شتێک لەودا هەبوو، حەزت پێیکرد؟"

دایکەش گوتی، زیرەکی و کاریزماکەی پیاوێکی پرزانیاریی کەمدوو، پەرۆش بۆ دادپەروەری، سەرنجڕاکێش بە شێوازە تایبەتەکەی خۆی. ئەو حەزی بە دەستە گەرمەکانی، بە چاوە ڕەشە قووڵەکانی، بە دەموچاوە فریشتەییەکەی بوو، کە بەسانایی دەکرا لێیەوە پەی بە هەستوسۆزی ببەیت.

هەینێ، دایکی بابە چوبووە تاران تا لەگەڵ زاوا و بووکە نوێیەکەدا بژی، دایکەش پێیوابوو ئەمە هەڵەی دایکی بووە، کە هەر زوو کوڕەکەی مەیلی بە لای تازە بووکەکەی لە دەست بدا. دایکم هەر ئەوکاتە زانی، کە دایکی باوکم لەنگەر بووە لە ژیانیدا، ئەمەش دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی بێچارە مایەوە. دوای ئەوەش بابە لە زیندان دەرچوو، دۆخەکە شەپرێوتر بوو؛ ئاخر دایکە هەستیکرد پشتگوێخراوە، ئیدی بووتە بەشێک لە کەرەستەی ناوماڵەکە و هیچی دیکە. "ساتێک چاوەکەمی دەپەرست، کەچی بۆ ساتی دوایی وای ڕەفتار نواند وەک ئەوەی هەر نەشبووبم."

لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ دایکم بەرەنگاری بووبووەوە، پێم وابێ پێویستی بەوە هەبووە ببینرێ و هەست بە بوونی بکرێ. پاسەکەش تا دەهات جەنجاڵتر و بە دەنگەدەنگتر دەبوو، ئێوارەکە لە چڵەپۆپەی خۆیدا بوو، منیش لە پرسیارکردن وەستام.

کاتێکیش گەیشتینەوە ماڵێ، دایکە قاچە هەڵاوساوەکانی بە دیوارەوە نا، دیاربوو پەڵەی ئاسەواری ئەو هەموو ساڵە پڕ ئازارانەی پێوە دیاربوو.

"بەڵام خۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان هەردووکتان یەکدیتیان زۆر خۆشدەویست؟ یاخود تۆ پێتوایە هەر لە سەرەتاوە خۆشەویستی لە نێوانتاندا نەبووە؟"

"تۆ هێشتا زۆر گەنجی تا لێ تێبگەی" بە دەم ئەم قسەیەی دەمی لاربووەوە.

"دایکە، من هەژدە ساڵم."

چاوەکانی نووقاندن. سینگی بەرزبووەوە. "باوکت حەزی لێبوو چاوم ماچ بکا، تەنها چاوم. منیش تێنەدەگەیشتم بۆ؟" فرمێسکێک بە چاویدا هاتەخوار. "وەها دەرچوو خۆشەویستێک لە ژیانی ئەو هەبووبێ، کە وەک من چاوی کاڵی هەبووبن. ئیدی بەرلەوەی ئێمە یەکدی بناسین، ئەو دەمرێ، بەڵام هەرگیز نەیتوانیوە لەبیری بکا. لێ من خۆشم دەویست. ئایا لە واتای ئەمە تێدەگەی؟"

"شتێک تێدەگەم." لە ڕاستیدا فرم پێوەنەبوو — بەزمی دڵداریی من لەگەڵ هیچ کەسێک لە یەک دوو مانگ زیاتری نەدەخایاند - بەڵام خۆ من نەمدەویست شتێک بڵێم وای لێبکا چیرۆکەکەیم بۆ تەواونەکا.

لە کۆتاییدا نەفام دەرچووم — هیچ کام لە وانەی پێم سەرسام بوون لە یەک دوو مانگ زیاتریان نەدەخاند- بەڵام خۆ من نەمدەویست وای لێبکەم چیرۆکەکەی تەواو نەکا.

"خۆی ئەوە یەکجار بوو لە ژیانمدا گەمژە بووبم، لەو کاتەشەوە باجەکەی دەدەم." دایکە بە دەم قسەکەوە سەرێکی بادا و درێژەی پێدا: "خۆشەویستی واتای ئەوەیە، بێ ئەندازە گەوج بی. کە دەڵێم بێ ئەندازە تێبگە. ئینجا ڕۆژێک دێت و هۆرمۆنەکانیش دەنیشنەوە، ئەوسا تێدەگەی هەر بە ڕاستی ژیانی خۆت بە چ کەسێکەوە گرێداوە. ئیدی تێکەوتووی، تووش بووی. حەز دەکەی تا ئێوارە سەری خۆت بە داروديواران دادی، چ دادت نادا." ئەو چاوەکانی لەسەر پەڵە شێدارەکانی بنمیچەکە ڕاگرتبووو؛ "بەڵام خۆ کەس ئەم شتە بە تۆ ناڵێ. ئەگەر وا بڵێن، ئەوا کەس مێرد ناکا." ئینجا بایدایەوە سەر من؛ "بەم جۆرە سەیرم مەکە. هەروەک خۆت گوتت، هەنووکە بوویتە هەژدە ساڵی؛ کاتی ئەوە هاتووە شتێک لە ڕاستییەکە بگەی."

دەستی بە شێلانی لاجانگی خۆی کرد، پاشان دانیشت و دەسرۆکەکەی توند لە پشتەسەری گرێدا. بڕوای وابوو پەستان کاری خۆی لە سووککردنی میگرینە دەکا تا ئەو کاتەی ئەو حەبانەی قوتی داون کاری خۆیان دەکەن. منیش هەندێ گوڵەبەڕۆژەم هێنان و لە بەرانبەری دانیشتم. بای شەماڵیش لە پەنجەرە کراوەکەوە هات.

بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە گوتی: "گوێبگرە... دەزانم هەندێک جار حۆلانە دەجووڵێمەوە. وا مەزانە نایزانم، بەڵام خۆ لە کۆنترۆلی مندا نییە."

ئیدی ئێستا هەر بە ڕاستی سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

دایکە دەنکە گوڵەبەڕۆژیەکی قرتاند. "خۆی ئەوە ئەو ژیانە نەبوو لەپێشچاوی خۆم دانابوو. هەندێک جار هەستدەکەم وەک ئەوەی نغرۆ ببم، دەڵێی قوڕساییم پێوەهەڵواسراون." ئەو بە پەنجەی ئاماژەی بازنەیەکی دروستکرد. "خۆ ئێستا تۆ لەبارەی ئەو کونە ڕەشەی گەردوون باس دەکری دەزانی؟ ڕێک یەکێکی وەها لە سینگم دایە. هەرگیز ناشزانم ئاخۆ کەی جارێکی دیکە بۆ خۆیم دەباتەوە. من دەقیژێنم و پەل دەهاوم تا لێی دەرچم، لەو کردەیەشدا کەسانی دیکە و خۆشم ئازار دەدەم." چاوی بە چاوم کەوت، هەراسان دیاربوو. "باوکت هیچ لەو بارەیەوە نازانی دۆخەکە چەند بۆ من سەختە. تەنانەت ئەو بە ناسۆریشم نازانی؛ ئەو هەر بیر لەوە دەکاتەوە، کە هەر ئەو بە تەنیا لە بنەبانی زیندانی قایمکرابی، بەڵام خۆم بۆ ژیانی خۆم دەجەنگم. دەمەوێ بژیم."

منیش بۆ تێگەیشتن لەمە کێشەم هەبوو.

"تۆ تێناگەی." وەهای گوت و قوڕگی پاککردەوە، ئەوەندەش بە هێز پەلکە گوڵەبەڕۆژەکەی دەردا، دەفرەکەی لەگەڵ لەریەوە.

ویستم بپرسم بۆ لە بری ئەوەی بەردەوام پەلامار بدا، هەرگیز هەوڵی نەداوە لەگەڵ یەکێک نەرمونیان بێ، بەڵکو لەگەڵ یەکێکی وەک جوانەی هاوسۆز، ئەو کەسەی بە هەڵە هێشتا هەر پێی وایە مایەی هەڕەشەیە بۆی، بەڵام نەمتوانی هەستەکەم وردەکارانە دەربڕم. ئەوە بوو هەر ئەوەندەم کرد، دەستم گرت و هەندێک گوشیم.

"هەرچۆنێک بێ." دایکە بەم جۆرە گفتوگۆکەی گەڕاندەوە سەر بنەما بێلایەنییەکەی خۆی. "ئەو کاتەی باوکت زیندانی کرا، تۆم

هەبوو، تۆش ئەوەندە شیرین و چاونەترس بووی، هەندێک جار وەها دەجووڵایەوە هەر دەتگوت دایکی و من کچەکەت." دایکە خەندەیەکی کرد. "لە ناوەڕاستی جەنگدا من تۆم بە شێوازی خۆم گەورەکرد، ئایا دەشزانی کاتێ کەوتیتە سەر قسە، یەکەمین وشە چیبوو گۆتکرد؟ بابە." غەمبارانە پێکەنی. "ئەوەش بەخت و نێوچاوانی من."

"ببورە دایکە." دڵنیاش نەبووم بەم قسەیەم داوای لێبووردن لە کامە بەشێکیان دەکەم.

"بە ئازادبوونی باوکت بەختەوەر بووین." ئەو وەها لەسەر قسەکەی ڕۆیشت. "ئاخر لەو ماوەیەدا چەندین هەزار زیندانی لە قەنارە دران. هیوام وابوو لەدایکبوونی چیا یارمەتیی بدا بە سەر ئازار و ئەشکەنجەدان و گرفتەکانی دیکەیدا زاڵ بێ، ئاخر ساڵانی بەرایی تۆی لە دەست چووبوو. بەڵێ چیاش یارمەتیی ئەوەی دا، هەر هیچ نەبێ بۆ ماوەیەک. باوکت حەزی لە منداڵی ساوا بوو، بەڵام کاتێک گەورە دەبوون و تێکەڵی خەڵک دەبوون، مەیلەکەی لە دەست دەدا."

"تۆ پێت وایە ئەو حەزی لە ژنی مردوو و منداڵی ساوا بێ، چونکە ئەوان نامرادی ناکەن؟ ئاخر ئەو شتانە ناکەن، کە حەزی پێ نییە."

دەموچاوی دایکە تێکهەڵات. "دەی واز لەو بەڕۆمانسیکردنە قوڕە بهێنە. ئەو ئەم شتەی لە مێشکدا نییە."

ئاها. ئەو ڕەچاوی هاوسۆزیی دەکرد، بەڵام ڕەتیکردەوە لە بەرانبەردا هیچ هاوسۆزییەک بنوێنێ.

لەپڕ گوتی: "دەی وازبێنە لەوەی خۆت لە هەمووومان بە هۆشمەندتر بزانی."

منیش خەندەیەکی ناشیرنم لەسەر ڕووی خۆم نەخشاند و گوتم " ببووورە."

ئێوارەیەکی درەنگی مانگی ئاب، بابە بە خۆی و ڕۆژنامەیەکی ئەستووری نائاساییەوە بە نوشتاوەیی لە بن هەنگڵیدانابوو، گەڕایەوە ماڵێ. من لە ژووری میوان دانیشتبووم، سەرم بەسەر شیعرەکانی سیمین چایەچی داگرتبوو، کاتێکیش نیگای بە ئاراستەی من هەڵبڕی، بیرکردنەوەی پێبڕیم.

ئەوەم بەدیکرد کە نائومێدی بەسەر چرچ و لۆچی ڕوخسارییەوە دیاربوو، ئەم کەڕەتەیان قووڵتر لە هەموو جارێک. سەیرێکی ڕۆژنامەکەم کرد. ئەوەی پەییم پێبرد هەژاندمی. ئاخر ئەنجامی هەزاران قوتابی تێدا بوو. تاقیکردنەوەی نیشتمانیی، کۆنکوردی تێدا بوو. چەند ملیۆنێک بەشداری تێدا کردبوو. هەر تەنیا دەستەیەکیان لە زانکۆ گشتییەکاندا وەرگیرابوون. منیش یەکێک نەبووم لەوان.

هەستمکرد لەسەر تەلارێکی هەوربڕدا فڕێیانداومەتە خوارێ. نەخێر، لەوەش پۆلکتر[٣٧]. دەستی قەدەر دابەزیبووە خوارەوە، ئەو بورجەی تارومار کردبوو، کە مرازەکانم لەسەری ڕۆنابوو، کەوتبوومە ژێر داروپەردووی تاوەری ئارەزووم.

هەناسەیەکم هەڵکێشا؛ "دەی با ببینم.

---

[٣٧] پۆلکتر: بەدتر، خراپتر

"حکومەت ترومبێلی فریادڕەسی مانگی سووری ناردووەتە ئۆردوگای پەنابەرانی کورد،" کاتێ بابە لەسەر کورسییەکەی دانیشت، وەک ئەوەی ڕووی قسەی لە هیچ کەسێک نەبێ، درێژەی پێدا؛ "کەسیش پێمان نالّێ چەند کەس کوژراون، چەندیش بریندارکراون." ئەو هێشتا ڕۆژنامەکەی هەر بە دەستەوە گرتبوو.

دلّۆپە فرمێسکێکم سڕیەوە، بەلاّم خۆ ڕۆندکێکی دیکە کەوتە سەر نیگاری ئەو پەپوولەیەی لەسەر دەفتەرەکەم کێشابووم و تێکیدا. ئینجا ڕۆژنامەکەم لە دەستی بابە دەرهێنا، بە سینگی خۆمەوە نووساندم و بەرەو ژوورەکەم ڕۆیشتم تا لە لیستەکەدا بە دوای ناوی خۆمدا بگەڕێم. قامکی ئاماژەم بەسەر لیستی ناوی وەرگیراوەکانی زانکۆدا داهێنا، لە سەرەوە تا خوارێ پێیداهاتم. ناوی منی تێدانەبوو. پەڕەکانی دیکەی ناوم هەلّدانەوە، دیسان بە دوای ناوەکەمدا گەڕامەوە. لەوێ، بەلّێ لەوێ پەنجەم گۆد بوو. من لە زانکۆیەکی ئەهلی وەرگیرابووم، ئەو زانکۆیەی پارەی خوێندنی ئەوەندە بوو، ڕوون و ئاشکرا هی ئەوە نەبوو بە ئێمە بدرێ.

سەری خۆم خستە بن سەرینەکەم. ئای خوایە، تۆ بلّێی چۆن ڕێگەم بە خۆم دا چاوەڕێی ئەوە بکەم ناوم لە لیستی خوێندکارە بەختەوەرەکاندا بێ، کە لە کێبڕکێی زانکۆکاندا وەرگیراون؟ قاقایەکی ناقۆلا و پێکەنینێکی تالّم بۆ لێدا و ڕۆژنامەکەم هەلّگلۆفت و فڕێمدایە نێو زبلّدان، ئینجا گریام.

دایکە و بابەش لە ژووری دانیشتندا شەڕ و دەمەقالّەیان دەستپێکردبوو. تۆ بلّێی خەتای کێ بێ سیسرک وەها ئازادانە لە

ناندین دێت و دەڕوا؟ ئەرێ تۆ بڵێی خەتای کێ بێ کە بنێشت بە قەنەفەکەوە نووساوە؟

هەرچەندە بابە کاتی زیاتری لە من و دایکم بەیەکەوە لەماڵەوە هەبوو، بەڵام ڕەتیکردەوە "کاری ژنانە" بکا." بە سەرکۆنەکردنێکەوە: "هەرگیز ژەمێکی گەرمم لەم ماڵە نەخواردووە."

دایەش بە سەریدا نەڕاندییەوە؛ "من کوێ ڕۆژ دەوامم هەیە و دەبێ ئاگاشم لە پیرەدایکی ئالزهایمەرگرتووم بێ." دایکە ئەوەی گوت، ئاخر خەتای منە دیوارەکان هەروەک چۆن پەردەکان، هەورەبانەکە و ژووری بنخان پیس و پۆخڵن.

منیش دەرکەی ژووری نوستنی خۆمم کردەوە و هاوارمکرد: "ماڵەکەتان بە ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی منیش هەبم، هەروا پیس و پۆخڵ بووە."

بە لای دایکەشەوە هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە دیاربوو من لە لیستی خوێندکارە وەرگیراوەکانی زانکۆدا نابم، ئاخر من ئەوەندە تەمبەڵم ناتوانم پاکوخاوێنی ماڵەوەش ڕابگرم.

لەبەر ئازاری سەرئێشە چاوەکانم بۆ هەڵنەدەهاتن، هەرچۆنێک بێ بەلارەلار خۆم گەیاندە لای چەکمەجەکەی دایکە، کە حەبی تێدا دانابوو. بۆنی ئارەقەی شێداری نزیکی ژوورەکە منی ڕشاندەوە. ئیدی بە هەردوو دەستم چاو و هەنیەم گرتبوو.

دایە و بابە لەسەر یەک شت ڕێککەوتن. تاکە چارەسەر ئەوە بوو بە مێردم بدەن، بەڵام بە هۆی ئەوەی بکیژێکی بەرچاو و جوان نەبووم، لە کاروباری ناوماڵیش هەر باش نەبووم، بۆیە تاکە کەسێکیش نەبوو بێتە خوازبێنیم.

به ئاستەم دەمتوانی چاوم هەڵبێنم، هەر چۆنێک بێ حەبە کۆدینەکانم[٣٨] دۆزینەوە و مشتێکم هەر بە وشکی قووتدان.

دایکە ئۆبالّی شکستەکەی منی بە ئەستۆی بابە دادا؛ "هەمووی خەتای تۆیە."

بابەش گلەیی هاتنە سەردونیای منی لێکرد. "هەرگیز منداڵم نەدەویستن. تۆ منت خستەداو."

بەرەو ژوورەکەم ڕۆشتم و ئەوەندەش توند دەرکەم لە دوای خۆم پێوەدا، وردە داری لێهەڵوەرین.

"خۆ دەکرا فێرە خۆکۆنترۆڵکردن بیت."

"لە مێژە بە باشی فێرە ئەوە بوومە."

"ئاخر قوندەرەی، بۆیە وای."

بابەش قاپێکی بە دیوارەکەدا دا، پاشان گەڕایەوە جێگەی خۆی لە هەورەبانەکە. منیش دەمویست کۆدینەکە کاری خۆی بکا و بمخاتە سەر شەپۆلی خەون.

---

[٣٨] Codeine کۆدین دەرمانێکی ئازارە لە ئەفیون دروستدەکرێ.

## بەندی پێنج

بۆ بەیانییەکەی کاتێ یەکەمین تیشکی شەبەنگی خۆر بەر پەردەی تەنکی پەنجەرەی ژوورەکەم کەوت، سەرئێشەکەم نەمابوو، بەڵام کاتێک ویستم خۆم بجووڵێنم، ئەندامەکانی جەستەم، گۆد ببوون، بە گوێیان نەکردم. ناڵین و نووزەش دادی نەدام. هەموو شەوەکە لە خەونمدا پیاوێکی قات ڕەش بە دوامەوە بوو، بۆ هەرکوێیەک چووبام، وازی لێ نەدەهێنام. جەنابی بەدبەختی، میراتی لەمێژینەی ماڵباتەکەم، دەستی لە ئەوک نابووم، لێ نەدەگەڕا لەسەر پێی خۆم بوەستم.

بێدەنگییێکی سامناک باڵی بەسەر ماڵەکەماندا کێشابوو، ئەوەش ئەوەی دەگەیاند دایبابم هێشتا هەر لە خەودابن یان هەر زوو لە ماڵێ دەرچووبن. دابەزیمە ژوورەکەی بنهۆمێ، ئێستا بووەتە هۆدەی خەوی چیا، لە پەنجەرەی بێپەردەوە بینم ڕۆشن بوو. ئەو دیوارەکانی بە پۆستەری چێ گیڤارا، گاندی و نیلسن ماندێلا ڕازاندبوونەوە. هیچ کەسێکیش لەسەر پرچە چەورەکەی لۆمەیان نەدەکرد. دەبۆرژا و تووکەحەرامەی سەر چرووچاوی هەڵدەکراند، لەسەر مێزەکەی سەری بەسەر دەفتەرەکەیدا گرتبوو، پرسیارەکانی وانەی فیزیای حەلدەکردن.

پێویستم بە خۆغافڵاندنێک هەبوو، ئەوە بوو کراسە خاکییەکە و پانتۆڵەکەم، کە شەوی پێشتر شوشتبوو، ئوتی کرد، ئەو کارەشم بە پاڵنەرێکی دینییەوە دەکرد، لەوەتەی ئەو ببووە نۆ ساڵ، لەسەری

ڕاهاتبووم. ساڵ لە دوای ساڵیش لە ماڵ و لە قوتابخانەش پەسنی چیایان لە سەر زیرەکی دەدا و منیش لەسەر ئەوە سەرکۆنە دەکرام، کە وەک ئەو نە زیرەکم و نە ڕێکوپێکیش. من هەر بۆ ئەوە باش بووم سێدارەی خۆم ڕابچێنم.

"لەیلا، ئەرێ حەزناکەی هەندێ تۆلستۆی بخوێنیتەوە؟ دەی واز لە ئوتوکردنەکە بهێنە. خۆ زۆری پێناچێ پانتۆڵەکە گلۆچ دەبێتەوە." چیا کە ئانیشکی دابووە بەرخۆی و چەناگەی لەسەر لەپی دەستی بوو، وەهای پێگوتم. ئەو هەمیشە کاری لاوەکی بە لاوەدەنا و پێی کات بەفیرۆدان بوو، بڕوای وەهابوو لەو جیهانەدا کاری دیکەی زۆری لە پێشدایە. دوێنێ گوتی: "باشە بۆچی پێخەفەکەم ڕێکبخەمەوە خۆ ئەمشەو هەر لەسەری پاڵدەکەومەوە و دەڕازێم؟ باشتر وایە هەموو بەیانیان لەو کاتەدا شتێک لەبارەی سەرهەڵدانی فاشیزم لە میانەی جەنگی دووەمی جیهاندا بخوێنمەوە. شتێکی قۆڕە، بە شەڕی نێوان وڵاتە دەوڵەمەندەکانەوە دەڵێن 'جەنگی جیهانی' و بە شەڕی وڵاتە هەژارەکانیش دەڵێن 'جەنگی خێڵەکی'!"

جلە ئوتوکراوەکانم قەد دەکردن. هەوڵمدەدا خزمەتیماڵباتەکەم بکەم، ماڵ خاوێن و بژوون ڕابگرم، بەڵام خۆ کەس بە هەندی هەڵنەدەگرت. هیچ لەو کارانەی دەمکردن نەدەبوونە مایەی دەستخۆشیی دایک و بابەم. براکەشم چاوی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی منی نەدەبینی، تەنانەت خوداش لەو "خەم و ترسە" ڕزگاری نەدەکردم کە لە کتێبە پیرۆزەکەدا هاتبوو.

بە هۆڕنی ترومبێلی فریادڕەسەوە، قیتاری هزرم وەستا. ڕووناکی لە پەنجەرە لارەکەی سەر پێخەفی ژوورەکەی چیاوە

ڕۆشنبووەوە. دانەیەک لە کتێبی شەڕ و ئاشتی لەسەر پێخەفە هەڵنەگیراوەکەی بوو. "ئەرێ بە ڕاست هەر هەزار و دووسەت لاپەڕەکەت خوێندوونەتەوە؟"

"ڕۆمانێکی زۆر گرنگ بوو." چیا بە دەم ئەم قسەیەوە سەری قەڵەمەکەی دایە بەر ددان و لەسەر قسەی بەردەوام بوو: "ئەرێ کتێبی هەزار و نۆسەد و هەشتاو چوارت خوێندەوە کە پێمدابووی؟"

هەڵم لە ئوتووکەوە بەرزبووەوە. من سەیرم نەکرد، بەڵام دەکرا ڕوخسارەکەی، ڕوخسارە ئاساییەکەی کە لە کاتی قسەکردندا بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرد بهێنمە بەرچاو. خۆی هەوڵمدا کتێبەکە بخوێنمەوە، بەڵام دیستۆپیاکەی[39] ئۆریل بۆ من- بۆ ئێمە شتێکی ڕاستەقینە بوو. خۆی من پێویستم بەو کتێبانە هەبوو، کە دەرفەتی دەربازبوون و هەڵاتنیان بخستبایە بەردەمم، نەوەک کتێبێک ئاوێنەیەک بە ڕووی ژان و ناسۆرەکانی خۆتدا قیت کاتەوە.

"ئەو شەوەی تۆی تێدا لەدایک بووی، لێرە لەم ژوورە من لەگەڵ شلێر و جوانەدا خەوتم."

"لەیلا، چی بێزاری کردووی؟"

منیش خۆم بە قەدکردنی پانتۆڵەکەیەوە خەریک کرد و گوتم: "غەریبیی شلێرێ دەکەم. ئەم ڕۆژانە بە دەگمەن دەیبینم."

"ڕاستییەکەم پێبڵێ، چییە؟"

---

[39] دیستۆپیا dystopia: ئەو کۆمەڵگەیە کە ترسوتۆقین و پاشاگەردانی باڵکیش بێ، ڕێک پێچەوانەی یۆتۆپیا.

منیش پێمڕامگەیاند: "پەنجەرەکەت دژوونە[٤٠]. یەک بارستە جلیشت هەن پێویستە بۆ تۆیان لە ئوتوو بدەم."

وەهام دانابوو چیا چاوەکانیم لەسەر لاببا. لەبری ئەوە لەسەر مێزەکەی خۆی هەڵسا و لە بەردەم ئوتووکەدا وەستا و گوتی؛ "ئەمە هەموو شتەکە نییە، وا نییە؟"

برا مێردمنداڵەکەم بەو پرسە، بە هێورەیی دەمامکی لە سەر ڕووخسارم لادا. منیش ڕووخام و گوتم: "من لێی دەرنەچووم. هەرگیز ناگەمە ئەو زانکۆیەی بتوانم پارەکەی بدەم، خۆ ئەگەر بشیگەمێ، بێ سوود دەبێ. پێدەچێ وەک بابەم لێ بەسەربێ، بەڵکو لەوەش پۆلکتر وەک دایکمان."

"دەی، جا چییە ئەگەر ئەمساڵ دەرنەچووی؟ خۆ خزمەتی سەربازییت لە بەردەمدا نییە. دەکرێ بۆ ساڵی ئایندە باش بخوێنی."

منیش بە هەنسکەوە گوتم: "هەموو ئەوەی لە ژیانم دەوێ، ئەوەیە خوێندنی زانکۆ تەواوبکەم، تا کارێکی شایستە بە دەستبێنم. ئینجا فیلم دروست بکەم، چیرۆکەکانی خۆمان بگێڕمەوە."

"دەی کڕووزانەوە بەسە. دڵنیام ساڵی داهاتوو دەردەچیت. ساڵێکت بۆ خۆئامادەکردن لە پێشە. هەر لە بەیانییەوە دەستپێبکە."

لە چاوەکانیدا گەڕام، ئەو بڕوای بە گوتەکەی خۆی هەبوو. سەرپەنجەم لە بادی ئاوەکە هەڵێنا و ڕشاندمە سەر کراسەکەی و دەستم بە ئوتووکردن کردەوە. ئوتووەکەم توند لە سەر کراسەکە گیرساند، خەریک بوو بیسووتێنم. بۆ ساتێک وەها هاتە مێشکمەوە

---

[٤٠] دژوون: پیس و پۆخڵ. دژەکەشی بژوونە.

ئوتووکە بە دەموچاوی خۆمەوە بنێم تا کەللەی سەریشمی لەگەڵدا داغ بێ، بەمە هەموو داڵغەیەکم بڕەوێتەوە.

کاتێک لە ئوتووکردنەکە بوومەوە، چیا پرسی: "ئەرێ پێت وا نییە، من و تۆ ژیانی بابەمان وێران کردبێ؟"

منیش پلاکی ئوتووەکەم لە کارەباکە دەرهێنا و گوتم : "بۆ؟"

"نەوەک مەبەستمان بووبێ، بەڵام سەیرکە، من لەو ڕۆژەدا لەدایکبووم، کە شارەکەی کیمیاباران کرا." بەدەم ئەم قسەیەشیەوە پشتەملی خوراند.

"ئێ، بەڵام من نا."

"دەزانی چۆن ویستوویەتی ناوت بنێ نیشتمان، بەڵام حکومەت لێی قەدەغەکرد؟"

"بێگومان."

"نیشتمان ئەو کچە بوو لە قوتابخانەی دواناوەندییەوە خۆشیویستبوو، دەشیویست بیخوازێ."

منیش مەراقی ئەو کچەبووم، ناوی نیشتمان بوو، ناوی وڵاتێکی دانپێدانەنراو، وڵاتێکی نافەرمی، کەچی هێشتاش هەر وڵاتێکی جوانە. ئەو کچەم بە دوو چاوی هەنگوینی هێنایە بەرچاوم، پڕ لە هیوا و فرە ئازاش. "باشە، ئەوە خەتای من بوو کە ڕووی نەدا؟"

"نا، نەخێر. کیژەکە بڕیاریدابوو ببێتە پێشمەرگە و بابەش تازە لە زانکۆی تاران وەرگیرابوو، ئیدی بڕیاریدا دوای کچەکە نەکەوێ. ئەوە بڕیارە، بە لای منەوە هی ئەوە بوو، دەبووایە هەزار داخی بۆ بخوا."

پێشمەرگە: ئەوانەی ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە. ئای لەو کیژە ئازایە. کیژێکی خوێندەواری خەونبین لە کاتێکدا ئەو چاوەڕوانییەیان لە ژنان نەبوو. لەبەرچاوی من دەمبینی ئەو کچە بەسەری بەرزەوە و بە شکۆوە دەڕۆیشت، ئەمەش کاریزمایەکی ناوازەی پێبەخشیبوو. بەڵام نیشتمانی کچ، هەروەک نیشتمانی زێدی کوردستان، هی ئەوە نەبوو دەستی بگاتێ. "سەرەنجام کیژەکە چەک و ئەویش خامەی هەڵبژارد. هەردووکیشیان شکستیان هێنا." ئاهێکم هەڵکێشا و گوتم "دایکە گوتی مردووە."

چیاش شانی هەڵتەکاند. "ڕاستییەکەی دەڵێن کیژەکە بزربوو." وا پێدەچێ چەوساوەکانی سەر ئەم زەمینە داریان لە بەخت درابێ، هەرچەندە بە هەرشتێکی بکەوێتە بەردەستیان دەجەنگن، کەچی هەر دەدۆڕێن. هێشتاش بەرگریکردن و شکست باشترە لە مردنێکی لەسەرخۆ و بێدەنگ، وا نییە؟"

"هەرچۆنێک بێ، ئەوە چ پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئێمە ژیانمان وێرانکردبێ؟ خۆ ئەگەر ویستبێتی ناوی من بە ناوی ئەوەوە بکا، هەردەبێ منی خۆشویستبێ یان هیوای بۆ من هەبووبێ." لە هۆدەکەی بابە لە هەورەبانەکەدا وێنەی پیاوێک هەبوو بە جلوبەرگی کوردییەوە، وێنەیەکی بە دەستەوە گرتووە، وێنەکە هی کیژۆڵەیەکە لە کۆمەڵکوژییەکەدا تیاچووە، کابرا وێنەکەی بۆ فۆتۆگرافەرەکە ڕاگرتووە وەک ئاماژەیەک کە لە دارونەداری دنیادا تەنها ئەو دانە وێنەیەی بۆ بەجێماوە." پێتوایە ئەو هیوای بەوە هەیە، منیش شتێک بۆ گەلەکەم بکەم، منیش ئەوەم دەوێ-تۆش دەزانی ئاخۆ چەندم

حەز لەوەیە فیلم دروستبکەم تا چیرۆکەکانمان بەرجەستەبکەم- بەڵام بە داخەوە تا ئێستا هیچم بە هیچ نەکردووە."

"بەرلەوەی من لەدایک ببم، حاڵی باوکمان باش بوو." چیا گوێی لە من نەگرتبوو. "جەنگی هەشت ساڵە تازە کۆتایی هاتبوو، هیوا هەبوو بەڵکو بمانباتەوە کۆنەزێدی خۆی، مەڵبەندی هەناران. بەڵام لەو کاتەدا من لەدایک بووم و شارەکەش کیمیاباران کرا. تۆش هاتیەسەر دنیا و بەسەر ماڵی ئەویشدا درا."

"ئەرێ شەوی گیرانەکەی بۆ گێڕایەوە؟ کەی بوو؟"

"ئۆو، لە مێژە."

منیش هەروەک زارۆکێک پێی خۆم لێکدا: "باشە بۆچی پێتنەگوتم؟ من هەموو چیرۆکەکەم دەوێ، بە وردەکارییەوە، کتومت وەک خۆی."

لە سەر ناوکەوەکە نیگایەکی بۆ کردم و برۆکانی وەک کەوان هێنانەوەیەک، جۆرێک دانیشتبوو دەتگوت لە دۆخی یۆگادا بوو، بڕبڕەی پشتی قیت و ناولەپی دەستەکانیشی لەیەکدابوو، ئینجا پێیگوتم: "بۆ؟"

"چونکە بابە هیچ شتێکم پێنالێ."

چیا قاچەکانی لێککردنەوە و ڕایکێشان. "باشتر وایە ئاسوودە بیت."

بەگوێرەی قسەکانی بابە، لەو کاتەوەی دایکە پێیگوتبوو دووگیانە، ئیدی گوێی لە تەقەیەکی لەسەر یەک دەبێ کە بە توندی لە دەرگایان دەدرێ. لە سەعاتی پێنجدا لێدانی دەرکەیان گەیشتە

ترۆپک. دوو پۆلیسی ڕیشدار بە جلی مەدەنییەوە لە دەرکەی پێشەوە خۆیان بە ژووردا کرد. درێژەکەیان بانگی کرد "سامان؟ ئالان سامان؟"

گیانی بابە کەوتبووە لەرزین. "چی لە گۆڕێدایە.؟"

پیاوەکەی یەکەم پێی گوتەوە زەلامێکی کەتە، کە پەڵەی زەردی توتن لەسەر ددانەکانی دیمەنێکی ناقۆڵای دابوویێ، پێیگوتەوە: "لە ئێڤین[41] دەیبینیەوە ئاخۆ چی هەیە."

بابەش پرسی: "نامەی دادگاتان پێیە؟"

پیاوەکەش مستێکی لە سکی دا. "ئەمە نامەکەت."

دایکەش خۆی ڕاپێشکرد و هەر بە جلی نوستنەوە چووە بەردەم مێردەکەی و قۆڵەکانی لێککردنەوە و گوتی: "تکایە ئاغا، هەر دەبێ هەڵەیەک لە ئارادابێ."

"ئاها، بەسەر هەر ماڵێکدا دەدەین، هەمان قەوان دەبیستینەوە،" ئەمە قسەی پیاوەکەی دیکە بوو، ئەو کەسەی عەینەکی لەسەر ڕدێنە نارێکەکەی لەچاوکردبوو، لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو: "ئێمە زیاتر بڕوامان بە ئیتلاعات هەیە تا قسەی تۆ."

ناوهێنانی ئیتلاعات، دەزگای هەواڵگریی کۆماری ئیسلامی، دڵی هەر مەدەنییەک دەخاتەلەزرە، ئەوسا کەسەکە گوێڕایەڵی قانون بێ

---

[41] یەکێکە لە زیندانە گەورەکانی ئێران، دەکەوێتە ناوچەی سەعادەت ئابادی تاران، زیندانییە سیاسییەکانی ئێرانی تێدا بەند دەکرێن.

یان نا. دایکی بابەش کە هەمووان بە دایە[42] بانگیاندەکرد، پاڕایەوە: "ئاغا، تکایە! من لە جیاتی ئەو ببە."

دایکەش بە سووربوونێکی شێلگیرانەوە: "مێردەکەم بێ خەتایە!"

ئەو کاتەی کابرای بە عەینەک چاویلکەکەی ڕاستدەکردەوە، هەیتە ددانشاشەکە قیژاندی: "ژنەکە، دەی خۆت داپۆشە."

بابەش پاڵێکی بە چاویلکە لە چاوەکەوە نا و بەرەو دەرگاکە پاڵی پێوەنا و پێیگوت: "دەی لە ماڵەکەم بڕۆنەدەرەوە." کەچی لەوکاتەدا پێنج هەیتەی دیکە بە جلی مەدەنییەوە و دەمانچە لە دەست وەژوورکەوتن، بابەیان لە پەنا دیوارەکە پەستا. بە ئاماژەیەکی پۆلیسە نهێنییە زلەکە، ئەوانی دیکە بۆ پشکنین بە ماڵەکەدا وەربوون، چەکمەجەکانیان دەکردەوە، پەڕەکاغەزەکانیان هەڵدەدادنەوە، هەر شتێکی کەوتبایە سەر ڕێیان دەیانشکاند. ئەو دوو کەسەی لە پێشدا هاتبوونە ژوورەوە، دەستی بابەیان کەلەپچەکرد.

دایەش خۆی خستە بەر پێی مەزنەکەیان و بە زمانی کوردی لێی پاڕایەوە: "بۆ خاتری خۆشەویستی خودا، لەگەڵ خۆتانی مەبەن. ئەو هیچی نەکردووە. لە جیاتی ئەو، من ببەن." هەڵبەتە ئەوان لە زمانەکەی نەگەیشتن، هەر باکیشیان پێ نەبوو.

بابەش دەستەودامانی دایەی بوو: "دایە گیان، دەی بڕۆ. تکایە، لێرە بڕۆ."

---

[42] Dayah

یەکێک لە هەیتەکانیش شاپێکی لە چەناگەی دایە دا. تفێکیشی تێکرد و پێیگوت "کافر"، دیسان کەوتەوە سەر لێدانی پیرەژنەکە، ئەمجارەیان لەقەی لە سینگی دا. بابەش نەڕاندی، پاڵێکی بە کابراکەوە نا، لە بەردەم دایکی نوشتایەوە، لێ لەبەر دەستە کەلەپچەکراوەکانی نەیتوانی باوەشی پێدابکا. ئەوسا یەکێک لە کەسە چەکدارەکان قۆنداغە تفەنگێکی لە لاجانگی بابە دا. تامی خوێنی خۆی کردەوە. دەستی لەرزۆکی دایەش لەسەر ڕوومەتی کوڕەکەی گیرسانەوە.

لەو شەوەدا، پۆلیسی نهێنی دوو کتێبی سیاسیی قەدەغەکراوی لە ماڵەکەدا دۆزینەوە، ئەمەش تاکە بەڵگە بوو لەسەر تاوانە گریمانەکەی بابە، بە هۆیەوە چوار ساڵ لە کونجی زیندانیان پەستا، بێ ئەوەی حوکمێکی ڕوون و ئاشکرای لەبارەوە بدەن، لەگەڵ دنیایەک ئەشکەنجە بۆ دانپێدانان، کە نەخشەی وڵاتێکی نەبوویان لەسەر پشتی جێهێشتبوو.

کاتێکیش دایکە، دایەی گەیاندە نەخۆشخانە، لەوێ ئەو پیرەژنە خوێنلەبەرچووەیان پشتگوێخست، چونکە جلوبەرگی کوردی لەبەردابوو، هەروەها یەک وشەی فارسیشی نەدەزانی. ژنە بەتەمەنەکە چاوەڕێ و هەر چاوەڕێ بوو، چاوەڕێی دەکرد تیمار بکرێ، چاوەڕێی دەکرد نیشتمانەکەی ئازاد بکرێ، چاوەڕێی دەکرد ڕۆڵەکەی بۆ بگەڕێتەوە، لە چاوەڕوانی و لە تاوان دڵەکەی لە لێدان کەوت. لەبەر ئەوەی کوڕەکەشی لەپشت شیشەبەندی زینداندا بوو، ئەگەرچی بەڵێنیشی پێدا بوو، لێ نەیتوانی تەرمی دایکی بباتەوە هەڵەبجە و لەتەک مێردەکەیدا بە خاکی بسپێرێ.

## بەندی شەش

ژمارەی دانیشتوانی شارەکەمان دوای هەڵاتنی ئاوارەکانی عێراق لە جەنگی دوای لەشکرکێشی ئەمریکا بۆ سەریان دوو هێندەی لێهات. زۆر لە دراوسێکانمان داڵدەی ئاوارەکانیان دا. ئێمە وەهامان نەکرد. ئاخر ماڵی ئێمەی ناتەبا بۆ خۆی نەبوو، چ جای میوانی نەناسیاویشی بێتەسەری. شلێر وەک خۆبەخشێک لە ئۆردوگایەکی سەرسنوور کاریدەکرد. لەو ڕۆژانەدا و بەتایبەتیش جینگەنە و شەڕانگیز بووم بەسەر ئەو کیژوکاڵانەم دەشیراند، ئەوانەی گاڵتەیان بە جلە مۆدیل کۆنەکان و پێڵاوە بۆرەکەم دەکرد و ئەو پیاوانەش کە وایاندەزانی من لەو جۆرە کچانەی چاولەدەرم و بۆ ژوان دەچمە دەرەوە. خۆ ئەگەر کەسیشم لەلا نەبووایە تووڕەیی خۆمی بەسەردا بڕێژم، ئەوا بەسەر ئەو کتێبانەدا هاوارم دەکرد، ئەوانەی لەگەڵ بیرکردنەوەی من نەدەهاتنەوە.

ئێوارەیەکیان دوای ئەوەی دایکە لەسەر سووتاندنی شێوی برنج سەرکۆنەی کردم، خۆم ترنجاندە هۆدەکەم. "لێ من دەبێ سەعی بکەم. ئەوە ئەرکی منە. هەر ئەو کارەیە پێویستە ڕایبپەڕێنم."

دایکەش وەڵامی دامەوە: "تۆ هەر بایەخ بە خۆت دەدەی، تۆ بوونەوەرێکی خۆپەرستی."

"باشە بۆچی داوا لە کوڕە خۆشەویستە نازدارەکەی خۆت ناکەی دارێک بخاتە سەر بەردێک؟"

"ئەو خوێندنی لە پێشە."

قیژاندم: "ئێ، ئەمنیش!" دەنگم بە نێو خانووەکەدا دەنگی دایەوە.

"خۆت منداڵ مەکەرەوە. بە باوەڕنامە و بێ باوەڕنامە، تۆ هەر دەبێ ئەوە بکەی، کە هەموو ژنان دەیکەن. باشتریشە بە چاکی بیکەیت."

پارچە پەمۆیەکم خستە گوێچکەم و لە پەراوێزی کتێبێک نووسیم "سەعات ٩:٢٨ ی شەو" پەراوێزی و دەستم بە نموونەیەکی خۆتاقیکردنەوە لە ئەدەب کرد، ئەو تەنیا بابەتەی تێیدا نمرەیەکی باڵام بەدەستهێنابوو.

چیا بە خۆی و جانتای کۆڵەپشتەکەیەوە هاتە ژوورەکەم، بۆنێکی لێدەهات، بۆنی کوڕوکاڵێکی پازدە ساڵی، کراسە زەردە ناشیرینەکەشی لەبەریدا زۆر گەورە بوو.

بە بۆڵەبۆڵێکەوە گوتم: "توخوا لە ژوورەکەم بڕۆ دەرێ، تۆش!" ئاخر ئەو چیدیکە شیرین نەمابووەوە، هەر هیچ نەبێ لە چاوی من.

ئەویش دەستی بەرزکردەوە وەک گاڵتەپێکردنێک بەوەی خۆی بەدەستەوەداوە گوتی: "دەی، ئەمجارەیان چی قەوماوە؟"

"ئەمجارە چی بووە؟" بەدەم ئەم قسەیەوە پەمۆکەم لە گوێکانم دەرهێنا. "پرسیارەکە ئەوەیە جا کەنگێ چی نەبووە؟ کەنگێ؟" ئاخر دووجار شکستهێنان لە تاقیکردنەوەی نیشتمانییدا واتای ئەوەی دەگەیاند ئایندەکەم تەنانەت لە ئایندەی دایکیشم تارماتر بێ، هەرهیچ نەبێ خۆ ئەو توانیبووی کەمە داهاتێک مسۆگەر بکا. ئاخر کوانێ بە بڕوانامەی خوێندنی دواناوەندی دەمتوانی کارێکی شایستە

بەدەستبێنم کە لە لایەن بابەوە پەسندبێ. لە شارەکەشدا دەنگودۆ لەبارەی سکرتێرەکان و ئەوەی لەگەڵ بەرپرسەکاندا دەقەوما، باوبوو.

چیا خۆی لە گوورە نەبرد. "بەڵام خۆ ئەمە شتێکی نوێ نییە، وایە؟" ئەو کتێبە لەسەریەک هەڵچنراوەکانی دەربارەی فۆتۆگرافی و مێژووی فیلمی هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن. لە پارەوە هێندی گوێ لەگلەیی و گازاندەم لەبەخت و نیوچەوانی خۆم گرتبوو گوێی پڕ ببوون.

"جا کوا تۆ بەخەیاڵت دادێ، خۆ تۆیان هەڵنەگرتۆتەوە! ئیدی واتدەزانی دایبابمان تەنێ دایبابی چیا بن، نەک هی منیش.

پێکەنی. پێکەنینی هۆشمەندێک بە گەلحۆیەک: "هەر بەڕاستی لە دڵەوە ئەم قسەیە دەکەی؟"

"پەککوو... بۆنی جگەرەت لێدێ، بۆگەن بووی. تۆ دەبێ زووزوو خۆت بشۆی." منیش وەک نواندنێکی سەر شانۆ بە دەستێک کەپووی خۆمم گرت و بە دەستەکەی دیکەش گوایە بۆنەکە دەڕەوێنمەوە.

"خوشکێ، چەند شتێکی سەرسامکەرم بۆت هەیە، هانێ. ئەوسا چیا جوامێرانە کۆنە هێدفۆنەکەی خستە گوێمەوە. منیش مەراقبووم بزانم ئاخۆ هەر بە راستی ئەو کارە جاران هیچ ئاسوودەییێکی دەبەخشیە چیای زارۆک کە ئێستا ڕێگەیەکی بێ بۆ دڵدانەوەم، یاخود هەر هەوڵێکی ڕووکەشیەتی بۆ ئارامکردنەوەم. لە هەردوو باریدا خەنیمەوە و لە قسەڕەقیەکەشم پەشیمان بوومەوە.

"دەی با شتێک لە ژوورە بێزارکەرەکەت بکەین." ئەوە بوو هەندێ پۆستەری لوولدراوی لەنێو جانتاکەی دەرهێنان.

بە تاڵییەکەوە گوتم "هەموو مامۆستاکان پێیاندەگوتم زیرەکم. لێ هەر کە دەستمکرد بە ماڵداری، ئیدی خوێندن و موێندنم لێتێکچوو." یان لەو ڕۆژە تێکچوو، کە کەوتمە سەر سووڕی مانگانە.

"تۆ دەبێ واز لەو هەموو هەرایە بێنی و تیشکۆی هزری خۆت بخەیتە سەر خوێندنەکەت."

"ئەرێ هەر بە ڕاست، ئەوە لای تۆ بایەخی هەیە ئاخۆ ژنێک خوێندەوار بێ یان نا؟"

ئەو هاتە پێشەوە، لەپەکانی خستنە سەر مێزەکە. "قسەی قۆڕ مەکە! هیچ شتێک لە خوێندن بایەخدارتر نییە. نەتایبەتیش بۆ ژن."

"بایەخەکەی لە چیدایە؟" منیش هەردوو باسکم لەیەک ئاڵاندن و درێژەم بە قسەکەم دا؛ "ئەوەتانێ دایکەش خوێندنی تەواوکردووە. بابەش خوێندنی تەواوکردووە. نامەوێ وەک ئەوانم لێبێ. نازانم هێستا نازانم ئاخۆ ببمە چی. هیچ بژاردەدەیەکم لە بەردەمدا نییە."

چیا بە هەڵواسینی پۆستەرەکان بە دیوارەکەوە سەرقاڵ بوو.

"دەبوایە لەگەڵ شلێر ناوی خۆم نووسیبا و چووبام مشووری بریندار و ئاوارەکانی شەڕی عێراقم خواردبا." بە ڕاستیش باکم بەوە نەبوو ئاخۆ لەوێ دەمرم یان نا، خۆ کەسیش باکی پێنەبوو. ئەگەر هەر شتێکیش قەومابا، لەکۆڵ هەمووان دەبوومەوە.

چیا بە گوتنی "ئەهاااا..ها.. ئەمەسیام ... ئەو!" لە بەرانبەر دیوارەکەدا هەنگاوێک کشایەوە دواوە. دوو پۆستەرە نوێیەکەم هی

شاعیرەکان و وشەکانیان بوون. -شێرکۆ بێکەس و شیعری: "**خۆ ئەگەر خوا تەنیا بۆ چەند خولەکێک کورد بووایە** و هی کەژاڵ ئەحمەد "ئافرەت و کوردستان: **ئەم جووتە چەند بە یەک دەچن.**"[٤٣]

"دەلالێ من[٤٤] زۆر سوپاس. زۆر بەلامەوە جوانن."

دەنگی پێیە قورسەکانی بابە لەسەر پەیژەی هەورەبانەکە ساتە شادمانییەکەمی تارکرد.

چیا بە خەندەیەکی بیژمۆتانە گوتی: "من ئەو شەو وای لێدەکەم دانیپێدابنێ." دەنگیشی بە شێوەیەکی مەکرۆیانە دەرهات.

"تۆ پێتوایە بابی پێویست مەست بێ؟"

"سەدام حوسێن لەسەر تەخت لادراوە."

بابە لەبەر دەرکەی هۆدەکەم پەیدابوو، داوایکرد بەڵکو کراسەکەی بۆ ئوتوو بکەم. هەر هەمان بۆنی هێورکەرەوە و بۆنی هەمان سابونی جاران، هەر شوێن قامچی پشت و سەرشانی لەبن فانیلەکەیدا بە بێدەنگی نیشانەی ژان و ناسۆرە هەمیشەییەکەیەتی. لەگەڵ ئەوەشدا وەک جاران تووڕەیی پێوە دیار نەبوو.

چیا چاوی لێداگرتم و بە دوای باوکمان لە هۆدەکەم دەرچوو. منیش بە دوایدا سایەم کرد، هەر لە دوورەوە لە شیپانەی دەرکەی ژوورەکەمدا چاوم لەسەریان بوو تا گوێیان لێبگرم. چیا لەتەک بابەدا لە ژووری میوان دانیشت، ئەویش هەر دەستی لە دوگمەکانی رادیۆ کۆنەکەی وەردەدا.

---

[٤٣] ئەم سەردێرەی هۆنراوەیە هی قەسیدەی نەء، دیوانی بەندەری بەرموزدای کەژاڵ ئەحمەدە، لە ١٩٩٩ چاپکراوە.

[٤٤] delala min

چیا بەم شێوەیە سەری قسەی داهێنا: "کەواتە لە کۆتاییدا، بکوژی ئەو هەموو کوردە ڕووخا."

منیش لە مێشکی خۆمدا ئەوەم بۆ بابە زیادکرد؛ *جەلادی ماڵباتەکەی تۆ، هی شارەکەی تۆ.*

براکەم لێیپرسی: "ئەرێ بە بۆچوونی تۆ کامەیان خوێنڕێژتربوو، خومەینی یان سەدام؟"

بابەش ڕووی خۆی بۆ لای چیا وەرگێڕا و بەرسڤی پرسەکەشی نەدایەوە- ئاخر چۆن دەتوانێ؟ ئێران باشترین دۆست و دوو لە برایەکانی لە قەنارە دابوو. عێراقیش مام و براکانی لە کوشتارگەکەی ١٩٦٣ کوشت و ئەو برایەشی مابووەوە لە ١٩٩١دا کوشت.

پیرەباوکمان چاوەکانی لەیەکدان و نووقاندنی. "گوێبگرە! ئێستا ئێران، تورکیا و سوریا تۆقیون. ئەوان گوشاری زیاتر دەخەنە سەر کوردی لای خۆیان." بابە ئاماژەی بە سندوقە دەنگ گوێزەرەوەکەی دا، کە بێجگە لە هەمان ویزەویز هیچی لێ دەرنەدەچوو. ئینجا سەرێکی ڕاوەشاند: "ئای لە کوردی بێ دەوڵەتی بەستەزمان!"

چیاش پرسی: "بابە، ئەرێ هەموو کورد بێ دەوڵەتن؟"

"تۆ لەبارەی کوردەکانی سوریا هیچ نازانی، ئەوان تەنانەت حاشا لە ڕەگەزنامەشیان کراوە؟" بەم قسەیە بابە ڕادەی زانیاریی کوڕەکەی لەبارەی کوێرەوەریی کوردەوە پێوا، بەڵام ئاخۆ چۆن ڕەچاودەکرێ ئێمە مێژووی خۆمان بزانین لە کاتێکدا مێژووەکەیان لە کتێبی قوتابخانە سڕاوەتەوە و میدیاکانیش فێرە شتێکی دیکەمان دەکەن؟ پرخەی دایکە لە هۆدەکەی خۆی و غژەغژی ڕادیۆ وایکرد

بە ئاسانی گوێم لە قسەکەیان نەبێ. "هەواڵەکان دەڵێن گوایە سێ سەد هەزار کەس دەبن، بەڵام من دڵنیام لەو ژمارەیە پترن." ئیدی خۆ ئەو نە چیای دەبینی و نە ئەو مافوورەی کە دەستکردی دایکی بوو، لەبەر پێی ڕاخرابوو. "منداڵانی ئەو گەلە بێ دەوڵەتە بێ ڕەگەزنامەشن. ئەوان کڵۆڵترین کڵۆڵن. هەر هیچ نەبێ خۆ تۆ بڕوانامەیەکی لەدایکبوونت هەیە، ئەوان ئەمەشیان نییە."

بابە وازی لە ڕادیۆکە هێنا و تەلەفزیۆنی پێکرد، هەر دەستبەجێ کاتێ بینی مەلایەک خەریکی وتاردانە لە سەر "هێرشی کلتووری لە ڕێی نرخاندنی تێکەڵاوبوون و تلیاک" بۆ لاوە بێباک و بێخەتاکان، یەکسەر گۆڕی و کەناڵەکانی دیکەش هەر مەلایان نیشان دەدا، یان خوێندنەوەی قورئان بوو. هەروەک پیشەی خۆی، بابە تفێکی لە شاشەکە کرد، نەفرەتی لە مەلاکان کرد، ئینجا تەلەفزیۆنەکەشی کوژاندەوە. هەر وەک هەمیشەش تووڕەییەکەی منیشی توندکرد، هەرچەندە بە دزییەوە گوێم لە گفتوگۆکەیان دەگرت.

چیا دەستێکی لە گەڵای گوڵە زەمبەق دا، کە بابە خزمەتی کردبوو. "ئەرێ ئەوان بۆ ئەشکەنجەی خەڵکێک دەدەن، کە هیچ تاوانێکیان نەکردووە و هەر بە تەنیا باوەڕیان بە شتێکی دیکەیە لەوەی پێیان گوتراوە؟" براکەم بڕبڕەی پشتی ڕاستکردەوە و بە چوارمشقی لەسەر مافوورەکە لە بەرانبەر باوکم دانیشت وەک ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکا ئامادەبێ بۆی ڕوونبکاتەوە.

بابەش کەساسانە سەیرێکی کوڕەکەی کرد، پاشان ڕووی خۆی لە شاشە ڕەشەکەی تەلەفزیۆنەکە کردەوە. شاشەکەش سەرەکەچەڵەکەی و دوولینگە فشوفۆڵەکە و فانیلە بێقۆڵەکەی

ڕەنگدایەوە. دەستی گەیاندە ڕۆژنامەیەک و لاپەڕەکانی هەڵدایەوە. "پڕوپاگەندەیەکی بۆگەن!" ئینجا فڕێیدایەوە و بە قامکی دۆشاومژەی سمێڵی خوراند.

چیاش بەختی خۆی تاقیکردەوە: "ئەرێ بابە کاتێ لە زیندان بووی، چی ڕویدا؟"

ئەویش گوتی: "لە نیوەی شەودا، ناوەکانیان دەخوێندنەوە. ئێمە لە قاوشێکدا هەشتا هاوڕێ بووین، هەندێک جار زیاتر و هەندێک جاریش کەمتر. هەر کەسێک دوای خۆرئاوابوون ناوی بخوێنرابایەوە هەرگیز نەدەگەڕایەوە."

من لە شوێنێکی پەناو نادیار لە چاوی ئەوان، گوێم هەڵخست. نیگای بابە لەسەر گوڵە چنراوەکانی سەر بەڕەکە بوون، دەربڕینەکەی بێلایەنانە و وەبیرهێنەرەوانە بوو. ئەویش لەسەر گێڕانەوەکەی خۆی ڕۆیشت: "ئێمە دەبووایە گوێبگرین و بەر لە خۆرهەڵات ژمارەی گوللە تەقێنراوەکان بژمێرین و بە چەنگاڵیش بەروارەکە و ژمارەی قەبڵێنراوی تیربارانکراوەکان لەسەر دیواری زیندانەکە هەڵبکۆڵین."

من خۆم توند بە لادەرکەکە گیرساندبوو، براکەشم لە شوێنی خۆی ڕەق لێی دانیشتبوو.

بابە بە پشوودرێژی درێژەی بە قسەکەی خۆی دا. "هەر جارێک دەنگ لە بڵندگۆکەوە دەهات، هەر کاتێک پاسەوانەکە بڵنگۆکەی پێدەکرد تێدا بانگی دەدا، کاتێک یەکێک ناوەکەی بە *ئا* دەستپێدەکرد...." وەستا و سەیرێکی چیای کرد، نیگای بەنێو چیادا ڕەتبوو وەک ئەوەی چیا هەر لەوێ نەبووبێ. "ئەو کەسەی بانگ

دەکرا، هەر هێندە کاتی هەبوو تا ئەو کەلوپەلەی هەیبوو بداتە دۆست و هاوزیندانەکانی، شتێک ئەگەر کەڵکی هەبووایە. کراسێک، جووت پێلاوێک، شانەیەک. دەکرا داوای ئەوەش بکا بەڵکو شتێک بۆ دایبابی، بۆ ژنەکەی یان منداڵەکانی وەک ڕۆژژمێرەکەی، وێنەکەی، دەستکردێکی کە بە هەویرە بەکەڵکنەهاتووەکەی سەمونە ڕەقوتەقەکەی دروستی کردبوو بنێرێتەوە. ئینجا برادەرەکانی....'

بابە چاوەکانی لەسەر یەک نووقاندن، بە ددانیش لالێوە بێ خوێنەکەی گەست. 'دوای ئەوەی پیاوەکان دەبردران، برادەرەکانی مۆمێکیان دادەگیرساند ئەویش ئەگەر هەیانبووبا، دەنکە خورمایان دابەش دەکرد ئەگەر هەیانبووبا، فرمێسکیان هەڵدەڕشت ئەگەر فرمێسکیان لە چاودا مابووبایە. ئیدی ئەم جۆرە شتانە. ئەوان بە یەکەوە ئەو کەمە شتانەی لە دوای لە سێدارەدراو بەجێدەما کۆیاندەکردەوە، ئیدی وەک بەخاکسپاردن و ڕێزلێنانێک لە شوێنێک دایاندەنا ئەو شوێنەی هەموومانی لەناودەبرد.'

چیا قورگی خۆی خۆشکرد و بە دەنگێکی گڕەوە پرسی: 'باشە کاتێک برادەرەکەیان دەبرد ناخۆشترین شت چی بوو؟'

باوکم سەیرێکی دووری کرد، دەموچاوی خۆی خوراند، قامکەکانی لەسەر لاجانگی خۆی گیرساند وەک ئەوەی تیشکۆی بیری بخاتە سەر شتێک. حەزمدەکرد بچم و پەرداخە ئاوێک بۆ بابە ببەم، ئاخر لێوەکانی وشک بووبوون، بەڵام وامنەکرد و لە شوێنەکەی خۆم نەبزووتم. 'جارێکیان کابرایەک بە جلی مەدەنییەوە و چرایەکی لە دەستدابوو هاتە ژوورەوە.' سیخە سیخێک لە

سینگییەوە هات. ڕووی بۆ لایەکەی دیکە وەرسووڕاند. یادەوەرییەکان هورژمیان بۆ هێنا.

منیش لە جێوە هەناسەی خۆم ڕاگرت، ئاخر نەمدەویست تاکە وشەیەکیشی لە دەست بدەم.

"پیاوەکە سێ پاسەوانی بە دواوە بوون، دیاربوو ئاژانێکی ئیتیلاعات بوو."

چیاش بەدەم هەناسە هەڵمژینەوە: "دەزگای هەواڵگری."

بابە درێژەی بە قسەکەی دا: "کاتەکە لە نیوەی شەو لایدابوو و چراکانی زیندانیش هەر هەمووی کوژابوونەوە. ئێمە ئەوکات نزیکەی دوازدە هاوزیندانی بووین، مێردەکەی جوانەشمان لەگەڵدا بوو. هەر ڕۆژێکیش پاشتر کیژەکەیان لەدایک بوو. فەرمانمان پێکرا هەڵبستینەوە و بە ڕیز بوەستین، ئیدی کاتێ ئەو کابرایە بە بەردەمماندا ڕادەبورد چرای لە دەموچاومان دەدا. ئەو بە پەنجەی ئاماژەی فەرمانی بە زیندانییەکی بەدبەخت کرد لە ڕیزەکە بۆ پێشەوە بڕوا. ئینجا چرا کوێرکەرەکەی لە چاوی منیش دا. منیش چاوەکانی خۆم داخستن و چاوم لەیەک دان. لە بەرتەکدا..." لێوی بابە شۆڕ بووەوە، قسەکەی دەخواردەوە و نەدەبیسترا.

دڵم لەو کاتەدا زۆر خێرا لێیدا، ئاخر دەترسام قسەکەی بخواتەوە و وشەکەی دواتری نەبیستم.

چیا بە هێواشی دنەی دا: "ئینجا؟"

بابە ئاخێکی هەڵکێشا، قووڵترین ئاخ. "هەر چۆنێک بێ دێوەزمەکە بڕیاریدا بەرەو ئەوی دیکە بجووڵێ و لە ڕیزەکە دەریهێنا. ئەو هەر

خۆشی بە ناوی زیندانییەکان ماندوونەکرد، گوێی بە فایلەکانیش نەدا. ئەو سەگبابە دەیزانی هەرچی بکات بۆی دەچێتە سەر و کەس یەخەی ناگرێ، کەس لێناپێچێتەوە. خۆ دەکرا فەرمان بە داگیرسانی چراکان بکا، کەچی وای نەکرد. زۆریش بێ باک بوو. ئەوێ شەوێ هەشت کەسی بردن."

سیمای بابە ڕێک هەڵات، هەناسەکەشی ئەوەندە تەنگ بوو هەستمکرد گەڕاوەتەوە ئەوێ و لە ترسوتۆقینەکەی هەینێدا دەژی.

"باشە هەرگیز خەبەری ئەو هەشت کەسەت زانیوە، کە باوکی شلێریش یەکێ بوو لەوان؟"

"ئەویش بوو. ئەوان لە لەعنەتاوا لەگۆڕنران." بابە چاوەڕێی ئەوەی نەکرد تا لە واتای لەعنەتاوای لێبپرسێ. هەر بەخۆی گوتی: "شوێنە نەفرەتلێکراوەکە. ئەو گۆڕە بە کۆمەڵەی دوای ئەوەی زیندانییەکانی لە سێدارە دەدران، یان لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا دەمردن، یاخود یەکێک کە دەفرێنرا و شوێنبزردەکرا، یان کە خێزانەکانیان پارەی گوللەکانیان پێنەدەدرایەوە... تۆ بێنە بەرچاوی خۆت... کاتێک ئەوان یەکێک گوللەباران دەکەن، داوای قەرەبووکردنەوەی گوللەکەشیان لەماڵباتەکەی دەکەنەوە بەر لەوەی تەرمەکەیان ڕادەستبکەنەوە. کوردستان پڕیەتی لە گۆڕی بە کۆمەڵی وەها، هەمووشیان پێیاندەگوترێ لەعنەتاوا."

پشوویەکی درێژی بە دوادا هات. ئینجا بابە تێهەڵچووەوە: "هەموو ئەو شتانەیان کرد. تەنانەت لاقەی ئەو ژنانەشیان کرد، کە بڕیاری مەرگیان بەسەردا درابوو، چونکە لەو بڕوایەدابوون کیژە پاکیزەکان دەچنە بەهەشتێ و ئەوانەش نەیاری دەوڵەت بوون هەر

دەبووایە بچنە دۆزەخێ. ئەوان ئەو کارەیان پێ لاقەکردن نەبوو. پێیاندەگوت مارەبڕین، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێ لە ڕووی دیینەوە پەسەند بێ. ئەوان بڕوایان بەو هەموو ئەو شتانە هێنابوو، یاخود لەوانەیە باوەڕیشیان نەهێنابێ، بەڵام خۆ دەیانزانی ئەمە گەمەی دەسەڵات و چێژە، ئەمەشیان نەدەزانی؟ قابیلە نەیانزانیبێ!"

چیا بە دەنگێکی گڕەوە گوتی: "بابە، بەڵێن دەدەم ڕۆژێک دابێ ببمە پارێزەر و هەموو ئەوانە بهێنمە بەردەم دادگا."

بابەش بە دەربڕینێکەوە، کە هیچی بە سەر ڕوخسارەوە دیارنەبوو، سەیرێکی دووری کرد. ئینجا لە هیکەوە گەڕایەوە سەر ڕۆڵەکەی. "لێ هەمیشە بە ڕۆژ ناوی منیان بانگ دەکرد. تۆ پێتوایە من کەسێکی بە بەخت بووبم؟"

چیاش نەیتوانی وەڵامی بداتەوە.

لێوەکانی بابە بە تەوسێکی تاڵاو لەرزین. "بەڵێ دەبینم تۆ وا دەکەی. هەموو ئەوەی دەرهەق منیان کرد قامچیکوتانم بوو و ئینجا بەرەڵایان کردم. بەرەڵایانکردم تا ئاوا بژیم کە دەمبینی، وەک سەگێک تا بۆ بەرماوێکی خواردن بۆ منداڵەکانی بنووزێتەوە. کوڕم، تۆ لە من تێناگەی. منیش گەنج بووم، هیوام هەبوو، باوەڕم وابوو ئەگەر زۆر ڕەنج بدەم تێبکۆشم شت دەگۆڕم. خەونم ئەوەبوو لە بڵندگۆدا چیرۆکەکان بۆ سەدان کەسی بە تەمەن، ئەوانەی لە نێو چیمەندا پاڵیان دابووەوە، بگێڕمەوە. تۆ بڕوا ناکەی، بەڵام وەختایەک منیش خەونبینێک بووم ئەمما خەوەنبین. ڕۆڵە، دەزانیچی؟ شکۆیەک لە مردندا هەیە هەزارجار گەورەترە لەوەی لەم جۆرە ژیانەی مندایە."

ئەو قومێکی لە بوتڵە عەرەقەکە دا، کە ئاخنیبوویە گۆشەی قەنەفەکە، ئینجا هەڵسا و بەرەو پەیژەکانی هەورەبانەکە ملی نا. کاتێک بە لای هۆدەکەمدا تێپەڕی، چاوی لە من نەکرد، لە سێبەرەکەیدا کووڕ دیاربوو. کەواتە زانی من هەموو وەختەکە بە دزییەوە گوێم لێڕاگرتبوو. چیاش هەر لە شوێنی خۆی دانیشتبوو.

بە هێواشی دەرکەی هۆدەکەم پێوەدایەوە و پلاکی ئوتووەکەم لە کارەبا گرت. کاتێ ئوتووە قورسەکەم لەسەر کراسێکی ڕەنگتاریکی باوکم دەسووڕاند، دەستم لەرزین. لەعنەتاوا.

بەبێ جیاوازی قامچی شوێنی خۆی لەسەر پشتمان دیاریکردووە. ئوتووەکەم لە لایەک دانا، کراسە گەرمەکەی بابەم لە باوەش گرت و بۆنەکەیم هەڵمژی. فرمێسکەکانم پەڵەی ڕەشی لەسەر جلەکانی دروستکرد.

خۆی، هەرێمەکەمان یەک گۆڕێکی بە کۆمەڵی گەورە بوو: دەهات. هەندێکیان بە بێدەنگی لێیکەوتبوون، هەندێکیشیان لە ژێر خاکەوە هاواریان دەکرد.

باوکم هەروەک کوردە بێ فریادڕەسەکانی ئێران، وەک ئاوارەکانی عێراق، وەک بێهیواکانی تورکیا و وەک بێ ڕەگەزنامەکانی سوریا پێویستی بە تیمارکردن هەبوو.

## بەندی حەوت

من بەر لە خۆرهەڵاتن لە خەو هەڵسام و دەستم بۆ سویچی گڵۆپەکە برد. ئەمرۆش ڕۆژەکە بوو. ئەنجامی وەرگیران لە زانکۆکان لە ڕۆژنامەی ناپێشچاو و کەمتیراژ بڵاودەکرێتەوە. چارەنووسی من و چیا بە پیتی ورد لە لیستەکاندا پرێنت دەکرێ. هەر ساڵێک گیۆمەتری و جوگرافیام دەخوێند تا بەشداری لە تاقیکردنەوەی نیشتمانیی، لە کۆنکوردا بکەم، بەڵام بێهوودە دەردەچوو. ئاخر هەر تەنیا زانکۆ ئەهلییەکان ڕێگەیان بە من دەدا تیایاندا بخوێنم، ئەوانیش گران بوون. ئەمەیان دوا جارە بەشداری لە کۆنکۆردا بکەم و چیاش یەکەمین جاریەتی. خۆ ئەگەر ئەمساڵ نمرەی شایستە نەهێنم، ئەوا دەبێ بوەستم چیدی خۆم گێل نەکەم. ئەگەر ئەویش دەرنەچێ ئەوا بۆ سەربازی پەلکێشی دەکەن.

خەوم لێنەدەکەوت، خەریکی پێچانەوەی دیارییەک بووم، کە بۆ ڕۆژی باوکانم کڕیبوو. ئەوە سێ ساڵی ڕەبەق بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕی، کە بابە چیرۆکی زیندانییەکەی بۆ گێڕاینەوە- هۆکارێک هێشتا هەر دەستم پێوەی گرتبوو تا دیارییەکی بۆ بکڕم- هێشتاش کە یادی ئەو ڕۆژە و گێڕانەوەی چیرۆکەکەی دەکەمەوە، فرمێسک بە چاومدا دێنەخوار. لەو کاتەشدا کەس بە ڕاستی ڕۆژی لەدایکبوونی بابەی نەدەزانی، دەبوو چاوەڕێی زۆر بۆنە بکەم، تا نیشانی بدەم ئاخۆ چەند مشورخۆری بووم. دایکی ئەو، ئەو ژنەی هەموو ساڵیکی بەشێکی هەرە گرنگی تەمەنی، منداڵێکی دەبوو،

گوتبووی بابە لە بەهاری ساڵی لافاوەکەدا هاتووەتە سەر دونیایێ. ئەمە هەموو ئەو شتە بوو، لەبیری مابوو. بڕوانامەی لەدایکبوونی برایەکی، کە کەوتبووە دەستی باوکە دوای ئەوەی ئەو ژیا و نەمرد، ئیدی بووە مێژووی لەدایکبوونی خۆی. کۆرپەکەی دیکەش هەر ناوی ئالان بوو.

بەبێ دەرچوون لە کۆلیژێکی زانکۆ، نەمدەتوانی خۆم ڕابگرم چ جای ئالایەک هەڵبگرم.

وێڕای خۆگریم ڕیزە فرمێسکێکی یاخی بەسەر ڕوومەتمدا هاتنەخوار، بەسەر کاغەزی پێچانەوەی دیارەکەدا کەوتن، ڕۆخی قامکەکەمی کەسک کرد، کە ڕەنگی دڵخوازی خۆم بوو، ئەو ڕەنگەی دنەدەری ژیانە کەساسەکەم بوو. پەنجەم گرت و خستمە بن شێرەی ئاوی دەستشۆرەکە، لە ئاوێنەشدا نیگام لە نیگای بابە گیربوو. دەرودراوسێ و خزمان دەیانگوت زوو زوو دەیانگوت تۆ چوویتەوە سەر باوکت، بەڵام خۆ ئەوە یەکەمین جار بوو پێکچوونێکی وەها سەرسامم بکا. خۆ ئەگەر لەوە تێگەیشتبا، کە چۆن کیژەکەشی زیندانی خۆیەتی، چۆن بە دەستبەسەری لە ماڵدا دەمایەوە.

بە کورتکردنەوەی پرچم بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ مانگەکانی گەرمای هاوین و شاردنەوەی پرچم لەبن سەرپۆشدا، هەر بە نێرەموکێک دەچووم، ئەمەش بە پێچەوانەی خەپەیی شلێر بە منداڵیی، کە تا گەورە دەبوو، لێیهات و بووبووە نیشانەی ژنایەتییەکی ڕێکوپێک. دیاربوو سینگوبەرێکی نەرمونیانی هەبوو، هەمیشەش بەو چاوە کێویانەی خۆی لە جاران نازدارتر

دەردەکەوت. لەو کاتەوەی لە کاری خۆبەخشیی کەمپی پەنابەران وازیهێنابوو هەندێ جار لە بازاڕ تووشی دەهاتم. لە قوتابخانەی گەوراندا دەستی بە خوێندن کردبووەوە.

پەڵە کەسکەکەی سەر پەنجەی ئاماژەم نەدەڕۆیشت. وام بۆ هات سەرتاپای جەستەم لە قووتووی بۆیەیەکی ئەو ڕەنگە وەربدەم و ببمە "ئافرەتی کەسکی دارستان". ئیدی دەکرا لە گۆڕەپانەکەی ناوشار بوەستم خەڵکیش پوول بخەنە ناو گۆزەکەی دەستم و خرینگەی لێوەبێت و خەندەیان بکەوێتە سەر لێو. پێویستیشم بە مێرد نەدەبوو. دەستم لەبن ئاوی ساردی شێرەکە گۆد بوو، بەڵام خۆ پەڵەکە هەر نەدەڕۆیشت مەگەر بە سابونم بشوشتبایە. ئەمەش بیرۆکەیەکی بۆ هێنام.

لەژێر پێخەفەکەمدا، هەندێ پارچە کاغەزی پەمەیی وەرپێچانم هێنا و خستمە نێو بادییەک و ئاوم بەسەرداکردن. ئینجا بە پارچە پەمۆیەکی بچووک، ڕووی خۆم بە بۆیەی پەمەیی ڕەنگ کرد. پێدەچوو سوورایەتی سەرڕومەتەکانم سروشتی دیاربن، ئیدی ڕوخسارم سەرباری قژکورتی و بازنەی ڕەش لەبن چاوەکانم هەندێک نازەنین دیاربوو.

هەر بە غار بە پەیژەکان بۆ هۆدەکەی بنهۆمێ بۆ لای چیا دابەزیم، مەراق بووم "مێکەپە" تەڕدەستەکەمی نیشان بدەم. بینیم ئەو دە نوێژێدا بوو. هەردوو دەستی بۆ ئاسمانێ بەرزکردبوونەوە، سەریشی هەندێک بۆ پشتەوە، چاویشی دابووە بنمیچە سپییەکە کردبوو، لێوەکانیشی دەجووڵان و ورتەورتی لێوەدەهات نەمدەزانی

نزا دەکا یان سکاڵا. دیسان وەها دیاربوو وەک ئەوەی لەسەر ئەم زەوییە هەر نەمابێ.

خۆم خزاندە ژوورەکەی، لەو گۆشەیە دانیشتم کە ڕووناکی لێ مابوو، بەڵام پاشاگەردانییەک بوو بۆ خۆی، ئیدی و لەسەر ڕۆژژمێرە کراوەکە شتێکم نووسی: "براکەم، هەر یەکێک لە ئێمە هەزار کەسی لە نێودایە، هەمووی لە ژێر یەک دەمامکدایە. هەر یەکەیان درەختێکی ئاڵۆزە بە چرۆ و دڕکەکانییەوە، پڕ لە هیوا، پڕ لە ئازار."

چیا دەستی گەیشتە گڵۆپەکە و پێیکرد، ئینجا وەک لێبوونەوە لە نوێژەکەی دەستێکی بە دەموچاویدا هێنا، بە بۆچوونی من ڕوخساری نووری لێدەباری، ئەمەش لە من بەدەر کەس نەیدەبینی. منیش گۆناکانی خۆم بە لەپی دەستەکانم شاردەوە. کیژی باش ڕووی خۆی وەها سوور ناکا. خۆی هەر تەنیا قەحپەکان شتی وەها دەکەن. کەس نازانێ دوایین جار کەنگێ بوو خوا گیانی من، مانگە خۆشەویستەکەی سەردەمی منداڵیم، ڕوویێکی خۆشی خۆی نیشاندام.

"ئامادەی؟" خۆی لە ڕوومەتە پەمەییەکانم لە گێلی دا.

"ماوەیەکە چاوەڕێم."

ئیدی بە هەشتاو خۆمان گەیاندە لای گەورەترین ڕۆژنامەفرۆشی شارەکە، حەشاماتێکی زۆریشی لێبوو. شەبەنگی هەڵاتنی خۆریش هێڵە تیشکێکی پەمەیی بە ئاسمانی سپێدەدەمدا بڵاوکردبووەوە.

کابرای فرۆشیار گوتی: "مردم هێندەی بڵێم کاکە، تا نیوەڕۆ ڕۆژنامەکە ناگا. خۆ ئەگەر کەسێکتان لە شارە گەورەکان هەبێ،

دەکرێ پێیبڵێن تا لە ڕۆژنامەکانا بۆتان بگەڕێ. بەردەم دوکانەکە مەگرن و قەڵەباڵغی پەیدامەکەن." کابرای فرۆشیار بۆ چۆڵکردنی پێش دوکانەکەی نەدەچووە بچمی ئەو خەڵکە بە هەراوزەنا و بێ حەوسەڵەیە.

چیا هەردوو دەستەکانی لە پشتەوە دانەبەر خۆ و پاڵی بە دیوارەکەوە دا. کاتێکیش سەعاتەکان تێدەپەڕین، منیش چاوم لە پەڵە هەورەکان بڕیبوو، کە لاملانە بەو تاوهەلاتە ڕەتیان کردەوە وێنەی چارەنووسەکەم بکێشن، بێ باک لەو جەنجاڵی و چاوەڕوانی ترسوبیمی ئاپۆرای خەڵکی سەر شەقامەکە.

کاتێکیش لە کۆتاییدا ڕۆژنامەکان گەیشتن، خەڵکەکە سەری بەسەر ئەو لاپەڕانەدا گرت، کە پاشناوەکانیان لەسەر چاپکردبوو. هەندێکیان لە ڕقی ئەوەی بە ئەنجامەکە ڕازی نەبوون لاپەڕەکانیان دڕاند. لە دواییدا هەر دە کەس بە سەر لاپەڕەیەکدا دابەش بوون، هەر یەک گۆشەیەکی ڕۆژنامەکەی ڕادەکێشایە لای خۆی وەک ئەوەی بکشێ. ئەوە بوو ڕۆندک داباریێن. قاقای پێکەنینی شێتگیرانە لێدران. یەک دوو دەنگی شاگەشکەبوونیش بەرزبوونەوە.

چیا ڕۆژنامەیەکی ڕاکێشا و لە ئاپۆرایەکە هەندێ دوورکەوتەوە. لەو کاتەی لیکە زەرداوم لە قورگم هەڵکشا، دەمم تامی پارەی ئاسنینی لێدەهات.

ئەو گوتی "سەرم دەسووڕێ." پەنجەشی بەرەو خوارەوەی لیستەکە، بۆ سەر ئەو ناوانەی بە (س) دەستیان پێدەکرد، داگەڕا.

نیگایەکی ترسناکانەی تێکردم و سەرێکی بادا. لێشاوێک لە ترسوتۆقین بیچمە هێورەکەی تێکشکاندم. کۆتا شکست بابەتێکی

دووبارەبووەوەی مۆتەکەی خەونەکانم بوو، بیرۆکەیەک بە هەموو توانستێکمەوە بە ڕۆژی ڕووناک لە خۆم دووردەخستەوە، بەڵام خۆ لە پەنای هەموو ساتێکمدا خۆی مەڵاس دابوو.

چیا بە سەردەستی کراسەکەی، دڵۆپە فرمێسکێکی خۆی سڕیەوە. منیش ڕۆژنامەکەم بۆ گرت، لاپەڕەکەی بە دیوارەوە گیرساند، هەوڵمدا قامکم لەسەر ناوەکان بگیرسێنم؛ ئاخر چەند سەد ناوێک سامان هەبوون. چەند جارێک چاوم تروووکاند. بینابیم لێڵ بوو.

یەکێک لە ناوەکانی تەنیشت سامان ناوی چیا بوو. چرپاندم: "تۆبڵێی خەون نەبێ."

قەدەری ئەو بە کۆدەوە لە تەنیشت ژمارەی ناسنامەکەی نووسرابوو. هەر تەنیا ئەنجامی تاقیکردنەوەکە بڕیاری لەسەر چارەنووسی قوتابییەکە دەدا؛ تەنانەت ئەوانەی لە زانکۆی گشتیی (میری)یش وەرگیرابوون، هیچی وایان لە بەرانبەر ئەو ڕشتەیەی بۆیان دیاریکرابوو، پێنەدەگوترا. چیا بۆ ماوەیەک لێی ڕاما، شانەکانی داتەپین، بۆ خۆگرتنەوە و هاوسەنگی ڕاگرتن پاڵی بە دیوارەکەوە دا.

"چیا؟"

دانەویە سەر زەوی و بە باسکەکانی دەموچاوی داپۆشی.

وێڕای ئەو هەموو سەعیکردنەی، وێڕای ئەو هەموو شەونخوونییەی زۆرەی، سەرباری هێنانی پلەی یەکەم لەسەر ئاستی قوتابخانەکەی، لەسەر ئاستی شار و پارێزگاکەش، کەچی نەیتوانی لەگەڵ قوتابیانی شارە گەورە و دەوڵەمەندەکانی دیکە، ئەو

قوتابیانەی بە ئاسانی کتێبی ڕاست و دروست و مامۆستای تەواو ڕاست و دروستیان دەستدەکەوت، کێبڕکێ بکا. لەسەر ئاستی نیشتمانی هەر قوتابییەکی ئاست مامناوەنجی بوو.

منیش؟ نەوەک هەر مام ناوەنجی، بەڵکو لە کێبڕکێیەکەدا، نمرەکەم هەر دیار نەبوو.

ئەو کچ و کوڕانەی هاوشانی ئێمە لەم بەیانییەدا لەبەردەم ڕۆژنامەفرۆشەکەدا چاوەڕوان بوون هەر یەکێک بە بێدەنگی خۆی کشاندە گۆشەیەک تا تاڵاوی شکستەکەی بکێشێ، ئەمەش دوای ئەوەی لە نێو خێزانە کرێکارەکەی خۆی و لە هەرێمە بەدبەختەکەماندا خەونی بە پاشەڕۆژێکی گەشترەوە دەبینی.

چیا لەوێ لە دڵشکاوەکان دوورکەوتەوە. منیش بە دوایدا چووم. بۆ ماڵەوە سواری پاس بووین، لە پاسەکەدا لەو شوێنانەدا کە هەردوو ڕەگەزەکانیان لێک جودادەکردنەوە، دانیشتین.

ئەو ئەوەی بۆ دەرچووبوو دەبێ زانستی سیاسەت بخوێنێ، کە گوێی پێنەدەدا، ئاخر ئەو حەزی لە خوێندنی قانون بوو. هەروەک بابەش دەبووایە بچێتە زانکۆی تاران. دەکرێ لەسەری بڕوا و تەواوی بکا یان وازی لێبێنێ، بێ دوودڵی حەزمدەکرد چارەنووسی لەگەڵدا بگۆڕمەوە. ئەم جارەیان من لە هیچیان وەرنەگیرام، تەنانەت لە زانکۆ ئەهلییەکانیش. لە نێو لیستەکەدا ناوی "لەیلا سامان" لە هیچ گۆشەیەکدا دیارنەبوو.

کاتێکیش گەیشتینەوە ماڵەوە، ویستم چیا بخافڵێنم. "دووسبەی خێزانێک سەردانمان دەکەن، دەکرێ یارمەتیم بدەی ژووری میوان پاکبکەینەوە؟" دایکم وەک پلانێکی لەناکاو ڕەزامەند بوو خوازبێنییێکی

نوێم بێت، ئەمەش دوایین هەوڵێکی بوو بۆ بە شوودانم، منیش دەستم بە دوا ترووسکەی هیواوە گرتبوو تا ڕێ لەم هاتنە بگرم، تا ناوم نەوەک هەر لە زانکۆی تاران، بەڵکو لە زانکۆی کوردستان یان لورستانیشەوە دەربچێ. بیرۆکەی دەستلێدانم لە لایەن پیاوێک کە حەزم بە چارەی نەدەکرد، ترساندمی، بەڵام خۆ چارەیەکیشم بۆ نەمابووەوە.

چیا بە بۆڵەبۆڵێکەوە: "ئەوان بۆ خوازبێنی تۆ دێن نەوەک هی من." ئەوە بوو بۆ هۆدەکەی خۆی ڕۆیشت تا بچێتە نێو پێخەفەکەی.

بە توورەییەوە چاوێکم لێکرد، مرومۆنییەکەی پەستی کردم. تۆ بڵێی تێنەگا ئاخۆ چەندم دەدا تا بکەوتمایە ڕەوشی ئەوەوە؟ زەمەن بەرەبەرە بەڵام بە ڕوونی تەنانەت بە فیزیکیش ئێمەی لەگەڵ یەک کردە غەوارە. پێستی نەرمی چیا بە مەلەی گۆلی زرێبار و یاریی تۆپی پێ لەگەڵ هاوڕێکانی لەبن هەتاوی پڕی کوردستان، بۆرەی هەڵگەڕاند. پێستی منیش لە تەنیاییدا زەرد هەڵگەڕا و ڕوومەتەکانیشم قۆرتیان تێکەوت؛ بە خراپی دەنوستم، لە بەر ئێشی ماسولکەکانیش لە خەو ڕادەبووم، پشتی چاوم ئازاری دەدام. چاوەکانی ئەویش هێشتا هەر دلڕفێن و دەمی منیش هێشتا گەورە. ئەو بەژندرێژ و سەرنجڕاکێش لە کاتێکدا من بەژنکورت و شڕوشەپرێو، سەریشم لەبەر پرچی لەگڕووزە و ناڕێکوپێک هەمیشە گرژبوو.

دیاربوو چیا لە هەراسانی دەموچاوم نیگەران بوو، بۆیە لە شوێنی خۆی هەڵسا، کتێبێکی لەبەرگ وەرپێچراوی دامێ: "هیوادارم ئەم دانەیەیان بخوێنیتەوە." کتێبەکەش وەرگێڕدراوی "ڕەگەزی

دووەم"ی سیمۆن دی بۆڤوار بوو، بە نرخی سێ ئەوەندەی کتێبێکی ڕێپێدراو لە بازاڕی ڕەشدا دەفرۆشرا.

منیش مەیلیم لێی نەبوو. مەیلم لە هیچ شتێکی ئەو و بابە، یانەی ئەو دووکەسە نەبوو کە پێی کارانگاز بوون.

"چیا،" وەها بانگم کردێ: "کتومت ئەو شتە نەبوو کە دەتەویست، بەڵام تۆ باشت هێناوە."

"تۆ تێناگەی. من ڕقم لە زانستی سیاسەتە. سیاسەت زانست نییە. دەمەویست ببمە پارێزەرێکی مافەکانی مرۆڤ."

"دەزانم. هێشتاش، هەر بە ڕاستی تۆ لە هەموو ئەوانەی لە نێو شارەکە دان، باشترت هێناوە." خۆم خواردەوە. "شانازیت پێوەدەکەم."

"نینۆکت خوێنی لێدێ" بەدەم ئەم قسەیەوە دەنگەکەی هەروەک ئەوە وا بوو کەسێک هەواڵەکانی ئاووهەوا بخوێنێتەوە.

"ئەهااا" نینۆکم بە پانتۆلە ڕەشەکەم سڕیبووەوە. "وا مەزانە دیسان نینۆکم کرۆشتووە." باوەشێکم بە چیادا کرد بۆ ئەوەی دڵنیای بکەمەوە لەوەی کە گوتم؛ چێژم لە دەستدان لە باسکە لاواز و بەتووکەکەی بینی، هەمان بۆنی ئاشنا و دڵنەوایيبەخشی چیا.

کە کشایەوە لەرزیم. مەودای هەست وسۆزەکەمان ڕەهەندێکی جوگرافیایی نوێی پەیداکرد.

"تۆ دەگرێی."

بە پشتەدەستی کراسەکەم دەموچاوم سڕی. بە دانگڕکردنەوە گوتم: "پێم وابێ فرمێسکی شادییە."

"خۆت وەها نمایش مەکە..."

"چی؟"

"پێمگوتی واز لە ئوتووکردن بهێنە و سەعی خۆت بکە، پێمنەگوتی؟ وام پێنەگوتی؟ بەڵام تۆ گوێت نەگرت. خۆ ئەوە هەڵەی من نەبوو..."

بە تاساوی لێی رامام.

"حەزم دەکرد بمدیتبای کە دەچوویە کۆلیژ، بەڵام خۆت ژیانی خۆت وێرانکرد و وەها جووڵایتەوە وەک ئەوەی من ناپاکیم لێکردبی بەوەی ویستبێتم هەر خۆم پێبگەیەنم."

"ئەوە باسی چی دەکەی؟"

"تۆ وام لێدەکەی هەست بکەم... تکایە تەنیا وازم لێبێنە." چیاش دەستی لە هەوادا ڕاوەشاند وەک ئەوەی مێشێک لە خۆی دەربکا.

"خۆ تۆ هێشتا خوێندنی کۆلیژت دەستپێنەکردووە، کەچی وەک لووتبەرزێک ڕەفتار دەنوێنی. هەر لەبەر ئەوەی من نەمتوانیوە.... تۆ مافی ئەوەت نییە سووکایەتیم پێبکەی."

" ئاخر بەجۆرێک تەماشام دەکەی." دەستی بەرزکردەوە و قامکەکانی بۆ ناولەپی بردنەوە وەک ئەوەی شتێکی نەبینراو بخورێنێ. "وا بە کەساسی تەماشام دەکەی هەستبکەم برایەکی هیچوپووچم، وەک ئەوەی ناپاکیت لێبکەم بەوەی لێرە بە تەنیا جێتبهێڵم."

"جەنابی چی گیڤارا تۆش ئەگەر ژن بوویتایە، کەسێکی هەشبەسەر دەبووی!" ئیدی دوای ئەم قسەیە دەرکەی ئەوم

پێوەدایەوە." کاتێک بە غار بەسەر پەیژەکاندا سەردەکەوتم هاوارم کرد: "هیوادارم لە تارانێ لە تەنیاییدا دیق بکەی."

ئینجا جار لەدوای جار لەسەر بانەکەوە تفم فڕێ دەدا، حیسابی ئەوەشم دەکرد ئاخۆ چەند دەخایەنێ تا تفەکەم بگاتە سەر ڕووی چەم و لمی سەر جادە. تا پێمدەکرا تفم دوور فڕێدەدا، دەمبینی لیکەکەم لە ماوەی چوار چرکەدا دەبووە هەڵم. من ئەمەم وەک شتێکی خۆم تووڕ فڕێ دەدا، بەو هیوایەی تفەکەم شتێکی پیس و بەدی من بێ، ئەو فڕێدراوە شووم و ناشایستەم بڕۆن و نەگەڕێنەوە.

پاشان بە دەمی وشکوبرینگەوە چوومە هەورەبانەکە، بەڵکو لە گۆزەی بابە هەندێ ئاو بخۆمە، بەڵام دەرکەوت ئاونەبوو. شلە تاڵەکەم خواردەوە، بارتەقای چەند پەرداخێک ئاو. لە ماوەی چەند خولەکێکدا سەرم سووڕا. لەسەر جێوبالینگاکی بابە پاڵمدایەوە، کەسایەتی بابەم بەرجەستەکرد، ئەو کەسەی شاد و شاناز بوو بەوەی کوڕەکەی شوێنپێی ئەو هەڵدەگرێتەوە و دەچێتە هەمان زانکۆ کە لێی خوێندبوو. پەنجەکانم تەقاندنەوە، لاقەکانم لێ ڕاکێشان، بە نمایش دەستم بۆ سمێڵەکانم برد. لێ خۆ شانۆنامەکەم بە بێ ڕادیۆ ناکامڵ بوو، بۆیە ڕادیۆکەشم پێکرد. هەڵبەتە میلەکە لەسەر ئێزگەی کوردی بوو. سەرەتا گوێم لێنەگرت، بەڵام دواتر گوێم شتێکی بیست.

"... شەڕ لەنێوان مەیدانی دووگۆلی لە قامیشلو لە نێوان هەوادارە کوردەکان بۆ تیمە خۆجێیەکە و هەوادارانی تیمی عەرەبە میوانەکان هەڵگیرسا. هێزەکانی ئاسایش بە گەیشتنە قامیشلو تەقەیان لە

کوردان کرد، چەندین کەسیان لێکوشتن. ڕێورەسمی بەخاکسپاردنی ئەو کوژراوانە گۆڕا بۆ خۆپیشاندانێکی توندوتیژ."

شرۆڤەکارێکی کاروباری کورد قسەی لەبارەی ساڵیادی ڕووداوێکی گەورەی سوریا دەکرد، کە دوو ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو، ئەوەی شیدەکردەوە چۆن پۆلیسی سوریایی بە سەدان کوردی کوشت و بریندار کرد و زیاتر لە دوو هەزار کوردیشی گرتبوو، ئەمەش نارەزایی کوردانی لە شارەکانی دیکەدا تەشەنەپێکرد.

هەر دەمودەست پەشیمان بوومەوە لەوەی ببمە بابە، بۆیە دوگمەی ڕادیۆکەم گرت و کوژاندمەوە، دەستم دایە پیرەڕادیۆ، کە سەرچاوەی ئەو سامناکیە بوو، ئیدی بە پەلە خۆم گەیاندەوە سەربان. بە هاوارێکی پاڵەوانانە سندووقە کۆنەکەم لە سەر لێواری بانەکە تێهەڵدایە خوارەوە، بینیم لە خوارەوە وردوهەڕا بوو. ئێستا دەکرێ سەرمان کەمێک بسێتەوە.

ئەو شەوە کاتێ باوکم لەسەر ئەوە زللەیەکی لە ڕوومەت دام، نەهێشا. بەڵام ئەوە هێشا کە یەک دوو ڕۆژ پاشتر بینیم ئەهریمەنێکی دیکە جێی ئەوەی گرتەوە کە پێموابوو قولماتم بڕی و کوشتم، ڕادیۆیەکی دیکە بە دەنگێکی گڕتر هەواڵی کێفەڕاتە بێ کۆتاییەکانمانی دەخوێندەوە.

## بەندی هەشت

"لەیلا، داپیرە پێویستی بە منە. دەچم ماوەیەک لای دەمێنمەوە. ناتوانم لەوە زیاتر پارەی مشوورخۆرێکی بۆ بدەم. پێموایە ڕۆژەکەشی نزیکبووەتەوە." دایکە بەدەم ئەم قسانەوە لای پێخەفەکەم وەستابوو، بۆنە نوێیەکەی شیرینێکی تیژ بوو، جانتایەکی پرتەقالیشی – لە ڕەنگی لێوەکانی- بە شانی وەکردبوو. تیشکی چاوی شتێکی دیکەی غەیرە ئەوەی وتی، نیشاندەدا. لەوانەشە بەوە ئاسوودەبێ، کەوا ئەم نۆرەیەی مشوورخواردنی دایکە خەڵەفاوەکەی بەرەو کۆتایی بچێ. دایکە بە پێچەوانەی خەسڵەتی خۆی، دیاربوو بۆ ماوەیەک بە حاڵی خۆی ڕازی بوو، دەمەقاڵەی لەگەڵ بابە نەدەکرد و لە جاران پتریش بایەخی بە ڕوخساری خۆی دەدا.

لەسەر کۆمەڵە شیعرەکەی (ژیلا حوسێنی)یەوە چاوێکم بۆ هەڵبڕی، کە لە نێو کتێبی کیمیادا شاردبوومەوە و پرسیم: "چەند دەمێنیتەوە؟" ئەوەی ڕاستی بێ دەستم لە چوونە زانکۆ هەڵگرتبوو، بەڵام وام نمایشدەکرد بەشداری دەکەم، ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر خۆم بوو، ئاخر تاکە قەڵغانم بوو لە هەمبەر نامرادی کە بە بێدەنگی و بە دڵنیاییەوە دایدەدۆشیم.

دایکە شانی هەڵتەکاند و لە ژوورەکەم چووەدەر و دەرکەشی بە تیدراوی هێشتەوە. لێ ئەو جانتا بۆرە خەپەیەی لە بەردەم دەرکەی دەرەوە هەڵیگرتبوو، وای لێکردم مەزندەی ئەوە بکەم بە لای

کەمییەوە بۆ چەند هەفتەیەک نایەتەوە. ئەو ماسکاراشی کردبوو، ڕەشکردنی برژانگەکانی دایکم چاوە هەنگوینەکانی ڕەونەقدارتر کردبوو، ئەو چاوانەی چیا لێی بە میرات گرتبوو. ئەوی دواجار، بەر لە پێنج مانگ و چواردەڕۆژ بوو بینیبووم، ئەو کاتەی بەرەو زانکۆ ڕۆیشتبوو. ئیدی برا بچووکەکەم لە پایتەخت بوو، ببووە پیاوێکی خوێندەواری وێڕاگەیوو. هەرچەند دەرگا بە ڕووی ئەودا دەکرانەوە، ئەوەندەش بە ڕووی مندا دادەخران.

ژوورەکەی دایکە، کە بە تەنیشت هی منەوە بوو، پشکنیم و بایی ئەوەندە دڵنیابوومەوە، بینینم تا ڕادەیەکی زۆر بەتاڵ و حەتاڵە. چاوێکم لە ئاوێنەی سەر مێزەکەی کرد، لەوە گرژبووم چۆن بەختی بۆماوەیی لە جوانی دایکم بەر براکەم کەوتبوو، کەچی منیش هیچی وا نا. لەو ساڵانەشدا تەنیا یەک دوو خوازبێنیم هاتبوون، ئای منیش چەند ڕقم لە چارەی ئەوانە بوو، کە ئەگەری مێردێکیان تێدابوو، من چاوم لەسەر ئەوە بوو، خوازبێنیم بێن و توانستی ئەوەشم بدرێتێ بڵێم نەخێر. من لەسەر سیسەمی دایکم دانیشتم؛ کە تەنیا یەک لای خۆی بەسەرداردرابوو، شەقڵی ژنێکی تەنیای وەرگرتبوو. هەر چۆنێک بێ جوانیش ئەو نیعمەتە نەبوو کە باس دەکرێ.

چاویلکە ڕوشاوەکەی خوێندنەوەی دایکە لەوێ لەسەر کتێبێک بوو، کە بەرگەکەی بە ڕۆژنامەیەک داپۆشرابوو. دەرکەوت کتێبێکی دەروونناسییە و لاپەڕەکانی بەندێکیشی بەناونیشانی "سنووری تێکچوونی کەسایەتی" بوو، گوێچکەکەی نووشتێنرابووەوە[٤٥].

---

[٤٥] لەکاتی خوێندنەوە، بەتایبەتی جاران، لەو شوێنەی خوێنەر لێیڕادەوەستا و بۆ نیشانەکردن، لێوی گۆشەی لاپەڕەکەی دەنووشتاندەوە، لە زمانی ئینگلیزیدا پێیدەگوترێ گوێچکەسەگ dog-eare.

نەیاریتی، دەمارگرژی و دەمدەمی، کیماسی لە هاوسۆزی، هەستێکی بەهێزی گۆشەگیریی، هەستی بەدگۆڕانی خود، ڕەفتاری خۆویرانکردن، ئەمانە پڕ بە پێستی دایکمن.

ڕێگەی هۆدەکەم گرتەوەبەر، ئاخر لەوەتەی چیا ڕۆیشتووە، خۆم گۆشەگیر کردووە و لەگەڵ کەس لە هاموشۆدا نەبووم تەنانەت لەگەڵ شلیریش. لەو نێوەشدا خەمۆکییەکی زێدە و ترسێنەر لە ناخمدا چەکەرەی کردبوو، دەیهەژاندم. هەندێک جار لە یادنامەکەمدا، شتم لەبارەیەوە دەنووسی، ئەمەش دەیخواردم و دایدەهێزراندم. جاری دیکەش خواخوام بوو بەتاڵی و بۆشایی ناخم بە یەکجاری قووتم بدات.

لەوە زەندەقم چووبوو کە دەبوو بژیم و نەشدەژیام، بەوەی ڕامانی خۆم هەبێ و نەشمبوو.

ئەو پۆستەرانەی سەر دیواری ژوورەکەم، کە چیا بە منی دابوون، لە بن تۆز و فەرامۆشیدا دەیاننالاند و پەردەی ژوورەکەشم هەمیشە دادرابووەوە، هەرچەندە پەنجەرەکەم بەسەر حەوشە بێسەروبەرەکەی پشتەوە و دیوارە مەڕمەڕی تەلارە بڵندەکەی دراوسێشماندا دەیڕوانی.

نووسیم: *لەو ساتەوەختە دەگمەنانەی تەمومژە چڕەکە دەڕەوێتەوە، نیگام دەکەوێتەسەر ئەو لایەیەی لە هەناوی مندا هەیە. لە بەر تیشکی ڕووناکییدا، سەرنجدەدەم ئەو دەمەی دادستێن خەوتووە، ئەشکەنجەدەرێک لەسەر کاری خۆیەتی. دەگوترێ زام ئەو شوێنەیە کە ڕووناکیی لێوە دێتە نێو گیانەوە، بەڵام خۆ تاریکییش هەر لە هەمان شوێن خۆی تێدەخزێنێ.*

زەنگی تەلەفۆنەکە لێدرا. نزیکەی دوو مانگ بە سەر دوا پەیوەندیکردنی چیادا تێپەڕیبوو. تەلەفۆنکردن بۆ شوێنی دوور گران بوو. "ئەریَ چۆنی؟" خۆشیم لە دەنگە شیرین و وشە ئالۆزەکانی بینی بەتایبەتیش کاتێ باسی هەبوونی بازاڕێکی قەدەغەکراوی کتێبی دەکرد، ئەو بازاڕەی لە ڕێی پەیوەندییەکانی خوێندکارانی زانکۆوە پێی ئاشنا بووە؛ ئینجا باسی دیداری نموونەیی خوێندکارانی لەگەڵ مامۆستاکانی فەلسەفەدا کرد بەوەی پەروەردەکردنێکی وەهایایان هێناوەتە کایەوە، ئامادەیە بۆ دارشتنەوەی کۆمەڵگە؛ باسی داخباریی کورد لە ئێران، تورکیا و سوریا- ناسنامە بەتاوانزانینەکەمان و سیاسەتی تواندنەوە و ڕەشکردنەوە سیاسەتی وەرە ڕایێ یان برۆ بۆ بن گڵی کرد. پرسیاری ئەوەی نەکرد ئاخۆ من چۆن بووم، بەڵام خۆ ئەگەر وەهاشی کردبا، دەبوایە چی بڵێم؟ بەوەی هیچ هۆکارێکم نەدۆزیوەتەوە تا لە نێو پێخەفەکەم هەڵبسمەوە، بەوەی من تا بڵێی شەکەت و خەمبارم؟

"ئەریَ کەی دەگەڕێیتەوە؟" بەم پرسیارە قسەکەم سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی و گەشەسەندنی هەرێمی کوردستان لە عێراق پێبڕی و پەنجەرەشم کردەوە. دەستم درێژکرد بەڵکو چەند کوڵوە بەفرێک بگرمەوە کە بۆ هاتنەخوارەوە لە کێبڕکێدا بوون، بێ ئاگا لە چارەنووسی ئەو کولوانە کاتێ دەگەنە سەر زەوی چییان بەسەردێ. مەراق بووم بزانم تۆ بڵێی هەرگیز کوڵوە بەفری یاخی هەبووبێ، یەکێکیان بپرسێ ئەریَ ئەم پەلەپروزێیە لە داباریین چییە. ئەوە بوو لەوێ بێجووڵە دانیشتم و سەیری ئەو کەسکاییەم کرد کە مابووەوە و بە ترسناکییەوە بینیم چۆن هاوەڵەکانیان لە ژێر چەکمەی خۆپەرستانەی مرۆڤی دڵبەرددا لە قوڕ و چڵپاو ڕۆدەچنەخوارێ و

دەشێلدرێن. تۆ بڵێی کوڵوە شاهیدەکە بە ئازارێکی بێسنوور توابێتەوە و مردبێ، زۆر زیاتر لە ئازاری ئەوانی دیکەوە، ئەوانەی بە بێ زانیاری و بەرەنگاربوونەوەیەکی پێشوەختە هەمان چارەنووسیان هەبوو؟ یان ئەو چێژێکی زیاتری لە باقی دابارینە ڕەهاکەی بینیبێ؟ بە چپام گوت: "ببوورە، چی؟"

ئەویش قسەکەی دووبارەکردەوە: "لەو دواییانەدا هیچ نیگارێکی نوێت کێشاوە؟"

"ئەرێ کەی بۆ پشووی زستانە دەگەڕێیتەوە ماڵێ؟"

"ببوورە، خوشکێ ناتوانم. لە دوای تاقیکردنەوەی سەری ساڵ، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم لە ڕۆژنامەیەک کاردەکەم. ئێمە دەمانەوێ کۆمەڵگە ڕابچەنێ و ئامادەبێ بۆــــ"

"ئۆو، تکایە وازبێنە." ئیدی تەلەفۆنەکەم دانایەوە، ئەمەش نەک تەنێ بۆ ئەو، بەڵکو بۆ خۆشم مایەی سەرسامی بوو.

لە کۆلانە بە بەفرداپۆشراوەکەدا، منداڵان بە دەستکێشەوە یارییان دەکرد؛ کیژێکی جوان لەسەر بۆنیتی ترومبێلێکی وەستاو دانیشتبوو، دڵداریی لەگەڵ پیاوێک دەکرد کە هەروەک سەگێکی برسی دەمی داچەقابوو. دراوسێیەکی تەمەن مامناوەنجی بە کەیفەوە بەردەرکەی ڕادەماڵی، لەبەر دەنگی موزیکی ڕادیۆکەی سەری دەهەژاند و گۆرانی دەگوت. خۆ ئەگەر توانیبام دڵتەنگییەکەم بکردبایە تۆپەڵەبەفر، ئەوا دەکرا بیگرمە ئەو خەڵکە.

پیاوێک پیدەچوو تەمەنی لە سییەکاندا بێ، کورسیی پێچکەداری ژنێکی لەوسەری پێچی جادەکەوە پاڵدەنا. ژنە کە چرچ و لۆچ ببوو، بە تاسەوە سەیری منداڵەکانی دەکرد کە خلیسکێنەی سەر بەفریان

دەکرد، غاریان دەدا و شێرەبەفرینەیان دروستدەکرد. من هەر لای پەنجەرەی خۆم وەستابووم، باسکە ساردەکانم لەیەک ئاڵاندن و هەر سەیری ژنە بە تەمەنەکەم دەکرد کە بە پەتویەکی کەسک و شین و سپی وەرپێچرابوو. کاتێ منداڵان بە خۆشییەوە تۆپەڵە بەفریان بە یەکدا دەدا، چاوەکانی ئەویش دەگەشانەوە. کاتێک پیاوەکەم بە کورسییەکەوە لە بەردەم پەنجەرەکەمدا بینی، هاوارمکرد: "دیارە دیارە حەزی لە ڕەنگاوڕەنگییە؟"

ئەویش بە سەری بەرزکردەوە و بە کەیفوسەفاوە گوتی: "بەڵێ، ئەو حەزی لە ژیانە." پیرەژنەکەش سەری بە ئاراستەی من بەرزکردەوە. منیش دەستم بۆ ڕاوەشاند. دوو جاران چاوی لێداگرتم، ئینجا خەنییەوە و ناسکیی تەواوی خۆی نیشاندا. لە ڕوخساریدا سەفای ژیانیم بەدیکرد. تۆ بڵێی کەی بووبێ بۆ دواجار بۆ کەمە بەهانەیەک گەڕابم تا بۆ چێژێک لە ژیان وەربگرم؟ هەڵلەرزیم، پەنجەرەکەم داخستەوە و چوومە بەردەم زۆپا خەڵووزییەکە. لەسەربانیش، دووکەڵی بۆڕیی زۆپاکە بەرەو ئاسمان بەرزدەبووەوە.

"وەرە سەما، فەرامۆش کە کێیت و چیت، وەلانێ لۆکەی سەر برینی شەهوەتت." ئەو دێڕە ڕیتمدارانەی مەولانام گوتنەوە، هەر هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کاتی دڵتەنگییەکەی ڕەواندمەوە. "سەماو شایی لە مەیدانێ خۆشترە، مەرد بە لەنێو خوێنی خۆت بگەوزێ."[٤٦]

---

[٤٦] لە وەرگێرانی ئەو چەند دێرانەی مەولانا و دێرە شیعرەکانی دیکەش کە لە فارسییەکەوە وەرگیراون، لە ڕێی کاک زاگرۆس ڕێبازەوە گەڕاینەوە سەر ماکی فارسی،

سەرلەبەری ماڵەکە هی من بوو، منیش بەو گۆشەگیرییە بووژابوومەوە. وەک دەرویشان دەخولامەوە، دارسامە دار و دیوار، با پێیان وانەبێ قەتیسم دەکەن، هەستمکرد بەناویاندا تێدەپەڕم. هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی، پاشان یەکێکی دیکە.

بەو سەرلەنوێ بەخۆهاتنەوەیەم، دەستم بە خاوێنکردنەوەی ناوماڵێ کرد. مشووری گوڵەکانی نێو ئینجانەکانم خوارد، گوڵە وەریوەکانی لیلۆک شێوەی کەوچکی چایان گرتبوو، گەڵا ژاکاوەکانی داربیبەری ماڵی شێوەی دڵێکی زیوینی بۆرەیان وەرگرتبوو. پێموابوو خوازیاری ژیان بن، وەنەبێ بۆ شتێک بژین، بەڵکو سەرباری هەموو شتێک نەمرن. ناندینەکەم خاوێن و ژووری دانیشتنیشم ڕێکخستەوە، هەرچەندە شتێکی کەمیشم دەربارەی ئەو سپرینگە شکاوەی قەنەفە دەستی دووەکە پێدەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا لە ماڵە پاکوخاوێنەکە هەست بە کەمتر نامۆبوون دەکرا. دوشێکم کرد و ئینجا نیسکێنەیەکیشم خستەسەر ئاگر، نیسکی هاڕدراو و پونگە و هەندێ بەهاراتیشم لەگەڵ تێکەڵ کرد.

لەگەڵ کوڵانی نیسکەکەدا، شیعرەکەی چۆمان هەردیم سەبارەت بە نیشتمان خوێندەوە و لای پەنجەرەکە دانیشتم. "باوکم هەرگیز بەوە نەگەیشت کە ویستی، ئێمەش هێشتا نەگەیشتینە ئەو نیشتمانەی کە ئەو فێریکردین خۆشمان بوێ." لە دەرەوە لە پێچی کۆڵانەکەدا سەروسەکوتی بابە بەدیارکەوت، عارەبانەیەکی پڕ لە پەتاتەی پێبوو. هەناسەکانیشی لەبەر کەپوویدا پەڵە هەورێکی

---

نەوەک لە وەرگێرانی نووسەرەوە بیکەینەوە کوردی، چونکە ئەوکات دەبووە دووجار وەرگێران، ترسام لە دەستپاکیی پەیامەکە دووربکەومەوە.

بچکۆلەی دروستکرد؛ نە دەستکێشی لە دەستدابوو، نە شاڵیشی لە مل کردبوو. ژنێکیش کە زراسکەکەی لە باوەشدا بوو، وەستاندی بەڵکو هەندێ پەتاتەی لێبکڕێ.

پیرەپیاوێکیش بە دوای بابەدا هات. "هۆ کابرا، هەی دزی پیس، ئەوە هی منە." کابرا لە شەڕ دەگەڕا و بە پێڵاوەکەی لە کەمەری بابەی دا، ئەویش کەوت. منیش لە شوێنی خۆم دەمم لێ بەش بوو.

کیسە پڕ پەتاتەکە لە دەستی ژنەکە کەوتەخوارەوە و پەتاتەکانیش بەو ناوەدا پەرش و بڵاوبوونەوە. "خانم ببوورە، خۆ سەلامەتی؟" بابە تەکانی دایەبەر خۆی و هەڵسایەوە پیرە دێوەکەشی فەرامۆش کرد.

کاتێ بابە پەتاتەکانی هەڵگرتەوە و لە کیسێکی دیکەی کردن، ژنەکە گوتی "شەقاوە!" بێ پەتاتە و بێ ئەوەی پارەکەش بدا ڕۆیشت.

بابەش نەفرەتێکی کرد: "ئەرێ چیتە؟ بۆ وادەکەی؟"

"ئەوە هی منە." پیرەمێردەکە لێبڕاوانە ئاماژەی بە عەرەبانە وەرگەڕاوەکە کرد.

بابەش کە خەریکی هەڵگرتنەوەی پەتاتە بە گۆڕێوەرکراوەکان بوو، بەنێوچاوان گرژییەوە پێیگوت: "دەی لەسەر ڕێگەم لاکەوە."

"چییە پێتوایە هەراسانت دەکەم؟ نیشانت دەدەم، بۆت بمێنێ!"

"هەی شێتوپێکەتی، بڕۆ چاوت دەرێ."

کابرا چاوی ترووکاند و بە متمانەیەکەوە چووە لای ڕاستی عەرەبانەکە و هاواری کرد: "دەیسەلمێنم. دەیبینی، ئەمە ناوی منە، دەبینی؟ ئەوەتا لێرە."

لەژێر تیشکی گڵۆپە ستوونە کارەبایەکەدا، ئارەقەم بینی لە هەنیەی بابە دەتکا. سەرم بادا هەندێک خۆم لە پشت پەردەکەوە گرمۆڵەکرد.

پیاوەکە بەوپەڕی دەنگی بەرزەوە قسەی کرد و جەستەشی دەلەرزی: "دەبینی یان کوێری؟"

بابەش بە پشتەدەستی کراسەکەی ئارەقەی تەوێڵی سڕی و سەری بۆ بینینی شتەکە نەویکرد، ڕووخا.

"خۆ تۆ هێشتا گەنجی تا کارێکی شایستە بدۆزیتەوە، یاخود دەتەوێ ئەمە دوارۆژت بێ." پیاوەکە بە دەم ئەم قسەیەوە پەنجەی ئاماژەی بۆ خۆی ڕاهێشت. کوردێکی چەوساوەی دیکە. خەندەیەکی تاڵ کەوتە سەر ڕووی بابە. ئەو نەیوت کەوا لەسەروبەندی گفتوگۆی تیژی دکتۆراکەی کاتێ **شۆڕشی کلتووریی** زانکۆکانی داخستن.

بابە ملی دا: "زۆر باشە،" هەڵەی منە." بەرلەوەی پیاوەکەش فریاکەوێ نارەزایی نیشان بدا، بابە چەند پەتاتەیەکی خستە نێو کیسەیەکەوە و بە شانی دادا و و بەخێرایی هاتەوە و دەرگەی کردەوە لە دوای خۆیشی گاڵەی دا. بە نیازبووم یارمەتی بدەم کاتێ هاتەژوورەوە، بەڵام ترسام ئەو برە کەمە شکۆیەی مابووی ئەویش بریندار بکەم. لە بری ئەوە سەرم بەسەر گۆڤارەکەمدا گرتەوە: "کوردستان، نیشتمانی ئازایەتی و ناپاکییە؛ داوات لێدەکا لە باوەشی بگری، بەڵام کاتێک کەوتیە ئامێزی، دەتگەزێ."

کاتێ بابە هاتە ناندین هەندێک شلۆق بوو. چاومان بە یەک نەکەوت. منگەیەکی لێوەهات. هێڵی نێوچاوانی باوکم قووڵ و

دەنگیشی لەرزۆک، سەرڕوومەت و کەپووشی سوور هەڵگەڕابوو. پەرداخێک ئاوم بۆ ڕاگرت و گوتم با چایەکت بۆ دێم کەم، بەڵام سەرێکی لەقاند و دەموچاوی لەنێو دەستشۆرەکە شوشت.

سەری مەنجەڵەکەشی هەڵدایەوە و گوتی: "هەر دەڵێی بۆنی شێوی دەستی دایکتە."

ئەمەش گەورەترین دەستخۆشی بوو. منیش دوو دەفری گەورەم پڕ لە سووپەکە کرد و لە بەرانبەر باوکمدا دانیشتم. دڕدۆنگانە کەوچکێکی لێدا، ئینجا منگەیەکی دڵمەندانەی بۆ کردم.

منیش پێمڕاگەیاند: "دایکە بۆ ماوەیەک لای داپیرە دەمێنێتەوە."

سەرێکی بادا و پارووێکی دیکەی لێدا. ڕقم لەوە بووەوە کە هێندە ئاسوودە دیاربوو. لێ خۆ ئەمنیش هەستمکرد ئێستا کەشی ماڵ پڕ ئۆکسجینە وەک ئەوەی دایکە پێشتر هەمووی هەڵدەمژێ.

"جاری داهاتوو ئاولیمۆی زیاتر تێبکە."

ئەو شەوە بابە نە تەلەفزیۆنی پێکرد و نە ڕادیۆش. لە بری ئەوە، بەڵکو بە هۆی شۆرباوەکەی منەوە بووبێ، چووە دەرەوە و بەڵام زۆری پێنەچوو بە کیسێک سەوزەوە گەڕایەوە. فێریکردم چۆن شێوێک لە گۆشتی بەرخ، کەرەوز، گێزەر، باینجان و ئاوەتەماتە دروستبکەم. نیسکمان بە قیمەی گۆشتی بەرخ گۆڕیەوە. وێڕای دیمەنە هەراسانەکەی پێشتر، کەشی سەڵتیە کاتییەکە خستبوویە سەر هەوای ئاهەنگ.

بەدەم لێدانی کەوچکێکی پڕ لە هەڵمەوە گوتی: "ئەرێ دەزانی بۆچی بەم خواردنە دەگوترێ مەلادز[٤٧]؟"

"واتای ئەوەیە مەلایەک دزیبێتی؟ بۆ وای پێدەڵێن؟"

"دەڵێن ئەگەر هاتوو شتێک باش بێ، ئەوا دەستبەجێ لەلایەن ژاندرمە یان مەلاوە دەدزرێ."

منیش پێکەنیم.

"شتێکی غەمناکە." ئەو بە شێوەیەکی سەرسامانە تەماشایەکی کردم و چێشتەکەشی تامکرد.

"دەزانم، بەڵام حەز لەم پێچە کردەیەی یاخیبوون دەکەم. ناونانی خواردن بەو شێوەیە."

تامی شێوەکەش زمانی سووتاند. منیش توندتر پێکەنیم. بە خۆشییەکەوە سەری لەسەر مەنجەڵەکە هەڵگرت، مەودایەک دوورکەوتەوە خنێرەکانی[٤٨] دیاربوون.

خواردنەکە ئامادە بوو. ئێمەش بە خۆشییەوە بە کەوچکان کەوتینە سەری.

"ئەمڕۆ نەوجەوانێکی دیکەیان تا مردن ئەشکەنجە دا. هەر پانزە ساڵ دەبوو. هەر لەبەر جوێندان بە ڕابەری باڵای نەفرەتی قامچیکوت کرا." خۆی ئەمە تاقیکردنەوە بوو، بەڵام من نەکەوتمە داوی. من لێی هەڵگەڕامەوە.

---

[٤٧] mala dez

[٤٨] خنێرە: ددانی پشتەوە.

"ئەرێ چۆن فێرە هەنگاوەکانی لێنانی ئەم خواردنە بووی؟ لە دایەگیانەوە فێربووی؟"

ئەو بە حەسرەتەوە گوتی: "هەموو شتێک کە ئەو دروستی دەکرد، بێ وێنە بوو. ئەو ژنێکی پیرۆز بوو. هەر شەوێک خەونێکی مۆتەکەئاسام ببینیبایە ئەو لەوێ بوو، ئامادە بوو پشتم بخورێنێ تا خەوم لێدەکەوێتەوە."

هەر لە خۆوە هەڵمدایێ و پرسیم: "تۆ لە منداڵیدا زۆر خەونی ناخۆشت دەبینین.؟"

بابە پێیگوتم، لەبەرئەوەی کاتێ تەمەنی حەوت ساڵان بووە، شاهید بووە لەسەر کوشتن و بڕین و چۆن هێشتاش وا هەستدەکا سەربازە بکوژەکان هەر ڕاوی دەنێن، ئەو دیمەنە ترسناکە لە جووڵەی ڕەش و سپییەوە بۆ ڕەنگاوڕەنگ، بۆ سێ ڕەهەندی، بۆ ژیانێکی ڕاستەقینە وەرگەڕا.

من و چیا لەسەر بیستنی سرتەیەک سەبارەت بەو ڕۆژەی بابە گەورەبووبووین، ئەو ڕۆژەی بۆ هەمیشە مۆری بە نێوچاوانی بابەوە نابوو. ئەمەش میراتەکەی بوو، ژان و ناسۆری ئەو بوو، منیش حەزم دەکرد هاوخەمی بم، خۆزگە تەنیا لەوە تێگەیشتبام ئاخۆ چ کار و چالاکییەک ڕێگەی زیندانی لەسەر کردبووەوە کە تا ئێستاش وەک زنجیرێک بە ئەستۆی خێزانەکەمانەوەیە.

ئەو هەر حەوت ساڵان بوو بابە خۆی خواردەوە، گوتی ناتوانم وردەکاریی ڕۆژەکە بگێڕمەوە. لەباتی ئەوە، ئەوەی گێڕایەوە چۆن شەوانی دواتریش ئەو مەرگەساتەی بووەتەوە میوان.

لە خەونە مۆتەکییەکاندا ئەو دیسان لەوێیە، ئەو شاهیدێکی سامناکە، قیژە و هاواری دایباب، بێبەزەیی سەربازان، زیڕەی زنجیری تانکەکان، فرمێسکی بێدەنگی زیندانییەکان.

بابە سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، بەڵکو ئاسمان شتێک بکا، بەڵکو کۆتایی بەو دڵڕەقیە بهێنێ. کەچی لە بری ئەوەدا، هەر خۆی لەنێو چاڵێکدا بینیەوە، تا چەناگەی نغرۆ بوو، لە هەمان کاتدا دیمەنێکی ترسناک و گیراوێکی تۆقیو. چاوەڕێی خودای دەکرد بەڵکو ئاوڕێک بداتەوە و کارێک بکا. ئەو ئەوەندە چاوەڕێ بوو تا هیچی بۆ چاوەڕێکردن نەمابووەوە و تانکەکەش خەریک بوو پایەماڵی بکا. کاتێک تانکەکان دەسووڕانەوە، هاوارکردنیش پێینەدەکرا بێداری بکاتەوە. ئەوسا داپیرە بە کراسێکی شینەوە، وەک ئەوەی پەرییەک بێ و لە پەنجەرە هاتبێتە ژوورەوە، پەیدادەبوو، دەستێکی ئارامبەخشی بەسەردا دەهێنا.

لە دەرەوە تایەکانی بارهەڵگرێک کرتەکرتی لەسەر بەفری جادەکەوە هێنا. بە واقوڕماییەوە، لە ڕووخساری خۆگر و ئازاردیدەی بابەوە ڕامابووم. خووزیم قووتدایەوە، ویستم شتێک بڵێم، بەڵام نەمدەزانی چی. ئەو چ حیکایەتخوانێکی بەهرەمەند بوو؟ من باش لێیتێدەگەیشتم، چونکە منیش لە ناسۆردا بووم، هەرچەندە توشبوونم بە جینۆساید و دەستبەسەریی لەسەر دەستی دوو بوو؟ ئەوەی ڕاستی بێ، ئەمەش خۆی گرفتەکە بوو. زیندانی و بێ دایکیی من ڕاستەقینە نەبوو، هی ئەو کتومت وەها بوو.

لە کۆتاییدا پرسیم: "ئەرێ لە زیندانیشدا خەونی مۆتەکەئاسات دەبینین؟"

دەبوایە پشووودرێژ بم تا وەقسە دێ. ئەو پێی گوتم، لێپێچینەوەی بەیانیان قامچیکوتکردنی لە ژێرزەمینەوە بە دواوە بوو. کەچی ڕۆژێکیان، پاسەوانی نهۆمی سەروو بانگیکرد و بابەش دەبوایە بە دوایدا بڕوا.

کاتێک بەسەر پەیژەکانیاندا سەرخست باوکم ڕووخسارە کەچوکرۆمەکەی بەرزکردەوە. ئیدی لەوێ، لە پەنجەرەوە ڕیزێک لەداردراوی لە حەوشەی زیندانەکەوە بینی. "بیستنی لەسێدارەدان شتێکە، بەڵام بینینی ئەم جەستە تێکشکا و سەری لاربووەوە..." نەیتوانی ڕستەکەی تەواوبکا.

بابە برا و مام و برادەرە شەهیدەکانی لەبەردەمی خۆیدا بینی، شنەباش بە هێواشی دەیانشەنێتەوە. سەرەکانیشیان بە لایەکدا شۆڕ بوبووەوە. پەتیش هەر لە ملیاندا بوو. دەست و قاچیان توند بە یەکەوە شەتەکدرابوو هەروەک ئەوەی خۆیان بە ئاسمانەوە هەڵواسیبێ.

پاسەوانەکە بابەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بەڵام بەرلەوەی بزانێ ئاخۆ هەر بە ڕاستی چی قەوما، بابە پاڵیکی بە سەربازەکەوە ناو بە هەموو هێزی خۆیەوە چۆکی لە پشتی سەربازەکە دا. پاسەوانەکەش ڕاقەنا، بەڵام خۆ ئەوانی دیکە دەورەی بابەیاندا و دایانە بەر مست و پێلەقە. کاتێکیش ئەویان تێر کوتا، ئینجا فڕێیاندایە زیندانی تاکەکەسیەوە.

تا ئەوکاتە بابە هێورترین و بەسەرخۆداشکاوترین کەسی نێو هەڤاڵەکانی بوو، لەوکاتەوە سەرە خوێناوییەکەی بە دیواردا دەکێشا. وەک سزایەکیش زیاتر لە زیندانی تاکەکەسیاندا هێشتەوە. زیندانە

گۆشەگیرە تەنگەکەی هیچ هەواکێشیشی نەبوو. بۆ چەندین مانگ بە تەنیا بوو، ئەو پارچەپلاستەرانەی کۆدەکردنەوە کە لەبنمیچەکەوە دەکەوتنەخوارەوە.

بۆ ئەوەی ڕێ لە بەربوونەوەی فرمێسکەکانم بگرم، دیوی ناوەوەی ڕوومەتم گەزتەوە. ئەوەی لە بەرانبەرم لە سەر سفرەی شێو دانیشتبوو، پیاوێک بوو لەپای هیوا و هەوڵی بۆ جیهانێکی دادپەروەر، باجێکی قورسی دابوو، کەسێک بوو مافی باوکایەتی بەسەر منەوە هەبوو، دواتر پشتگوێی خستبووم، ئەو کەسەی بێ ئاگا بوو لەوەی ڕقوقینی پەنگخواردووی گیانی هەموو حەز و مەیلێکی دیکەی تێدا کوشتبوو، هەرچی سۆزی ناخی هەبوو بەرلەوەی تفی بکاتە دەرەوە تێر دەیجووی. خەریکە منیش بەسەر هەمان ڕێچکەی ئەودا شۆڕببمەوە خوارێ.

پاشان من خۆم بە شوشتنی قاپوقاچاخەوە خەریککرد و ئەویش کاسێتێکی ڤیدیۆی لە هەورەبانەکە هێنایە خوارێ. کاتێکیش لە شوشتنەکە بوومەوە، لەسەر قەنەفەکە لە تەنیشت ئەودا دانیشتم، بە تیلەی چاویشمەوە لێی ڕامابووم، بە هیوای ئەوەی چیرۆکی زیاترم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام ئەو چاوی لەسەر شاشەکە هەڵنەبڕی. زووش چیرۆکی تایتانیک بۆ خۆی بردمەوە، کە دەبووایە نیوەکەی لەبەر تێنەگەیشتنی زمانەکەی قەرەبوو بکەمەوە. ئەویش ئەو کۆپلانەی ماچوموچی تێدابوو خێرا دەیڕۆیاندن، لە ساتانەشدا گەمەم بە دامێنی تەنوورەکەم دەکرد.

بۆ ڕۆژی پاشتر کاسێتی تایتانیک لە هیچ شوێنێک دەستنەدەکەوت. ئاخر بابە تا من لە "لاساری و بێشەرمی بپارێزێ، شاردبوویەوە. کاتێکیش لە کۆتاییدا زاتی ئەوەم کرد داوای لێبکەم هەندێ فیلم بێنێتەوە، ئەوە بوو فیلمێکی ئێرانی لێدا، کە هیچ جووتەیەک ماچوموچیان نەدەکرد و دەستی یەکدییان نەدەگرت تەنانەت ژنەکانی نێو فیلمەکە بە سەرپۆشەوە دەنووستن. لەگەڵ ئەوەشدا من هەر سوپاسگوزار بووم. مەیلی بابە بۆ فیلم منی جۆشدایەوە.

یەکێک لە دیمەنە دووبارەبووەکان لە بابەم بینی، ئەوە بوو لە کاتی سەیرکردنی فیلمەکەی بەهمەنی قوبادی، کیسەڵەکانیش دەفڕن، ویستی فرمێسکەکانی چاوی لە من بشارێتەوە، کاتێک کیژە لاقەکراوەکەی نێو فیلمەکە ویستی خۆی فڕێبداتە نێو گۆمەکە و خۆی بخنکێنێ و کۆرپەکەی ناوسکی لەناوببا، گوایە دەستەیەک لە سەرباز لاقەیان کردووە. بە تەماشاکردنی ئەو فیلمانە، هۆکاری ئەوەم بۆ پەیدابوو هەموو بەیانیان لە خەو هەڵبستم.

## بەندی نۆ

لە کاتێکدا بە باوێشکدانەوە بە نێو کۆمەڵە فیلمە سنووردارەکەی نێو کتێبخانەکەدا دەگەڕام، یەکێک چرپاندی: "دەی بەسیەتی سەیرکردنی ئەو شتە قۆڕانە". دەنگەکە هەموو بێدەنگییە شکۆدارەکەی کتێبخانەی شکاند، کە هەر تەنیا دەنگی هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبانی تێدا دەبیسترا.

ماخۆی دەنگەکە قەڵەمی ڕەشی لە لێوی دابوو و سێبەرێکی تاریکیشی بۆ برۆکانی دروستکردبوو. لووتە تیژ و چاوە ئەستێرەییەکەی هی ئەوە نەبوو نەناسرێتەوە.

منیش گوتم: "چییە دیارە هەر بە دوای گۆبەنددا دەگەڕێی؟" باوەشم تێوەرێنا.

ئارایشتە زەقەکەی شلێر وایکردبوو ئامانجێکی ئاسان بێ بۆ پۆلیسی "ئەمر بیلمەعروف و نەهی عەن مونکەر"، کە لە دەوروبەری قوتابخانەی کچان و کتێبخانەکاندا بە دوای ئەوەدا دەگەڕان، بەڵکو ئێمە "بپارێزن". بەڵام خۆ ئەو هەر شلێرەکەی جاران بوو، نەدەترسا.

شلێر ئاماژەی بە بارستایی ئەو کتێب و فیلمانەدا کە هەڵمگرتبوون و گوتی: "چییە، ئێستا بوویتە کرمی کتێبان؟"

"سەیرکە چیم دۆزیوەتەوە. گرەو لەسەر ئەوە دەکەم سەرپەرشتیارانی ئێرەش پێیان نەزانیوە." بە دەم ئەم قسەیەوە دانەیەکی باریکم لە نامیلکەی "کوندەپەپوی کوێر"ی سادقی هیدایەت

دایەدەستی، بەرگی کتێبەکە لەبەر کۆنبوونی وشک و شەقار شەقار ببوو، بۆنیشی لە بۆنی تووتنی قەلْنیکی نایاب و تۆزوخۆڵ دەچوو.

ئەویش بە چاوداگرتنەوە: "شازە، هەندێ لە فیلمەکانی هیچکۆکت دەوێ؟"

من لە خۆشییان گەشامەوە. ئەویش بەسەر شانییەوە تەماشایەکی کرد و پێیگوتم، بەڵکو لە ماوەی سەعاتێکدا دیڤیدییەک لەوسەری ژێرزەمینی کتێبخانەکە ببەم، ئەو شوێنەی سەر ڕەفەی تەونی جاڵجاڵۆکە دەوری کتێبەکانی داوە و ڕەفەکانیش پیس و پۆخڵن. هەر بە سرتەشەوە گوتی: "بیبە و هەفتەی داهاتوو لە هەمان کات و هەمان شوێندا بیگەڕێنەوە." ئای لەو کیژە، هەر دەڵێی ئەو کەسەیە کە لە یەکێک لەو چیرۆکانە دەردەکەوێ و لە مێشکی خۆم سازم کردووە، ڕێک هەوە، بەوەش دەمێکە دڵی بردووم.

هەرچەندە لەوەش وریابووم نەکەومە ژێر چاودێری بەوەی بە دوای فیلمی قەدەغەکراودا دەگەڕێم، بۆیە بەرلەوەی فیلمەکە بگەڕێنمەوە شوێنی خۆی، شەش جاران فیلمی Vertigoم لێدا و شلێریش زۆربەی ئەو جارانەی لە کتێبخانەکەدا بەیەک دەگەیشتین و فیلمە نوێیەکانی هەفتەی بۆ دەهێنام. لەوکاتەوەش بابە تاکوتەرا دەهاتەوە ماڵێ، کاتی تەواوم بۆ سەیرکردنی هەر شتێک حەزم پێیبوایە هەبوو، هەر کاتێکیش لە دەرکەی حەوشەوە بە دیاردەکەوت، ئیدی دەمکردەوە تەلەفزیۆنە فەرمییەکەی دەوڵەت. لە چاکەی ئەوەشدا بۆ شلێر پەخشانم بۆ قوتابخانەکەی ئێوارانی دەنووسی. ئەویش تەنیا حەزی لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بوو کە

خۆی هەڵیدەبژاردن نەوەک ئەوانەی قوتابخانە ناچاری دەکرد بیانخوێنێتەوە.

"ئەری هەرگیز خورش خەلالت[49] خواردووە؟" بەمە ویستم لە بەرانبەر دلۆڤانییەکەیدا هەندێ قەرەبووی بۆ بکەمەوە، نەخاسمە ئەو دیڤیدی (بۆنی ژنێک)ی پێدام سەیری بکەم، کە بۆ سێ هەفتەی ڕەبەق خۆشترین فیلممان بوو. خۆی دەبوایە دیڤیدییەکە لەنێو لاپەرەکانی فەرهەنگی ئینگلیزی ـ فارسییدا بشارمەوە، کە تاکە کتێبی پیرۆزی من بوو، ئاخر یارمەتیدام تا لە دەمەتەقێی نێو فیلمەکە بگەم، چونکە زۆر حەزم لێی بوو.

شلێر سەرێکی بادا، گلۆپی بنێشتی دەمی تەقاند و لە بری ئەوەی لەسەر کورسی دابنیشێ، لە سەر مێزە ڕەنگ قاوەییەکەدا دانیشت.

لەسەر بنێشتجووینەکە سەرکۆنەم کرد و گلۆپە بنێشتەکەم لێتەقاند. ئینجا گوتم: "من دەربارەی خواردنی کوردییەوە دەدوێم. پارچە گۆشتی گوێرەکە بە گوێز و زرشکەوە... بلێ ئێ؟"

ئەو کارمەندەی کتێبخانە کە فێربوو بێهوودە سەرکۆنەی شلێری کرد لەسەر رەفتاری "کوڕانەی"، بەنێو مێزەکاندا دەگەڕا تا دڵنیابێ لەوەی کردەیەکی نالایق لەئارادا نییە، کردەیەکی وەک نووسینی نامەیەکی دڵداری. چاویلکە چوارچێوە زیویەکەی بە خەناوکەیەک بە ناوەڕاستی سینگییەوە وەکردبوو، کاتێکیش بەنێو دۆلابی کتێباندا دەڕۆیشت تا سەر کەپووە دەندووک ئاساکەی بەرزی دەکردەوە.

---

[49] خورش خلال واتە شلەی بادەم، خواردنێکی کرماشانییە.

"نەمدەزانی فێرە چێشتلێنان بووی، ئیدی ماست و شەکر لای تۆ باوی نەما؟" شلێر وەهای گوت و ڕەتیکردەوە لا لە کارمەندی کتێبخانەکە بکاتەوە، سەرێکی بادا و کاتێکیش بە لایدا تێپەڕی ئاخێکی هەڵکێشا.

"هاهاها.... ئەدی، ماست و شەکر خۆشبێ، بۆیە هەرگیز هەڵمنەدا. ئەرێ دایکت چۆنە؟"

"ئەو باشە. ئەم بەیانییە پێیگوتم کە چۆن دایکت وێنەی تۆی بە قاچاغ بۆ باوکت دەگەیاندە زیندان."

"بە ڕاست، تۆ دەبێ هەموو شتم لەو بارەیەوە بۆ بگێڕییەوە."

"ئەمەیان دەبێتە چیرۆکی دەستی پێنجەم. باوکت بە باوکمی گوتبوو، ئەویش بۆ دایکم، دایکمیش بۆ من. داوا لە باوکت بکە با بۆت بگێڕێتەوە."

کچێکی عەینەک ئەستوور وسسێکی لێکردین و سەری بەسەر لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا گرتەوە. شلێریش ئاوڕێکی لێدایەوە.

"کەواتە دەتەوێ بچینە لای من؟"

"دەی با بچین." ئیدی شلێر لەسەر مێزەکە بازی داو و دەستی دایە پاڵتۆکەی و کۆڵەپشتە شینەکەی.

لە مەیدانەکەدا دەستەیەک لە کچانی دواناوەندی سەرگەرمی قسە و پێکەنینی خۆیان بوون. گۆمەکەش بە چینێکی ئەستووری بەفر داپۆشرابوو. "دەی سەبارەت بەو کاری فریاکەوتنە بدوێ کە دەتکرد."

"نەخێر،" شلێر کورتە وچانێکی دا، ڕوانینەکەی زۆر چڕ بوو، ئینجا هاتەوە قسە: "نەخێر. کارکردن لەوێ ناخی مرۆڤی دەهەژاند. بەرگەی بیستنی بەسەرهاتەکانم ناگری، توخوا لەوبارەوە هیچم لێمەپرسە. باشە؟" دارەکانی سەر ڕێگەی وێستگەی پاس، قوربانی ڕەشەبا توندەکەی دوێنێ شەو بوون، سەروگوێیان شکابوو، ڕەگەگەکانیش ڕووتبووبوونەوە و بەدەرەوە بوون. یەک دوو کۆڵانمان بە بێدەنگی تێپەڕاند، تا ئەوکاتەی شلێر کەوتە سەر باسی شتێکی ئاسانتر.

ئیدی بە جەفەنگەوە گوتی: "ئەرێ تا ئێستا هیچ کوڕێکی ژیکەڵەت بینیوە؟ دوێنێ شەو کریس ئۆدۆنێلم ماچکرد. هەڵبەتە لە خەونی خۆما" ئەو کەیفوسەفا کۆتنەکراوەی ئەو پێچەوانەی زۆر لە کچانێک بوو، کە ڕەفتاری خۆیان جڵەوکردبوو، بەمەش سەرنجی ڕێبوارانی هێڵی هاتوچۆی گشتیی بە سەرزەنشتەوە بۆ لای خۆی ڕاکێشا. ئەو پیاوانەی لەگەڵ ئێمەدا سواری پاسەکە بوون، پێیان وا بوو گیانی ئازادانەی شلێر ئاماژەیەکیشە بەوەی شل بێ و بە ئاسانی دەستەمۆ ببێ، بۆیە لەو وێستگەیەی ئێمە لێی دابەزین ئەوانیش دابەزین و بە دواماندا هاتن و ئینجا کەوتنە خۆنواندن. منیش وررووژابووم، هەستمکرد لە پەنجەرەی ماڵەکانی دەرودراوسێوە سەر دەهەژێن و چاویش لەسەر ئێمەن. شلێریش بێباکانە لەسەر دەمەتەقێی خۆی دەربارەی لێوەتەڕەکانی کریس ئۆدۆنێل بەردەوام بوو.

کاتێکیش پێمان خستە ماڵەوە، فلیمە خۆشەویستەکەمان لێدایەوە. شلێر لە داڵغە و خەیاڵی خۆیدا خەریکی سەمای تانگۆ بوو لەگەڵ قلەکەی، کاری سەیروسەمەرەی کرد. منیش لە سەرە تراشراوەکەی

نزبوومەوە، هەر تەنیا پۆڕی درێژ بوو، بە شێوەیەک کاتێک سەرپۆشی دەبەست نەتدەزانی سەر ڕووتەڵەیە. ئەو بە شەوقەوە دەستی گرتم و بە دەوری خۆیدا سووڕاندمیەوە، بەڵام من ئەوەندە حۆل بووم نەمدەتوانی پێی ڕابگەم، بۆیە خۆم لێدزیەوە و چوومە ناندین و خۆم بە ئامادەکردنی خواردنەوە سەرقاڵکرد.

شلێر لە کاتی خواردنەکەدا پەنجەی خۆی لستنەوە و هەموو جووڵەیەک و دەنگێکی سەرنجڕاکێشی کرد. پیرە کورسییەکەمان لەرزی کاتێک شلێر خۆی بۆ تێکردنەوەی قاپەکەی شۆڕکردەوە. کەوچک لە دوای کەوچکی دەدا و هەر بێنی نەدایێ.

"بۆچوونێکم هەیە!" من بووم وەها سەری قسەم داهێنا؛ "لەو باوەڕەدام تام و بۆنی خواردن لەسەر بنەمای ئەو وزەیەی لە نێوان خەڵکی سەر خواندا و لە کاتی خواردندا دەگۆڕێ."

ئەویش چەورییەکەی سەر لێوی سڕیەوە. "من دڵنیام شێت و شەیدای خواردنی دەستی دایکە خۆشەویستەکەمم، بەڵام هەرگیز شتێکی وەها بە تامم نەخواردووە. تەواو تێر بووم."

ئینجا لەسەر قەنەفەکە پاڵمان دایەوە و گوتم "غەریبی جوانە دەکەم."

"تۆ دەبێ سەری بدەی. ئەویش غەریبیت دەکا."

دەستمان بە تەماشاکردنی فیلمەکەمان کردەوە: "منیش لێرەم تا پیت بڵێم..." ئیدی من و شلێر ئەو قسەیەی ئال پاچینۆمان[٥٠]

---

[٥٠] ئال پاچینۆ، ئەکتەری بەناوبانگی ئەمریکی، لە خانەوادەیەکی بە ڕەچەڵەک ئیتالیە.

دەگوتەوە، ئەو دێڕانەی هەردووکمان لەبەرمان بوو، ئەو ڕستانەی هێزی دەربڕینی خستە پێشچاوم.

چەندین مانگ توتی ئاسا بەدەم گوتنەوەی ئەو وشە و دەستەواژانە و ئەو دەربڕینانە وای لێ کردبووین بە شێوەیەکی ساختەش لاسایی شێوەزاری ئینگلیزیی ئەمریکایی بکەینەوە.

ئەوە بوو زەنگی تەلەفۆن لێدرا و خۆشی و جەفەنگی ئێمەی بڕی. لەوسەری تەلەفۆنەوە چیا پێویستی بە هەندێک هاندان هەبوو. "لە مادەی سێی بەندی چواردەمدا، دەستوری ئێران مافی وەک یەکی بۆ هەموو کەمایەتییەکانی ئێران فەراهەم کردووە." ئەو بەم شێوەیە کەوتە قسە. لە دەنگیڕا دیاربوو زیرەک و ئاڵۆز دەدوێ، بەڵام ئەوەی لە بیرچوو لە حاڵم بپرسێ. ئەو درێژەی بە قسەکانی دا: "بەڵام ئێمە لە سەر ئاستی مامناوەجی و باڵای پۆستەکانی حکومەت و خوێندن بە زمانی زگماکەوە حاشامان لێکراوە. بە مەبەست گوێنەدان بە بواری پەرەسەندن لە ناوچەکەماندا و لاپەڕگەکردنی باری ئابووریمان بە توندی ڕێگربووە لە بەشداریی ژیانی گشتیی ئێرانییدا."منیش نەمدەزانی هەندێ لەو وشەکانی واتای چی دەگەیەنن.

شلێر پرسی: "ئەوە کێیە؟"

منیش پانیەدەستم بەسەر دەمەوانەی تەلەفۆنەکەدا گرت. "براکەمە."

ئینجا شلێر دەسکی تەلەفۆنی بۆ خۆی ڕاکێشا: "سڵاو سڵاو جەنابی زانای سیاسەت. ئەری شارە گەورەکە چۆنە؟"

هەرچەند ئەو لەوسەری تەلەفۆنەوە قسەی دەکرد، شلێر ئەوەندی دیکە پڕ بە دڵ پێدەکەنی. منیش بە خورتی دەسکی تەلەفۆنم ڕاکێشایەوە بن گوێی خۆم، بەڵام هەموو ئەوەی گوێم لێبوو، هەر قاقا بوو."ئەرێ نە چی پێدەکەنی؟ بۆچی نوکتە بۆ من ناکا؟"

شلێر کەپووی لەبەر قاقای پێکەنین دەلەرایەوە گوتی: "لەیلا لێناگەڕێ لەگەڵت قسە بکەم."

لە دواییدا جڵەوی تەواوی تەلەفۆنەکەم کەوتەدەست و دامخستەوە.

شلێر سەرە ڕووتەڵەکەی خوراند و گوتی: "پێم وا بوو دەتەویست قسەی لەگەڵ بکەی."

"ئەرێ شلێر سەرت بۆ وەها تاشیوە؟"

ئەویش ئارویەکی لە بەفرگرەکە دەرهێنا و گوتی: "بڵێم چی."

منیش قاپێک و چەقۆیەک و خوێدانێکم لە بەردەمیدا دانا، بەڵام ئەو هەر گوێشی پێنەدام و ئارووەکەی دایە بەر قەپاڵان. "یەکەم جار کەوام لە پرچم کرد، ئەو ڕۆژەی یەکەمین سووڕی مانگانەم بوو. خۆ لە یادتە. ئەو ڕۆژە خەریکبوو لە هەراسانیان دەمردم. هەر چۆنێک بێ، هەینێ ڕاستەوخۆ چوومە لای دەلاک، مەکینەی سەرتاشینم هێنا و خۆم لە کۆڵ پرچم کردەوە."

من بالیفێکم لە بن ئانیشکم داناو پاڵمدایەوە. "باشە تۆ ویستت لە کۆڵ ژنایەتیت ببیەوە."

"لەوانەیە." پەنجەی بۆ لێوی خوارەوەی برد، ئەویش پشتی بە کورسییەکەوە دا، سەری بەرزکردەوە تەماشای چراکەی ناوەڕاستی ژوورەکەی کرد، کە بە وایەرێکی سپی هەڵواسرابوو. "من کەسێکم خۆشدەوێ."

"لەگەڵ کریس ئۆدۆنیل؟"

"گەمژە، نەخێر. لەگەڵ پیاوێکی ڕاستەقینە. مەبەستم پیاوێکە کە لێرە دەژی."

من بە حەپەساویەوە گوتم: "تۆ دۆستت هەیە؟ تۆ بڵێی ئەو بێژمۆتە بە بەختە کێ بێ؟"

بە تیلەی چاو سەیرێکی کردم. "ناتوانم پێتبڵێم، هەرچەندە زۆریش دڵنیام کە من بێژمۆتە بە بەختەکە منم."

"تۆ هەر دەبێ وابێ." بالیفەکەم ڕاوەشاندێ. "دەی پێم بڵێ. من دەیناسم؟"

ئەویش قاقایەکی لێدا: "دواتر بۆت دەردەکەوێ."

بە پەستییەوە نوقرچکێکم لەباسکی دا: "کێیە؟"

ئەویش ئامبازم بوو، ئینجا گوتی: "بەیانی. بەیانی پێتدەڵێم. من دەبێ سەرەتا داوای مۆڵەت لەو بکەم. بەڵێن دەدەم."

## بەندی دە

ژنێک، لە دەروازەی کتێبخانەی مەڵبەندیی شاردا، کە خۆی لە چارشێوێکی ڕەش وەرپێچابوو، لە ناسنامە و پۆشاکی هەر ژنێکی هاموشۆکەری دەپرسییەوە. ئەم باڵەخانەیە دوو نهۆمە جێگەیەکی "نموونەیی" نەبوو بۆ خەڵک. تابلۆیەکی کەتە بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو. فەرمایشتێکی محەمەد پێغەمبەری لەسەر نووسرابوو: "لە لانکەوە بۆ گۆڕ بە دوای زانیاریدا بگەڕێ." هەر بە تەنیا بۆنی بۆیاغ لە باڵەخانەکەوە دەهات، دوور بوو لە بۆنی تۆز و غوباری کتێبخانە کۆنەکە، کە من خۆشم دەویست، بەڵام ئەمەیان کۆمەڵە کتێب و فیلمی نوێی تێدا بەردەست بوون.

بە گوێرەی پلانەکە، شلێر لە گۆشە دوورەکە بوو. دەنگی زرمەی کۆڵە پشتە زلەکەی حەپەساندمی. ئارەقەش لە نێوچاوانیدا بریقەی دەدایەوە. داوای لێکردم: "ئەرێ دەکرێ ئاگات لەمە بێ؟" بەڵام خۆ چاوەڕێی بەرسڤم نەبوو. لێیدا ڕۆیشت. ئەو هەر وەک چۆن لەپڕ دەرکەوت، ئاواش لە ناکاو ونبوو. منیش جانتاکەیەم لای خۆم دانا و چۆکم وێدا و هەر خەریکی خوێندنەوەی 'یۆل'ی یەلماز گونەی بووم. ئەو فیلمەی لەو کاتەدا تۆمارکرابوو کە فیلمسازە کوردەکە ئاخنرابووە زیندانی تورکیا. ئەم فیلمە قەدەغەکراوە چەندین خەڵاتی نێودەوڵەتی وەرگرتبوو.

ئەوە بوو بڵندگۆکە ڕایگەیاند؛ دوای پازدە خولەکی دیکە کتێبخانەکە دادەخرێ. منیش بەنێو ڕیزە ڕەفەی کتێبەکاندا چاوم بۆ

شلێر گیرا، لە هیچ کونێک دیارنەبوو. شوێنەکە خەریک بوو چۆڵ دەبوو، لە "دەستوپێسپییەکی[٥١]" وەک من زیاتر کەسی لێنەمابوو، ئەم وشەیەشم هەر لە فلیمان قۆستووەتەوە. بە دوایدا سەرێکی ئاودەستەکانیشم دا، لەوێش نەبوو. وەهام مەزەندەکرد لە حەوشەکە بێ، وەک هەمیشە خەریکی زۆربلێی بێ.

کاتێکیش لە پەیژەکان دابەزیم، لە پەنجەرەکانەوە لایتی ترومبێلی پۆلیسی ئاکارم بینی دەبریسکایەوە. وەستام. شلێر کەلەپچە کرابوو، بەڵام هێشتا خەندە مەکرۆیەکەی هەر لەسەر لێوان بوو. نەمتوانی گوێم لێ بێ ئاخۆ چی بەو ژنە گوت، کە لە تەوقی سەری تا پاشپانی لە بن عەبای ڕەشدا بوو، ئاخر ئەو یەکێک بوو لە ئەفسەرە ژنەکان، بۆ کاری پشکنین لەوێ بوو، چونکە نەدەکرا پیاوان ئەم کارە دەرهەق بە ژنان بکەن. ئەم ژنە پاڵی بە شلێرەوە دەنا و بەسەریشدا هاواری دەکرد: قەحپە، هەی ماکەر.

پێدەچێ لە بنکەی پۆلیسیش شلێر بخرێتە بن پرسی شیکاریی پەردەی کچێنی، ئەگەرچی هەر لێی دەردەچێ، بەڵام خۆ جێتێخی سووکایەتییەکە هەر دەمێنێ. ئارەزووم بوو لە توانامدا هەبووایە شتێکی بۆ بکەم. ئیدی بە سەلامەتی گەڕامەوە لای ئاودەستەکان و کۆڵەپشتەکەیم پشکنی. پڕ بوو لە دیڤیدی و کاسێتی ڤیدیۆ. نزیکەی پەنجا دانەیەک دەبوون. ئێ خۆ لەو گەنجینەیە باشترم دەست نەدەکەوت. خواستێکی پەرۆشانەی بە گوڕم بۆ پەیدابوو کە زوو

---

[٥١] مەبەست وشەی nerdی ئینگلیزییە، ئەو کەسانەی عەینەکێکیان لەچاوە، تێکەڵی کەس نابن، خوو بە یەک شتەوە دەگرن جا خوێندن بێ، یان گەمەی ئەلەکترۆنی بێ، یان کۆمپیوتەر، ستایلی جلوبەرگیان و پرچ و دەم فلق و ددانیان زۆر نارێک و شەپرێوە، وشەی دەستوپێسپیم بە شێوەیەک لە شێوەکان بە بەرانبەر زانی.

خۆم بگەیەنمەوە ماڵێ سەیریان بکەم، هەر بەو دۆخە، بێ نانخواردن و تەنانەت بێ هەناسەدانەوەش بمێنمەوە تا تەماشایان بکەم. بەڵێ، هەر تەنیا سەیرکردن. هەموویان قووت بدەم، بەڵام ڕەنگبێ هەر ئەو فیلمە قەدەغەکراوانە هۆکاری گرتنی شلێر بن.

ئاوەزیشم پێیگوتم، دەی جانتاکە فڕێدە و بەرەو ماڵ بە بێ ئاوڕدانەوە غاردە و بڕۆ، بەڵام خۆ ناوەڕۆکی جانتاکە ئەو شتە بوو من بە ژیانم خوازیاری بووم؛ هەر هیچ نەبووایە بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ و هەفتە دەبووە مایەی دڵخۆشیم.

کارمەندانی کتێبخانەکە لە سەروبەندی داخستنی کتێبخانەکەدا بوون، منیش دەبوایە بکەومە خۆ و پەلە بکەم. گوێم لە پۆلیس بوو، لە ئانوساتدا بوون بێن و ئەو شتەی ماوە بیپشکنن. خۆ ئەگەر بە یەکێک لەو فیلمانەوە بگیرێم، بابە لێم خۆشنابێ. بە ئاسانی هەناسەم پێنەدەدرا.

"کەس لێرە ماوە؟"

پێموابێ تێکەوتم. "من!"، بەم جۆرە وەڵامم دایەوە، بەڵام قوڕگم ئەوەندە وشک بوو، بە ئاستەم دەنگم دەبیسترا.

ئەم جارەیان بە دەنگێکی زلتر: "کەس لێرە ماوە؟"

دەنگی کارمەندە پیرەکەی کتێبخانەم ناسیەوە، ئەوەی کتێب و گۆڤارەکانمی پشکنی بوو. ئیدی قوڕگی خۆم سافکرد. "هەر یەک خولەک". تۆ بڵێی دەنگە بە زریکەکەم دەربازم بکا.

خەریکبوو دەنگی تەپەی پێیەکانی لە داڵانەکە نەدەما کە گوتی: "وا خەریکە دایدەخەین."

دەبوایە جانتا پڕەکەم لە شوێنێک دانابایە، دواتر بمتوانیبایە بیهێنمەوە. بەڵکو لە شوێنێک لە نێوان کتێبەکانی ڕشتەی ئایین، کە هەر یەکێک لەم وڵاتەدا بە زیادەوە لە بابەتەکەی ڕوانیوە، بەڵام خۆ هۆڵە سەرەکییەکە داخرابوو. بنمیچەکەش لە گەچ بوو، ئیدی تاکە بژاردە تەنەکەی خاشاکەکە بوو.

بە دەستێکی لەرزۆکەوە، حەوت لە فیلمەکانم دەرهێنان و خستنمە نێو جانتاکەم و باقی گەنجینەکەشم فڕێدایە نێو تەنەکەی خاشاکەوە و جانتا شینەکەم لەبن کاغەزەکان شاردنەوە، ئەو پەڕانەی لە دەفتەرەکەم کردنەوە و پێم داپۆشی. شتەکەش وەک ئەوە وابوو دڵی خۆم گۆڕەوشار بدەم.

پاشان لەوێ هاتمە دەرەوە و دەستیشم بە سابون شوشت. فاتیماش کە تازە هاتە ئاودەستەکە بە سرتەیەکەوە گوتی: "ئەو سوراوەش بشۆ! ئەوان لە دەرەوە وەستاون." منیش ئاوم بە ڕوومەتە پەمەییەکانمدا کرد، بەڵام بێ سوود بوو. ئاخر خۆ من هیچ مێکئەپێکم نەکردبوو.

چارە نەما، بەدەر لەوەی ڕاستەوڕاست بە لای پۆلیسدا بڕۆم و هیوای باش بخوازم. هەوڵمدا خۆم بێ باک ڕابگرم، پرچم خستە بن سەرپۆشەکەم و بە هێواشی ڕێمکرد. لێ ئەوکات بۆم دەرکەوت، زۆر هێواشم، بۆیە هەندێک پێم هەڵێنا. باشە چی دەبێ ئەگەر هاتوو کۆڵەپشتەکەیان پشکنیم؟ ئەو وشانەی "ئەمر بیلمەعروف و نەهی عەنمونکەر"، کە بە باشی و بە جوانی لەسەر ترومبێلەکەی پۆلیس نووسرابوون ئەوەی دەگەیاند مافی ئەوەمان هەیە ڕێ لە هەر کەسێک بگرین، کە گومانیان لێی هەبێ. خۆی دەبوایە بگەڕاباماشەوە

ژووری ئاودەستەکان و سەرتاپای دیڤیدییەکانم فڕێدابانە زبڵدانەکەوە، بەڵام بەم کارەم گومانم لای ئەوان دروستدەکرد. ئاگرێکم لە هەناو بەربوو، دەیسوتاندم.

بۆ دواوە گەڕامەوە و ڕەمەکیانە بەرەو لای فاتیما ڕۆیشتم، کە لە پەیژەکان دەهاتەخوار و چارشێوە ڕەشەکەی بەخۆیدا دابوو. "هاتووم داوای شتێکت لێبکەم."

ئەویش وەک زۆرجاران هەر وای دەکرد، چاوێکی بەو ناوەدا گێرا.

"دەمەوێ داوات لێبکەم. چۆن....؟ ئمممم... ئەرێ ڕات چییە ئەگەر بەشداری تاقیکردنەوەی نیشتمانیی ئەمساڵ بکەینەوە؟" هەر لە خۆزاییەوە خاڵێکی هاوبەشم دۆزییەوە. شکست. دیاربوو فاتیما لەنێو کۆمەڵگەیەک، کە بەهای بۆ ژن لەسەر کەپووبچووکی و لێوخڕوپڕی دادەنا، خوازراو نەبوو، بەڵام خانەوادە فرەپوڵدار و مەزهەبییەکەی ئەو هەستێکی باڵای لە نێو کۆمەڵگاکەدا بۆ پەیداکردبوو. بابە ناشایستەکەی، ئەوی جارێکیان کامێرای هێنایە قوتابخانە، سەرۆکی دامەزراوەی سەرچاوە سروشتییەکان بوو لە پارێزگای کوردستان. تاکە شایستەییشی ئەوە بوو غەیرەکورد و شیرەخۆرەی حکومەت بوو.

فاتیما گوتی ئەو سەبارەت بەوە زۆر نیگەران نییە، ئاخر بۆ پێنجەمین جاری تاقیکردنەوەی چوونە زانکۆ شکستی هێناوە، ئەوەشی ڕوونکردەوە، چەندین خوازبێنی هاتوون و "بە دوای داوێنپاکیی نەوەک ڕواڵەت و ڕوخساردا هاتوون". منیش بە مەیلێکی ساختەوە گوێم لێ گرت، مەراق بووم خۆ ئەگەر ئەمجارە پۆلیس

ڕێگەم پێنەگرێ و هەراسانم نەکا، خۆ ئەگەر باوکم بزانێتەوە قسەم لەگەڵ فاتیمادا کردووە، ئەوا خۆیم لێ بێبەری دەکا. ماڵباتەکەی ئەو کچە، بە گوێرەی ڕوانینی بابە بێ، "ئەو زەرووانەن کە سامانی سروشتیی خاکی کوردان هەڵدەمژن و مشەخۆرانە بە خوێنەکەی قەڵەو دەبن."

پیاوێکی بە ڕدێن لە ترومبێلە ڤانەکەی پۆلیسەوە بەرەو ڕوومان هات، هەناسەم لە سینگما ڕاوەستا. ئەو ئەوەندە چووبووە نێو باسکردنی چیرۆک و خەونەکانی، ئاگای لەوە نەمابوو کە من لاچکی جانتا سپییەکەم توند کرد و بە ئاستەم بەسەرخۆمدا زاڵبووم بەوەی تێبتەقێنم و ڕابکەم. ئیدی فاتیما هەر قسەی بۆ ڕووە بزڕکاوەکەم دەکرد و وەها لەسەری ڕۆیشت: "یەکێ لە داخوازیکەرەکان، ئەندامێکی کەشخەی پەرلەمانە. پێشتنالێم ئاخۆ کامەیانە، بەڵکو هەر خۆت پێشبینی بکەی. ئەو بۆ هەتاهەتایە منی دەوێ؛ خۆشت دەزانی ژنێکی بە ئابڕوو خواستی زۆرتر لەسەرە تا یەکێکی چاولەدەر."

پیاوە تەمەن مامناوەجییەکە، کڵاوە کەسکەکەی وەک ڕێزێک لە سەر هێنایە خوارەوە گوتی: "سڵاو، خاتوون."

منیش لە شوێنی خۆم، وەک کۆتەڵێک هەر سەیری فاتیمام دەکرد.

کابرا لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت: "پێیان گوتووم بتگەیەنمەوە ماڵێ. شوفێرەکەی باوکت داوای لێکردووم، چونکە ئەو نەیتوانی بێتە دوات."

پۆلیسەکە بۆ ئەوە لەوێ بوو تا فاتیما بگەیەنێتەوە ماڵەوە نەوەک شلێر لەبەر فیلمەکانی دەستگیر بکا. پەککوو لەو نەفرەتییە. دیاربوو

شلێر لەبەر ئارایشەکەی گیرابوو. من دەبوایە بگەڕابامایەتەوە لای ئاودەستەکان و جانتاکە بێنمەوە.

فاتیما چاوی بەردانەوە سەر شۆستەکە کاتێ وەڵامی کابرای دایەوە: "دیسان؟" ئاخر کچێکی بەستەزمانی وەک ئەو هەرگیز نەدەبووایە ڕاستەوڕاست سەیری دوڕ چاوی پیاوانی بکردبایە. ژنێکی بە حەیا و شەرمی وەک ئەو تووشی کێشە نابێ، هەر ئەوانەی وەک شلێرن سەر بە گۆبەندن.

"کوڕی شۆفێرەکەتان کەوتووەتە نەخۆشخانەیە."

فاتیما ڕووی کردە من و گوتی: "لەیلا دەکرێ تۆش بگەیەنینەوە ماڵەوە."

خەریکبووم بڕشێمەوە. بەختم بەوە باش بوو پۆزشێکی باشم بە دەستەوە بوو تا پێی بڵێم نەخێر. "زۆر سوپاس، بەڵام خۆ ماڵی ئێمە لە دیوەکەی دیکەی شارە."

"گوێ مەدەرێ. لە ڕێدا باسی خوازبێنییێکی دیکەت بۆ دەگێڕمەوە. "فاتیما بە متمانەوە بەرەو لای ڤانەکە ڕۆیشت، وای چاوەڕوان دەکرد بە دوایدا بڕۆم. خۆ ئەگەر درۆزنێکی خراپ نەبووبام، دەبوایە لەبەر خاتری سەلامەتی لەگەڵی سوار بوومایە، بەڵام ترسام مەبادا پۆلیس لە زمانی جەستەوە گومان بکەن لەوەی شتێکم شاردووەتەوە. هەرگیز ئارەقەیەکی وەک ئەو ڕۆژەم دەرنەداوە.

هاوارمکرد: "تازە بە بیرم هاتەوە، من دەبێ ئەمشەو بچمە لای داپیرەم. ئەوەتا لەوێ دەژیێ." بە دەم ئەم قسەیەوە بە کەڵەموست ئاماژەم بۆ پشتەوەی خۆم کرد. "ئەو نەساغە و دایکیشم پێویستی بەوەیە ئاگام لێی بێ."

لە کاتێکدا پۆلیسەکە کڵاوەکەی لەسەر نایەوە گوتی: "یەکێک تا ئەوێ لەگەڵت دەڕوات."

لەوە زیاترم شت بگوتبا ئاشکرا دەبووم.

" لەیلا خواحافیز." فاتیما گەڕایەوە و ڕوومەتی ماچکردم، کە گەرم داهاتبوو. دیاربوو لەو چەند خولەکەی تێپەڕیبوو، ئێمە بووبووینە باشترین برادەر.

پۆلیسەکە فاتیمای بردە نێو ترومبێل و بە منیشی گوت: "خاتوون، دەی بڕۆ. یەکێ لە پیاوەکانمان بە دواتدا دەڕوا. بڕۆ بە سەلامەتی."

منیش داماوانە سەرم بۆ لەقاند. "سوپاس." پۆلیسەکان پێیان وابوو ئەوان لە پیاوانی دیکە کەمتر ژنان دەترسێنن. هەیتە. هەر بۆیە لە فیلماندا پێیاندەڵێن هەیتە.[٥٢]

ئیدی پێم لەگەڵ لێدانی دڵم هەڵهێنا و بە بێ ئاوڕدانەوە بۆ دواوە لە شەقامێک بۆ ئەوی دیکە ڕۆیشتم. گەیشتمە بەردەرکەی ماڵی داپیرەم، ئەوسا زانیم، کتێبخانە بۆ بەیانی تەنیا بۆ پیاوانە؛ ژنان ڕێگە نادرێن.

دراوسێیەکی بێ کەڵبە و دانم لێ وەدەرکەوت: "کچی گەنج سڵاوت لێبێ"، کابرا لە بەردەرکەی ئەپارتمانەکە وەدەرکەوت. من ئەوەندە هەناسەسوار بووم لە سەر لەقاندن زیاتر هیچم پێنەکرا. لە مەودایەکی دوورەوە نیگام کەوتە سەر هەیتەیەکی بەرگ کەسکی

---

[٥٢] ئەوەی ڕاستی بێ لێرەدا نووسەر وشەی Copsی بەکارهێناوە، کە گەمەیەکی زمانەوانی تێدایە. بە پۆلیس یان ئەفسەری پۆلیس دەگوترێ، هەڵبەتە ناوەکەش نافەرمییە، لە copەوە هاتووە، واتای ڕاوەدوونان و گرتن دەدا. لێکدانەوەی دیکەش هەیە کە بۆ چاودێری نەوتیش بگەڕێتەوە. لە بەرانبەردا لە وشەی هەیتە باشترم بۆ نەدۆزییەوە.

دیکە لە شەقامەکەدا دەسووڕایەوە، لەو ساتەدا پلیکانەکانم دوو دوو دەبڕین تا بگەمە نهۆمی سێیەم.

دڵۆپە ئارەقە لە قوتقوتۆکەی ئەوکمەوە بەنێو درزی مەمکەکانمدا بۆ سەر سینگم شۆڕبوونەوە. هەستم کرد نەساغم. ئەرێ تۆ بڵێی چی بەسەر شلێری بەستەزماندا هاتبێ؟ ئای کە دەستەپاچە بووم، نەمتوانی هیچی بۆ بکەم.

دایکە بە دیتنم سەرسام بوو، بەڵام نە بۆڵەبۆڵی کرد، نە شەڕی لەگەڵ کردم و نەدەریشی کردم. ئەو گرێی سەرپۆشەکەی توندکردبوونەوە لە ژووری میوان نوێژی دەکرد و ٩٩ ناوە لەیەک جیاکانی خوای بەویرد دەگوتنەوە، دوای هەر ناوێک دەنکە تەسبیحێکی دەهاوێشت، دەستی بەو پیرۆزی و موفەرکییەی وەگرتبوو کە بۆی دەپاڕایەوە. تەنانەت نیگەرانییە زەقەکەی منیش دەربارەی شلێر لە حاڵەتی خۆی نەدەشڵەژاند.

نەنەش لە هۆدەی نوستنێ بە دایبی و شێواویی خۆیەوە، لەچاو یەکێک کە لەسەر لێوی قەبر بێ باش دەهاتەبەرچاو. پێدەچوو ڕاوێچکەکانم ڕایهەژاندبێ.

منیش بە پەرۆشییەوە گوتم: "داپیرە هەر ئێستا دەستەخوشکەکەی منیان گرت. لەسەر هیچ و خۆڕاییش! نازانم چی بکەم." ئەویش بە گومانەوە سەیرێکی کردم و پرسی ئاخۆ من دشی نەوم. "یەک دوو خولەک دواتر گوتی: "ساتێک بوەستە! من دەتناسم. تۆ دراوسێکەمانی."

منیش ئاخێکم هەڵکێشا. "نەنێ، خەم مەخۆ. ڕاستیت بوێ، خۆشم نازانم کێم."

شتێکی بێهوودە بوو لەوێ پتر بمێنمەوە. نەمدەتوانی یارمەتیی شلێر بدەم، بەڵام خۆ دەمتوانی باقی فیلمەکانی دیکە ڕزگار بکەم. دوای ئەوەی لە ماڵی داپیرە ڕۆیشتم، لای کتێبخانەکە وەستام، بە چاودێرەکەی کتێبخانەم گوت، کەوا سەرلەبەیانی ئەمڕۆ گوارەیەکی زێڕم لە ئاودەستی کتێبخانەکە لەبیرکردووە، ئەگەر ڕێگەم پێبدا بیهێنمەوە.

چاودێرە گەنجەکەش بە دەمگرکردنەوە: "کچەتیو، لاچۆ لێرە."

بە دڵێکی خەمبارەوە سواری پاس بووم و گەڕامەوە ماڵێ.

## بەندی یازدە

"ئەرێ شلێر گوێت لێمە؟" دەستم لەسەر دڵم دانا و لەبەردەم پەنجەرەی ژووری نوستنمدا کڕنووشم برد. نزامکرد بەڵکو دەستەخوشکەکەم هەست بە وشەکانم بکا. "من و تۆ قوربانیی دەستی شێتایەتیی نەتەوەیەکین، کە سزای ژنایەتی و هونەر دەدا و ڕێزیش لە دز و بکوژان دەگرێت، بەڵام خۆ تۆ بە تەنیا نیت. من لەگەڵتدام. ئەوەش دەزانم تۆ بەهێزی. تکایە بەهێز بە."

بەفر بەسەر سەرمدا داباری. هەناسەشم بووە هەڵم.

بابە بە پرتاو خۆی بە ژوورەکەمدا کرد و پەنجەرەکەی پێوەدایەوە. "ئەرێ ئەوە تۆ چیت لێهاتووە؟" منیش لە شوێنی خۆمدا دەکولام.

لە شوێنی خۆم ڕاچەنیم: "ئەرێ بابە دەکرێ شلێر ڕزگار بکەی؟"

"جوانە تێلی کرد. ئەرێ شلێر قسەی لەگەڵ کوڕێک یان شتێکی لەو جۆرە دەکرد؟" جلوبەرگی بابە بۆنێکی شیرینی ناخۆشی نوێی لێدەهات، پۆقژەکانی ژێر چاویشی قووڵتر و تاریکتر دەردەکەوتن.

"نەخێر. بەستەزمانەی لە کتێبخانەکە بوو. ئەرێ بابە ئەوان چی لە شلێر دەکەن؟"

"خەفەت مەخۆ. هیچی لێناکەن. خۆت دەزانی، هەر وەک هەمیشە سووکایەتی پێدەکەن. بریگرتەیەکم بۆ دۆزیوەتەوە." ئیدی وەرسوڕا

و له ژوورەکەم دەرچوو. منیش داماوانە پێویستم پێی هەبوو لەگەڵ من دابنیشێ، خەم و نیگەرانییەکانم بڕەوێنێتەوە.

"وشکەساڵی لە ڕۆژئاڤا... ئای چەند جەرگبڕە." بەدەم ئەم قسەیەوە هەوڵمدا لەسەر تەختی نوستنەکەم دابنیشمەوە.

ئینجا نیگایەکی ساردوسڕانەی تێبڕیم. چەوساندنەوە. جیاکاری. نەداری. جۆشە دێرینەکەی تاوی سەندەوە. ئەو گەلە بێ دەوڵەتەی ڕۆژئاوا، ئەوانەی قاتییان تێدا بڵاوبووەتەوە، ئەوانەی گوندەکانیان خاپوورکراون، ئەوانەی نە پارەیان هەیە و نە بەڵگەنامەیەکیش تا بە هۆیەوە داوای مافی پەنابەرێتی بکەن. کوردانی باکووریش، ئەوانەی گوندەکانیان سوتێنرا و ئەوانەی ژنەکانیان لە لایەن لەشکری تورکەوە لاقەکران؛ ئەوانەی هەر لەبەرئەوەی بە زمانی دایکیان دەدوێن، زیندانی کران و ئەشکەنجە دران...

سەیری بابەم کرد کە لەسەر کورسییەک لە تەنیشت تەختەخەوی من دانیشت، سەری بادا و لەگەڵ هاوسۆزیی چەوساندنەوەی نەتەوە دەماری گرژ بوون. کوریشکەکانی دەوربەری دەم و چاوی ڕێکهەڵاتن، هەردوو گۆشەی لالێوی وشک و شەقار بوون، پرچیشی کە تا دەهات بۆ دواوە دەگەڕایەوە، ماشوبرنجی بووبوو. ئەو هەرئەوەندە بە جەستە ئامادەبوو تا خۆی لە شتەکان نەدا، دەنا وەکی دیکە ئەوەندە بە نادادییەکانی دەرەوەی ماڵ پەژموردە بووبوو تا ڕووخاویی خۆی تێدا ببینێتەوە چ جای بە تەنیا هی من. ئەو بێدەنگ مایەوە، دیاربوو بە شێوەیەکی نائاسایی پەشێوحاڵە یان لەوانەیە هەر شەکەت و ماندوو بێ.

"بابە، تا تەمەنم نەبووە سێ ساڵان تۆ هەرگیز منت نەبینیبوو، دروستە؟ دایکەش گوتی؛ یەکەم وشەم، 'بابە' بوو." خۆی تامیسکەیەکیشم[٥٣] لە لالێو هاتبوو.

"وێنەیەکم بینی، هانا بە دزییەوە هێنابوویە زیندان."

"دەکرێ لەو بارەیەوە قسەم بۆ بکەی؟"

"خۆت دەزانی، خەریکە بیر لەوە بکەمەوە، کە زانین نرخی خۆی بە دواوەیە. پێموایە تۆ دەبێ پرسنییەکەت[٥٤] جڵەو بکەی." کە ئەم قسەیەی کرد، هەڵسا بڕوا.

منیش پێلیم گرت، ئاخر خۆ تۆ هەمیشە دەتگوت: "نەزانی زۆر گرانترە."

"ئەوە تۆ زۆر گەرمی."

من پەرۆشی چیرۆکێکی شاد بووم، بەڵام خۆ دیار بوو ئەو لەمانەی زۆر پێنەبوون. "دەی پێمبڵێ. ئەمە وام لێدەکا هەست بە باشبوونەوە بکەم." بابە لەسەر کورسییەکە دانیشتەوە و باسی سەردانەکانی دایکمی بۆ زیندانی ئێڤین بۆ لای ئەو بۆ کردم، ئەو زیندانەی زۆر لە ماڵمان لە مەریوانەوە دوور بوو، دوای گیرانی بابە، دایکم باری کردە ئەوێ.

لە هەشتاکاندا زیندانەکان لە سەرتاسەری وڵاتدا پڕکرابوون لە کەسانی ڕاستەقینە و گۆترەی ناڕازی، هەندێکیان بۆ بەدبەختی لە کاتی خۆپیشاندانەکاندا بە ڕێکەوت لەوێ دەبینرێن و دەگیرێن یان

---

[٥٣] تامیسکە: زیپکە

[٥٤] پرسنی: زۆر پرسیارکردن. خۆ لە شت هەڵقورتاندن. مایتێکەری، فزولی.

به تەلەفۆن قسەیان لەگەڵ یەکێکدا کردووە. تاوانی بابەش بەوەی لە لایەن خاوەنکارەکەی خەبەری لێدرابوو، کە "دژەشۆڕش" بووە، کوردیش بوو، لەوەش پۆلکتر سوننی بووە و دوو کتێبی قاچاغیشی لێ گیرابوون. یەکێکیان لە لایەن دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو، سەرکردە کاریزماکەی کورد، ئەوەی خەباتی بۆ مافی نەتەوەیی دەکرد، نووسرابوو؛ ئەوی دیکەش کۆمەڵە باسێک بوون لە لایەن گرووپێکی چەپەوە چاپکرابوون، ئەو گرووپەی خەباتی چینایەتی لە سەرەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی دانابوو. ئەم دوو حیزبە سیاسییەی کورد زۆر لەگەڵ یەک کۆک نەبوون، بەڵام بابە نموونەییەکەم ویستبووی هەردوو فەلسەفە و خاڵە هاوبەشەکانیان بخوێنێتەوە. کاتێکیش ئەو گیرا، تاڵترین تەوس، بەوە تاوانبارکرا کە سەر بە هەردوو گرووپەکەیە.

قاوشەکانی زیندانی ئێڤین ئەوەندە پڕبووبوون، بابە و هاوزیندانەکانی دیکەی لەسەر ناوکەوە[٥٥] ڕەقوتەقەکەی دەڕازان. بەرەبەرەش سەرنشینی قاوشەکان کەمتر دەبوون، ئاخر چەندان و چەندان لە "دوژمنانی دەوڵەت" لە سێدارەدران. خومەینی، ئەو کەسەی هەر بە خۆی خۆی کردبووە نوێنەری خوا لەسەر زەوی، فەرمانەکانی دەردەکردن: دەی کوردان بکوژن، ئەوانە گەندەڵەکانی سەرزەوین؛ کۆمۆنیستەکان بکوژن، ئەوانیش ڕوخسارە تەواوکەرەکەی کافرانن؛ موجاهیدەکان هەر بکوژن، ئەوانەش موسڵمانی نەیاری ئەون.

---

[٥٥] زەمینەی ژوور و خانوو، پێچەوانەی بنمیچ.

بابە ساڵی دووەمی بوو، لە کونجی زینداندا بوو کە دایکە سەردانی کرد. بێزار لەسەر کورسییەک لەودیو شوشەبەندێکی ئەستوورەوە دانیشت و دەستی دایە تەلەفۆن تا قسەی لەگەڵدا بکا. سەربازێکی چەکداریش هەموو ئەو شتە پێچراوانەی دەپشکنی کە دایکە بۆ بابەی بردبوون. دایکە لێوی جووڵاند، بەڵام خۆ بابە لەبەر دەنگەدەنگی تێکەڵبووی زیندانییەکان گوێی لە هیچ نەبوو. ئینجا دایکە ئاماژەی بە دەسکی تەلەفۆنەکە کرد، ئەویش دەستی دایێ.

"ببوورە، من لەیلام لای دایکم بەجێهێشتووە. هێنانی ئەو بۆ ئێرە بۆ ماوەی دە سەعات، زۆرسەختە. هەر چۆنێک بێ، هەموو ئەوەی ئەو دەیکا، خواردن و ڕیتنە."

بابەش نیگایەکی لە چاوە هەنگوینییەکان و چەناگە بەرزەکەی دایکە کرد و پەی بەوە برد کە هیچی بۆ گوتن پێ نییە بۆ خانمەکەی. تا ناخی دەروونی خۆی شۆڕکردەوە، لێ بە دەستی بەتاڵ هاتەوە دەرێ.

پاسەوانەکە ئەو وێنە بچووکەی لە بەرکەی کراسە شینەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو دەرهێنا و بە توڕەییش سەری بادا، لە سەروبەندی ئەوەدا بوو بەسەر دایکەدا هاواربکا، بەوەی چۆن وێنەیەکی بە قاچاغ بۆ نێو زیندان ئاودیو کردووە، بەڵام خۆ دایکە ئەوەندە لەگەڵ خۆدواندن سەرقاڵ بووبوو ئاگای لە کابرا نەبوو. ئیدی کابرا بانگیکرد: "خانم!"

دایکەش دەسکی تەلەفۆنەکەی دانایەوە و بە ڕوویەکی ترشی ناگراویەوە ئاوڕێکی لە پاسەوانەکە دایەوە. بابەش هەوڵیدا بزانێ ئاخو چی دەڵێ، بەڵام خۆ شتی ئەوەندە لەسەر لێوی نەبوو تا

بیخوێنێتەوە. تەنیا حەزی لە یەک شت بوو بەر لەوەی کاتەکە بەسەر بچێ تا لە دایکی بپرسێ.

دوای بە یەکگۆڕینەوەی نازونوزێکی بەردرێژ، پاسەوانەکە وێنەکەی دانایەوە نێو بەرگی کراسەکە و زریزەکەی هەڵکێشایەوە.

دایکەش دەستی دایەوە تەلەفۆنەکە. "ئەرێ چیم دەگوت؟ ئۆو، چاوم بە باوکی برادەرەکەت کەوت. ئەرێ ناوی چی بوو؟ دانا. بەڵێ ئەو بوو، خۆت دەزانی..." دایکە بە پەنجەی لە گەرووی خۆی دا. "باوکی دانا ناچاربوو لەنێو لاشە لەسەریەک کەڵەکەبووەکاندا بە دوای تەرمی ڕۆڵەکەی خۆیدا بگەڕێ. بەڵێ، بەختیان هەبوو. ئاخر زۆر لەماڵباتەکان هێشتا تەرمی منداڵەکانیشیان بۆ نەگەڕێنراوەتەوە."

بابە ، چیرۆکەکەی خۆی بڕی، تا بڵێ: "دایکت بەم شێوەیە هەواڵی لە سێدارەدانی هاوڕێ هەرە باشەکەمی پێڕاگەیاندم."

منیش لە هاوسۆزییدا تەنیا سەرم بۆ لەقاند، دەمزانی لە کەمترین ئاماژەی حوکمداندا ئەو لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە دەوستێ. بۆیە ئەو چیرۆکەکانی هەر بۆ خۆی هێشتوونەتەوە: لە ترسی ئەوەی لێی تێنەگەن.

بابە لە سەر کورسییەکەی هەڵسا، چووە لای بەفرگرەکە، بیرەیەکی ساردی هێنا و هاتەوە. پشتی بە کورسییەکەوە دا، لەسەرووی من سەیری ژووری دانیشتنی کرد، ئەوسا دەستی بە گێڕانەوەی باقی سەربردەکەی کرد.

مانگی گوڵانی ١٩٧٩، سێ ساڵ بەر لەوەی بابە زیندانی بکرێ، هەشت تانکی ئێرانی، ماڵە کوردەکانیان دایەبەر شێلکەی تۆپەکانیان.

پاسەوانانی شۆڕش، واتە پاسدار، لەبەر چاوی زەقی منداڵەکان بابەکانیان کوشتن. ئینجا دوکانەکانیاشیان تالانکرد و کەلوپەلەکانیان لە بازاڕی ڕەشدا فرۆشتەوە. پەڵەی دووکەڵ بەری ئاسمانی شینی گرت، بۆنی دارتوو و گوڵە مێلاقەی سوور تێکەڵ بە بۆنی بارووت بوو، قەدی نەونەمامەکان بەو خوێنەی تێکەڵی ڕووباری شارەکانی کوردستان بوو، سوور هەڵگەڕان.

منیش دەمزانی وەها باشتر بوو قسەکەی پێنەبڕم.

ئایەتوڵڵا خومەینی دەیەویست دڵنیابێ لەوەی دەست بەسەر باقی شار و لادێ کوردنشینەکاندا بگرێ، کاتێکیش زانی بەرگرییەکە هی جڵەوکردن نییە، نەسڵەمیەوە لەوەی فتوایەکی دینی دەربکا تا کورد بە "دوژمنی ئیسلام" خەتابار بکا، خۆ دەشیزانی زۆرینەی کورد موسڵمانی سوننە مەزهەب بوون.

بابە فڕێکی لە بیرەکە دا.

پاسدار بە پاڵپشتی تانک و فڕۆکەوە کوشتاریان لە کورد کرد. تەنانەت دەست لە نەخۆشخانەکانیش نەپارێزرا. کورد بە تەنیا مایەوە، لە سەر ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی فەرامۆش کرا. هەرچەندە کوردستان پڕ لە گەنج بوو، هاوشێوەی گەنجانی گۆرەپانی تیانئانمێنی دە ساڵ دواتر، هەوڵیاندا بەر بە هێزی سەربازی و تانکەکان بگرن.

هەستمکرد وەک ئەوەی لەناو بۆتەی فڕندا دانیشتبم، ئارەقەم دڵوپ دڵۆپ لێدەتکا، ئارەقەم بە نێو لاقان و بەسەر بڕبڕەی پشتمدا دەهاتەخوارەوە. پرسیم: "باشە کاتێ دایکە هاتە سەردانت، چیت دەویست پێی بڵێی؟" ئای خۆخواردنەوە چەند بە ئازار بوو.

ئەو سەری بەردابووەوە، سەیری ڕایەخە ڕەنگ کاڵبووە داودیارەکانی بەردەمی کرد و گوتی: "لێم پرسی ئاخۆ دایکمی لە کوێ بە خاک سپاردووە."

ئەویش وەڵامی دابووەوە: "هەڵبەتە، لە تاران، لەو شوێنەی تێیدا مرد. چی؟ تۆ دەتویست تەرمەکەی هەڵبگرم و ئەو هەموو ڕێگەیە ببڕم و بگەڕێمەوە هەڵەبجە و لەوێ بینێژم؟ بەو شەڕ و ئاگربارانە بپەڕمەوە ئەودیو؟ بە کام پارە؟ نەدەکرا ئەو کەمە ئاڵتوونەم بۆ ئەم شتە بفرۆشم."

بابە توانی لەنێو دانە جیڕبووەکانی ئەوەندەش بڵێ: "لەکوێی تاران؟"

"مەبەستم ئەوەنییە بڵێم زیندان بەهەشتە، بەڵام خۆ هیچ نەبێ لەوێ سەلامەتی. کەس زیندانەکان بۆمباباران ناکا. تۆ نازانی ڕاکردن بۆ کونەتەیارە و ژێرزەمین لەو هەموو سەعاتانەدا بە خۆت و کۆرپەلەیەک بە باوەشەوە چەند قورس و سەختە..."

"کامە گۆڕستان؟"

ئەویش خۆی مۆن کرد و گوتی: "ناوی گۆڕستانەکە نازانم. گەورەکەیان. ئەوەیان کە ـــــــ"

دەنگی فیکەیەک کۆتایی مۆڵەتی پازدە خولەکی چاوپێکەوتنەکەی لێدا.

"لانی کەم کێلت بۆ پەیداکرد؟ ناوت لەسەری نووسی؟"

ئەوان هەردووکیان لە یەک کاتدا قسەیان دەکرد، بەوپەڕی دەنگبەرزیی خۆیان، بۆ نێو هەوای خنکاوی زیندان.

دایکە بە دەست لە پەنجەرەکەی دا. ئەوانیش لێنەگەڕان یەک وشەی زیاتر قسە بکا.

دواتر لە هەمان ڕۆژدا، بابە پرێسکە شتێکی لە دایکە پێگەیشت کە بۆی هێنابوو، لە نێویدا وێنەیەکی ڕەشوسپی بچکۆلەی تێدابوو، وێنەی کچێکی چاوزەق. کیژەکەی. کاتێک من لەدایکبووم، ئەو لە زیندانەوە نامەیەکی بۆ دایکم نوسیبوو تا ناوم بنێ نیشتمان، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوەکە قەدەغە بوو، دایکم لە بری نیشتمان ناوی نام لەیلا.

منیش لێمپرسی: "کەواتە هەرگیز مۆڵەتیان پێنەدای؟"

"تەنیا یەک جار. بۆ بیست و چوار سەعات. مۆڵەتەکە زۆر کورت بوو تا لەوێوە بگەڕێمەوە کوردستان سەرت بدەم." بابە بەو سەرمایە و بە ڕۆژێکی تۆف و زریان لە گۆڕستان بە دوای گۆڕی دایکیدا گەڕابوو، تا وێنە و ناوەکەی دۆزیبووەوە، کە لەسەر کێلێک هەڵکەنرابوو. لە دوو پارچە مەڕمەڕە ساردەکە ڕامابوو، ئەوە ئیدی ئەوە هەموو ئەو شتە بوو کە لە تاکە سەرچاوەی مێهر و پایەداریی ژیانی بۆی مابووەوە.

هێنامە پێشچاوی خۆم، چۆن بابە دەستی لە وێنەکە، لە بسکە زیوینییەکان و لێوە نەجووڵاوەکان، لەژێر چاوە گەش و شادمانەکانی دەدا.

پرسیارێکی نوێم بۆ هات. "بابە." بەسانایی قسەم بۆ ڕیکنەدەخران. ترس و لەرز دایگرتبووم: "باشە بۆچی لەگەڵ ژنێک ژیای کە تۆـــ؟" کەمێک وەستام، ئینجا وشەی "خۆشت لێنەدەهات"م

به خەفەکراوی لە دەم دەرچوو، نەمدەتوانی دەربڕینێکی لەوە بەهێزتر بخەمەپاڵ هەستی باوکم بۆ دایکم.

ئەویش لێم نزبووەوە. "بۆچی چی؟ لێمدەپرسی بۆچی لەگەڵ دایکت مامەوە؟ ئەدی ئەوە ڕوون نییە؟"

من سەرم بادا، سەیری دوڕ چاویم کرد، کە ئازاری پێنج دەیەی تێدا نێژرابوو.

"لەبەر تۆ." ئەو بە شێوەیەکی وا کتوپڕ وەڵامی دە دەستی نام دەتگوت پرسیومە بابە ناوت چییە.

"لەبەر من؟" پەنجەم بۆ سینگم برد و برۆشم هەڵکشان.

"بێگومان. لەبەر تۆ و چیا. ئەی وادەزانی چیدیکە بووە؟ چەند جارێک ویستم واز لەو ژن و مێردایەتییە بهێنم. نەدەکرا منیش بڕۆم-یەک دوو جاران زۆر نزیک بوو وازبێنم- بەڵام نەمتوانی. نەوەک دوای ئەو هەموو شتەی لە ژیانمدا بەسەرمهاتبوو، نەمتوانی."

دەمم لێ بەش بوو.

"دایکت، دەستبەجێ مێردی دەکردەوە. ئاخر چارەی دیکەی لەبەردەمدا نەبوو -دایکێکی سەڵت بە تەنیا دەرباز نابێ- بەڵام پێشچاوییەکەی کارەکەی بۆ ئاسانتر دەکرد، زوو کەسێکی دیکە دەهاتە نێو ژیانیەوە، بەڵام ئەی ئەگەر مێردە نوێیەکەی ئازاری ئێوەی دابا؟ ئەم کاولەوڵاتە هیچ قانونێکی وەهای نییە منداڵان بپارێزێ، خۆت ئەوە دەزانی. بۆ من ئاسان نەبوو."

من هەر لە بابە ڕامابووم.

"سەرباری ئەوەش، هەڵگیرسانی جەنگ لەگەڵ ئەمریکا، لەگەڵ عەرەبستانی سعوودیەدا لە ئان و ساتدا بوو. هیچ شتێک هی ئەوە نەبوو لێی دڵنیا بیت. من بە چاوی خۆم لە ماوەی جەنگەکەدا شتگەلی وەهام بینین" تالانوبڕۆ، دەستدرێژی و لاقەکردن و ڕفاندن، قاچاغچێتی بە ژن و منداڵەوە." فڕێکی دیکەی لە بیرە هاوردەکە دا. دەمی سڕی. ئاخێکی هەڵکێشا. "لە ئۆردوگای پەنابەراندا دایبابی وەهام بینین لەپێناو هەندێ ئاوی خاوێن گەوادیان بە کیژەکانیانەوە دەکرد. چادرێک وەربگرە، خواردن بۆ باقی منداڵەکان پەیدابکە. شەڕ خراپترین خەڵک دێنێتە پێش، تەنانەت ئەوانەی لە کاتی ئاشتییدا کەسانی بەڕێزیش بوون. هەر چۆنێک بێ، بە لای کەمییەوە، بەم ڕێگەیە دەمزانی تۆ و چیا سەلامەت دەبن."

گەلۆ باوکم زیندانەوانی من بوو، یاخود من زیندانەوانی ئەو؟

کلیلێک لە قفڵەکە بادرا.

"لە کۆتاییدا وەها دیاربوو داپیرەت پەرپیبێتەوە ئەودنیا." بابە ئەم قسەیەی کرد و هەڵسا. "ئاگادار بە، بە قسەی دایکت هەڵنەخەڵەتێی. ئەو ژنە بەرلەوەی تووشی نەخۆشیی لەبیرچوونەوە ببێ و ئەوەی بەسەر بێ، ژنێکی خراپ و دڵڕەق بوو. دەزانم کاتی خۆی لە 'هانا'ی داوە، هەروەک چۆن مێردەکەی خۆی تێیدەسرەواند."

لێ ئەو تەپە پێیانەی شێلگیرانەو لێبڕاوانە بەسەر پەیژەکان بۆ سەرەوە هەنگاویان دەنا، هی دایکم نەبوون.

قسەکەم بە باوکم بڕی و بەرەو ژووری میوان غارمدا.

بە بینینی سەرە کەچەڵەکەی چیا حەپەسام. ئاخر ئەو پرچەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست. "ئەوە چیت لێقەوماوە؟"

بابەش بە نێوچاوان گرژییەوە: "ئەرێ ئەو هەرایەت لەچیە؟ کابرا هاتۆتەوە سەرێک لە خانەوادەکەی بدا."

چیاش بە زەردەخەنەوە: "تکایە، دەکرێ باوەشێک؟"

ئیدی منیش خۆم خستە باوەشی.

ئەویش دەستێکی لەسەر نێوچاوانم دانا. بە تەوەسەوە گوتی: "ئەرێ لەیلا گیان چییە، سەرت بە هیتەرەکەوە ناوە؟"

بابەش چوو دوو بیرەی لە بەفرگرەکە هێنا، یەکیان بۆ خۆی و ئەوی دیکەش بۆ کوڕەکەی. "لەیلا پەنجەرەکەی بە کراوەیی هێشتووەتەوە. پێموایە بای سارد لێیداوە و نەخۆش کەوتووە."

چیا دەستی گرتم و لەسەر قەنەفەکە دانیشاندم، ئینجا گوتی: "پێویستە پزیشکێک ببینین."

چاوم ئاوی کرد: "ئەوان لەسەر هیچ وخۆڕا شلێریان گرت."

چیا هەموو چەکمەجەکانی کەوانتەری هیرباری کردەوە و داخستەوە. "وەرە پەڕۆیەکی خاوێنی تێدانەبێ؟"

بابەش لە چیای پرسی: "دەتوانی بەیانی لەگەڵم بێیتە پۆلیسخانە؟"

"بە دڵنیاییەوە." ئەوسا چیا هەندێک ئاوی لە دەفرێکی پلاستیکی گەورە کرد و پێیەکانی منی خستنە ناوی. کراسەکەی خۆی داکەند، تەڕی کرد و لەسەر هەنیەی دانام. "ئەرێ بابە هیچ کۆدینمان هەیە؟"

بابەش بۆڵەبۆڵێکی کرد و چووە حەمامەکە.

"ئەرێ ئەو جێبرینە چییە؟" بە دەم ئەم قسەیەوە ئاماژەیەکم بۆ شانی کرد، لە کونی فانیلەکەیەوە دیاربوو.

"هیچ نییە." چیا نێوچاوانی ماچ کردم، ئیدی هەموو ئازارێکم ڕەویەوە.

"ئەریَ بۆچی لە پشووی زستاندا نەهاتییەوە مالَیَ؟ باشە ئێستا لە ناوەڕاست و گەرمەی خوێندندا چۆنە هاتوویتەوە؟" پرچە سەربازئاساکەشی هیچ لێنەدەوەشایەوە.

"دەبینی، کراسە تەڕەکەم وشک بووەوە. خۆ ئەگەر تایەکەت نەهاتبایە خوار، ئەوا یەکسەر دەمبردیە بەشی فریاکەوتن." ئەو یەک دوو حەبی دامیَ و پەرداخە ئاوێکیشی بەسەر دەمەوە کردم.

دوایین شتێک وەبیرم مابیَ، ئەوە بوو خۆی و بابە منیان هەلگرت و لە ژوورەکەی خۆم دانامە سەر پێخەفەکەم. "چیا... یارمەتیی شلێر بدە." بە زەبوونییەوە لێی پاڕامەوە، بەلاَم وشەکان بە شێوەیەکی ناحالَی لە دەمم دەرچوون.

ئەویَ شەویَ، هەر کاتێک چاوم هەلَدەهێنا، چیا لە تەنیشتم بوو، کراسەکەی تەڕ دەکرد و لەسەر نێوچاوانی دادەنام.

سەروبەندی نیوەڕۆ بە بۆنێکی خۆش بە خۆ هاتمەوە. "لە کەیەوە چێشت لێدەنێی؟" هەینیَ سەرگێژییەکەم کەمتر بووبوو، بەلاَم هێشتا هەر زەبوون و کەنەفت بووم.

"کوڕ کاتیَ لەسەر دەستی خۆی بژی..." ئیدی قاپێکی لە سووپی مریشکی ڕادەست کردم، هێشتا هەلَمی لێهەلَدەستا، ئەو گیا و بەهاراتەی تێی کردبوو لەسەری سووپەکە نیشتبوو.

"ئەریَ شلێر ئازاد کرا؟"

ئەو بە سەنگینی تەماشای کردم. "بەڵێ. ئەو ئێستا لە نەخۆشخانەیە." تەوژمێکی نوێ لە نیگەرانی دەستەخوشکەکەم بەربووە گیانم.

"دەی با هەڵیبێنم ــ ئەو لەسەر دارِسانەکەی لێدانی خواردووە؟"

"شلێرە ئیدی." ئینجا چاوی لەسەر لابردم، بەڵام شتێکم لە ناخیدا بەدیکرد، پەنگی خواردبووەوە.

بەلای کەمییەوە بەوە ئاسوودە بووم کە شلێر لە زینداندا نییە. داواشم لە چیا کرد ڕاستییەکەم پێبڵێ.

ئەو کترییەکەی لەسەر ئاگر دانا و گوتی: "چ ڕاستییەک؟"

منیش ڕووبەڕووی بوومەوە. "تۆ لە تەلەفۆنکردن وەستای. وەهام چاوەڕێدەکرد لە پشووی زستاندا سەربدەیتەوە. ئێستاش پرچت. چی لە ئارادایە؟"

ئەو دەنکە شقارتەکەی لە هەوادا بەرزکردەوە تا فویەکی لێبکا و بیکوژێنێتەوە. چیا گوتی، وازی لە زانکۆ هێناوە، نایەوێ بچێتەوە و زانستی سیاسەت تەواوبکا لە کاتێکدا دڵی هەر بۆ خوێندنی قانون لێدەدا.

"لەم وڵاتەدا، ئێمە تەنانەت مافی ئەوەشمان نیە داوای مافەکانمان بکەین." ئامانجی ئەو وەک خۆی گوتی، ئەوەبوو بەڵکو تاوانبارانی جینۆساید و ڕەشەکوژی پەلکێشی دادگای تاوانە نێودەوڵەتییەکان بکا. ئەو ئەرخاین بوو لەوەی ئەمە ئارمانج و مەبەستی ژیانی ئەوە، ئیدی نەیدەویست چوار ساڵی خوێندن بە شتێک بە فیڕۆ بدا کە بێ سوودە. لێ کە ئێستا دەرکراوە، ناتوانێ چیدی دەست بە بەهانەی

خوێندکارییەوە بگرێ بۆ ئەوەی نەچێتە سەربازی، بۆیە ئەو سێ مانگەی ڕابردوو لە سەربازگە بووە، مەشق و ڕاهێنانەکەی تەواوکردووە. منیش لێی تووڕە بووم، ئاخر پێشتر پێی ڕانەگەیاندبووم، بەڵام خۆ من لەبەر لەرز و تا گێژ و کاس بووم تین و حەوسەڵەی دەمەقاڵێم نەبوو.

"باشە ئێستا کە سێ مانگەی سەربازییەکەت تەواو بوو، چی دەبێ؟"

"دەنێردرێمە گوندێکی دوورەدەستی لاپەڕگە تا دەرس بڵێمەوە."

"هیوادارم بنێردرێیتەوە شوێنێکی نزیک." بە دەم ئەم قسەیەوە ئەو گیراوە لیمۆ بە هەنگوینەی بۆی گرتبوومەوە فڕمکرد.

"منیش هیوادارم. باشترە خزمەتی گەلەکەی خۆم بکەم."

بەدەم ملخواراندنەوە پێمگوت: "ئەم خۆنواندنەت لیری لێهێنام."[٥٦]

ئەویش پێکەنی.

ئەم ئێوارەیە درەنگ هاتەوە، لە نامرادی و تووڕەییان دەکولا. ئاخر تورکیا دووسەد کەسێکی لە کوردان کوشتبوو. باوکمان بە ڕاشکاوی داهێزرانی پێوە دیاربوو؛ ڕوخساری لە بن ئازاردا گرژ بووبوو.

ئیدی ئێمەش هەروەک جاران ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێ، لە لایەن باوکمانەوە پشتگوێ خراین.

---

[٥٦] نیدیومیکە واتای هەراسانی و تووڕەیی دەدا.

دوای ئەوەی شلێر لە نەخۆشخانە دەرچوو، منیش لە دەردی هەوکردنی سییەکان ڕزگارم بوو، سەرم لە شلێر دا. جوانە دەرکەی لێکردمەوە و باوەشی پێداکردم. وەها دیار بوو وەک ئەوەی بگری.

"شلێر نوستووە. جارێ دانیشە." شوێنە یەک هۆدەیە ڕێکوپێکەکەیان لە نهۆمی بنخانی بە خۆی و دیوارە بۆیەکراوە کرێمییەکەی و قەنەفە بچکۆلەکە پێچەوانەی بۆیە زەردباوەکە و قەنەفە سووورباوەکەی لای خۆمان بوو.

"نەخێر، من نەنوستووم." دەنگی شلێر بوو لە ژوورەی نوستنەوە دەهات.

ئیدی جوانە منی بۆ لای ئەو ڕەوانەکرد و خۆیشی چوو دەموچاوی بشوا. شلێر لە گۆشەیەکی تەختی نوستنی دانیشتبوو، ئەژنۆکانی خۆی توند گرتبوونە باوەش، توند بۆ خۆی گیرساندبوو. سەری هەڵبڕی و نیگامان بەر یەک کەوتن. جێبرینێکی گەورە لەسەر لاچەناگەی چەپییەوە تا ناوەڕاستی نێوچاوانی ڕۆیشتبوو، برۆکەشی شەقکردبوو. خاڵێکی خوێنینی چکۆلەش لە سەر چاوی چەپەی هەبوو. دەموچاوێکی ڕووشاو و پڕ لە ئازار.

منیش نووشتامەوە و دەستم گرت. "دەلالا من[٥٧]، ئەوە چیان لێکردووی؟"

بە ڕاچڵەکینەوە: "من باشم. تەنیا گورچیلەیەکم لە دەست داوە."

منیش قیژاندم: "گورچیلەیەک. تۆ گورچیلەیەکت لە دەست داوە؟"

---

[٥٧] "Delala min"

جوانە بە خۆی و سینیەک کە پیاڵەی چای لەسەر بوو، هاتەژوورەوە، چاوەکانیشی بە تەواوی وشک بووبوونەوە. "ئەو گورچیلەیەکی تەواو کارای دیکەی هەیە."

"چۆن؟ بۆچی؟" هەوڵمدا دەستەکانم لە نێو مشتی شلێر دەربهێنم، بەڵام ئەو دەستی بەرنەدام. بۆ یەکەمین جار بوو ترسم لە چاوەکانیدا بەدیکرد. دەتگوت ناوکەوەکە لە بن مندا ڕۆدەچێ. ئاخر هەرگیز نەمبینیبوو ئاوەها لە شلێر بدرێ چ لە قوتابخانە چ لە هیچ شوێنێکی دیکە.

"لە شیکاری پەردەی کچێنیم دەرنەچووم. پاشخانی دایبابیشمیان دەزانی. ئیدی دوو پیاو و ژنێک کەوتنەسەرم لێدە و لێدە. نەخۆشخانەی زیندانەکە گورچیلە خراپبووەکەمیان دەرهێنا. دەزانی سەیرەکە چی بوو؟ لەو هەموو لێدانەدا پەنجەکانی ژنەکە شکان." ئەو دەمێک بوو پێدەکەنی تا دیسان ئەژنۆکانی بە سینگیەوە توند گیرساندنەوە.

جوانە دەستێکی لەسەر تەوێڵی شلێر دانا و دەستی ماچکرد.

منیش هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، لێنەگەڕام فرمێسکەکانم داببارن. "من هەندێ لە ڤیدیۆکانتم پاراستوون. حەوت دانەیان. ببوورە، هەر ئەوەندەم پێکرا."

ئەمجارەیان شلێر بە زەردەخەنەیەکی ڕاستەقینەوە گوتی: "لەو بڕوایەدا نەبووم یەک دانەیشیان قوتاری بێ."

ئینجا زنجیری پاڵتۆ درێژەکەم کردەوە و جانتای دیڤیدیەکانم دەرهێنان.

شلێر سووکە شۆخی لەگەڵ کردم و زەردەخەنەکەشی گەیشتە جوانە کە گوتی: "گوتم ئێستا بەمێردیان داوە و دووگیانیشە."

"ئەدی!"

ئێمە پێکەنین. هەڵسام پاڵتۆکەم لەسەر کورسییەک دابنێم. کتێبی "ڕەگەزی دووەم" لەسەر ڕەفەی کتێبەکان بوو. من هەر نەمخوێندبووەوە، کەواتە هەر دەبێ چیا بۆی هێنابێ. لەسەر یەکەمین لاپەڕەی تێبینییەکی نووسیبوو: بۆ *شەڕڤانە خۆشەویستەکەم.*

منیش بە مۆنییەکەوە: "نەمزانی تۆ و چیا ئەوەندە لێکنزیکن."

شلێر داوای لێکردم: "لەیلا، تکایە کەمێک لام دانیشە. چراکان داگیرسێنە. دەرکەکان بخەرە سەرپشت. "پێنج خولەکی پاشتر، شلێر خەوی لێکەوت.

منیش لە ژوورەکە هەستام. ئیدی هەستم نەکرد پێویست بێ چیدی بەر بە فرمێسکەکانم بگرم. جوانەش بە دوامدا هات و باسکی گرتم. منیش گوتم: " ئەرێ بۆ خاتری پێغەمبەر خوا کەنگێ لایەک لێرە دەکاتەوە؟ بۆچی ئەم شتانە لە شلێر دەقەومێن؟"

"ئۆۆو، شیرینا من، خودێ بێ قسوورە." ئەمە قسەی جوانە بوو، بە زاراوە نەرمە کرمانجییەکەی – کە زۆر لەو سۆرانییەی کوردان لە ئێران و عێراق قسەیان پێدەکرد، دەنگدارتر بوو- بە شێوەیەکی تایبەت نەرمونیانتر بوو. "ئەوە هەمووی پشێویی ئادەمیزادە و ئاژانەکەش بەشێکە لە قانون. کەواتە هەمو شتێک لە دەستی

خۆماندایە. گوڵەکەم[58]، دەکرێ بگۆڕدرێ." ئەو هەر بە گوڵەکەم بانگی دەکردم.

"حەزم دەکرد بڕوای تۆم هەبوایە."

بیرم لە چەرمەسەریەکەی جوانە کردەوە کە چۆن لەکاتێکدا نەیدەزانی بە فارسی قسە بکا، دانیشتنێکی دادگایان بەسەردا ساغکردۆتەوە کە لەهەموو گەنگەشەکە تەنیا لە چەند وشەیەکی کەم حاڵی ببوو. کاتێکیش هەوڵیدابوو بە کوردی داکۆکی لە خۆی بکا، دادوەرە تووڕەکە بڕیاری حوکمدانەکەی لە زیندانی "هەتا هەتایە" بۆ لە "سێدارەدان" گۆڕیبوو. بە لۆژیکی دادوەر، جوانە مادام بەزمانی دایکی قسەدەکا، کەواتە جوداییخوازە. لەکاتێکدا ئەو تا ئەوی ڕۆژێ جوداییخواز نەبوو.

جوانەش گریابوو، ڕوونیکردبووەوە، کە ئەو لە کۆبانێ، لە سوریا گەورەبووە و فارسی نازانێ. بەڵام خۆ کەس لێی تێنەگەیشت. هەروەها کەسیش خۆی لەوە بەخەم نەکرد، ئاخۆ ئەوەی بەکوشتن تاوانبارکراوە چی بۆ گوتن پێیە. جوانە بە ناوە کوردی و فارسی و عەرەبییەکانی خوا سوێندی خواردبوو، ئەوەی کردبووی بەرگری لەخۆکردن بووە، چونکە کاتێ لە کار گەڕاوەتەوە ماڵێ، پیاوێک هەوڵیداوە دەستدرێژیی بکاتەسەر، بەڵام خۆ قانون تەنیا یەک شتی دەزانی: ژیانی پیاوێک دووهێندەی ژیانی ژنێک بە نرخە. خەڵک کوتیان پیاوەکە بەرلەوەی بکوژرێ هەر بە ڕاستی لاقەی نەکردبوو. پرسیبوویان خوادەزانێ ئەو ڕۆژە چی لەبەردابووە؟ باشە بۆچی بە

---

[58] Gulakam

تەنیا و بە تاریکی گەڕاوەتەوە ماڵێ؟ هەرچۆنێک بێک، دەبوو جوانە یان ئەوەتا دیەی خوێنی کابرا بدات، یان لە تۆڵەدا لە سێدارە بدرێ.

تاکە شت کە جوانەی لە پەتی قەنارە دەربازکرد، شلێر بوو، کە لەزگیدا گەشەی دەکرد. ئێستاش هەر هەمان حکومەت، ئەوەی بڕیاری مەرگی دایکی دابوو، هاتۆتە زگ شلێرێ.

ئێمە بۆ ماوەیەک ئامێزمان بە یەکدا کرد و لە باوەشی یەکدیدا تێر گریان.

"چاوەکەم[٥٩]، هەموو ئەوەی پێویستە بکرێ هەندێک گوێگرتنە. لەبیرنەکەی، گریان، تەنانەت نزا و پاڕانەوەش بێ کەڵکە و نابیسترێ." ڕوانینە گەرمەکەی، منی خستە سەر ئەو کەڵکەڵە ئەرخەیانە، کە دەمزانی هەر لەبەر چاوی ون ببم، لە دەستی دەدەم و نایبینمەوە. جەستەی دەستەخوشکەکەشم چەشنی ڕۆحی شێواوی من، شێوێنرابوو.

لە ڕێگای گەڕانەوەشم بۆ ماڵەوە، دەنکەکەی شلێر کێیە.

---

[٥٩] chawakam

## بەندی دوازدە

بابە لە حەمامێ هاتەدەر، هەمان پەشتەماڵی بە شێوەیەکی فشۆڵ بەسەر شانی دادابوو، هەمان نیشانەی جێبرینەکانی سەر پشتی و سابونیش هەمان بۆنی جاران. داخی هەڵقولاوی ناخیشم لەگەڵ بینینی جێبرینەکان هەر هەمان هەستی جاران بوو، بەڵام گەورەتر. ئەوەندە دڵشکستەبووم هێزی جووڵانیشم نەبوو، دیسان خۆم بە گۆشەگیری بینیەوە. بیستم فاتیما، ئەو کچە دەوڵەمەندە، دوای ئەوەی دەزگیرانەکەی لە ڕۆژی زەماوەند خۆی نیشان نەدابوو، لە داخان خۆی کوشتبوو. منیش لە دڵی خۆمدا، لەسەر ئەو کارەی لۆمەم نەکرد.

هەر ڕاستەوڕاست بابە چووە ناندینەکە و سەری لەسەر مەنجەڵەکە هەڵدایەوە و بۆن و بەرامەی شێوەکەی هەڵکێشا. ئاخر شۆربایەکی هەرە خۆشەویستی چیام بە داودەرمان و گۆشتی گوێرەکە، سەوزی قاولمەم[60] بۆ لێنابوو. لەسەر خواردنەکە هەم سەرنجی بابەم بۆ لای خۆم ڕاکێشا هەم دەستخۆشیی چیاشم حاسڵ کرد، بەڵام هەر کە تێروپڕ خواردیان و لێکشانەوە، من هەر هێندەی قاپ و کەوچکە چەورە جێماوەکانی ناو دەستشۆرەکە پیشچاو بووم.

---

[60] sewzi ghawlma

بابە لەسەر مافوورەکەی دایکی پاڵی لێدایەوە و گوێی لە رادیۆکەی خۆی گرت. "هەروەها محەمەد سەدیق کەبودڤەند، نووسەری هەفتەنامەی پەیامی مەردومی کوردستان -پەیامی خەڵکی کوردستان- بە 'دنەدانی خەڵک بۆ هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەتی ناوەندی' تۆمەتبارکرا و یازدە ساڵ حوکمی زیندانیی بەسەردا درا."

بابە گوتی، ڕۆژنامەنووسەکە لەبارەی کۆڵبەرانی[٦١] نووسیبوو، لە منیشی پرسی ئاخۆ دەیانناسم. منیش نەمدەناسین. گوندنشینە کلۆڵەکان، ئەوەندە بێچارەن ژیانی خۆیان و ژیانی شتە بەهادارەکەیان، واتە هێسترەکانیان بۆ بە قاچاغبردنی کەلوپەل دەخەنە مەترسییەوە، بە چەندین سەعات و ڕۆژ بە نێو کێواندا دەڕۆن ئەو بارە قورسەشیان بە کۆڵ هەڵگرتووە، بەنێو چەندین خاڵی پشکنیندا دزەدەکەن، هەر لە گۆترەش پاسدارە بێڕەحمەکانی ئێرانی تەقەیان لێدەکەن.

"بابە، من هەمو ئەو کراسانەم دۆزینەوە کە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا وەک دیاریی بۆم کڕیبووی. ئەری هەوڵت نەداوە هیچیان دەبەربکەی؟ تەنانەت بۆ یەک جاریش؟" ئەمانەم لە بن بارستایەکی گەورەی ڕۆژنامەکان لە هەورەبانەکە شاردبوونەوە، هێشتا کاغەزی کارخانەکەیان هەر پێوەبوو.

"خۆ ئەگەر پاسەوانەکانیش نەیانکوژن، ئەوا سەختیی کارەکە دەیانفەوتێنێ." ئەو درێژەی بە قسەکەی خۆی دا، بەڵام هەستمکرد نیشانەیەکی هەراسانبوونی کەوتە سەر ڕوخسار. چاوەڕێم کرد ڕوونکردنەوەیەک بدا، بەڵکو بڵێ ڕەنگەکەیان زۆر زەق و شادن یان

---

[٦١] Kulbar

سایزەکەیان بۆ من نابێ، کەچی ئەو لێمە ڕاما و منیش توانیم بیرکردنەوەی بخوێنمەوە. ئاخر چۆن لەیلا زیاتر بایەخ بە کراسەکان دەدا زیاتر لە ژیانی ئادەمیزاد، کە هەفتانە لەبەر هەژاری و لە ئەنجامی دڕندایەتیی پاسەوانانی سنوور سەریان تێدادەچێ؟

ئاخێکم هەڵکێشا و ڕووم لە تاکژوورەکەی چیا لە بنهۆمێ کرد. ئەویش ڕادیۆکەی پێکردبوو، لەسەر هەمان وێستگەش بوو: "لە سەقز ـــ خۆپیشاندەرە ناڕازییەکان کوژران و چل و دوو کەسیان لێگرتن. باڵەخانەکانی حکومەت و بانکەکانیش وێران کران."

ئەو لە هۆدە بچکۆلانەکەی ڕاوێچکەی دەدان، ئارەقەی دەردەدا، تێبینی دەنووسینەوە، ئینجا ڕاوێچکەی زیاتری دەدا. "هێزی سەربازیی ئێرانی هەزار و دووسەد خۆپیشاندەریان گرتووە و یازدە کەسیشیان کوشتوون..." ڕادیۆکە لەسەر ڕاگەیاندنەکەی خۆی بەردەوام بوو.

مەل و کرمیش هەموو گێلاسەکانی حەوشەی پشتەوەیان خواردبوو. پایسکیلەکانیشمان لەوێ ژەنگاوی و خراپ بوون. دارەکانیش وشک هەڵاتبوون.

چیا بۆ کاری مامۆستایەتی خۆی تێکدەنا.

منیش لە هۆدەکەی وەژوورکەوتم. "هەمو هەفتان سەردەدەیەوە؟"

لە شوێنی خۆی بەسەر جانتاکەیەوە نیگایەکی تێکرتم: "هەموو هەفتەیەک؟"

"ئێ خۆ ڕێگاکەی هەر سێ سەعاتە!"

"دەبێ کتێب و شتە قورسەکان لە بنەوە دابنرێن، وایە؟ ئینجا جلی ژێرەوەم و گۆرەویەکانم بئاخنمە کەلێنی کتێبەکان، تۆش پێتوانییە؟" ئەو لێی پرسیم ئاخۆ هیچ شتێک دەربارەی سەفەر دەزانم. ئەری هەر بە ڕاستش، کابرایەک ئەوەندە لە خزمەتی کۆمەڵگەدا بێ، بۆچ پارەکەی خۆی بۆ سەردانی سەرگەردانێکی هەمیشەیی و پیربووی دەستی زەمانە بە فیڕۆ بدا.

"کراسە شینە خۆشەویستەکەت لە بیرنەکەی!" بە دەم ئەم قسەیەوە کراسەکەم بە خاوێنی و ئوتووکراوی دایەدەست.

ئەویش گوتی "ئەها، سوپاس!" بەڵام نەشیخستە نێو جانتاکەیەوە.

"دەی ئوستاد، بۆم ڕوونبکەوە: چ عەیبێکی تێدایە کراسی خاوێن و جوانت دەبەردابێ؟" ڕەنج و خەمخۆریی وجودی بێبەهای من نەبووە مایەی بایەخی وی.

چیا سەری بادا و گوتی: "من دەچمە گوندێکی هەژار، خۆ ناچمە کێبڕکێی شیکپۆشی."

منیش دەستم خستە سەر کەمەر و گوتم: "ئۆو، کەواتە تۆ ئێستا بوویتە پیر[٦٢]، وا نییە؟ چییە تۆ پێتوایە نازانم، کە تۆ بەرپرسیاری لە لەدەستدانی گورچیلەکەی شلێری؟"

چیا نووزەیەکی لێهەستا و ئاهێکی دەردا، لە مەشدا بۆم دەرکەوت پێشبینیە سرکەکەم لە جێی خۆیدا بووە. خۆی بەسەر جانتاکەی شۆڕکردەوە، خۆی لە نیگام بە دوور گرت و جلەکانی

---

[٦٢] لێرەدا وشەی پیرم بەرانبەر پیاوی پیرۆز بەکارهێناوە.

ژێرەوەی بچووکتر و بچووکتر لێدەکرد تا لە کەلێنە بچووکەکەی نێوان شتەکانیدا، جێ بکاتەوە.

هەمو شتێک ڕوون و ئاشکرا بوو. کەواتە گیانە پێشکەوتنخوازەکان لە یەک نزیک دەکەوتنەوە و لە منیش دوور. "تۆ دەڵێی کەوا هەموو شتێک لەبارەی ئەم کۆمەڵگەیەوە دەزانی، کەچی نەتتوانی یارەکەشت بپارێزی؟ لە کەیەوە بە دزیی من پەیوەندیتان هەیە؟"

"شلێر داینابوو هەمان ئەو ڕۆژەی تێیدا گیرا پێتبڵێ. لەیلا، هەر بە ڕاستی، ئێمە دەمانویست پێت بڵێین، بەڵام دەبوایە وەختی خۆی بێت و کاتەکەی گەنجاو بێ. تۆ لەسەر ئەم جۆرە شتانە زۆر کورتبین و هەستیاری." ئەم قسەیەی چیا بۆنی هەمان وەسفی شلێری لێدەهات بۆ من کە هەزار جار بەگوێی دادابوومەوە: کاتێک باسی سێکس بێتەگۆڕێ من دەمارم گرژە. "دەی تکایە دەتوانی ئێستا وازم لێبێنی؟"

"ئەرێ بۆچی وەهام لەگەڵ دەجووڵێیتەوە وەک ئەوەی تەنیا مایەی هەراسانی بم؟" بە دەم ئەم قسەیەوە دەنگم لەرزی، وەک مشکێک بسریکێنێ وابووم.

"ئێمە یەکدیمان خۆشدەوێ. دەزانی ئەمە مانای چیە؟ خۆ ئەوە نییە ناچارم کردبێ." بە پشتە دەستی لەرزۆکەوە ئارەقەی نێوچاوانی سڕی.

"چاکە، خۆ ئەو لەسەر ئەو بەزمە تووشی ئازار و ئەشکەنجە بووە، تۆش وەها ڕەفتاردەنوێنێ وەک ئەوەی لە ئاسمان کەوتبێتە خوارێ."

کتێبێکی گرت و بە دیواری دادا و بە دەنگێکی گەورە کە تا ئەوکات گوێم لێنەبوو هاواریکرد بێ: "دە بڕۆ ژیانی خۆت بژی و لە کۆڵم بەوە."

منیش هیچ ژیانم نەبوو.

چیا زنجیری جانتا نیوەپڕەکەی توندکردەوە، بێ ئەوەی قسەیەکی دیکە بکا و ڕۆیشت و دەرکەشی بە توندی لە دوای خۆی پێوەدایەوە.

بە دڵساردی لەسەر مێزەکەی ئەو دانیشتم و دەفتەرەکەیم خوێندنەوە. ژان و ناسۆری کوردانی بە زمانی زگماکی قەدەغەکراو دۆکیۆمێنت دەکرد: پیاوانی کورد ژمارەیەکی نابەرابەریان لە نێو زیندانییە سیاسییەکان و لەسێدارەدراوان پێکدەهێنا، زیاتر لە ڕێژەی ٤٠٪ بوون. ژنانیش خۆیان دەسووتاند. خوێندکارە زیرەکەکانیش لەبەر خۆیان و لەبەر چالاکی سیاسیی خانەوادەکەیان لە زانکۆکان دەردەکران. لە هەر لاپەرەیەکیش سروودی نەتەوەیی بە خەتێکی تێکەڵاو نووسیبووەوە: کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە.[٦٣]

منیش پەنجەم بەسەر وشەکاندا داهێنا. زیندووە. مردووە. زیندووە. ئێمە مردووین بەڵام هێشتا هەر زیندووین. ئەرێ ئەمە چۆن دەبێ؟ لە ڕاستییدا وابوو، هەستم پێکرد. پەنجەم خستە بەر لووتم. هەناسەم دەدا، بەڵام خۆ نەدەژیام. کەس نەبوو ئەو ڕاستیە ببینێ.

---

[٦٣] Kas nalle Kurd merduwa; Kurd zinduwa

شتێکی بەهێز ئامبازم بوو و نەشدەڕۆیشت. بێ ئۆقرە بووم، ڕاوەدوو دەنرام. منیش نووسیم: *لێرە من هەم. کوردێک کە ئارەزووەکانی لە پێشچاوی تۆدا بوونی نییە، ژنێک بە ئازار و گۆشەگیری داڕماوە، هەزار ساڵە گۆشەگیری و ناتوانایی بە ملیدا ئاڵاوە. تۆ ژانوناسۆری هەموان دەبینی، تەنێ هی من نەبێ.*

تۆیۆتایەکی سوور لە بەردەرکەی ماڵمان خاویکردەوە و هۆڕنی لێدا. بابە بە ڕیشتاشراوی و جلێکی خاوێن و بژوونەوە سوار بوو. شوفێرەکە، دەرمانفرۆشێکی دراوسێمان بوو، هەموو کەسێک پێی دەگوت گۆڕهەڵکەنە.

منیش دەبووایە زیاتر بچمە دەرەوە. قوتووە بچکۆلەکەی حەبی ڤیتامینم پڕ لە ئاوی گەرم و کاغەزی پەمەیی کرد. بە پارچە پەمۆیەکیش سەرڕوومەت و لێوەکانم ڕەنگکرد. ئەم بوژانەوە ساختەیە هەندێ تینوتاوی متمانەی پێبەخشیم تا بچمە تاکە پارکی شارەکەمان.

چیمەنەکە دوای سووکە بارانەکە خاوێن و بۆنیشی دەمار دەمار دەڕۆیشت. سەرباری قەدەغەبوونەکە، گوڵە مێلاقە و گڵوکەکانی دیکە لێکرابوونەوە. کاتی لەدایکبوونی چیام وەبیر هاتەوە، ئەو کاتەی لەگەڵ جوانە و شلێر بە قەدەکانیانەوە لێماندەکردنەوە. شەقێکم لە میوە گەنیوەکەی بەرپێم هەڵدا، ئەوەی لە دارەکە کەوتبووەخوارەوە و کرم و باڵندەش نیوەیان خواردبوو. ئای لەو سێوە نەخوازراوە.

پیاوان بە وێدا دەهاتن و فیکەیان لێدەدا، بانگیان دەکرد، چەند نزیک دەکەوتنەوە بە جلە مۆدێل کۆنەکانم پێدەکەنین. دەکرا چۆنیان

خواستبا وەهام ڕەفتار لەگەڵ بکەن. ئاخر ژنان هەر دوو جۆر بوون: قەحپە و کۆیلەی گوێڕایەڵی ماڵباتەکانیان. کیژە باشەکان هەرگیز بە تەنیا نەدەچوونە پارک. کیژە باشەکان بەوە قایل بوون پیاوان لە بری ئەوان لەوێ هەوای سازگار هەڵمژن، هەموو ئۆکسجینەکە هەڵبمژن تا ژنان لە تەنگژەدا بهێڵنەوە.

کاتێ لە پارک و لە ژێر ئاسمانە شینەکەدا پیاسەم دەکرد، دوو نەوجەوانم لە سەر دارێ بینی، یەکدیان ماچ دەکرد، هەوڵیاندەدا لە نێو گەڵای دارەکەدا خۆیان لەبەرچاوان بشارنەوە. هەر دەبێ بڕوایان بەوە هەبێ کە لە شەقڵ و دابی پۆلیسی ئاکاردا نییە بەرەو ئاسمان بڕوانێ. ئاخر خۆ لەسەر ئەوە کوڕەکان لە سێدارە دەدران.

منیش خواحافیزیم لە گوڵزار کرد و لاڕێیەکەم گرت. شوفێری ترومبێلەکان بە هۆڕنلێدانەوە هەوڵیاندا لەگەڵ خۆیاندا هەڵمگرن. ئیدی هەر یەک دوو چرکەی پێچوو بڕیاری خۆم دا. ئامادەبووم سواری یەکێ لە ترومبێلە هۆڕنلێدەرەکان ببم و خۆم بدەمە دەستی قەدەر. ئەمەش شتێکی باو بوو بۆ پیاوانی ترومبێل نوێ، کە ئافرەت سواربکەن، لەو سواربوونانەشدا شتی بە دوادا دەهات- ژمارەی تەلەفۆن، ماچێک، ژوانێک، ڕابواردنێک، بەڵکو شتی دیکەش ئەگەر کارلێکەری سۆز و دەروونیان تێکهەڵکێش بووبایە.

لەسەر لێواری شۆستەکە وەستام. پیاوانیش هەر دەنگیان دەهات و فیکەیان لێدەدا، لە پەنجەرەی ترومبێلەکانەوە سەیریان دەکردم، دەیانپرسی، "ئەرێ ئەو کچە شۆخە بۆ کوێ دەڕوا؟" منیش لە ژێر دەغەڵییە خۆماکییەکەم سوورهەڵگەڕابووم.

یەکێکیان پەنجەی گەورە و ئاماژەی لەیەکخشاندن تا نیشانم بدا پارەم دەداتێ.

منیش لەسەر شۆستەکە دانیشتم. لێدانی دڵم خاوبووەوە، تا نێوانی لێدان و لێدانێکی دیکەی زۆری خایاند. لێدانەکان دەهاتنەوە، دڵکز و مەلول، میناى ماسییەک بووم لەسەر بەردێک بلەرزێ و دەمی لە یەک بدا.

ترومبێلێکی دیکەش هۆڕنی لێدا. سەرم هەڵبڕی تا لە جامی پەنجەرەی سەرنشینەکانییەوە ببینم، ئەوە بوو لەو کاتەدا ترومبێلێکی سووری شیڤێ لە بەردەممدا ستۆپی گرت. دەستەکانیشم لە سەرمان گۆد ببوون، دەرکەم پێنەدەکرایەوە.

"ئەرێ بۆ خاتری جەهەننەم، ئەوە لێرە چی دەکەی؟"

" سڵاو بابە." توورەیی لە چاویدا نەوەک هەر سامناک بوو: ڕقوکینەی وەک تەوژمێکی کارەبایی بۆ سەر من گواستەوە؛ ئاخر من لەکەی سەر نامووس بووم، هەوڵمدەدا لەگەڵ ترومبێلی بێگانان سواربیم. منیش هەر ئەوەندەم گوت: "بە تەمابووم بچمە لای پزیشک."

ئەو پەنجەرەکەی داخستەوە و ترومبێلەکە بە تەناش دەرپەڕی و لە دوای خۆی تۆز و غوباری پەیداکرد. من لەسەر شتێک سزادرام، هێشتا نەمکردبوو، لە دادگایەکیش دادگایی کرام، کە لێی دوورخرابوومەوە.

دوای ئەوەی بە تەواوی بەتاڵبوومەوە، داماوانە کەمێک بە پێ ڕۆیشتم و پاشان دەستم بۆ تاکسییەک ڕاگرت بۆ ماڵی داپیرەم.

کاتێک گەیشتمە بەر دەرکە ژەنگاوییەکەی ئەپارتمانەکە، بەرچاوم تاریک بوو. بە دەست خۆم بە دیوارەکەوە گرتەوە، ئینجا سەرم وە باسکم کرد و وا هاتەبەرچاو وەک ئەوەی سەرە بچکۆلەکەی چیام وەشانم کردبێ. من ئەو ڕۆژانەم هاتنەوەیاد کە ئەو چێژی لە چیرۆکەکانی من دەبینی، ئەو چیرۆکانەی لەو کاتەی چووە زانکۆ ئیدی وردە وردە لە ناخی مندا شی بوونەوەو لێکهەڵوەشان.

ناوکەپەتکێکی نادیار من و چیای بە یەکەوە گرێدابوو، ئەو جۆرە پەیوەندییەی نێوان خوشک و برا، کە لای باوانیان پشتگوێخرابوو. ئەو ئەوەندە شۆڕببووە نێو پرسی مامۆستایەتی، ئێستای خۆی فەرامۆشکردبوو. هەق بوو لەگەڵی چووباما یە گوندەکە، ئەگەرچی ئەو پێشنیازەشی بۆ نەکردبووم.

سەرکەوتن بۆ نهۆمی سێیەم بۆ لای ئەپارتمانی داپیرە، مرۆی گێژوویژ دەکرد. ئیدی ڕوومەتم بە دەرکە ئاسنینەکەی وەنا تا کەمێک سارد ببمەوە.

لە دەرکەوە گوێم لە دەنگی دایکم بوو، دەنگێکی سەیر، نەغمەئاسا قسەی دەکرد، ئەو دەنگەی بۆ شەو گوێم لێبوو کاتێ تەلەفۆنی دەکرد. نەمدەتوانی وشەکانی لەیەک جیابکەمەوە و لێی حاڵی ببم، بەڵام خۆ سۆزداری بە وشەکانییەوە دیاربوو. کلیلە یەدەگەکەی لای خۆم دەرهێنا، بە هێواشی لە قفڵەکەم وەردا، چی ببینم، شتێکم بینی، نەدەبوایە هەرگیز بینیبم.

بە هەق پێم باشتر بوو بڕوام بەوە کردبایە تووشی شیزۆفرینیا بوومە لەوەی کە بە چاوی خۆم بینیم. هەر بە ڕاست دایکە بە

دەنگێکی ئەویندارانە بۆ چوکە بچکۆلەکەی ژنە ڕووتەکە دەدوا. بە دەست لە ڕاستی دەمی خۆی ڕاگرتبوو. دایکە جلێکی ژێرەوەی سووری لەبەردابوو- هەرگیز پێشتر لە دۆڵابی جلەکانی ئەودا نەمبینیبوو، بە دڵنیاییشەوە هی ئەو نەبوو. ئینجا دایکە وازی لە کیرۆکەی ئەو هێنا و قوزەکەی لستەوە. منیش چاوم ترووکاند. دیسان ترووکاندم. چاوم هەڵگلۆفتن.

داپیرەم هاواری کرد: "هێی قەحپە، پەرداخە ئاوێکم بۆ بێنە." ئەو لە ژووری نوستنی خۆی بوو، دەرکەش داخرابوو. دایکە ئەوەندە چووبووە قووڵایی چێژ و خۆشیی خۆی، نە ئاگای لە کچی و نە لە دایکیشی بوو. منیش بەرلەوەی بمبینێ دەرکەم پێوەدایەوە، بەڵام ئەوەندەم بە قایمی پێوەدایەوە، تا خاترجەم بێ بینراوە.

## بەندی سێزدە

ئیدی بە کلکێ بارگیرم دادا و گەڕامەوە. هەر بە غاردان لە پلیکانەکان دابەزیم. بە سەر و دڵ تێکهەڵاتن و هەناسەبڕکێوە بازمدایە سەر شەقام. شتێک ڕاوی دەنام. چەند جارێک لای دارەکە هێڵنجمدا، لە دواییدا زەرداوێکم هێنایەوە. بە پێ هەندێ خۆڵی پیسم بەسەر ڕشانەوەکەمدا کرد، پاشان بە چۆکدا کەوتم.

دوای ماوەیەک، هەستمکرد توانای ئەوەم هەیە لەسەر قاچی خۆم بوەستم، ئینجا دەموچاوم وشککردەوە و یەکەمین تاکسی کە بینیم، ڕامگرت.

ئەو نیگا بێشەرمانەی شوفێر بۆ من دەماری گرژتر کردم. دەکرا بەگۆشەنیگایەک ببینم چۆن لە ئاوێنەکەوە سەیرم دەکا، منیش سەرپۆشەکەم بۆ پێشەوە زیاتر هێنایەخوار، ئەو تیسکە پرچەی هاتبووە دەرەوە، خستمە بن سەرپۆشەکەم و دەستێکیشم پێوەگرت تا نەشلەقێ.

"بۆ کوێ؟"

منیش دوورترین شوێنم بە بیرداهات و پێمگوت. ئاخر پێویستم بەوە بوو دوورترین مەودا بخەمە نێوان خۆم و ئەوەی بینیم. هەناسەشم تا دەهات تەنگتر دەبوو. پێویستم بە هەوا هەبوو.

کاتێ جامی پەنجەرەم داکێشا، شوفێرەکە گوتی: "گەرم دیاری."

منیش لێی ڕامام. پێدەچێ بەو زووانە لە پێچەکاندا بەیەکدا هەڵبشاخێین، چونکە لە خەیاڵی ویدا ژنان بۆیە ئافرێندراون تا لە ئاوێنەی پشتەوە سەیر بکرێن. بیرۆکەی مردنێکی خێرا خەریک بوو دنەی دەدام.

"مەبەستم ئەوەیە خوێنت گەرمە." کابرای شوفێر درێژەی دایێ: "ئەمڕۆ خۆ ڕۆژێکی فێنکە، کەچی تۆ جامەکە دەکەیتەوە."

خێرایی ڕێپێدراو پەنجا کیلۆمەتر بوو لە سەعاتێکدا، بەڵام بە لای کەمییەوە ئەو سەد دەڕۆیشت. حەزم لێبوو هێوری بکاتەوە، تا بە سەیرکردنی دیمەنەکان خۆم لەبیربکەم. ئەویش هێوری کردەوە، منیش لە پڕێکەوە هاتمە سەر ئەو بڕوایە نێوچاوانم شوشەییە و ئیدی ئەو دەتوانێ لێیەوە هزرم بخوێنێتەوە، یاخود لەوەش پۆلکتر، دیمەنی ئەمڕۆی دایکم لەسەر هەنیەم ببینێ، کە هێشتا هەر لە ناوسەرم خولی دەخوارد، وەک کورتکراوەی فیلمێک کە پێدەچوو ساڵانێکی دوورودرێژ بێ بەردەوام بێ.

ئەو پرسی: "تۆ خەڵکی مەریوان نی؟ وایە؟"

کەوایە من بە خەڵکی خۆمانە نەدەچووم. تۆ بڵێی بە کێ چووبم؟ خۆ دەمتوانی شێوەزارم بگۆڕم و هەڵیبخەڵەتێنم، بەڵام دەستێک لە قووڵایی سینگمەوە دەنگمی لە قوڕگمدا خنکاند.

شوفێرەکە کۆڵی دا، جا نازانم بەسەرخۆیدا شکابووەوە یان بێزار ببوو. "*ساڵەهای ساڵە، ئەوینداری تۆم...*" ئیدی بە دەم ئەم گۆرانییەی ناسری ڕەزازی لە نەوارەکەی، ئەویش لەبەر خۆیەوە زیلەی[٦٤] بوو.

---

[٦٤] زیلە: گوتنەوەی گۆرانی لەبەرخۆوە و بە دەنگێکی بە ئاستەم بیستراو.

سەرەنجام چاوی لەسەر من هەڵگرت، لە خوام خواست ڕێگا پێچاوپێچەکە هەرگیز کۆتایی نەیەت.

چاوەکانم هەڵگلۆفتن، بەو هیوایەی دیمەنی گۆرینم لەبەرچاوان نەمێنێ. ڕێی تێناچێ نا. هەر دەبێ ئاوەزم لەدەستدا بێ. هەر ئەوە بوو.

ئێستا خەریکبوو لە چیاکان نزیک دەبووینەوە. لەسەر خۆغافڵاندن مکوڕ بووم. خۆی هەردەبوو وا بکەم، دەنا هۆشی خۆم لەدەستدەدا. گۆلی زریبار زۆر جوان بوو، زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ئاوی سازگار بە پانایی هەزار هێکتار. لە مێشکی خۆمدا هەروەک ئۆفیلیا[٦٥] باوەشم بە فێنکاوەکەیدا کردبوو، جەستەم لە گۆلەکەدا سەرئاو کەوتبوو، لە کاتێکدا بەشێکی نادیارم لە سەرەوە تەماشای دەکردم.

بازگە.

منیش نەمدەزانی کاتێ یەکێکی ئەو خاڵی پشکنینە لێم بپرسێ ئاخۆ بۆ چی دەچمە زریبار، چۆن وەڵامی بدەمەوە. کاتێک لە بازگەکەدا وەستاین، شوفێرەکە ددانی گڕکردنەوە و بە گەرمی سڵاوێکی کرد و تەوقەی لەگەڵ سەربازەکەدا کرد، ئەو سەربازەی کلاشینکۆفی بە پشتدا شۆڕکردبووەوە و کەپووشی بۆ پێشەوە بۆ نێو ترومبێلەکە هێنا، بەڵکو شتێکی قاچاغ بۆن بکا: کۆنکەن، مەشروبات، موزیکی یاساغ، یان دەرمانی هۆشبەر. شوفێرەکە

---

[٦٥] ئۆفیلیا Ophelia کاراکتەرێکی شانۆنامەی 'هاملێت'ی شکسپیرە. لەدەقەکەدا، کچی خانەدانێکی دانیمارک و دەزگیرانی هاملێتە. بە هۆی کردەی هاملێتەوە دین دەبێ و لە کۆتاییشدا لە لقی دارێک بەردەبێتەوە نێو چەمێکەوە و نوقم دەبێت.

شتێکی خستە ناو لەپی پاسەوانی بازگەکە، ئەویش ڕێگەیداین بە ڕێگەی خۆماندا بڕۆین.

لای گۆلەکە، شوفێری تەکسییەکە پرسی ئاخۆ لە سەرم بوەستێ یان نا. منیش هەرچی خوردەی پارەم پێبوو لە مستم کرد و ئەوم بەجێهێشت. "ئەویش بانگی کردم: "خوشکێ، ئێرە سەلامەت نییە. دەکرێ لەگەڵت بێم یان لێرە چاوەڕێت بکەم. پارەشم لێت ناوێ."

هەر لە پڕێکەوە بوومە "خوشک"ی ئەو. شەپۆلێکی تەوسی ناقۆلا لێیدام. "مەبەستی تۆ ئەوەیە بڵێی ئێرە لەبەر کەسانی هەوەسبازی وەک تۆ سەلامەت نییە؟"

"قەحپە[٦٦]!" ئیدی پێی لە گاز نا و بە تەناش هەڵستا و تۆزوخۆڵی لە تایەکانی پشتەوەی دەرپەڕی.

کە بینیم تاکسییەکە ونبوو، لە پێچە تیژەکە دوورکەوتووەتەوە، هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی، وەک ئەوەی لە کۆتاییدا دوای بناولێدانێکی قووڵ سەرئاو کەوتبمەوە. ئینجا ڕێگەی خۆم بۆ سەر گردەکە گرتەبەر، دارستانە سەوزەکە مێرگێک بوو بۆ خۆی. مەیلم بۆ لای شتێکی تاڵ و بەفراوی دەچوو، هەر شتێک بەڵکو ڕووی دایکەم لە بیربباتەوە کاتێ دەستی لە کێرە بچکۆلانەکەی ئەو ژنەکە وەردەدا. خۆ لەوانەیە ئاڵەتیش نەبووبێ، ڕەنگە میتکەیەکی زۆر گەورە بووبێ.

بیرۆکەکەم لە مێشکمدا هەژاند و لە بری ئەو چاوم خستنە سەر رووە شووشەییەکەی گۆلەکە. کاتێک ئێمە مناڵ بووین، جوانە هەندێ ئەفسانەی بۆ من و شلێر لەبارەی گۆلی زرێبارەوە

---

[٦٦] Ghahba

گێڕابووەوە، یەکێکیشیان ماکێکی تەلیسماویی هەبوو: چون کەس نەیدەتوانی بناوانەکەی بدۆزێتەوە – گۆلەکە بە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەی ئاو نەبەستراوەتەوە و هەر بە تەنیاش لە بارانەوە گۆلێکی وەها پێکنایەت – هەندێک بڕوایان وابوو، گۆلەکە بە جادوو دروست بووە. خۆ ئەگەر تەنیا گۆلەکە هەندێک جادووی خۆیم بداتێ، هەندێک هێزم بداتێ تا بەسەر هێدمەگرتنی خۆمدا زاڵ ببم.

جوانە پێی گوتبووم هەموو ئەوەی من پێویستە بیکەم، گوێگرتنە. منیش وەهام کرد. هێشتا لووتکەی چیاکان خۆیان نەدابووە دەست تینوتاوی خۆری بەهار، بەڵام لە گردەکان گوڵ و گوڵووک سەریان دەرهێنابوو. لەنێو ئەواندا تووشی شلێر هاتم، ئای لەو جوانییە ناوازەیە. گوڵپەڕی خونچەشلێر بەرەوژێر شۆڕببونەوە و گەڵاکانیشیان وەک تاجێک لە سەر لوتکەی هەر ساقێک هەڵنیشتبوون. مێلاقی سووریش لەبن خۆردا دەدرەوشانەوە و لاچکیشیان بە نەرمەبا دەهاتنە سەما. شێلگیرانە دنەیاندام هەندێ زیاتر لەوێ بمێنمەوە، لێ هزر و خەیاڵێک هەراسانی کردم.

تۆ بڵێی باوکم زانیبێتی چی لە گۆڕێدایە؟ ویستم ویێکەوم – دەرەقەتی ئەوە نەدەهاتم هەر بە تاقی تەنیا و بە بێدەنگی ئەو بارە هەڵبگرم- لەگەڵ ئەوەشدا دەترسام بێباکیی خۆی لە بیستنی هەواڵەکە نیشان بدا. دەترسام لە بێخەمیی ئەو لە ناپاکییەکە، لە تاوانە لەبوورین نەهاتووەکەی ژنێکی لەخواترس، کە ئێمەی لە سەر سنوورێکی توندوبەندی نێوان ژن و پیاودا پەروەردەکردبوو، بە تەواوی وێرانم بکا.

تۆ بڵێی تا کەنگێ لەژێر کۆڵی ئەم بارە گرانە بەرگەبگرم؟ وردوخاشم بەدیار ئەو زوڵم و ستەمەی ڕۆژانە دەرهەق بە گەلەکەم دەکرێ، ئاخر حاشایی لەزمان و مێژوومان دەکرێ، چاودێری دەکرێین، زیندانی دەکرێین، ئازار و ئەشکەنجە دەدرێین و هەڵماندەواسن، کاتێکیش ئەمە هەمووی ببێتە سەرباری بەدبەختییەکانی خۆم ئیدی بارەکە قورستر دەبێ لەوەی بەرگەی بگیرێ. دووبارە و چەندبارەکردنەوەی تاقیکردنەوەی کۆنکور، گرتنی شلێر و لێدان و کوتانی، ئەوی ئەمڕۆشی هاتەسەر. هەر نادادییەکەم دەهاتەپێش لەوی پێشتر ناقۆڵاتر بوو. من دەمزانی لانیکەم ئەمجارەیان خەتاکە لە منڕا ڕووینەداوە، بەڵام ئەو هەستەم لێنەدەبووەوە کە لەبنەڕەتدا بوونی من خەتایەکی ئەزەلیە. من خۆم هەڵەیەک بووم. ئێستا ئیدی بە جەزبەی کەساسی و مەلوولیی خۆم بەزەویدا دەچوومەخوار، بە دوای چڵەپووشێکدا دەگەڕام دەستی پێوەبگرم.

لێگەڕام سەرپۆشەکەم لەسەر بخزێ و بکەوێتەخوارەوە. چاوەکانم نووقاندن و لەسەر گیا دانیشتم، لەپم بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە، ڕۆژیش بە نەرمی لە دەموچاوی دەدام. بە چاونووقاوی بینیم با جەستەمی هەڵگرت و بەسەر چیمەنەکەدا بەرزیکردەوە، مێلاقە سوورەکانیش درووودییان لەسەر گیانی مردووی من دەخوێند.

کاتێکیش چاوەکانم کردنەوە، بینیم پەپوولە بە سەر سەرمدا دەفڕن، باڵە خاڵدارە نارنجی و بۆر و ڕەشەکانیان لێککردوونەتەوە، لەم مێلاقە سوورە بۆ ئەو خونچەی ئەو گوڵە کێوییە هەڵدەفڕن،

لەوێوشە بۆ چرۆی گێوژ و یاسەمین کە بۆن و بەرامەیان بەسەر هەموو ئەوانیدا باڵکێشە. دار بادام و هەرمێیە کێویلکەش جێگیر و ئارام. سوێسکە و زەردۆڵە و باڵندەکانی دیکەش بە ئۆرکسترایەکی جادوویی گۆرانیان دەچڕی.

کات تێپەڕی. منیش نەمدەزانی تا چەند لە نێو ئەو گوڵزارە و لە پشت ئە گابەردە زل و کەتەیەی گردەکەدا داڵغەم ڕۆیشتبوو، بەخەیاڵی تونەبوونێکی بێخوست[٦٧]. چەندین سەعات هیچم نەکرد، هەر هیچ: نە بیرکردنەوە، نە ماڵ خاوێنکردنەوە و نە خواردن ئامادەکردن، نە زیلەکردنی گۆرانی، نە تەماشاکردنی هیچ فیلمێک بۆ جاری ملیۆنەم.

خۆر خەریک بوو ئاوا ببێ، منی لە دۆخی خەون و خەیاڵان دەرێنا.

بەڵێ ئەوە منم لێرە، ژنێک بە تاقی تەنیا و لە بولێڵی ئێوارە و لە نێو چیاشدا.

چەکمەیەکی نادیار خرایە سەر قوڕگم هەناسەی تەنگ کتدم و برستی لێبڕیم، کەچی هێشتاش نەمدەویست بڕۆم و بچمە بەردەمی دایبابم. یاخود نەمدەویست ڕووبەڕووی ئایندە خنکاوەکەم ببمەوە. هەر لە پەنا گاشەبەردەکەدا، دەستم لە چۆکان وەرێنا بوون و ئازارەکەشم لێبووبووە ئاگرێکی هاروهاج هەموو جەوروستەمێکی لرف دەکرد.

ئەرێ، شانم لەبن سەختی و ناهەمواریەکانی ژیان داهێزرابوو، ژیانی ژنێک لە لەعنەتاوا، لە شوێنێکی نەفرەتلێکراو. ئەم شەکەتیە

---

[٦٧] a serene nonexistence تونەبوونی کرمانجی لەبری عدم الوجود.

حەسانەوەی نەدەناسی. وێڕای ئەو هەموو پۆشاکەی لە بەرمدا بوو، پێستم هەستی دەکرد بەردەوام لە بەردەم ئەو هەموو دڕکوداڵەی هەبوونمدا ڕووتوقووتم.

ڕۆژ ئاوابوو، لەودیو گۆلی زرێبارەوە ئاوابوو. دەرزەنێک شەبەنگی سوورباو لە ئاسۆوە کرابوونەوە، کاتێ ڕۆژ جوامێرانە جێگەی خۆی بۆ شەو بەردەدا، سوور دەبریسکانەوە.

لە دامێنیش، ڕێگەیەکی تەسکی قیرتاو هەروەک تەنوورەیەکی کەسک بە ڕیزێک گوڵی سوور و گوڵە سپییە کێویلکەکان دەورەی نەخشاندبوو. گوڵە شلێریش کەشخە و درێژ، بە ڕازاندنەوەی ئەو بانە سەختەی کوردستان، دادەڕسایە سنوورەکان، دادەڕسانە ئەو سنوورە بێ واتایەی هاوپەیمانان دوای جەنگی یەکەمی جیهان کێشابوویان.

دانەویمەوە و گوڵە شلێرێکم قیتکردەوە، دیاربوو ڕێبوارێکی بە سووکی پێی لێنابوو، بەڵام هێشتا نەقرتابوو. کاتێک قامکم بەسەر گیاوگوڵەکەدا دەهێنا، تامەزرۆی کۆڵنەدانەکەی شلێر بووم، بەڵام خۆ من باخێکی ترس و قێز، باخێکی ناسۆربووم؛ نیشتمانە داگیرکراوەکەشم زێدی مەرگ بوو.

هەڵسامەوە، بە هەناسە برکێوە پشم بۆ هاتەوە. چیدی خۆم نەشاردەوە. هاوارم کرد: "بەسە بەس. ئیدی بەسە بەس."[٦٨]

ئینجا هەر بە گورگەلۆقە سەربەرەوژێر بوومەوە، خۆشم پێ نەدەسەنگرایەوە. وێڕای سەرماوسۆڵەی ئەنگۆرەکە، ئارەقەشم

[٦٨] Basa bas

کردبوو. (با)ش له دەسماڵە سەرپۆشەکەی دەدام، ئیدی خێراتر دەبووم. هەروەک ئەوەی باڵم هەبن، باڵەفڕکێم بوو.

کاتێک غارم دەدا هاوارێک لە سینگم دەردەپەڕی. بەرەو ڕێگای سەرەکی، بەرەو جیهانی پیاوان ملم لێنا. شەقامەکان هی ئەوانن. پیاوانی قەزاوەتچی. پیاوانی دووڕوو. پیاوانی ناموس-بەژنانەوە-بەند. ترۆمبێل بە دەوری پێچەکەدا گڕەیان دەهات، پڕ لە شوفێری بەدمەست. کاتێک منیان بینی لە گردەکە دەهاتمە خوار، دەستیان بە هۆڕنلێدان کرد. ئەوان لەو ڕێگەیدا زۆر خێرابوون، خێرا لەچاو دەستوبەندیان بۆ قەزاوقەدەر، زۆریش خێرا بۆ کەچە ترۆمبێلەکانیان. ترۆمبێلێکی سپیی مۆدێل نوێ لەسەر ڕێگە پێچاوپێچەکە لایدا، تۆز و خۆڵی پەیداکرد. بایەکەشی لە گوێم دا.

پێدەچوو لێخوڕی ترۆمبێلە سپییەکە لە کەسێکی وەک من، لە هاوسەفەرێک بگەڕێ. منیش لە بەردێک هەڵنگووتم، گوڵە مێلاقە سوورەکەی ناو گیام پانکردەوە. کاتێکیش سەرپەلۆم برد و بە لادا هاتم، چیرۆکە نەبێژراوەکانی ناخم وەک پەڕە لەکتێبێک بدڕێنێ و فڕێبدەیە تەنەکەی خۆڵەوە، لێمهەڵدەوەرین. هەینێ شتێکم بەسەردا زاڵ بوو و تینی دامێ چیرۆکەکانم بە دەنگی بەرز بچڕم، هەر لە بەراییەوە تا کۆتایی هەڵیانڕێژم. لە هیکەوەش سەری ئەو هەموو کوردەم دەبینی لە بن زنجیری تانکەکاندا دەپلیشانەوە.

بە خێراییەکی شێتانە لە نشێوەکە دەهاتمە خوار و هەر لە هاواریشم دەدا، ئاخر نەمدەتوانی خۆم بگرمەوە، خۆمی شێتوشور.

لە دوا تەکاندا باڵم گرت.

سیرەسیری ستۆپی ماشێن. سەرەنجامیش هێمنی.

## بەندی چواردە

کاتێک باپیرە بە ماست لە سەر لێوی ئالان خەتی سمێڵی بۆ دروستکرد، کوڕیژگەکە لە پێکەنینیان کەوتە سەر پشتێ. هەڵبەت وێناکردنی خۆی بە دەسکێک سمێڵەوە خستیە هەیەجان، ئاخر وای بیرکردەوە هاتنی سەروڕدێن بەکەڵکی دێ لەشاردنەوەی بەژنە کورتەکەی لەچاو هاوپۆلەکانی دیکەی.

تەنیا مامە سۆران، کە لەنێو شەش مامەکانیدا بچووکترینیان بوو، بێدار بوو، کاتێ هاتە سەر قەپەنگی سەر حەوشەکە، دەستێکی لە پرچی ئالاندا و ئالۆزیکرد و گوتی: "هەی مەیمونی کەمۆ، پێکەنینەکەت هەڵیستاندم."

ئالان پێکەنییەوە. "باپیرە، تکایە کلکیشم دەوێ."

باپیرەش بە پەنجە قڵیشاوەکەی باقی سمێلە ماستینەکەی لەسەر هەردوو لاڕوومەتی خوارکردەوە وەک دەسکی لێکردن و یەک دوو دلۆپیشی بە کەپووی داکردن. ئالانیش لە پێکەنینا خۆی پێنەگیراو کەوت.

هەینێ، ئەو بەیانییەی حوزەیرانی ١٩٦٣، وایدانا، باپیرە دڵخۆشترین کەسی سەر ڕووی زەمینە. لەوانەشە هەر ئەمە هۆکار بێ کە ئالان متووی بە سالمەندەکان بووبێ و حەزی لێبێ گوێ لە حەکایەتەکانیان بە تایبەتیش گوێ لە هی مام ڕێوی ڕابگرێ[٦٩].

---

٦٩ maama rewi

ئەوەش بۆ ئالان مایەی ئازار بوو، ئاخر زۆر لەوانەی موویان ماشوبرنجی بووبوو نەیاندەتوانی بنووسن و بخوێننەوە، ئەوان پشتیان دەهێشا و دەستەکانیشیان دەلەزرین؛ خەونی ئەو، ئەوە بوو بە بلَنگۆ چیرۆک بۆ سەدان پیر بخوێنێتەوە ئەو دەمەی ئەوان لە چیمەنێکی گەورەدا لەنێو گوڵە پەمەیی و سوورەکاندا پاڵیان لێداوەتەوە.

داپیرەش نانی زیاتری هێنا، نانی تیری، نانێکی تەنکی خڕ، ئەو نانەی لە ژێرزەمینەکەوە لەسەر ساج برژاندبووی. ئالانیش بابۆڵەیەکی لە هەنگوین و کەرە بادا. بە دەم بابۆڵەکردنەوە گوتی: "دوای خواردنی ئەمە، خێراتر لە گوللە غار دەدەم."

مامە سۆرانیش بە دەم بابۆڵەکردنەکەی خۆیەوە گوتی: "مەیموونەکەمان گەورە دەبێ، کەچی هێشتا هەروەک منداڵێکی بچکۆلە ڕەفتاری لەگەڵ دەکەین."

باپیرەش کۆشی خۆی هەڵکوتا و هاتە قسە: "خۆی هەر وایە، ئەوەی مرۆ هەر بچووکە. ئالان، ئەگەر من لە جێی تۆ بم، هەرگیز وا ناکەم گەورە ببم."

داپیرەش سەری هاوڕابوونی لەقاند و گوتی: "بەڵێ، گەورە بوون تەڵەیە."

کەچی ئالان گوتی: "بەڵام من حەزم لە ئایندەیە."

ئەوانیش پێکەنین. باپیرە مڵچەی ماچێکی لەسەر گۆنای ئالانەوە هێنا. "شتێکی وا لە دەمی کەسێکی شەش ساڵانە دێتەدەرێ."

هێشتا ئالان سمێڵە ماستینەکەی هەر پێوە مابوو، بە مۆڕەیەکەوە گوتی: "نا باپیرە، من حەفت ساڵانم."

دیسان خەنینەوە.

باوک هاتبووە سلێمانی تا ئەو وتارەی لەگەڵ مام سۆرانی سەبارەت بە هێنانە بەرچاوی ژان و ناسۆری چینی کرێکار لە کوردستان و باقی بەشەکانی دیکەی عێراق نووسیبوو، چاپ و بڵاوبکاتەوە. ئاخر کورد سێ سەد ساڵ بەر لە لەدایکبوونی عیسای مەسیح لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس دەژیان، کەچی ئێستا گەلەکەی ئالان وڵاتێکی سەربەخۆی خۆیان نییە. کاتێکیش هاوپەیمانە خۆرئاواییەکان هاتن و نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوینیان داڕشت و خاکەکەیان خەتخەت کرد، کوردستانیان کردە چوار لەت، بەسەر ئێران و عێراق و تورکیا و سوریادا دابەشیانکرد.

ئالان بە سەردانیکردنی باپیرەی لەگەڵ باوکیدا، دەبووایە ڕێنووسی کوردیشی باشکردبایە، بەڵام خۆ کوردی بابەتێک نەبوو لە قوتابخانە خوێندرابا؛ هەر عەرەبی تاکە زمانی بەکارهێنراوی قوتابخانە بوو. بابەش تێکۆشا و ئەو سێ برایەکەی بە زمانی زکماکی خۆیان فێری نووسین بکا، شتێک کە ئالان تێنەدەگەیشت سوودی چییە. بۆ بەیانی بابە خۆی لە قاوەڵتی دزییەوە، تا بەناو شاردا بگەڕێ، بەڵکو ئامیرێکی تایپی قەدەغەکراو بدۆزێتەوە.

لەنێو حەوشەکەشدا داپیرە گوڵە پەمەیی و گوڵاڵە سوورەکانی ئاودەدا. دەنگێکی گەورە لە دەرگا دارینەکە کە لە نێو دیوارە چیمەنتۆکەدا گیرابوو، کە دەوری زەوییەکەی دابوو، تیشکۆی هرزی پچڕاند. سۆندەکەی دەستی فڕێدا.

ئالانیش بە غاردان هات تا کێشەکەی لە کۆڵ کاتەوە گوتی: "من دەیکەمەوە"، بەڵام بەر لەوەی بگاتە دەرگاکە، شەش سەربازی عێراقی یەکپۆش، دەمووچاویان بە شاڵێکی خەتخەتی بۆر شاردبووەوە، دەرگاکەیان شکاند و لوولەی تفەنگەکانیان لە ڕووی داپیرە کرد.

هەرە کورتیلەکەیان فەرمانی کرد: "کوان؟"

باپیرە لە جێی خۆی گۆد بوو، هێشتا پارووی لە دەمدا بوو. ئالانیش ئاوڕی دایەوە بینی مامە سۆران بە سەر دیوارەکەدا بۆ سەر بانی ماڵی دراوسێکەیان بازیدا. کەسێک، کە ئالان ئەودەم نەیدی، بەڵام داپیرەبوو دەستی ئالانی گرت و ڕایکێشایەوە ماڵێ.

ئالان لە باوەشی داپیرەدا سەیریکرد چۆن سەربازەکان بێ ئەوەی فەرموویان لێبکرێ بەسەر ماڵەکەیان دادا. هەر شەش مامیان لە نێو جێوبالینگانی خەو یان لە گەرماوەکەی ماڵێ و لە هۆدەی بنخان و لەسەربانی ژوورەکەی دیکە بە ڕاکێشان هێنایانەدەر. ئالان بە سەردەستەی کراسەکەی ئەو دەسکە سمێڵانەی بە ماست بۆیان دروستکردبوو سڕیەوە، هەوڵی دا لەو هەراوزەنایە، لەو جموجۆڵە نائاساییە، لەو دەنگەدەنگ و ژاوەژاوە ناحاڵییەی کە بە ئاستەم لە گەرووی ماڵنشینان دەهاتەدەر تێبگا. ئای ئەگەر چاوەکانی لە جیاتی فرمێسک چەکێکی دەدایەدەست، ئەوسا دەیزانی چی دەکرد!

یەخەی ملی مامەکانیان گرت و هەر بە هاتوهاوار و خۆگیرکردن لە دوای خۆیان ڕاکێشان، هەروەک ئەوەی دابەستە بن و بۆ قەسابخانە ببردێن تا سەریان ببڕدرێت. پرسیار و دوعا و نوێژەکانی باپیرە، هاوار و پاڕانەوەی داپیرە، قیژە و هاوار و

نەفرەتی دەرودراوسێ، هیچ شتێک لەمانە بایی نوکە دەرزییەکیش کاری لە سەربازەکان نەکرد، ئەوانەی کردەنیازەکەی خۆیان بە بێ هیچ کاردانەوەیەک جێبەجێدەکرد.

مامەکانی ئالان، کە هەندێکیان هەر بە جلی خەوەوە و لە بن هەڕەشەی لوولەی تفەنگەوە بردرانە لای ئەو ترومبێلە باربەرانەی سەربازی، کە سەدان کوڕوکاڵی چواردە بۆ بیستوپێنج ساڵی کوردیان خڕکردبووە سەریەک و بارکردبوو. ئالانیش خۆی لە دەستی داپیرە ڕاپسکاند و لە باوەشی هاتەدەر و بە غاردان خۆی گەیاندە سەر جادە. داوا لە پیاوە گیراوەکانیش کرا لەسەر تەختەی پشتەوەی ترومبێلەکان دابنیشن و دەستیشیان بۆ پشتەوەی سەریان ببەنەوە و متەقیشیان لە دەمەوە نەیەت. ئالان ئاوڕێکی لە باپیرەی دایەوە کە لای دەرگا شکاوەکەی ماڵێ وەستابوو، سەری بەردابووەوە.

ئالان لەگەڵ ئەو هەموو ژن و منداڵانەی گەڕەکێ بە دوای ئەو ترومبێلە بارقوڕسانە کەوتبوو. تایە کەتە و زلەکانی زیل و ئیڤاکان[٧٠] بەنێو قیژە و هاواری ژن و منداڵە وەدووڕاچووە تۆقیوەکان زەلامەکانیان بردن و لەدوای خۆیان هەر تەپو تۆزیان بەجێهێشت. پیاوە بەتەمەنەکانیش، بێ چەک و سامگرتوو، بە دوای چەکدا گەڕان و دایانە شاخ، داوایان لە پێشمەرگە کرد بەڵکو فریایان بکەون و دابەزنە شار و ڕووبەڕووی ئەو سەربازانە ببنەوە، کە سەرتاپایان چەک بوو. ئالان بە دوای ئەو زیلە کەوت کە مامەکانی سوارکردبوو، بۆ لای گردەکەی ناوجەرگەی شار ڕۆیشت. دڵیشی

[٧٠] زیل و ئیڤا دوو جۆری ترومبێلی ڕژێمی عیراقی بوون بۆ گواستنەوەی سەرباز.

هەرگیز وەها خێرا لێینەدابوو. لە کۆتاییدا ترومبێلە زیلەکان لە سەر گردەکە وەستان و هەر بە پاڵ بەندکراوەکانیان فڕێدانەخوارەوە.

لە سەر عەردەکەش هەر گیراوێک بێڵ یان تەورێکی درایەدەست و فەرمانیان پێکرا زەویەکە هەڵکەنن. بە دەم جوێنی "ئیبنول گەحپە"، هەی کوڕی قەحپە تفیان پێدادەکردن. فەرمانیشیان بە ڕێبوارەکان کرد لەوێ نەمێنن، خەڵکیش بە ناچاریی ملکەچی هەڕەشەی لوولەی کلاشینکۆفان بوون.

ئارەقە و چڵک لە جەستە و پرچ و برۆ و برژانگی گیراوەکان دەتکا کاتێک بە تەور و بێڵی دەستیان خاکەکەیان هەڵدەکەند. ئارەق بە سەروچاویاندا دەهاتەخوارەوە، فرمێسکیش بە هەنسکی پەنگخواردوو بەسەر دەستەکانیاندا. ئالان سەیریکرد میز بە دەلینگی کوڕێژگەیەکی تەنیشتی دێتەخوار، ژنێکیش لە پشتەوەی ئەو بەدەستەکانی سەروڕوومەتی خۆی دەڕنێتەوە و هەر هاوار دەکا "خوایە، خوایە، خوایە" پیرەمێردێکیش لەو لاوە هەر دەلەرزی، خۆی پێ کۆنترۆڵ ناکرێ و دەستی بە ئاستەم کۆمی گۆچانەکەی گرتووە. پێنەدەچوو ئالانیش ماخۆی جەستە بەستووەکەی خۆی بێ.

کاتێکیش لە هەڵکەندنی چاڵەکە بوونەوە، فەرمان بە نیوەی گیراوەکان کرا بازبدەنە نێوی، فەرمانیش بە نیوەکەی دیکە کرا خۆڵەکە بەسەر دەموچاوی دۆست و خزمەکانی خۆیاندا بکەن. لە کۆتاییدا باپیرە خۆی گەیاندە سەر گردەکە؛ ئەو ئالانی لە ڕیزی پێشەوەی تەماشاچیانەوە بینی، بەدەم تەماشاکردنەوە سەرپەنجەکانی دەکرۆشت. ئالان لە داپیرەی پاڕایەوە بەڵکو ئەو دڵڕەقییە توندە ڕابگرێ.

باپیرەش گەیشتێ، ئامێزێکی بە ئالاندا کرد و گوتی: "ئەم پیاوەگەنجانە هەر یەک دوو ڕۆژی دیکەیە ئازاد دەکرێن." سەری ئالانیشی بە سینگی خۆیەوە گیرساند. "باوانم[71]، ئەوان هەر دەنێرنەوە ماڵێ، لەوانەیە بەسەر شکاوی و ڕوو ڕوشاوی، بەڵام ئەوان هیچیان لێنایەت. دەی دوعایان بۆ بکە." کاتێکیش ئالانی بە خۆیەوە دەگوشی، دەستەکانی دەلەرزین. "بەڵکو باران ببارێ بەرلەوەی ئەو پیاوانە لە تینوێتیاندا بمرن."

ئالان لە نێو ئاپۆرای گیراوەکاندا چاوی گێڕا، بینی مامە سۆران بە بێڵەکەی خۆڵ فڕێ دەدا. کاتێکیش سۆران چاوی بە چاوی هیوای[72] برای کەوت، دەستی شل بوو. هیوا لە نێو قۆرتەکەدا چاوەڕێبوو بە دەستی کەسە هەرە نزیکەکەی زیندەبەچاڵ بکرێ، بەڵێ بەدەستی ئەو پیاوەی بە کوڕوکاڵی گەمەی زۆرانبازی دەکرد، کە لە هەموو ژیانیدا باوەڕ و متمانەی پێبوو. "دەی سۆران دەی،" ئەو وەهای گوت، چاوەکانیشی لە قۆرتەکە بە ڕوودا دەدرەوشانەوە. سەربازێکی ڕیشدار لەبن بەرگێکی شارییەوە دوودڵییەکەی سۆرانی بینی. "کەلب ئیبن ئەلکەلب!" -هەی سەگی کوڕی سەگ- وەهای نەخوڕی و قونداغە تفەنگێکی لە بناگوێی چەپی سۆران دا و دەستەکەی هەڵدڕی.

سۆرانیش نەڕاندی، کاتێ ئاوڕیدایەوە خەریک بوو بخنکێ. بە لەکەی دەستی قونداخی کلاشینکۆفەکەی لە خۆی دوورخستەوە بە هیوەیەک بەر خاوەنەکەی کەوت و جامی سەری هەڵگرت. ئالانیش

---

[71] Bawanem

[72] نووسەر هەر لە دێرێ دواتردا بۆ خوێنەری ئینگلیز ڕاڤەی وشەی هیوا دەکا، پێویست نەبوو من لە دەقەکەدا هەمان دێڕ بنووسمەوە.

چاوی ترووکاند. ئیدی هەر گوللە بوو لە هەموو لایەکەوە دابارین. سۆران ڕاقەنا و گەوزی. خوێنەکەی بەسەر هیوادا ڕژا، ئەویش لە شوێنی خۆی هاواری دەکرد و هەوڵیدەدا جەستەی براکەی بپارێزێ، بۆ لای خۆی ڕاکێشا، دەستی لەسەر چەناگەی خوێناوی براکەی دانا و فشاری خستەسەر.

باپیرەش بە هاوارەوە هەوڵیدا بەرەو لای ڕۆڵەکانی بڕوا، بەڵام یەک دەرزەن لوولەی تفەنگی لە سینگ کرا، یەک دەرزەن دەستیش پڕیاندایێ و بۆ دواوەیان گەڕاندەوە. شێلکەی تەقەکەش هەر نەوەستا: جەستەی هەردوو برایان لە ئامێزی یەکدیدا کونبەدەر کرد، خۆیان و خاکەکەیان لە خوێن سوور کرد.

مامەکانی کە هەر لە ئامێزی یەکدیدا بوون، لە چاڵەکەدا نێژران. نیوەی گیراوەکانیش تا چەناگەیان هەر لە بن خۆڵدا بوو. بیست و پێنج پیاوەکەی دیکەش نێردرانە چاڵێکی دیکە، سەربازەکانیش خۆڵیان بەسەرداکردن تا سەریان لەنێو خۆڵدا بزر بوو. ئالانیش سەیری ڕیز لەسەر ڕیزی کەللەسەری مرۆڤ، باخێک لە ژان و ناسۆری دەکرد.

سەربازەکانی سەرمەستی هێز و دەسەلات، پێلەقەیان لەسەرە دیارەکان، ئەوانەی خۆڵ بە تەواوی نەیشاردبوونەوە دەدا، هەندێکیان بە قۆنداغە تفەنگ لێیان دەدا و گاڵتەیان پێدەکردن.

لەسەر گردەکە باپیرە بە هەموو هێزی خۆی دەگریا وەک ئالان هەستیپێکرد، بە شێوەیەک کەوتە شیوەن، زەوی هێنایە لەرزە. دەستی توند بە شان و ملی باپیرەیەوە وەگرتبوو، هەستیکرد بێ ڕاددە بچووکە.

پیاوێکی تاوبردوو، کە دراوسێی بوو بە دەمووچاوێکی بەسەرخۆداشکاو باوەشی بە باپیرەدا کرد، چووە بن باڵی، دەستە لەرزۆکەکانی لەسەر شانی خۆی دانا و لە گردەکەی هێنایە خوار.

باپیرەش هەناسەیەکی دایەوە و گوتی: "ئەرێ کوڕەکانی دیکەم لە کوێن؟"

دراوسێیەکەشی پێیگوت: "دەی با جارێ بچینەوە ماڵێ."

ئالانیش ویستی لەگەڵ باپیرەی بڕوا، بەڵام قاچی بە دوایدا نەهات، نەکرا لە شوێنی خۆی بجووڵێ. خۆ ئەگەر هەنگاوێک بهاوێژێ، ئەوا خەوە مۆتەکەکەی لێ بە ڕاست وەردەگەڕێ. ئەو بە چاوەکانی لە گردەکە بۆ مامەکانی دیکەی گەڕا، لەوانەیە ئەوانیش لەوێ لە چاڵێک نێژرابن و نەتوانن لە شوێنی خۆیان ببزوون. ئەوانی نەبینی. تەنانەت باپیرەش لەبەر حوکمی چاوان نەمابوو.

ورده ورده دەبدەبەی[٧٣] خەڵکەکە دەڕەوایەوە. لایەکانیش، ئەوانەی بەسەر دیمەنەکەوە شاهید بوون و ترس بردبوونیەوە، نیگایەکانیان بۆ سەر یەکتری تاکە دەرفەتی دڵنەوایی یەکدی بوو. سەرەکانیان بە هێواشی دەجووڵا، هەروەک ئەوەی هەموویان لە ژێر ئاودا گیریان خواردبێ. هەناسەی ئالانیش لە کەشوهەوایەکی سامگرتووی ئارام و هیسترایەکی وچانخواردوودا بوو.

ئەوە بوو لەپڕ خەڵکەکە لە سامناکییدا لە هاواریان دا. لە ڕێگایەکی خواروی ئەوانەوە، چەندین تانکی زرێپۆش نزیک دەکەوتنەوە. ئالان بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو گەڕایەوە دواوە،

---

[٧٣] دەبدەبە: دەنگەدەنگ و هەراوزەنا.

دەستی لەسەر دەمی دانابوو. ئەو نە دەیتوانی هەڵبێ و نە دەشیتوانی دڵەکوتەکەی هێمن بکاتەوە، ئاخر ئێستا ترسی ئەوەی هەبوو دڵی بتەقێ. کاتێکیش ئاپۆرە تۆقیوەکە بەرە پێشەوە پاڵی نا، تەقە بە هەوادا کرا، بەڵکو بیانگێڕنەوە دواوە.

تانکەکانیش پێشڕەوییان کرد.

مێشکی ئالانیش لە ڕەوتی دیمەنەکانی پێش چاوی خۆی نەدەگەیشت. ئاخر هەر هاوار و قیژە و نزا و پاڕانەوە لە لایەک و هەر پێکەنینی ئەهریمەنانەی سەربازەکانیش بوو لە لاکەی دیکە. هەستی بە خۆی کرد بەشێکی نەبینراوی لێکەوتەخوارەوە و لەنێو خاکەکەدا توایەوە. ئیدی هەرگیز ئالانەکەی جاران نەما.

ماوەیەکی یەکجار زۆر پڕ لە ناسۆری کێشا تا تانکەکان سەری گیراوەکانیان پلیشاندەوە.

بۆنساردی ماددەی بە خوێن، بۆنی گۆشتی هەڵبڕزکاو، کەللەسەری پلیشاوەی مرۆڤ، بۆنی مەرگ ڕێگای خۆی بەرەو بینەرانی دیمەنەکە گرتەبەر و لووت و قوڕگی گرتن. بەختەوەرەکان ئەوانەبوون کە ڕشانەوە، ئالان یەکێک نەبوو لەوان.

کاتێک ئەو ئاسنە زەبەلاحە ماڵباتەکەی ئەو و کوردەکانی دیکەی لەسەر ئەم دنیایە ڕەشکردەوە، ئالان هەناسەیەکی سارد و بێکەڵکی هەڵمژی.

لە ماڵیشەوە باپیرە کەوتە سەر جێ، لە ناسۆردا دەتلایەوە، دەستیشی هەر لەسەر سینگە پڕ لە ئازارەکەی بوو. لە تەکیشیەوە ژنەکەی بە بێدەنگی فرمێسکی هەڵدەڕشت. هەرچەندە ئەوان بە چاوی خۆیان پلیشانەوەی سەری کوڕەکانیان لەبن زنجیری

تانکەکاندا نەبینی، بەڵام لەو ڕۆژەوە بە جەرگسووتاوی یەک بە دوای ئەوی دیکەدا کەوتن. یەکێک چوو بەڵکو پزیشکیان بۆ بانگبکا.

باوکەیش گەیشتەوە ماڵە باوانی، بێئاگا لەو کێفەڕاتەی قەوما، ئەو بە کوێرەڕێکەدا ڕۆیشتبوو تا گەنجینەکەی دەرباز بکا. وتارە تایپکراوەکەی لە ژێر کراسەکەیدا دانابوو. خۆشیی دەستکەوت و هیوای بە گەلەکەی لە چاوەکانیدا دەردرەوشایەوە. ئینجا بینی دایبابی لەسەر نوێنی مردنن. بە هێواشی و بەرەبەرە دراوسێکان لە کێفەڕاتی مەرگەساتەکەیان ئاگادارکردەوە، کە چۆن سەربازانی بەعس - بە فەرمانی عەبدولسەلام عارفی سەرۆک و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکری جێگری- سزای کوردیان لەسەر ئەوە داوە گوایە چۆن زاتی ئەوەیان کردووە خەون بە حوکمی خۆسەرییەوە ببینن.

ئیدی بابە هەر بە غاردان خۆی گەیاندە سەر گردەکە، لەوێ منداڵە سەرلێشێواوەکان خۆیان بە یەکەوە نوساندبوو. لە پاڵ ئەوانیش دەستەیەک لە خەڵکی هەراش شین و شەپۆڕیان بوو، خۆڵیان بەسەر و پرچی خۆیاندا دەکرد و لە سامناکییاندا لە سەروگوێلاکی خۆیان دەدا.

ڕووی قسەی بابە لە کەسێکی دیاریکراو نەبوو، کە گوتی: "ئەو بەریتانییە زۆڵانە چەکیان داوەتە بەغدا تا ئێمە بکوژن. تانکەکانی ئەوان، فڕۆکەکانیان، بۆمبە نەفرەتییەکانیان و گازی ماستەردیان بەر لە چل ساڵ عێراقییەکانی کوشت و هەنووکەش ئێمە دەکوژن."

ئەوسا بە چاوێکی نەبینراوەوە تەماشای دەمی گردەکەی کرد، کە بە خوێنی خەڵکەکە و براکانی سوور بوو.

کاتێ ئالان ئەو کردەوە سامهێنەرەی باوکی بینی، لە کۆتاییدا ڕێگەی بە هەنسکەکانی دا بێنەدەر، ئەمەش لەو کاتەی سەربازەکانی بینی تەقەیانکرد، خۆی گرتبوو. ئیدی منداڵەکانی دیکەش شوێن ئەو کەوتن و لە هەنسکی گریانیان دا. ئەوە بوو فرمێسک لەسەر ڕووخساری تۆزاویی ئەو کوڕ و کچانە تێکەڵی یەک بوو، ئەوانەی دایبابیان لەو راکەڕاک و قیامەتەدا، بە زیندوویی یان بە مردوویی، دەستبەرداریان بووبوون.

ئالان بۆ لای باوکی غاریدا و خۆی لە کۆشی هاوێشت. بە گریانەوە گوتی: "بابە گیان، بابە!" دوو خولەکی پێچوو تا باوکی لە بوونی ئەو هایدار بێ و لە باوەشی بگرێ.

"ئێمە دەبێ عێراق بە جێبێڵین. نابێ هیچی دیکە لێرە بژین." خواستێکی سەرکەش بەوەی 'لەهەر کوێ بین تەنها لێرە نەمێنین' لە هەناوی ئالانیش قوڵپی دا.

هەندێ لە ژنە پرهیمەت و پشوودرێژەکان و چەند پیاوێکی بە تەمەن بە بێ فرمێسک هەڵڕێشتن باقی تەرمە نەناسراوەکانیان بە خاک سپارد. ئەوان لەسەرلینگانیشیان بەردی بێ ناونیشانیان وەک کێل ڕیز بەدوی ڕیز دانان و دوای شین و گریانیش داوایان لە ئالان و منداڵەکانی دیکە کرد بەڵکو بچن هەندێ گوڵە کێویلکە و گوڵی پەمبە لە دامێنی گردەکە بچنن و تا لەسەر گۆڕەکان دایانبنێن.

ئالانیش ئەو خوێنەی مژت کە دڕکی گوڵەکان لە قامکیەوەیان هێنا.

ئافرەتێک دەگریا و ئالانیشی نەدەناسی، کەچی هەر بانگی دەکرد "ئالان!" سێ کوڕیژگە بۆ لای دەنگەکە ئاوڕیاندایەوە؛ یەکێکیان

غاریدایە لای ژنەکە. ئاخر ئالان ناوێکی خۆشەویست بوو، واتای خۆی دەگەیاند. ئەمەش گەواهی بوو لەسەر ئەوەی لە منداڵی نەتەوەی بێ دەوڵەت چاوەڕێدەکرا، ئەوەی دەبێ لە دژی نەبوونییەکەدا بجەنگێ.

## بەندی پازدە

تا ماوەیەک، تاریکییەکی بێخوست باڵێکیش بوو. من لە عەدەمدا مەلەم دەکرد، وەک تەنێکی بێقورسایی لە نێو دەهۆڵێکی قۆقزی گەورەدا.

لێ زیندی بووم.

ئارەزووی سەرکەش و توندی مانەوەم -تەنانەت لە دامێنی ژیانیشدابێ- مەرگی ترساند و تاراند.

"مێینەیەکی تەمەن بیستوچوار ساڵان. ڕووداوێکی ترومبێل. ئەگەری مێشکشلەقان. شکانی حەوز. نەبوونی هیچ ئاماژەیەکی خوێنبەربوونی هەناو. توخمە ژیارییەکان جێگیر، فشاری خوێن حەفتا و سێ لەسەر نەوەد." ئەوە ئەو وشانە بوون لەسەر سەرم دەگوتران، وشەیلێک کە دەنگێکی بێ بێگیان و سارد دەریدەبڕین پێڵووی چاوەکانمیان هەڵێنا، کەچی بۆ ماوەیەک لەبەر ئەو تیشکە پڕەی سەر سەرم هیچم نەدەبینی.

من مابووم. لە نێو ئازاردا گینگڵم دەدا.

نەمدەتوانی ملم بجووڵێنم، ئاخر بە ڕاگرێکەوە بەسترابووەوە، بۆیە چاوم بە بەرینی کردنەوە، لەهیکەوە لەو هەرایەی لە سەرم بوو، ئاگاداربوومەوە.

گوێم لە دەنگێک بوو گوتی "تا سێ دەژمێرم"، ئیدی کە ژمارەکە گەیشتە سێ، لەسەر تەختەیەکی ڕاگیرەوە بۆ سەر یەکێکی دیکە

گواسترامەوە. ئەو هاوارەی لە کاتی گواستنەوەکە لە گەرووم دەرهات نەمناسییەوە. دەستم بەر لینجاویکی سپی لەو پارچە پەرۆیانەی لە ژێرمدا بوون کەوت لە ڕوودۆشەکە ڕەقەکانی ژێر جەستەمەوە سوکەبۆنێکی فاستم هاتەبەر مەشام، پاشان هەستم بەتەڕێتیەکیش کرد – ڕشانەوە؟ میز؟ خوێن؟ هی من؟ ئیدی گریام، هەنسکم جەستە هاڕاوەکەمی هەلاهەلا کرد، شکستەکەم وێرانیکرد.

تەنانە لە مەرگیشدا شکستم هێنا.

ژنەیلێک بە سەدریەوە بەسەرمدا نوشتابوونەوە، بە مقەس جلەکانیان لە بەردادڕیم بە دوولینگەکەشمەوە، ئاخر ئاماژەیان پێدا کە چەند پشکە خوێنیکی پێوەیە. یەکێکیش پەردەیەکی بە دەوردا کێشام، بەلاّم لە نێو ئەو دیوارە قوماشەدا جەستەم بە تەواوی بۆ غەوارە ئاوالاّ بوو. گریام و قیژاندم، چەرچەفەکەی ژێر خۆم ڕاکێشا تا بە خۆمیدابدەم و خۆمی پێداپۆشم. هەموو پنتێکی جەستەم کەوتبووە ژان. ئەریّ چۆن ئەو هەموو ئازارە ڕێیتێدەچێ؟

پەرستارەکان جلێکی فشوفۆلّ و درێژی نەخۆشخانەیان دەبەرکردم، لە پشتەوەش بۆیان گرێدام، قژەکەشمیان بەست و بە سووکیش لەچکەکەمیان بۆ بەستمەوە. چەند داوە پرچێکم کەوتبوونە ژێر ملەوەو گیریان خواردبوو، لەگەلّ هەر دەستلێدانێکیاندا تووک و نەفرەتم لێدەکردن، هەرگیز نەمدەزانی دەتوانم ئەو جوێنانە بە دوای یەکدا ڕیزبکەم. وێڕای نەفرینەکانم ئەوان لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بوون، بە دوای ئادگارە ژیارییەکانمدا دەگەڕان و منیان بە شاشەیەکەوە بەستەوە، بیپەپیپی ئامێرەکە و دەنگەدەنگ هێندەی دیکە دۆخەکەی شەپرێوتر کرد.

پیاوێکی گەنجی درێژ و باریک بە خۆی و چاوی ماندوویەوە - لەوانەیە دکتۆری موقیم بێ- پەردەکەی بۆ دواوە کێشایەوە و لە دیوەکەی من وەژوورکەوت.

"خاتوون، تووشی ڕووداوێک بووی"، بە دەم ئەم قسەیە سەیری تەختە لێنووسەکەشی کرد، ئینجا درێژەی بە قسەکەی دا: "دەکرێ پێمبڵێی کوێت دێشێ؟"دەنگیشی دەنگێکی ئارامبەخش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هێوری نەکردمەوە.

منیش بە گریانەوە گوتم: "هەموو شوێنێک، هەموو شوێنێک،" لەگەڵ هەر هەناسەدانەوەیەک ئازار گوشاری بۆ سەر سینگم دەهێنا، وەک ئەوەی لە ناوەوە دەستێک سییەکانم بگوشێ. دکتۆر دەستێکی نەرمونیانی لەسەر شانم دانا، دەستێک وێڕای تابوورییەکەی، بەڵام میهرەبان بوو.

"دەی، سیتی سکانی بۆ بکەن."

ئەوەندەی دەنگی هاوارهاوارم بەرزتر دەبووەوە ئەوەندە ئەوان خێراتر منیان لەسەر کورسییەکە لەپاڵ وێنەی کەتە و زلی ڕابەری کۆن و نوێ، خومەینی و خامەنەئی خێراتر پاڵدەنا. قابی بیناییشم لێڵ بوو.

تا گەیەنرامە ژوورێکی تایبەت بۆ چاودێریکردن، دایکم گەیشت. شێتودین لە ژوورە بچکۆڵەکەدا وەک ئەوەی گیاندارێکی نێو قەفەس بێ، هەر ڕاوێچکەی دەدا، دەنکی تەسبیحی [٧٤] نوێژانیشی بە پەنجەی

---

tasbih[٧٤]

گەورە و ئاماژەوە یەک بە دوای یەک ئاودیودەکرد و لەگەڵ هەر دەنک هاویشتنێکیشدا ناوی خوای ئەوەندە بە دەنگ دەگوتەوە هەموو ئەوانەی لە قاوشی چاودێری چڕ بوون گوێیان لێدەبوو. ناو بەناویش لەچکە سپییەکەی بۆ پێشەوە دەهێنایەوە تا سەرتاپای نێوچاوانی دابپۆشێ وەک ئەوەی لەبەرچاوان نەمێنێ.

بەدەم ڕەوڕۆکردنی تەختە ڕاگرەکەمەوە قیژاندی: "لەیلا!" کە غاریدایە لای مە ئەژنۆکانی دەلەرزین، بە دەستەکانی توند شیشەی تەختەکەمی گرت و بە جۆرێک سەری خۆی بە پێخەفەکەم دادا کە تەختەکەمی هەژاند.

منیش گوتم: "بەسیەتی، دایکە تکایە بوەستە، ئێستا دەروەستی نایەم." کە ئەمەم گوت هەستمکرد زمانم لە ناو قورگمدا قورس و ئەستوور ببوو.

دەستی هێنا تا بە هەنیەمدا بێنێ، بەڵام ئەو چرپەیەی بە گوێمدا چرپاند هەموو شتێک بوو تەنیا دڵنەوایی نەبێ، ئاخر ئەو گوتی: "لەیلا، گوتیان دەرپێکەت پەڵەخوێنی پێوەبووە."

بە زۆرلەخۆکردن بژولکەکانم کردنەوە تا نیگایەکی هەراسانی تێببڕم.

گوتی: "ئاگادار بە، ئەمە بە باوکت مەڵێ."

منیش بە نووزەوە هەم بە ئازار و هەم بە تووڕەییەوە گوتم: "بۆچی من پێیبڵێم؟ خۆ ئەگەر ئەو بزانێ، ئەوا بەر لە خوا بۆ دۆزەخ دەمنێرێ."

خۆشبەختانە گەورەی دکتۆرەکان هاتە ژوورەکەم، بە ئاستەم سەری لە سەر کارتی بەیانی پشکنینەکەم بەرزکردە و بە دایکمی گوت: "خانم، بەپێی خەملاندنمان کچەکەت بە هۆی تامپۆنی ترۆمبێلەوە بریندار بووە. وێنەی بەیانی وا نیشاندەدا پێنج درزی لە حەوز و دوو درزی دیکەی لە پەراسووی چەپی هەبێ."

منیش دەستم لەسەر سینگم دانا و گوتم: "هەر ڕێک لێرە، لەسەر دڵم."

دکتۆرەکە درێژەی بە قسەی دا: "خاتوو سامان، تۆ زۆر بە بەخت بووی." بە دەم ئەم قسەیەوە ڕوی لە دایکم کرد: "پێناچێ هیچ برینێکی ناوەوەی لە ئەندامەکانیدا هەبێ هەروەها هیچیش ڕۆنەچۆتە جەستەیەوە، بەڵام دەبێ باری حەوزەکەی جێگیر بکەین، پێشمان باشترە هەر ئێستا بیکەین. ئێمە تەنیا چاوەڕێی ئاکامی پشکنینی خوێنەکەی دەکەین، ئینجا بۆ نەشتەرگەری ئامادەی دەکەین."

منیش لێمپرسی: "ئەرێ چیم لێدەکەن؟"

"ئێمە قاچەکانت ڕادەکێشین تا جێگەی خۆیان لە نێو جومگەکانیانەوە بگرنەوە و قورساییەکیان پێوەدەکەین و لە نێو جومگەکانیش برغو دادەنێین ـــ"

دایکم کە قسەکەی پێبڕی: "برغو؟" ڕەنگیشی سپی بوو.

"بەڵێ، بۆ ئەوەی درزی ئێسقانەکەی بۆ شوێنی ڕاستی خۆیان بگەڕێنرێنەوە. هەڵبەتە هەندێ ئازارشکێنیشی پێدەدەین. دەزانم کەمێک نارەحەتی، ئازارت زۆرە. دواتر سەرت لێدەدەمەوە."

کەمێک نارەحەت، پەکوو! دکتۆرەکە خەریکبوو بڕوا، دایکیشم تا دەرکە بە دوایدا چوو، بە سرتەوە شتێکی نیگەرانی پێگوت و تەسبیحەکەشی هەر لە دەست دەجوولا.

ئینجا دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە و گوتی: سوپاس خوایە." کاتێکیش دکتۆرەکە دەرکەی لە دوای خۆی پێوەدایەوە، هات و بە گوێیدا چرپاندم، کەوا من لەو بارەیەوە سەلامەتم. "تۆ کچێنیەکەت لە دەست نەداوە، نە تەکینیکیانە و نە بە هیچ شێوەیەکی دیکە. هیچ شتێکی تیژ نەیسمیوە، وایە؟"

"ئەرێ تۆ لەو هەموو شتە، هەر ئەوە خەم و نیگەرانییەکەتە؟"

"چی دی خەمم نەما. خوێنی سەر دەرپێیەکەشت لەوانەیە هی برینەکەت بێ، بەڵام..." ئیدی دەنگی خۆی نزم کردەوە. "بەڵام دکتۆرەکە گوتی لەوانەیە لەمەوپاش نەتوانێ بە شێوەیەکی ئاسایی منداڵی ببێ. هەرچەندە ئەوسا دەکرێ بە نەشتەرگەریی بتبێ. جارێ دەبێ بزانین چاکبوونەوەت بە کوێ دەگا."

قیژاندم و دیسان لە پرمەی گریانم دایەوە: "ئەرێ کەسێک پێم ناڵێ ئاخۆ دەتوانم جارێکی دیکە بە پێی خۆم بڕۆم؟"

لەسەر دیوارەکە پۆستەری ژنێکی نازداری حیجابپۆش هەبوو، پەنجەی ئاماژەی خستبووە سەر لێوی، داوای بێدەنگیی دەکرد.

دایکەش لەسەر ڕاوێچکەکەی بەناو ژوورەکە و بردەبردەکەی بەردەوام بوو. نیگەرانییەکەشی ڕەویەوە، لە کۆتاییدا ئەو پرسیارەی کرد، کە دەمێک بوو لە مێشکیدا ختووکەی دەدا.

"ئەرێ دەمەکانی پێشتر تۆ بووی هاتیە ماڵی داپیرەت؟"

منیش سەرێکم بۆ بادا، نەوەک بۆ حاشایی لێکردن بێ، بەڵکو لە حەژمەتان بوو. دیاربوو پاراستنی نهێنییەکەی زۆر لە شکانی ئێسقانەکانم لە لا گرنگتر بوو.

نیگایەکم تێبڕی، لە سیمایدا هەستوسۆزی یەکتربڕی دژبەیەکی وەک نیگەرانی، شەکەتی، تاوانباریی، خەفەت، شەرم و ترسم لەسەر ڕوخسارە بە ساڵاچووەکەیدا بینی. دایکە دەمی خۆی ویکهێنایەوە تا وەک هێڵێکی باریکی لێهات، ئیدی هیچی دیکەی لە دەم نەهاتەدەر تا پەرستارەکان هاتن و منیان بۆ نەشتەرگەرییەکە ئامادەکرد.

دوو پەرستار تەختەکەی منیان بەرەو ژووری نەشتەرگەرییەکە پاڵنا. بە بنمیچە ئەشکەوتئاسا و قۆقزییە بە شکۆکەی ژووری نەشتەرگەرییەکەم وەک مزگەوتێک هاتەبەرچاو، تێیدا هەستمکرد بچووک و بێ بایەخم. لێ لەبری شتی دینی، زۆر لە ئامرازی بڕین بە دیوارەکانیدا شۆڕببوونەوە. ئامانجی هەردوو شوێنەکە، بێ ئەوەی پرسیشێکی واشت لێبکەن، لێکردنەوەو تێفرێدانی بەشە گەنیوەکان بوو. هەر پیاو و ژنی بە دەمامکی نەشتەرگەری بوو هاتن بە دەستوانەی پلاستیکی دەوروخولیان دام.

"خاتوون، خەم مەخۆ، من سەیری تۆ ناکەم،" ئەمە قسەی پەرستارێکی نێرینە بوو لای قاچمەوە وەستا بوو، هەندێ قاچی بەرزکردمەوە دەرزی بەنجی ئەندامسڕکەرەی لێدام. هەر ئەژنۆیەک و سێ دەرزی لێدا و هەر بە گومانیش بوو. لەناو سەریشمدا بە چرنووک چاوم لە بنەوە دەرهێنا. لە کۆتاییدا ئەو ژنەی باسکمی گرتبوو داوای لە پەرستارە نێرینەکە کرد، بەڵکو جێگەی لەگەڵ بگۆڕێتەوە، بەهانەی ئەوەی دۆزیەوە گوایە ناتوانێ جووڵە و

لەرزینەکەم بەرزەفت بکا. پەرستارەکە لە هەڵهێنانەوەی ئەو پاکانەیە چاوێکی لێداگرتم. منیش ئاهێکم پێداهاتەوە. ئیدی ئەژنۆم خەریکبوو سڕ دەبوو.

من ململانێم لەگەڵ چوار پەرستاردا دەکرد، ئەمەش لەو کاتەی پیاوە چاوباشقاڵەکە، درێلە کارەبایەکەی دایەدەست نەشتەرگەر.

"ببوورە. لەوانەیە ئەمە هەژانێکی مێشکت لا دروست بکا، ئاخر لەوە زیاتر ناتوانین تۆڕە دەماری هەستیارت سڕ بکەین." پەردەیەکی کورت حوکمی چاومی بڕیبوو، منی لە باقی جەستەم دابڕیبوو.

منیش کە ئەوەم بینی شیڕاندم: "نا! تۆ ناتوانی بەم ئامێرە کونم تێبکەی. دەی وازم لێ بێنە. لێمگەڕێ با بۆخۆم بمرم."

من بێدار بووم و ئاگاشم لەوە بوو کە چۆن ئاسنێکی تیژ ئێسکی کون دەکردم.

بۆ ڕۆژی دواتر لە تاریکییەوە دەنگی براکەم هات بە فشقیاتەوە: "لەیلا، ئەرێ چما نازانی کە ترومبێلە نوێیە گرانبەهاکان سیستمی ABSیان بۆ ستۆپگرتن هەیە؟ ئیدی شوفێرەکانیش ئەم جۆرە ترومبێلانەیان زۆر خۆشدەوێن، بۆیە بێباکانە لێیان ناخوڕن."

بۆ ڕاکێشانی ئێسقانەکانم، قورسایی بە پێم وەکرابوو، هەر پێیەک سێ کیلۆ. ئەو قورساییانە وەک سیستمی خەرەک بۆ تەون بە ئەژنۆکانمەوە بەسترابوونەوە. لەپشت چیاشەوە پەردە دادرابووەوە، بەڵام هێشتاش کزە ڕووناکییەک لە دامێنی پەردەکەوە، لە پەنجەرەکەوە دەهاتەژوورەوە. دڵۆپەکانی شلە بێڕەنگەکەی ئای ڤیم

دەبینی بۆ دەمارەکانم دەچوو. خۆشبەختانە دایکم لە هیچ شوێنێک دیار نەبوو. "ئای خوایە، ئەرێ ئەوەیان بۆ لەگەڵدا کردم؟"

یەکێک هات و ئەو ڕاگرە ڕانەپسکاوەی ملمی لابرد. چیاش پێیگوتم: "دیارە درزی حەوز و پەراسوو بە خۆیان چاکدەبنەوە، بۆیە پێویستت بەوە نییە ڕاگریان بۆ دابنرێ. ئەم قورسایەش بۆ ئەوەیە لە ماوەی چاکبوونەوەتدا قاچەکانت نەیەنەوەیەک."

منیش کراسە شۆڕەکەی نەخۆشخانەم هەڵدایەوە تا نیشانی بدەم: "ئەوان لێرەوە چۆکەکانی منیان کونکردووە."

"بە داخەوە. لێ خۆ ئەوە پێویست بوو بکرێ، تا لە شەلەبوونی ئایندە بتپارێزێ."

بە دەست شوێنی ئیسقانی بە ئازاری سەر دەموچاوم پشکنی. "دەکرێ ئاوێنەیەکم بدەیتێ؟"

"خەم مەخۆ، ڕوخسارت باشە." ئەو لەسەر کورسییەکی پلاستیک لە تەنیشت تەختەکەم دانیشتبوو، چاوە هەنگوینییەکانی درەوشاوە و بە سۆز بوون، بەڵام نیگەرانی گۆشەی دەمی گورچ کردبوو. ""دەی خوشکێ ئەوە لە چ درامانیە بۆلیودەوە فێربووی؟ ئەو دەمەی پیاوێکی جوامێر و کەشخە خۆی فڕێدەداتە بەردەم قیتار هەر بۆ ئەوەی ژنە جوانەکە لە دوا ساتدا ڕزگار بکا؟"

"ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟"

"شوفێری ترومبێلەکە گوتی گوایە ..." چیا وەستا، هەندێک گوێی خوارند ئینجا تێهەڵچووەوە: "ڕووداوەکە؟ وەها بوو..." ئەو کێشەی

لەگەڵ وشەی دەربڕ هەبوو، لە کۆتاییدا لە قسەکەی بووەوە: "...خۆڕسکانە؟"

منیش چاوم سووڕاند، بەڵام خۆ بچوکترین ئاماژەش ڕایدەچڵەکاندم. "نەخێر، لەناوبەری ئافەتکوژم بەکارهێنا."

چیا پێکەنی، لە پڕێکەوە سیمای گۆڕا، ڕەنگی هاتەوەبەر و ئاسوودە بووەوە. "من دەمزانی تۆ بە مەبەست خۆت هەڵنەداوەتە بن ماشێنی کابرایەوە."

منیش وەڵامم دایەوە: "ئای ئیرادەی ئازاد ئەفسانەیەک نییە بۆ خۆی؟"

دەربڕینی سەر ڕوخساری خەفەتبار و تێڕاماو بوو. براکەم حەزی لێبوو لەسەر ئەوە بدوێ کەوا ئەگەر زەمەنی مرۆڤ بە هەمان پێودانگی هەلومەرجەکەی خۆی بۆ بگەڕێتەوە دواوە و بکەوێتە نێو هەمان بارودۆخی گۆڕین، دیسان هەر هەمان بڕیاڕ دەداتەوە کە پێشتر داویەتی، ئاخر مرۆڤ ئەو بڕیارانە لە چرکەساتێکدا دەدات و لۆژیکیش ئەو ڕۆڵە مەزنەی تێدا نابینێ وەک ئێمە حەزمان لێیەتی بڕوای پێبکەین.

نیگای منیش پەڕیە سەر ئەو یاسەمین و گوڵە سپییەی کە چیا لەسەر لای پەنجەرەکەی دانابوو. ئیدی پێمگوت: "ئەوانەت بۆ من هێناون؟"

ئەویش بە ئاماژەی بەڵێ سەرێکی جووڵاند. "من دەبێ بوارت بدەم پشوو بدەی."

"ئازارشکێنێک؟" بە دەستیش ئاماژەم بە قوتوویەک کرد لەسەر مێزێکی بچکۆلە لە گۆشەیەکی ژوورە تەنگەبەرەکەم دانرابوو.

چیاش کاغەزەکەی سەری خوێندەوە و سەری لەقاند. "بەڵێ، بەڵام خۆ ئەوان دەرزی مۆرفینیان تێکەڵاوی ئاوی ئای ڤییەکەت کردووە. دەی دەچم پەرداخە ئاوێکیشت بۆ دێنم."

چاوێکم لە مژی مۆرفینەکە کرد و بە سووکیش باسکم خوراند. ئینجا پێمگوت: "تۆ بڵێی کورسییە تایەدارەکەم بۆ بێنن؟"

ئەرێ باشە چۆن بچمە ئاودەستێ؟ یان چۆن بچمە حەمام و دووشێک بکەم؟ مەیلم لێنەبوو بە شێوەیەکی تایبەت دایکم بێ و بمشوا. ئاخر دەمەویست ئەو ڕوانینەم سەبارەت بە یارە دڵخۆشەکەی ئەو بڕەوێنمەوە.

ئەوە بوو گوێم لە دەنگی باوکم بوو، بەرلەوەی پێ بنێتە ژوورەکەم لە هۆڵەکەوە گوورەی هات: "ئەرێ تۆ بۆچی وامان لێدەکەی؟"

"باشە چ جۆرە کچێک بە درەنگانێک لە چیا دەمێنێتەوە؟" بابە مستی دەستەڕاستی لە ناولەپی دەستی چەپەی دا. ئینجا درێژەی بە قسەکانی دا: "کێت لەگەڵ بوو؟" دەربڕینەکەی تێکەڵەیەک بوو لە تووڕەیی و نائومێدی، ئەو تاکە بەشی ئاشنای مۆتەکەی ڕۆژ بوو.

براکەم بە خۆی و دوو پەرداخ ئاوەوە گەڕایەوە، لەسەر ئەو مێزە جووڵەداری لای پێخەفەکەمی دانا. "بابە، ئێستا کاتی ئەوە نییە؟"

بابەش ئاماژەیەکی خەمبارانەی بۆ قورسایییە هەڵواسراوەکانی پێیەکانم کرد و گوتی: "ئەوە چ کەتنێکت کردووە، ئاکامەکەی ئەوەی لێکەوتۆتەوە؟"

لەو هەموو شتانەی لەگەڵیدا کردم ئەم قسەیەی زۆر دژوار بوو. ئەو نەیپرسی: "ئەرێ چیت لێقەوماوە؟" یان "ئەوە کێ وای لێکردووی؟"

چیاش دەنگی خۆی بەرزکردەوە: "ئەوە تۆ چۆن قسەی وەها دەکەی؟"

"شوفێرەکە و هەر چوار سەرنشینی ترومبێلەکەی گوتیان، کەوا تۆ هەر وەک ئاسکێک لە پێش ئەواندا بازتداوە." ئیدی بابە ئانیشکی بەرزکردەوە وەک ئەوەی ئامادەبێ لە کەسێکیەوە بژەنێ.

منیش بە ورتەیەکەوە: "ئەوان ئەژنۆکانیان کون کردووم."

"ئێمە دەبێ بڕوا بە لەیلا بکەین." چیا بەم قسەیەی ڕووبەڕووی بابە بوویەوە، سینگی هەردووکیان هەر چەند ئینجێکی نێوان بوو.

"تۆ بەرگری لە کەسێک دەکەی کە هەم بۆ تۆ و هەم بۆ منیش شەرمەزارییە؟" ئیدی بابە پاڵێکی بە چیاوە ناو بە دیواری دادا، مێزە خولاوەکەش کەوت ئەو حەبانەی لەسەری بوون، بە گۆڕێ وەربوون.

منیش ئاخێکم هەڵکێشا و جووڵەیەکم کرد، ویستم سەرم ڕاستبکەمەوە، بەڵام ئازاری پشتم ناچاریکردم بگەڕێمەوە دواوە. "دەی بوەستن! ئەرێ دایکە لە کوێیە؟" وشەکانم هەندێک شێواو

بوون. باوکیشم یەخەی چیای بەرنەدا. ئەو دەهرییبوونەی باوکم زیاتر لەو دریلەی ئیسقانەکانمی کونکرد، تۆقاندمی.

لەو کاتەدا کیژۆلەیەکی تەمەن شەش سالان بە ویدا ڕەتدەبوو، سەیریکی ناو ژوورەکەی کرد، ئاماژەی بە من دا و ڕوخساری لە ترس و قیزدا ڕیکهەلگەڕا. ئینجا هەر زوو پیاویکی بە دوادا هات، ئەویش چاویکی لیکردم و چاوی تروکاند، ئینجا خیرا بەر لەوەی کچەکە لە ژوورەکە بباتەدەرەوە چاوی لەسەر لادام. بە هۆی هەراکەوە یەک دوو کەس لە ڕاڕەوەکە خڕبوونەوە، هەندیکیان کراسە فشوفۆلەکەی نەخۆشخانەیان لەبەردابوو.

"ئاخر چۆن دوای ئەوە دەتوانم لەو شارە بژیم؟" دەنگی بابە لە کۆتایی ڕستەکەدا نزمبووەوە.

ئەوە بوو خەلک خڕبوونەوە. دەنگەدەنگ پەیدابوو. یەکیک بە چرپەوە گوتی: "تۆ بلیی ئەو کچە چی کردبێ؟" بابە گویی لەو قسەیە بوو، ئیمەش هەمووان گویمان لیبوو.

"من حاشات لیدەکەم". ئەوە قسەی باوکم بوو دەنگی وەک بۆڕەی ورچیک دەهات.

منیش بە دەستیک بە شیشە ڕاگرەکەی تەختەکەمەوە، هەندیک پالم بە خۆمەوە نا. ئیدی ئازار لە ئەژنۆکانمەوە تا بڕبڕەی پشتم ڕۆیشت.

چیاش بە دەم دەرکردنی خەلکەکەی ئەوێ گوتی: "بۆ خاتری خوا، بە تەنیا جیمان بیلن، ئەوە شتیکی خیزانییە."

بابەش ئاخێکی هەڵکێشا و پشتی لە ئێمە کرد. ئەو لە ماوەی ئەو چارەکە سەعاتە پڕ لە گرژییەدا تەواو پیر بوو.

"بابە تکایە، وەرەوە سەرخۆ، ئاگات لە خۆت بێ، تکایە دانیشە." بە دەم ئەم قسەیەوە چیا دەرکەی ژوورەکەی پێوەدا و دەستێکی لەسەر شانی بابەمان دانا.

بابە دیسان سەری بەرزکردەوە.

"بێمەوە سەرخۆ؟" دوای ئەو هەموو شتە، دوای ئەو هەموو ڕەنجەی بە هەردووکتانم کێشاوە، ئیدی بەمە چاکەم دەدەنەوە؟"

چاوم خەریک بوو بە فرمێسک تەڕدەبوون.

"تۆ، خۆ تۆش بە قەد وی خراپی." بابە لەوە گەڕایەوە کوڕەکەشی بارنج[٧٥] بکا، هەنگاوێک بۆ دواوە گەڕایەوە، ئاماژەی بە من و بە ئەویش کرد. ڕەنگی چیاش گۆڕا، سپی هەڵگەڕا، وشە ئارامکەرەوەکانی لەسەر لێو وشک بوون. هەرگیز بابە لە دۆخێکی وەها ناپاکیلێکراودا نەبووە. ئینجا پشتی تێکردینەوە، دەموچاوی بە سەردەستی هەڵگلۆفت و لە هۆدەکە چووەدەرەوە.

"من ئەو کەسە نەبووم کە.... من هیچم نەکردووە. سوێند دەخۆم!" کە ئەو دەرچوو من وەها بانگم کرد و گەرووشم تا دەهات لێی توندەکردم.

چیا لە ژوورەکەدا کەوتە ڕاوێچکەدان، باسکی چەپی داتەکاند، کە بابە توند گرتبووی. "ئەرێ بە ڕاست خۆ هەوڵی ئەوەت نەداوە خۆت

---

[٧٥] بارنجکردن: بێبەریکردن، دوورخستنەوە

بکوژی، خۆ وات نەکردووە لەیلا؟" ئەو ئەم پرسیارەی بە ڕوانینێکی سۆراخپرس لێکردم و سیماشی زۆر جددی بوو.

منیش نەمدەتوانی سەیری ناو چاوی بکەم. دەمەویست بڵێم نەخێر، بەڵام خۆ ئەمە درۆ بوو. بۆیە دەمم هەڵبڕی بڵێم بەڵێ، لێ ئەمەشیان هەر درۆ بوو. ئەریٚ تۆ بڵێی ئەو کیژەی لە گردەکە بەغار هاتەخوار کێ بوو؟ ئەوە من بووم و من نەبووم. لە کاتێکدا خۆم لە پرسیارەکە دەدزیەوە، کانوێلای ئایڤییەکەم دیسان ختووکەی دام.

"هەرگیز خەیاڵم بۆ شتێکی وەها نەچووبوو.... لەیلا گیان ببوورە کە تۆم بەم شێوە لە دواوە جێهێشت. لەو کاتەی تۆ لێرە دەردەچی، ئەپارتمانێک دەدۆزمەوە تا بەکرێی بگرم، بەڵام من یەک شتم لە تۆ دەوێ. ئەویش زۆر گرنگە تۆ بیر لە پرسیارەکەم بکەیتەوە. خۆ ئەگەر ڕاستی هەر چییەک بێ، من دەمەوێ بیزانم. لانی کەم ئەوەندەم پێ ڕەوا ببینە. خۆ ئەگەر نەتوانی بە قسەش وەڵامم بدەیتەوە، دەکرێ هەموویم بە نووسین بۆ بخەیتە سەر کاغەز."

منیش بە دووچاوی زەقەوە لێی ڕامام.

"فەرموو. دڵنیابە کەس نەیبینێ." بە دەم ئەم قسەیەوە، چیا بە سەرمدا دانەویەوە و هەنیەی ماچکردم و دەفتەرێکی خستە بن سەرینم. "ئیدی بەسیەتی فینگەفیگ و چڵم هەڵلووشین. شتێکی پیسە."

منیش بە زەبونییەوە خەنیمەوە زمانم لێ دەرهێنا.

چیاش هەردوو پەنجەی گەرووی خستە گوێکانی دەستەکانیشی وەک قۆچ لێکردن چاویشی وەک من دەمکرد لێ ئەبڵەقکردمەوە.

هەردووکمان لە پرمەی پێکەنینمان دا، بە هۆیەوە دیسان چەناگەم ئێشا.

"ئەرێ ڕووم چی لێهاتووە؟"

"هیچ."

"چۆن ئەوەم لێ چاوەڕێ دەکەی ڕاستییەکەت پێبڵێم لە کاتێکدا بە هەمان میهر لەگەڵمدا ناجووڵێیەوە؟"

ئەویش ئاهێکی هەڵکێشا. "تۆزێک ئاوساوە، بەڵام نامێنێ. لە پەرستارەکانم پرسی، ئەوان کڵۆ بەفرت بۆ دێنن. چاوەکانیشت..."

"چاوەکانم چییانە؟"

"لەبەر ڕووداوەکە مولوولەکانی خوێن پچڕاون، خوێنیان تێزاوە، لە گلێنەی چاوت خەریکە هیچ سپیایەتییەک نەمێنێ." هەر دەبێ هەستی بەگۆڕانی ئاکارم کردبێ چونکێ هەر زوو هاتەوە قسە: "دەڵێمەوە، هیچ شتێک نییە مایەی نیگەرانی بێ. بینابیت بێ کێشەیە. سوورایییەکەی گلێنەشت و دڵۆپەی چاوت بە تێپەڕینی کات لە بەین نامێنێن و دەڕۆن. هەر لەبەر ئەوەش بوو خەڵکی هۆڵەکە فزووڵیان تەقیبووەوە."

"تۆ دڵنیای؟"

"بەیانی ئاوێنەت بۆ دێنم. ئەوە لەبیر نەکەی کڵۆ بەفرەکان لەسەر دەموچاوت دابنێی و پشوو بدەی. تکایە بنووسە. چاوەڕێی ئەوە دەکەم یادنامەکە و زۆرپا دیاری ئەپارتمانە نوێیەکەمان بێت."

ئەو ڕۆیشت و منیش لەبەر داودەرمان خەوم لێکەوت.

پاشان که له ژووره بچووکەکەمدا بە تەنیا مامەوە، لاپەڕەکانی یادنامەی براکەم هەڵدانەوە، سێیەکی یادنامەکە پڕبوو لە چیرۆک سەبارەت بە گوندی خوێندکاران.

*خوێندکاران دەستی یەک دەگرن، لە بازنەیەکدا دەجووڵێنەوە، گۆرانی دەڵێن. هەواڵی مەرگی شیرین وەک بەندوباوێکی هاوبەش بڵاوببووەوە. خۆی دەبوو ئەو خوێندکارێکی ئەو قوتابخانەیە بێت. سێ مانگان دوو گیان بوو، ئەو هەم خۆی هەم کۆرپە نەبوویەکەی ئاگرتێبەردا. منیش بە لای کورسییە چۆلەکەیدا ڕەتبووم، قامکم بەسەر ئەو دەستەواژەیەدا هێنا، کە لەسەر تەختەدارەکەی هەڵکەندبوو، هەر دەبێ هی ئەو بێ: "ئارەزووم بوو بە ئافرەت لەدایک نەبووبام."*

چیا لە دوای ئەوە لە لاپەڕە سپییەکە نووسیبووی: "چیرۆکی لەیلا." منیش بۆنی کاغەزە هەرزانەکەم کرد و پەنجەم لەسەر دەستخەتە لاربووەکەی خشاند.

لە میانەی هەفتەی دواتردا و لە ماوەی نێوان خواردنی دەرمانە ئازارشکێنەکاندا، دەستم دایە قەڵەم و لە دەفتەرەکەدا نووسیم:

*حەزناکەم بیر لەو ساتە بکەمەوە، بەڵام کاتێک ناچار بم و کاتێکیش وێنەکان قوڵپ بدەن، ئەوا بە خۆم دەڵێم ڕووداوێک بووە. کاتی وا هەیە بڕوام وایە، هەندێ کاتیش تارماییەکی مۆتەکەییم بۆ دێ و بە ناقایلی سەری خۆیم بۆ دەهەژێنێ.*

لە ماوەی هەفتەی دووەمدا، لەو سەعاتە بەردرێژانەی هاتنی پەرستارەکاندا، دیسان دەستم دەدایەوە خامە و ئەو داوە پرچەی لەسەر ڕووە ئارەقاویەکەم دەکەوتە خوارەوە، لادەدا و دەمنووسی.

*من بۆیە دەنووسم تا من و براکەم لەوە تێبگەین چۆن بەر لەوەی هێلکە و سپێرمەکان بە یەک بگەن و ئێمە دروستبکەن، چارەنووسمان دارێژرا. خۆ ئەگەر چیرۆکەکەمان نەگێڕمەوە، ئەدی چۆن لەوە تێبگەم ئاخۆ بۆچی چیا بە کارابییەوە بە شوێنپێی بابەدا دەڕوا؟ چۆن ئەو پاسەوانانەی زیندان کە ئازار و ئەشکەنجەی بابەیان دەدا، منیش ئازار دەدەن؟ چ دەگەیەنێ کە گەلێکی بێ دەوڵەت بیت و وەها تێکشکابی کە خۆوێرانکردن ببێتە شتێکی ڕۆتین؟ ئەرێ چۆن ئازاد دەبم ئەگەر بەرەنگاری پاسەوانی بێ ڕوخساری زیندانی خۆم نەبمەوە؟*

لە کاتێکدا دەمنووسی، هەستمدەکرد وشەکانم ئەوەی لە هەناومدا شکاوە، چاکی دەکەنەوە؛ کەچی پزیشکەکانیش ئەوەیان چاک دەکردەوە، کە لە دەرەوەمدا شکاوە. کاتێکیش لاپەڕەکانی دەفتەرەکەم پڕکردنەوە، خامەکەم دانا. داڵغەم ڕۆیی.

# بەندی شازدە

"ڕەنگە ژیان ئەو ساتە داخراوە بێ، کە نیگام خۆی لەنێو پێڵوی چاوەکانی تۆدا وردوخاش دەکا." کاتێ بە سەر پلیکانەکەدا سەرکەوتم تا کتێبەکەی لەسەر ڕەفەی دیوانی شاعیرەکان دابنێمەوە، ئەو شیعرەی فروغی فەڕوخزاد لە مێشکمدا دەهات و دەچوو. لە ماوەی ئەو هەژدە مانگەی دوای ڕۆژەکەی زرێبار، شادمانی خەریکبوو دادەبەزیە مەودای چنگەکانم، وەک کلکی ئەو کۆلارە بەرزەفڕەی ئێستا لەهەموو کات لەعەردی نزیکتر ببوو.

ئێستا چیا لە زانکۆی تاران خوێندکاری قانونە، هاوەڵی و هاودەمیەکەی وی لەگەڵ من و هەستی ئارمانجداریم لەژیان تەوژمی هێرشبەرانەی ترسوبیمە هەمیشەییەکەمی ڕەواندبووەوە. ئەو کوشکە بچکۆلە کتێبفرۆشییەی ناو بازاڕی تاران ببووە سەرچاوەی داهات - و کەیفم. بە هۆی ئەو زەریالووشە گەورەیەی زانست و زانیاری و سەرگەرمی کە لەبەردەستمدا بوو، سەرم بەسەر کتێبە کلاسیک و تازەکان داگرتبوو، سەیری فیلمەکانم دەکرد و ڕابردووشم لەسەر ڕەفەکەی دواوە، لە پشت خۆم دانابوو.

کارۆی قۆز و کەشخەش وێڕای ئەو نیشانەنمایەی لەسەر کۆشکی کتێبفرۆشییەکەم نووسرابوو "داخراوە"، خۆی بە ژووردا کرد و گوتی: "پەککوو چەند باشە، تۆ هێشتا هەر لێرەی."

بۆ ساتێک هەستمکرد لەسەر پلیکانەکە بەردەبمەوە. ئاخر ئەو کڕیارە کاریگەرییەکی سەیری بە سەر جەستەمەوە هەبوو، وای

لێدەکردم لە کاتی سەخت و پڕ لە گوشاردا دڵم زیاتر لێبدا وای لێدەکردم لێدانی دڵم بەسەر پنتەکانی فشاری جەستەمدا بڵاوبنەوە[٧٦].
کارۆ لەسەر بانیژەی ئەو باڵەخانەیە دەژیا کە ئێمە ئەپارتمانەکەمان لێ بەکرێگرتبوو. ئەو لە هەمان زانکۆی چیادا لە ڕشتەی ئەندازیاریی کۆمپیوتەردا خوێندکاری دکتۆرا بوو، لەگەڵ ئێمەشدا هەموو بەیانیانی ڕۆژانی هەینی بەسەر کێوی توچالدا هەڵدەگەڕا. خۆی خۆش بوو ئەو لەو ناوە بێ، بەڵام ئەوەی دوێنێ ڕوویدا ئەوەندە مایەی خەجاڵەت بوو نەدەکرا بە ئاسانی فەرامۆش بکرێ.

خۆی، ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو، من و کارۆ لە شوێنێک بە تەنیا بە یەکەوە بین. چیا بەر لە ئێمە خۆی هاوێشتە نێو کابینەی تەلەفریک (گۆندالا)و ڕۆیشت، بەڵام ئێمە زۆر خاو بووین بەو ڕانەگەیشتین، بەرلەوەی پێی ڕابگەیەن دەرکەکانی داخرانەوە. چیا لەودیو کابینە شوشەییەکەوەیە ئاماژەیەکی بۆ کردین، ئێمەش هەر بەغار بەرەو کابینەی دووەم ڕامانکرد. ئەو دەستەیەی لە دوای ئێمەش بوون لەگەڵ ئێمە نەهاتن، چاوەڕێی کابینەی خۆیان دەکرد. کارۆش نیگایەکی تێبڕیم، منیش ئایسکرێمێکم بە دەستەوەیە و بە زمان دەیلێسمەوە، ئیدی ئەو هەر ڕەنگێکی هێنا و برد، سەرەتا سپییاتە بوو، پاشان پەمەیی لە دواییدا سوور هەڵگەڕا.

---

[٧٦] body pressure points بەپێی ڕێنماییەکانی پزیشکی سوننەتی چینی و هونەرە جەنگییەکانی ئاسیای دوور هەندێ پنتن لە لەشی مرۆڤدا کە ئەگەر بەنیاز و مەبەستی دیاریکراو فشاربدرێن زیاتر لەشوێنەکانی دیکەی لەش کاریگەری دەخەنە سەر هەستەدەماری مرۆڤ، ئەو پنتانەی لەش بەمەبەستی لە پەلوپۆخستن یانیش چارەسەری سروشتی فشاردەدرێن.

منیش نەمدەزانی چۆن ئەو گرژییە بێدەنگە و قورسای ڕوانینی ئەو لەسەر خۆم خاوبکەمەوە، بۆیە پلم بە ئایسکریمەکە کرد و لە سەری کەپووی ئەوم هەڵسوو. کارۆش پێکەنی، نیگای چاوی پەڕیە سەر گەردنم. منیش ئاگام لە لەچکەکەم بوو، هەندێک بۆ خوارەوە خوشی بوو. شتێک لە ناخەوە دنەیدام. ئاخر بەر لە کارۆ چاوی خەڵکیشم لەسەر بوو، بەردەوام هەستمدەکرد ڕاودەنرێم، کەچی دوێنێ هەستمکرد چاوەکانی یاریم لەگەڵ دەکەن، خۆش و شادیبەخشن. هەرچۆنێک بێ بە هۆی ئەو نائاسوودەییە زۆرەمەوە، هەموو ئایسکریمەکەم گرت و بە دەموچاویمدا کرد.

کارۆش لێم زەقبووەوە و دەستێکی بە دەموچاویدا هێنا و سڕیەوە گوتی" کچێ بۆ واتکرد؟"

منیش بە بێ هیچ شەرم و خەجاڵەتییەک پێکەنیم و گوتم "شایستەی ئەوەی."

"نا، نەخێر."

خۆشبەختانە سواربوونی کابینەکە زوو کۆتایی هات. پاشان کە چیا دەموچاوە شێدارەکەی کارۆی بینی، هاتە پاڵ پێڕابواردنەکە و بە دوای کارۆدا بەرەو نافورەی ئاوەکە ڕۆیشتین. ئیدی هەموو ڕۆژەکە من و کارۆ نیگای زیتەڵانەمان لە یەک دەبڕی.

من چاوەڕێی ئەوە نەبووم هێندە زوو ببینمەوە، چ جای ئەوەی بێتە شوێنی ئیشەکەم و بە تەنیا بمێنینەوە، ئاخر ئەو لەو دەمانەدا هەرگیز سەری لێنەدەدام. کە ئەوم بینی گەرووی خۆم پاکردەوە و کۆخەیەکم کرد و گوتم" ئەوە چی دەکەی لێرە؟" سەیری شوێنی بەتاڵی دەمژمێرە هەڵواسراوەکەشم کرد، ئاخر هەر زۆر نەبوو

قەناعەتم بە خاوەنی کارەکەم کرد، بەڵکو دەمژمێرەکە لەویَ لابا، تا ئەو کڕیارانەی دێنە ئەویَ، نیگای تێنەبڕن و وادەی دیکەیان بە بیردابێتەوە و پەلەبکەن و بڕۆن، بەڵکو دەمەویست زیاتر بە هەڵدانەوەی پەڕەی کتێب و ڕۆژنامەکانەوە خەریکبن.

کاتێکیش لەسەر پلیکانەکە دەهاتمە خوارەوە، کارۆ توند پێچکەی پلیکانەکەی گرت، ئەو تۆزەی لەسەر ڕەفە و لە پلیکانەکەش هەڵسا لە هەوادا کەوتە سەمایەکی شێتانە. جامی سەعاتە دەستییەکەی ئەو ئەوەندە گەورەبوو، توانیم ببینم کە میلی دەمژمێرەکە لەسەر سەعات ٥:٢٣ی ئێوارەیە. خۆی دەبووایە لە سەعات پێنجدا دەرکەی کۆشکەکەم داخستبا، کارۆش دوای وانەی ئێوارانی دەیویست بچێت وەرزش بکا، منیش نەمدەویست بە تەنیا لە ئەپارتمانەکە بمێنمەوە، کە هەواکەی هەمیشە وەڕسی بوو.

"دەمەویست بەرلەوەی بڕۆیتەوە بتبینم." کارۆ لە بن چاکەتە ڕەشەکەیدا لە جاران بەژندرێژتر دیار بوو. دەستێکی بە نێوچاواندا هێنا. ئای خۆ لەو کەشە ساردە زستانییەدا هەر ئەوانەی بە توندی غاردەدەن ئارەقەدەکەنەوە.

دووبارە لەوە دڵنیابوومەوە کە سندوقی پارەکەم گاڵەداوە. ئەو ڕۆژەدا تەنیا بایی حەوت هەزار و پەنجا تمەنم فرۆشتبوو. بە تێکڕایی بەو برە پارەیە، خاوەنەکەی نەیدەتوانی کرێیەکەیشی بدا، چ جای کارمەندەکانی. لێ خۆشبەختانە خاوەنەکەی پیاوێکی دەوڵەمەندی کلتورویست بوو، کەسێک بوو دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران هەڵاتبوو، لە لۆس ئەنجلس گیرسابووەوە، لەو کاتەشەوە بەهای تمەنی ئێرانی دابەزیبوو، زۆر

باكی بە خڕکردنەوەی پارەوپوول نەبوو. ئینجا لە کارۆم پرسی: "ئەرێ ڕەوش لەوێ چۆنە؟"

کارۆش پژمی و بە سەردەستی لووتی سڕی و وەڵامیدایەوە: "دیسان هەموو شوێن پڕ دەکەن لە پاسدار. پێموایە لەم شەوەوە هەموو ناڕەزایی و خۆپیشاندانێک قەدەغە دەکەن."

زەبروزەنگی تەپەسەرکردنی خۆنیشاندان دژی هەڵبژاردنەوەی ئەحمەدی نەژاد -یان وەک هەندێک ناویان لێنابوو دانانەوە- لە ماوەی هاویندا پشێوی لەسەر شەقام دروستکرد، بەڵام خەریکیش بوو خۆپیشاندانەکە هێوردەکرایەوە. خۆپیشاندەران بە ئاشتییانە دروشمی وایان بەرزدەکردەوە کە یەکێکیان لێی نوسرابوو "ئەرێ دەنگم چی لێهات؟"، کەچی دواتر کاتێ دەگیران و لە کونجی زیندان دەئاخنران و لاقەیان دەکردن، ئەوسا پێیان دەگوت "دەنگت لێروکانەیە."

"ئەرێ کتێب یان شتێکی دیکەت دەوێ؟" بە دەم ئەم قسەیەوە دەستم لە کۆبەرهەمی شاعیری کورد شێرکۆ بێکەس دا و لەسەر ڕەفەکە ڕێکمخستەوە، ئەو شاعیرەی چەند ساڵێک پێشتر چیا پۆستەرەکەی لە دیواری ژوورەکەی مندا هەڵواسیبوو، هەروەها لە نێو کۆڵەپشتەکەشمدا بوو تا لەنێو میترۆدا بیخوێنمەوە. هەر ئەم بەیانییە زووە جارێکی دیکە شیننامە/سەردولکەی "سکاڵایەک بۆ خوا"م خوێندەوە، تێیدا نووسەر دوای کێفەڕاتی هەڵەبجە نامەیەک بۆ خوا دەنێرێ، ڕاستەوخۆش نا بەڵکو بگاتە بەردەستی سکرتێری چوارەمی بارەگای خوا، ئەویش لەسەر سکاڵانامەکەی نووسیبووە: "گەوجە، بیکە عەرەبی، کەس لێرە کوردی نازانێ و نایبەین بۆ خوا!"

منیش هەوڵمدا سیمای کارۆ بخوێنمەوە، مەراقبووم بزانم ئاخۆ شیعرەکە سەرنجی رادەکێشێ.

" ئۆو، ئم... لەوانەیە. دەی با سەیرێکی بکەم." پەڕەی کتێبە نوێیکەی هەڵدایەوە. بۆنی تەختەی ناو ئەو کۆلۆنیایەی لە خۆی دابوو کەپووی پڕکردم. زۆر لەو بۆنە قورسانەی لە لایەن خەڵکی شارستانەوە لە خۆ دەدرێن، کەپووە هەستیارەکەم هەراساندەکەن، بەڵام ئەوەی کارۆ دارستانی بەبیرهێنامەوە.

بەم دواییانەدا چیا پێیگوتم کارۆ نیوەکوردە، منیش مەراقبووم بزانم ئاخۆ ڕەچەڵەکی ئەو یارمەتی دەدا تا لەو شیعرەی سەبارەت بە چەوساندنەوەی کوردە بگات، ئاخر زۆر لە ئێرانییەکان مەرگەساتی ئێمە دەقۆزنەوە تا بڵێین دۆخی کوردی ئێران زۆر لە هی عێراق و تورکیا باشترە، ئەمەش هەوڵ و تەقەلایەکە تا خۆیان لەو تاوانانەی لە وڵاتەکەیان دەرحەق بە کورد دەکرێن بدزنەوە و هەروەها تا ئەوە بنوێنن گوایە تراژیدیاش دەکرێ هەروەک پەتاتە و شتی دیکە پێوەری خۆی هەیە، بکێشرێ.

جاری وا هەبووە هەندێ لە کڕیارەکانم لێیانپرسیوم: ""ئەرێ بۆچی لە تورکیا و عێراق کورد ئەوەندە بێزراون؟" وەک ئەوەی من لە شرۆڤەکردنی گەوجێتی و نەزانی بەرپرسیاربم، وەک ئەوەی هۆڤیگەریی و نەژادپەرستی تێزێکی فەلەسەفی هەبێ و منیش بە حوکمی ئەوەی سەر بە گرووپی قوربانییەکانم، هەر دەبێ خوێندبێتمەوە و لێی بزانم. ئاخر کەس لێم ناپرسێ: "ئەرێ تۆ وەک کوردێک لەو جیهانە پڕ لە کینەیەدا هەستت چۆنە؟"

کارۆ سێ ڕۆمانی خەیاڵی زانستیی جزووبەندی لێگرتن و پارەکەشی بە تەواوی دامێ. بڕیارمدابوو دواتر شیعرە کوردییەکەی بۆ بکەمە فارسی، ترسام مەبادا وەرگێڕانی تەڕدەستانە دەربەست نەیەت. ئاماژەم بە کارۆ دا، بەرلەوەی دەرکەی کۆشکەکە دابخەم، بڕواتەدەرەوە، دیار بوو لە خەمی ئەوەشدابووم چۆن دڵەکوتەشم بشارمەوە.

"ئەرێ چۆن بوو تۆ ئەمشەو لەگەڵ چیا نەچوویە هۆڵی وەرزشکرن؟" بە دەم ئەم پرسیارەوە دەستم دایە شاڵەکەم و دووجاران لە ملی خۆم وەرێنا و دەستەوانەشم کردنە دەست وەک ئەوەی بەرەو میترۆ/ وێستگەی قیتاری ژێر زەوی بڕۆین.

"برادەرێک بلیتی زیادەی نمایشێکی شانۆیی داومەتێ، گوتم لەوانەیە حەزبکەی سەیری بکەین."

کاتێک باماندایەوە بۆ سەر شەقامە هەرە جەنجاڵەکەی وەلیێ عەسر، درێژترین شەقامی تاران، بۆ چرکەیەکی کورتخایەن نیگامان تێکئالا. شەقامەکە بە ڕیزەدارێکی سالمەند چێنرابوو، لە هەردوو دیوی ڕێگاکە جۆگەیەکی ئاودێری بۆ ڕاکێشرابوو. کاتێک بۆ یەکەمین جار من و چیا بۆ تاران بارمانکرد، هەستمکرد بەسەر سنوورێکی نافەرمیی بازدەدەم و دەمودەستیش لە واتای قسەی برایەکەم گەیشتم کە پێشتر گوتبووی کوردستان بە مەبەست بە پەرەپێنەدراوی هێڵراوەتەوە. تاران گەڕەکی زۆر بەربەرین و تەلاری هەوربڕ و ڕێگاوبانی خێرای یەکدیبڕ و بێژماریش بازاڕە مۆڵ و باڵەخانەی هەبوو.

ئەو ئەوەشی بۆ زیادکرد: "من لە کوێ، خۆشەویستی لە کوێ؟"

خۆ دەکرا ئەو بەو قسەیە دەمامکم لەسەر ڕووودا دابماڵێ. منیش بۆی خەنیمەوە.

ئەو قسەکەی خۆی وەها ڕوونکردەوە: "ئەمە ناونیشانی شانۆگەرییەکەیە."

"خۆی ئەمە شیعرێکی مەولانایە. ئۆو، ئەمڕۆ ڕۆژی ڤالانتاینیشە." هۆڕن و زیڕەزیڕی ترومبێلەکانیش بە شێوەیەکی زۆر هەراسان تێکەڵ بە دەنگی بانگدان بووەوە.

ئەو ئەمەشی بۆ زیادکرد: "شانۆگەرییەکە لەبارەی ژیان و شیعری فروغی فەروخزادەوەیە. شەوێدی بینم دەتخوێندەوە".

"تۆ بلیتێکت هەیە؟" بە دەم ئەم قسەیەوە پەنجەی دۆشاومژەم بەرزکردەوە تا ئاماژە بە یەک دانە بدەم، لە گۆشەیەکی چاویشمەوە چاوم لێی کرد، بەشێکی ڕوخساریشم داپۆشی.

"بەڵێ، تەنیا دانەیەک. چیا پلانێکی هەبوو، پێموابوو تۆش لە من زیاتر حەزی پێدەکەی. ئەمشەو لە سەعات هەشتدا دەستپێدەکا." بلیتی شانۆنامەکان گران بوون، بەڵام خۆ دایبابی کارۆ لە هەندەران دەژیان، دیار بوو پارەی زۆریان هەبوو، کارۆ خەمی پارەی نەبوو. یان هەر هیچ نەبێ من و چیا لە جۆری ترومبێلە زانتیاکەی و شێوەی خۆشگوزەرانییەکەی کە بەسەری دەبرد و بە گوێرەی پێوەرەکانی خۆمان وەهای تێگەیشتبووین.

ئینجا منیش گوتم: "ئارەزووم بوو بلیتی زیاترمان هەبووایە، تا هەرسێکمان بە یەکەوە چووباین."

ئێمە درێژەمان بە گفتوگۆکەمان دا. شەقامەکەش خاسیەتی تایبەتی خۆی هەبوو؛ لەسەر شەقامەکە ژنان بە مانتۆی تەسکوتار و لەچکی هەندێک کراوە، هەندێکیشیان لەبن عەبای سەرتاپا ڕەشدا دەڕۆیشتن، پیاوانیش هەبوون قاتیان لەبەردا بوو، هەشبوون کاوبۆی تەسکوتروسک، هەر هەمووشیان بە مەبەستێک هەنگاویان بۆ پێشەوە دەنا. بۆنی دووکەڵی ترومبێل، کەباب و نان و کێکە تازە برژێنراوەکان و بانگەبانگی فرۆشیارە گەڕۆکەکان و خەندە و پێکەنینی ئەڤینیانەی کچ و کوڕان، هەموو ئەم شتانە شارەکەی لەبەرچاوم بەرز ڕاگرت.

کارۆ هەر یاری بەو بلیتەی ناولەپی دەکرد و هیچیشی نەگوت. هەوای نێوانیشمان هەستدەکرا بارگاوی بووە. کاتێکیش لە مەیدانەکە بەرەو ئاراستەی شانۆکە تێپەڕین، بالآبەرزەکەی کارۆ و سیمای وایان لە ژنان دەکرد ئاوڕی بۆ بدەنەوە. زۆر لە ژنە شیکپۆشەکان لووتیان بە پلاستەرێک بەسترابووەوە، ئاخر تاران ببووە پایتەختی جوانکاریی لووت.

کارۆ کە سەیری بەرپێی خۆی کردبوو بە دەنگێکی نزم گوتی: "لەیلا... شتێک هەیە حەز دەکەم پێتبڵێم".

منیش تفی خۆم قووتدایەوە.

"بەڕێز، تکایە!" کیژۆڵەیەکی تەمەن پێنج ساڵان، کە مانتۆیەکی بێسەروبەری لەبەردابوو لەچکێکی سپیشی پۆشیبوو، دەموچاوی پیس و پۆخڵ، هەرایەکی نایەوە واپێدەچوو گریابێ، بەڵام هیچ فرمێسکی نەباراندبوون. کارۆ وەستا، دانەویەوە و قسەی لەگەڵدا کرد.

منیش به دەمارگرژییەکەوە ئاورێکم لەو ناوە دایەوە. ئاخر ئەوەی فەرمانی پێکردووە لەو گۆڕە لەسەر جادە دەرۆزە بکا، چاودێریی دەکرد.

کاتێک کارۆ وەستا پێیگوتم: "ساتێک بوەستە." ئینجا خۆی بە دوکانێکی نزیکدا کرد. کیژۆڵەکەش بە ئۆقرەلێبڕاوی چاوەڕێی بوو، لەجێی خۆشی ئەم قاچی بەرزدەکرد و ئەویدیکەی دادەنا، پاشان بە پێچەوانەوە بەڵکو هەندێک گەرم ببێتەوە، هەموو ئەو ماوەیەش نیگای هەر لەسەر من بوو هەروەک ئەوەی منیش لێی ڕابمێنم ئاخۆ ئەوە دەهێنێ یان نا.

دوای چەند خولەکێکی کەم کارۆ بە خۆی و لەفەیەکەوە گەڕایەوە و بە دەنگێکی نزم قسەی لەگەڵ کیژۆڵەکە کرد، وشە دەربڕاوەکانی لەنێو ئەو جەنجاڵییەدا وژەی ترومبێلان لەو سەعاتە گوڕدەمەیە کە بەرەو شەقامێکی نزیک تێژتێپەڕین، هەروەک ویزەویزی مێشومەگەز دەهاتە بەرگوێ. منیش پشتم بە دارێکەوە دا و سەیری ڕێبوارانم دەکرد، زۆربەیان لە تەمەنی بیست و سی دابوون و جلوبەرگی کەشخەشیان لەبەردابوو. هەر تەنیا چەند شەقامێکی کەم لە خوارووی ئەو مەیدانە جوانەدا، ئیدی جادە و کۆڵانەکان هەم تەسک دەبوونەوە هەم پیس و پۆخڵیش بوون، خانووەکانیشیان شەقوشڕ و ترومبێلەکانیش کۆن و چەپرەک. مەرزێکی نەبینراو تارانی دەکرد بە دوو بەشەوە، بەڵام نازوفیز بە بەرفرەوانی باڵکێش بوو، ئاخر خۆ دابی شارە گەورەکانیش یان بەشێکی پەرشوبڵاو لەوانە هەراسان بوون کە پێیان دەگوترا

شەهرستونی[٧٧] – واتە ئەوانەی خەڵکی تاران نەبوون- ئەوانەی بە شێوەیەکی تەوستاسا بەشە هەرە گەورەکەی دانیشتوانی شارەکەیان پێکدەهێنا.

کارۆ هێشتا لەفەکەی لەناو دەستدا بوو، گەڕایەوە لای من و گوتی: "دەی با بڕۆین."

"مامە، مامە." کیژۆڵەکە بەدەم ئەم بانگکردنەوە بە دواماندا هات، زیرەکیشی لە چاوە ماندووەکانی تیشکیدەدایەوە.

کارۆش لێیپرسی: "چییە ڕای خۆت گۆڕی؟" ئەویش سەری بۆ لەقاند. ئینجا لەفەکەی دایەدەست و دیسان بۆی دانەویەوە. "من لێرە دەوەستم تا لە خواردنی ئەم لەفەیە دەبیتەوە."

ئەویش لەسەر شانییەوە ڕوانی.

کارۆ بە دەنگ هات و گوتی: "زۆرباشە. ئەوان دەزانن، کە زۆرم لێکردووی تا لە بەردەمی مندا ئەم شتە بخۆی." ئەویش بە گرژییەکەوە قەپاڵی لە لەفەکە گرت، لە کاتی جوینی قەپاڵە گەورەکەشیدا بە ملا و ئەولادا دەیڕوانی، کاتێ بە تەواوی لە خواردنی بووەوە، بە ڕووی کارۆدا خەنییەوە. ئەو ددانانەی ساوایەتی کە کەوتبوون، ددانگرکردنەوەکەی گەوجانە نیشاندا.

منیش چاوێکم لێداگرت: "باشە، ئەرێ تۆ دایکە ترێزا نیت؟"

کاتێکیش کیژەکە لە خواردنی لەفەکە بوویەوە، کارۆ بە خەندەیەکی لەخۆڕازیبوونەوە کەوتەوە ڕێ.

---

[٧٧] Shahrestooni

دوای چەند کۆلانێک ڕووبەڕووی دەستە پیاوێکی چەکدار بووینەوە، تەیار و ئامادە بوون، کڵاوی پلاستیکیان لەسەر بوو، گولەبەندی تەواویان لەبەردابوو کە سینگ و ئەژنۆیان داپۆشیبوو. ئاخر چەند هەفتەیەک بوو خۆنیشاندەران لەو دەوروبەرانە خڕدەبوونەوە. ئێمە بە بێدەنگی ڕێمان بڕی و مەودای نێوانیشمان بایی ئەوەندە بوو گومانی پۆلیسی ئاکار نەوروژێنێ، ئەوانیش لەوسەری شەقامەکە دۆستانە قسەیان لەگەڵ پۆلیسە ڕاونەرەکان دەکرد. کەچی کڵۆ بەفرەکان بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو هەراوزەنایەی لە نێو شاردا بڵاوبووبووەوە، سەمای خۆیان دەکرد.

ئێمە گەیشتینە لای ئەو پارکەی بەرانبەر شانۆیەکە. گرووپێکی زۆر لە کوڕ و کچ بە لافیتەی دەستیان لەسەر شەقامەکە بوون، دەمامک و شاڵی کەسکیان پۆشیبوو، بە ئاراستەی پێچەوانەوە دەڕۆیشتن. کارۆ منی بردە ئەودیو فوارە گەورەکەی ئاو لە گۆشەیەکی هێمنی پارکەکەدا ماینەوە.

منیش پرسیم: "ئەرێ بە تەمابووی زووتر چیم پێبڵێی؟"

"ئاها، چاکە، بەس خۆ ئاسان نییە..."

هەستم بە ختووکەیەکی زگ کرد. "دەی بیڵێ."

ئەویش بەسەر سامی لە بێ ئارامییەکەمی ڕوانی. "ئەرێ خۆت دەزانی، من نیوە کوردم، وایە؟"

"ئەها... ئەوە دەڵێێ." بۆ ماوەیەک ماهی مام، بەڵام هاتمەوەسەرخۆ. "ئەرێ بە ڕاست، خۆ چیا باسی شتێکی وەهای کرد، بەڵام ئایا تۆ هیچ وشەیەکیش بە زمانەکەمان نازانی بدوێی، وایە؟" منیش مەراق بووم بزانم ئاخۆ چی وای کردووە یەکێک

کوردی تەواو بێ و ئەویدیکەش نیوەکورد. ئایا یەک لە دایبابی کوردە یاخود شتەکە لەوە زیاترە و پەیوەندی بە بەرگریکردنی ڕەگەزییەوە یان بڕینی ڕێیەکی دوور و زیاتر لە مایلێک تا فێری زمانەکە ببیت و لە مێژوویەکەی بگەی؟

"دەکرێ لێرە دانیشین؟" ئیدی بەدەم ئەم قسەیەوە بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامەکەشم بکا، چووە ئەو شوێنەی بە قامک ئاماژەی بۆ کرد. منیش لە بەرانبەری وەستام. بۆنوبەرامەی پستەی سودانی برژاو بۆنی گاز و بەنزین بە هەوادا دەماردەمار دەڕۆیی. دەنگی رادیۆی پۆلیسێکی ڕاوەدونەری هەرا و پشێویش بە نێو شەقامەکەدا دەنگی دەدایەوە، کەچی تا ڕادەیەک هێشتا ئارامی و هێورەیی پارکەکە نەشڵەژابوو. "دڵنیانیم ئاخۆ ئەمشەو مرۆ لە دەرەوەی ماڵ سەلامەت بێ." ئینجا بە گرژییەکەوە دەستی بۆ پشتی تەختەبەندەکە ڕاکێشا.

منیش قۆڵەکانم بۆ یەک هێنانەوە. "ئێوە لەوە ڕانەهاتوون ئەوە ببینن کە چەکدار بەناو شارەکەتاندا بڕوا، وانییە؟ کەچی دەیان ساڵە کوردستان بە مێلیشیایی کراوە، و چەکدار تێیدا جرتوفرتیانە."

ئیدی کارۆ لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی باوکی، لە ساماڵی ئاسمانێ، لە فوارەی ئاوەکە، لە خاکی بەرپێی، لە هەرشتێکی بەرچاو دەکەوت نزبووەوە تەنیا لە من نەبێ، وەک ئەوەی باری شانی لەبن مێژوویەک قورس بکا، کە چۆن دەستوپەنجەی لەگەڵ نەرم بکا.

هەروەک باوکی من، بابەی ئەویش یەکێ لە کوردە بلیمەتەکان بووە، یەکێک بووە دژی هەموو شتە باوەکان، چووەتە زانکۆ لە

پایتەخت و لە سەرەتای حەفتاکاندا پلەی هەرە باڵای بەدەستهێناوەوە، بەڵام دوای ئەوە ڕێچکەکانیان لەیەک جیادەبێتەوە.

باوکی ئەو لە ماوەی تەواوکردنی خوێندنەکەیدا بە تەواوی گۆڕا، هەم ناوی خۆی و ناوی زێد و ناسنامەکەی خۆیشی دەستکاری کرد و گۆڕی، سمێڵی تاشی و شێوەی پرچداهێنانەکەشی گۆڕی، گرانترین قاتی لەبەرکرد و گرانترین بۆنیشی لە خۆی دا، واشی نواند شێوەی فارسییەکەی بۆیە غەریبە گوایە لەبەر ئەوەیە لە ئەمریکا لەدایک بووە، هەرگیز فێرە فارسییەکی ڕەوان نەبووە. وای نمایشکرد بۆیە لە ئەمریکا گەڕاوەتەوە تا لە ئێران لە موڵکوماڵی خۆی وەبەرهێنانی ڕاستەقینە بکا، توانیشی قەرزوقۆڵەیەکی قەبە وەربگرێ، بەڵام زۆری پێنەچوو خەونەکەی بەدیهێنا. هەر دوای ئەوەی سامانێکی زۆری بەسەریەکەوە نا کچی یەکێک لە وەربەرهێنەرەکانی خۆی خواست، تەنیا دوای زەماوەند ڕەچەڵەکی خۆی بۆ ئاشکراکرد.

"کاتێ دایکم بە ڕاستییەکەی زانی، ڕووخا."

لەگەڵ بیستنی ئەو قسانە لە کارۆ، من لە تاوان قوڵپم دەداو دەمووچاویشم سوورهەڵگەڕا. ئەو بەو بڵێسە ئاگرەی لە چاوانم هەڵگیرسابوو، حەپەسا. ئاخر کارۆ لەو ڕۆژە تووڕانەی چیمەنی مەریوان نەیناسیبووم. هەر چۆنێک بوو گوتی: "پێموایە بەم زووانە شانۆنامەکە دەستپێدەکا."

"من نامەوێ هەر بە تەنیا بچم و سەیری شانۆنامەکە بکەم." دوای ئەم قسەیە لە شوێنی شانۆنامەکە دوورکەوتمەوە، لەبری ئەو ڕووم لە وێستگەی قیتاری ژێرزەمینی کرد. هەر ماتۆڕی

شرِوشەپرِێویش بوو بە بەردەمدا تێدەپەرِی و گڤەی دەهات. کارۆش بە دوامدا هات، بەڵام لە جیاتی ئەوەی داوام لێبکا شانۆگەرییەکە ببینێ، درێژەی بە گێرِانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆی دا. دوای درکاندنی راستییەکە، دایکی برِیارِیدا قەلاقوپی لێبکا و بۆ کەسی باس نەکا، بە منداڵەکانیشیەوە، بەڵام لەو رِۆژەوە رِقی لە مێردەکەی بووەوە. هەر بەم دواییانەش بوو کارۆ بەوەی زانیبوو کەوا نیوە کوردە. خوشکەکەی لە نیویۆرکەوە و لە نامەیەکدا پێی راگەیاندبوو، ئەمەش دوای ئەوەی وای لە دایکی کردبوو دان بە شتەکەدا بنێ. "ئێستا لەوە تێدەگەم بۆچی باوکم لە ماڵەوە هەمیشە هەر خۆپارێز بووە،" کارۆ ئەمەی پێگوتم و ئیدی منیش تووشی زریانێک لە هەست و سۆز بوومەوە. ئەو نەیدەزانی ئاخۆ چی لەو زانیارییە رِەچاونەکراوانە بکا و داوای هاوسۆزیی لێکردم.

" ئای لەو بەستەزمانە. ئاخر چۆن لەگەڵ ئەو زانیارییە تراوماییەدا بژی؟ کەواتە تۆ لەسەر ئەوە پەروەردەکراوی، کە ئەو لادێییانە لەوێ دەژیان لە تۆ نزمتر بوون، کەچی لە پرِێکەوە - شتێکی ناکاو و سەرسام رِوویدا، تۆش بوویتە یەکێک لەوان! خەریکە دڵم بۆت پارچەپارچە دەبێ."

"ئەرێ ئەوە هەموو ئەو شتەبوو تۆ لە بەسەرهاتەکەدا هەڵتهێنجا؟"

"دایکت راسیستە."

"کارۆ لای ئەو پەیژەیە وەستا کە بەرەو تونێلی قیتارە ژێرزەمینییەکە دەرِۆیشت و گوتی: "دایکم هەڵخەڵەتێنرا!"

"ئەوە بۆیە تۆ هاموشۆی من و چیا دەکەی و ئەو هەموو پرسیارانە سەبارەت بە دیرۆک و سیاسەت دەکەی، وەها نییە؟" ئیدی ئەو پێویستی بە ئەنسکلۆپیدیایەکی وەک چیا هەبوو، تا بڕیار بدا ئاخۆ چی دەوێ، دەیەوێ ڕەچەڵەکەکەی لە باوەش بگرێ یان هەروەک پارچە دیکۆرێکی جوان بە دیوارەوە هەڵیواسێ.

"ئایا ئەوە هەڵەیە؟ من هەندێک هاوسۆزییم لە تۆ گەرەک بوو."

""هەر بە ڕاستی بە داخم کە باوکت درۆی لەگەڵ دایکت کردووە. شتێکی سامناکە. شتەکە دەناسمەوە. تەنانەت منیش پەست بووم. هیوادارم لەوە تێبگەی ئەم جۆرە خاپاندنە بەشێک نییە لە کلتووری کوردی. ڕاستیت بوێ، زۆربەی کات شێوە پێچەوانەکەیین: ئێمە ئەوندە سەرڕاست و ڕووڕاستین تا خوا دەڵێ بەسە. ئەوەی هەراسانم دەکا ئەوەیە، تۆ دان بە دەمارگرژیەکەی نێو جەوهەری بەسەرهاتەکەتدا نانێی، ئەو دووڕیانەی بەردەمت ناناسییەوە. ئەرێ بە ڕاست ئایا ئەگەر هاتبا و بۆت دەرکەوتبا تۆ نیوە ئاڵمان و نیوە ئینگلیزی، سەرباری مێژووی نازیزم و کۆلۆنیالیزمیش، ئایا دوودڵ دەبووی بۆ جیهانی جاڕ بدەی؟ ئایا دەزانی باوەشکردنەوەت بۆ کوردبوون نرخی خۆی هەیە، نرخێکی قەبەش."

کارۆ نائاسوودە بوو. تا دەهات دەنگەدەنگی ئەو ڕێبوارانەی ڕێگەیان بۆ وێستگەی قیتاری ژێرزەمین دەبڕی، زیاتر دەبوو، منیش لە هیکەوە لە خۆم ئاگابوومەوە، زانینم دەنگم بەرزبووەتەوە.

"ئەرێ هەرگیز بۆت دەرکەوتووە ئاخۆ بۆچی باوکت ئەوەی بە پێویست زانیوە ماک و بنەچەکەی خۆی بشارێتەوە؟" لەچاوی مندا، کارۆ لەوجۆرە خەڵکانە بوو کە لە بێ ئەزموونیاندا، لەبەرئەوەی

تووشی نەهاتبوون، لە کێشەوگرفتی وەک نەداری، بەدخۆراکی، خراپیی کەرتی تەندروستی و خوێندن و پەروەردە نەدەگەیشتن. لێ کاتێ سەیری ئەو ڕوخسارە کەشخە و ڕەنجاوەم دەکرد، مەراق بووم بزانم گەلۆ من لە بەرانبەریدا زۆر وشک و زبر نەبووم. بەرلەوەی تەقەللای ئەوە بدەم ڕووی دەمەتەقێکەم بە لایەکی دیکەدا وەرگێڕا، گوڕدەمی ئاپۆرای خەڵک منی بەرەو خوارەوەی پەیژەکانەوە پاڵنا، شەپۆلێک لە خەڵک بەرەو ڕوومان هات، منیش لە جێی خۆم لە ترسان زەندەقم چووبوو.

کارۆ سەیرێکی ئەملا و ئەولای کرد، دەستی گرتم و تا هێزمان تێدابوو ئێمەش غارماندا. ئەو گوڕدەمە تۆقێندراوە وای لە ئێمەش کرد هەڵبێین. تەقەش بە هەوادا کرا. خەڵکەکە کەوتنە قیژە و هاوار. بۆ پۆلیسی گێرەشێوێنی هەموو کەس تاوانبار بوو، ئەستەمیش بوو پێچەوانەکەی بسەلمێنرێ. منیش تا هێزم تێدابوو ڕامکرد، بەڵام هەناسەم سوار بوو.

"بۆ لای دیوار، بۆ لای دیوارەکە." کارۆ بە دەست و چاو ئاماژەی بۆ کردم. منیش بە گوێم کرد. ئەو، کۆڵەپشتە بچۆوکەکەی لە پشت کردمەوە وایکرد بۆ بەرسینگمی ببەم، ئیدی حەشاماتەکە بێ قەراپەستێنە و خۆپیدادان لە من تێپەڕی. پۆلیسیش تا دەهات نزیکتر دەبووەوە گازی فرمێسکڕێژیان لە قوربانییەکان دەڕشاند. کارۆ وریایانە ناوچەکەی پشکنی. ئینجا دەستی گرتم و گوتی" دەی وەرە،" و لاماندایەوە سەر شەقامێکی لابەلا.

منیش بە هەناسە بڕکێوە گوتم: "شەقامە بچووکەکان تەڵەن."

خەڵکەکە بە جۆشەوە هەر لە گۆترە لە دەرکەی ماڵانیان دەدا. لێرە و لەوێ، هەر بینا دەرگەیەک کرایەوە، کەسێک بەر لەوەی دەرگەکە پێوە بداتەوە یەک دوویەکی بۆ ژوورەوە ڕادەکێشا.

کارۆش بە دەم ڕاکێشانی باسکی منەوە گوتی: "من دەزانم چی دەکەم." ئیدی بەرەو کۆڵانێکی تەنگەبەرتر هەنگاومان نا.

من تاسا بووم. "خۆ ئەگەر بگیرێین، ئەوا من یەکێک دەبم لەوانەی دەکوژرێن، نەوەک تۆی نیوە فارس."

کارۆ بۆ نێو مەڵبەندێکی پزیشکی لە لای دەستەڕاست ڕایکێشام، کە تا ئەو ساتە تێبینیم نەکردبوو. جووتەیەکی دیکەش لە ئێمە نزیکبوونەوە. "ئەگەر ئەوان هاتن خۆت نەخۆش بکە."

بە دەم گوتنی ئەم قسەیەم: "چی؟ ناتوانم خۆم وەها بنوێنم." باسکم لە دەستی ڕاپسکاند.

"ئەوان لەبەردەم پیاودا هەست بە خراپە ناکەن. تەنیا بگری و هاواربکە وەک ئەوەی ئازارت هەبێ، دەی بۆ خاتری خوا مشتومڕم لەگەڵدا مەکە! دەتوانی وا بکەی؟" ئای ئەگەر تەنها دەیزانی.

یەک دوو کەسی دیکەش بە دوای ئێمەدا خۆیان بە سەنتەرە پزیشکییەکەدا کرد و پیاوێکی پیریش دەرکەکەی پێوەدایەوە. کاتێک بە ڕووی ئاپۆرەی تۆقاوی خەڵکیدا ڕوانی، ئەمەی گوت: "باشترە چەند کەسێک دەرباز بکەی لەوەی هیچیان." ئێمەش نیگای خەتابارانەمان لەگەڵ یەکدا گۆڕییەوە، بەڵام کەس بەرپەچی نەدایەوە. ئاخر ویستی مانەوەمان بە سەر شەرمەزاریماندا زاڵ بووبوو.

من و کارۆ بە پلیکانەکاندا دابەزین و خۆمان خزاندە نێو تاقیگە جەنجاڵەکە. "دەی خۆت وەک دووگیان بنوێنە."

لەبەر بۆنی داودەرمانە کیمیاییەکە چاوم تروکاند و گوتم: "بۆ خاتری خوا ئەم بەزمە چییە؟"

"ئێمە دەبێ وا بجوولێینەوە وەک ئەوەی ژن و مێرد بین، دەنا گومانیان دەوروژێ." ئینجا کارۆ ئاماژەی بە جووتەیەکی دیکە دا، کە لەنێو خۆپیشاندەران بینیبوومانن. ژنەکە دەستێکی لەسەر کەلەکەی دانابوو، دەستەکەی دیکەشی لەسەر سک. دڵۆپە ئارەقەشی لە بڕبڕەی پشت و لە مل دەتکا. کابرای تاقیگەکە چاوێکی لێداگرتین و ڕاگەیاندننامەیەکی پزیشکیشی دایە دەست جووتەکە. ئەوان خەریکی ئەوە بوون پەردەپۆشمان بکەن. منیش شڵەژاوانە لە پرمەی پێکەنینم دا.

کارۆ شانی گرتم و بە چرپەیەکەوە پێیگوتم: "خۆ نەشمگوت وەها!"

ژنەکەی دی کە پێدەچوو دووگیان بێ، برۆی بزووت و سەیرێکی کردم و گوتی: "پیرۆزە!" منیش لە کەمەرمەوە هەندێ نوشتامەوە و دەستیشم بە زگی خۆمەوە گرتبوو.

کارۆش وەها وەڵامی دایەوە: "زۆر سوپاس! ئەوە نۆبەرەمانە." کاتێکیش بە سۆزەوە دەستی لە شانمدا منیش سەیری سیما جدییەکەم کرد. ئەو بە خاترجەمییەوە سەیری کردم، منیش هەرچی تووڕەیی و ترس هەمبوو، دامرکایەوە. ڕەنگە *ژیان ئەو ساتە داخراوە بێ، کە نیگام خۆی لە پێڵووی چاوەکانی تودا وردوخاش دەکا*. هەر بە ڕاستیش وایە.

## بەندی حەڤدە

بە خۆم و کامێرایەکی بچکۆلەی جۆری کامکۆردەر، فیلمی پیاوێکی لانەوازم لەو بەری شەقامەکە گرت، پیاوێکی پرچ ماشوبرنجی، سەرنەشۆراو و قژ دانەهێنراو، بەسەر شانەکانیدا شۆڕبوووبووەوە. جینزەکەی لە کلاوەی چۆکەکانی دڕابوو، دڕانەکەی بە قەد یەک ئینچ تا سەرچۆکانی هاتبوون. هەرچەندە هێشتا زوو بوو لە دوورەوە پەڵەهەوری تاریک دیاربوو تا دەهات دەهاتنەوە یەک و هەڕەشەی ئەوەی لێ دەخوێندرایەوە پاشنیوەڕۆیەکی بە باوبۆڕان بێ.

پیرەمێرد بە نێوانی دوو پیرەداردا قەدەمی لێدا و دەستی لە چڵی هەر دارێک دەدا بە لایدا تێپەڕیبا، بە دەنگی بەرز و بە گوڕوتینەوە قسەی دەکرد، دەستی بەرزدەکردەوە و هەندێ جاریش ڕێک بە سینگی خۆیدا دەدا. ڕێبواران تیژ بە لای ئەودا تێدەپەڕین جا نیگایان تێگرتبایە یان نا. کەس نەدەوەستا تا گوێی لێبگرێ؛ ورتەورتی پیاوە ئۆقرەلێبڕاوەکە لەنێو دەنگ و سەدای مۆبایل بە دەستەکاندا ون بوو.

چیا بە خۆی و بێجامە بۆر و فانیلەی بن جلەکانیەوە چووە ناندینێ، لایەکی ڕوومەتی شوێنەواری گەچرانی سەرینی پێوە بوو، ئاڵۆزی پرچە خۆڵەمێشییەکەی ئاماژەی پێنج ئاراستەی دەدا. بەر لەوەی بتوانێ بەیانی باش بکا، باوێشکێکی درێژی هاتێ. ئینجا

یەخچالەکەی پشکنی، ئەم حاڵەتە ئەو ڕۆژانەی بیرهێنامەوە، کە کوڕێژگەیەکی پارچەڵە بوو، گۆرەوەیی تاکە و تاکی لەپێدەکرد.

"بلسیمە؟"منیش بە وریاییەوە بێ ئەوەی کامێراکەم بکوژێنمەوە لەسەر مێزەکە دامنا و پیاڵە چایەکەم بۆ خۆم تێکرد.

"پەککوو، هێشتا وازت لە کامێرا نەهێناوە؟" بە دەم ئەم قسەیە چاوەکانی هەڵگلۆفتن و ڕاستەوخۆ لە بوتڵەکەوە هەندێ شیری هەڵقوڕاند.

کامێرا کامکۆردە ڕەشەکە ئەمبارێکی مایکرۆ دیڤیدی هەبوو، هەرچەندە کامێراکە یەک دوو مۆدیلیش لەپاش بوو، بەڵام بەهادارترین شتم بوو. هێشتاش بە تەواوی نەبووبووە موڵکی من، تەنیا قیستی یەکەمم دابوو، مانگانە بڕە پارەیەکم دەدا. ئای چەند خۆش بوو لە کاتی بەکارهێنانیدا، کامێراکەم بە باری ئاسۆیی و لارییەوە دەجووڵاند.

هەستێکی پاڵنەری بەهێزم بۆ تۆمارکردنی ئەو خۆشییە کەمانەم هەبوو، هۆکارەکەش بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە زۆر دەترسام لەوەی ئەو ساتە خۆشانەم زۆر کورتخایەن بن، بەشەکەی دیکەش لەبەر ئەوە بوو حەزم لێبوو ئەو ساتە جوانانە دووبارە و چەندبارە ببینەوە. زۆر تامەزرۆی ئەوە بووم سەردانەکەی هەفتەی داهاتووی شلێر تۆمار بکەم تا هەڵسوکەوتە سەیرەکانی دووبارە لێبدەمەوە، ئەو ڕەفتارەی دەمێک بوو غەریبیم دەکرد.

"ئەرێ بەو شەوە درەنگەی دوێنێ چیت دەکرد؟" ئیدی لە سەر یەکێک لە کورسییە دارینەکانی ناندین دانیشتم، ئەوانەی لە دوکانێکی

دەستی دوو کڕیبوومان، ئەم کورسییانە زۆریان پێویست بەوە بوو سەرلەنوێ بۆیە بکرێنەوە.

"خاتوونی کتێبفرۆش، سەبرم لێبگرە. سەرەتا سەعیم دەکرد، پاشان کۆبەرهەمەکەی شێرکۆ بێکەسم دەخوێندەوە، ئەوەی بۆت هێنابووم." کە چیا ئەم قسەیەی کرد، ناندینە تەنگەکەی بەجێهێشت و بە نێو ژووری دانیشتنی دا ڕەتبوو چووە ژوری نوستنی خۆی. ئەو ڕۆژانەی ژوورە بنهۆمەکە بەسەرچوون، لە ئەپارتمانەکەی تارانماندا هۆدەیەکی نوستنی گەورەترم هەبوو. هەستمکرد ئەو دیوارە ڕووتانەی ئەو ئەپارتمانەی بەکرێمانگرتبوو، چیدی هەراسانی نەدەکردم. ئاخر ببووە ماڵی من.

چیا بە خۆی و کتێبەکەوە گەڕایەوە و لە بەردەممدا دانیشت، ئەو لاپەڕەیەی کردەوە کە گوێیەکەی کەمێ نوشتاندبووەوە، ئیدی کەوتە سەر خوێندنەوەی:

لەو ساڵەدا

ئێمە و مێژوومان تەنیا بووین

ئێمە و مردنمان تەنیا بووین

دوای شانزەی سێ ...

نە جوبریلو نە فریشتە و نە ئەسحابە و نە مشایەخ

هیچ کامێکیان دوورا و دووریش

نە بە دەست و نە بە سەر و نە بە قاچیش

سڵاوێکیان لێنەکردین!

موسا و عیسا و پێغەمبەران هەر هەموویان

به دوو دێڕیش

نامەیەکیان بۆ نەنووسین !

بۆ دڵنەوایی و سەرەخۆشیی

خودای گەورەیش ...

نە یەک تەلەفۆنی کرد و

نە فاکسێکیشی بۆ ناردین !

لەو ساڵەدا ئێمە و ئەم خاکە تەنیا بووین

ئێمە و مردنمان تەنیا بووین!

بۆن و بەرامەی ئەو چایە بەدارچینەی تازە دێمێ کێشابوو هەڵمدەمژی، هەڵمی ئیستکانەکەی کاتێ بەرزم کردەوە لە چەناگەی دام، بە دەم فرلێدانی ئیستکانە چایەکە سەری ڕەزامەندیشم بۆ شیعرەکە لەقاند، بیریشم هەڵفڕی، ڕۆژی لەدایکبوونی چیام هاتەوە یاد، لەو کاتەی سەیری تەلەفزیۆنم کردبوو، هەر نیشاندان و باسوخواسی توندوتیژی بوو، مێشکیشکم لە شتەکە نەدەگەیشت، بەڵام هەموو خانەیەکی لەشم لەگەڵیدا دەهەژا.

چیا کتێبەکەی دانا و هەندێ کەرە و مرەبای هەڵووژەی لە پارچە نانێک هەڵسووی. پڕ بە دەمی قەپاڵی لە پارووە نانەکە دا.

"بیستم لەم یەک دوو ڕۆژەی ڕابردوودا، ئەو مەعمیلەی دایکم، کەسە نێرەمووکەکە خۆی کوشتووە. ئەوی ڕاستی بێ، چیدی مەعمیلی دایکە نەماوەتەوە... خۆت دەزانی."

"ئای لەو بەستەزمانە. هەردەبێ ئەویش لە بن ژان و ناسۆردا ناڵاندبێتی."

"دیاره چیدی تووڕه نیت."

"نا ئەوەندە نا،" بە هێواشیش ئیستکانە چایەکەم فڕکرد. بابە دەستبەرداری من بووبوو، منیش لە دڵی خۆمدا دایکەم دەرکردبوو، ئیدی پەیوەندیم پێوە نەمابوو. هەموو زانیاری گەیاندنێکی سەبارەت بە ژیانی من، هەر لە ڕێی چیاوە بوو. وێناکردنی ئەو ئازارە زۆرەیشی ئاسوودەیی دەدامێ، پاشان ئەو هەستی ئاسوودەییە ویژدانی دەهێنامە ئێش. کاتێکیش ئێمە بۆ تاران بارمانکرد، دەستم بە چەند دانیشتنێکی چارەسەری کرد، کابرای دەروونزانیش بۆی ڕوونکردمەوە، گوایە ئەو نەرجسیەتەی دایکە و ئەو خەمۆکییە درێژخایەنەی باوکم بە ئەنقەست -یان بە ئاگاییەوە- نەبووە تا ئازارم بدەن. دیارە دیاردەی جێزەبر[78] مێراتێکی کوردە، لە نەوەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە گواستراوەتەوە.

ئەویش پرسی: "ئەرێ چۆن تۆ بەرانبەر ئەو هەموو شتانە خەمساردی؟" هێشتا هەر بە سووکی بە دەوروخولی باسوخواسی گۆبەندەکەی دایکمدا دەسووڕاینەوە، ئەو دوا دووڕووییە ناڕەوایە منی بەرەو سەر لێواری کەندار پاڵدەنا.

"نەخێر، من وەها نیم. تەنیا ئەوەیە من وەها بیردەکەمەوە کە سەرجێیی بێگانان تاکە ڕێگەی ناپاکی نییە لە هاوسەرەکەت. ئەوان هەردوولایان ناپاکیی لەگەڵ یەکدی و لەگەڵ منداڵەکانیشیاندا کردووە. من ئێستا زۆر بۆیان پەرۆشم، هەروا بە تەنیایی تەمەنیان هەڵدەکشێ."

---

[78] لێرەدا جێزەبرم لە بری وشەی تراوما بەکارهێناوە.

دەستم بە سووکی لەرزی و چایەکەشم شڵپەی لێوەهات. ئاخر لەهەر هەناسەدانەوەیەکدا ئازارێک لە سینگم، لە سییەکانم دەردەهات. چاوخشاندنەوە بەو ڕووداوانەی من بە هەناسەساردی لەپشت سەری خۆم جێمهێشتبوون، دەیتەزاندم و هەستم دەکرد تەوژمە سامناکییەکی تازەم بە سەردا دێ. ئەوە بوو چیا هات و بە دەستەکانی خۆی هەردوو دەستی گرتم.

"لەیلا، دەکرێ بۆ تەواوکردنی ئەو پرۆژەیەی کەوا دەستم پێکردووە یارمەتیم بدەی. پرۆژەکەشم ناولێناوە 'لە خۆسەریەوە بۆ خۆشەوتاندن: پارادۆکسی ژیانی ئافرەتی کورد. ئەمەش لە گۆڤارێکی کەنەدی بۆ مافەکانی مرۆڤدا بڵاودەکرێتەوە. من ئەوە دەبینم هەر کاتێک باسی ئەو ڕووداوە بکەین، ڕەنگت دەبزرکێ و بە ددانیش نینۆکەکانت دەقرتێنی، لەو باوەڕەدام بە یەکەوە کارکردن هەم یارمەتی تۆ، هەم من و هەم ئەو ژنانەی لە ژێر هەڕەشە و مەترسیشدان دەدا."

" کتومت پێمبڵێ بە دوای چیدا دەگەڕێی؟"

"باشە پێم ناڵێی بۆ لە سەدەی هەژدەهەمدا ژنی کورد دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوابووە، کەچی ئەم پرسە ئەوکات لای ئێرانی و تورک هەر ناویشی نەبووە. ئێستاش خۆت دەبینی، ڕێژەی خۆکوشتنی ژنان لای ئێمە چەند بەرزە، ئەرێ باشە ئەوە چی بەسەر ژنی کورددا هاتووە؟"

منیش پرسیم: "چی بەسەر پیاوی کورددا هاتووە؟" زەنگی ئاگادارکردنەوەش کە لە دەرەوەڕا دەهات وشتی[٧٩] کردم. "ببوورە، پێموانییە هێشتا بۆ ئەم شتە ئامادەبم."

ویستم خۆمی لێبدزمەوە و لە شوێنێک خۆم حەشاربدەم.

ئیدی چیا بە دەم گوتنی "چاکە، با وا بێ." دەستی دایە کامێراکە و زوومەکەی خستە سەر ئەو کەسەی پێشتر من وێنەیم گرتبوو.

ئەوسا لێمپرسی: "ئەرێ ئەو گۆڤارە چۆن تۆی دۆزییەوە؟"

"بە ئینتەرنێت، لە ڕێی بلۆگەکەمەوە."

"چیا، جا باشە پێتوانییە ئەمە زۆر جێی مەترسی نەبێ؟"

ئەو لە وێنەیەکی من ڕاما، وێنەی چیا بە بەفرداپۆشراوەکانی زاگرۆس، کە لە کاغەزە گوڵ گوڵییەکەی سەر دیوارم دابوو. ئینجا گوتی: "خۆ هەر دەبێ یەکێک شتێک بکا. وریاش دەبین. بە ناوێکی خوازراوەوە بڵاویدەکەینەوە."

"شەوێدی لە خەونمدا دەستە ماسییەکم هەبوو، پێشم نەدەکرا خواردنیان بدەمێ. ئیدی ئەوان لە نێو شووشەیەکی بچکۆلەدا مەلەیان دەکرد، کە لەنێو گۆمێکی گەورەدا بوو. دەشمزانی برسییانە، بەڵام خواردنی ئەوانم پێ نەدەدۆزرایەوە تا بیاندەمێ. ئەو زیندەوەرە بچکۆلانە خەریکبوون لە برسان دەمردن، بەدەر لە منیش کەس پێی نەدەزانی، ئەوانیش چاویان هەر لەسەر من بوو، بۆ خواردن لێم دەپاڕانەوە. خۆی ئەرکی منیش بوو خواردنیان بدەمێ،

---

[٧٩] وشت، وشتکردن: واتە گوێت لە شتێکی نائاسیی دەبێ، گوێی بۆ قوڵاغ دەکەی و دەسڵەمییەوە.

بەڵام هەر دەگەڕام و خۆراکەکەیانم بۆ نەدەدۆزرایەوە. هێشتاش هەر پەرۆشم بۆیان."

"هێشتاش هەر خەونی جڕناوفڕنا دەبینی؟"

ئەو بەوەی دەزانی، ناوبەناو یەکێ لە خەونە مۆتەکەئاساکانم تارمایی کەسێکی تێدایە و بە خۆیی و جلێکی شینی شۆڕەوە[٨٠]، درێلێکی کارەبای بە دەستەوە لە پێشم وەستاوە، منیش بەتەواوی ڕووتوقوت، ئیدی لەسەر سەرم دەوەستێ و پێم پێدەکەنێ. گوردییێکم کەوتێ.[٨١]

سەری بەرزکردەوە. ئینجا گوتی: "ئەرێ جاری وا هەبووە ئەو پیاوە غەوارەیە لە یەکێ لە فیلمەکانتا دەربکەوێ؟"

منیش چەکمەجەی کەوانتەرەکەم کردەوە و تەختە قیمەکەم دەرهێنا. "هەر کاتێک خوا برە پارەیەکی بە مەبەستی فیلمەکەم نارد، ئەوسا شتەکە مەیسەر دەبێ."

"چیا بەرەو لای من وەرگەڕا و سەیری کردم و گوتی: "تۆ دەبێ بە دوای ڕێگەیەکدا بگەڕێی کارەکەت بخەیتە بەردەم دەرهێنەرێک."

هەر خێرا بە کێردێک[٨٢] کاهوویەکم لەتکرد. "ئاخر چی نیشان بدەم؟ هەر لە گۆترە وێنەی شەقام و خەڵک و پیادەڕەو، یان داروبار و باڵندە، خۆ ئەو شتانەی بە کامێرا کامکۆردەکەم تۆمارم

---

[٨٠] لێرە مەبەست جلی پزیشک و پەرستارانەیە، وشەیەکی دەقاودەقم بۆ نەدۆزرایەوە.

[٨١] گوردی: حاڵەتی ڕاچڵەکین لەناکاو، لەرزینێک لەپڕ.

[٨٢] کێرد: چەقۆیەکی گەورە، بە تایبەت ئەوانەی لە ناندین بۆ گۆشت وردکردن بەکاردەهێنرێن.

کردوون بۆ کەسێکی پیشەمەند[83] شتێکی گاڵتەجاڕیی دەبێ... چیا، گاڵتەم پێمەکە." ئەوسا کێردەکەم لەسەر تەختە قیمەکێشەکە دانا و ڕووم تێکرد. " تۆ دەبێ ئەو کەسانە بناسی کە خەڵک دەناسن."

ئەو سەری بەردابووەوە، لە کاشییە سپییەکانی ناندینێ بە هەمان داڵغە نزبووەوە و خەونی بە ڕاستییەکان بەراورد دەکرد. "خۆت دەزانی دەبێ چی بکەی؟" بە قامکەکانیشی پرچی داهێنا. ئینجا درێژەی بە قسەکەی دا: "کڕیارەکانی کتێبفرۆشییەکەت بدوێنە. ئەوەی سەیری فیلمان دەکا، ئەوەی گۆڤاری فیلم و سینەمایی دەکڕێ، ئا بەم جۆرە. ئمممم...." دیسان زوومی کامێرای تێگرتەوە و لێوی سەرووشی گەزتەوە. "خۆ ئەگەر ڕێگەیەکمان دۆزیبایەوە تا پەیوەندی بە دەرهێنەرێکی کوردەوە بکەین، بۆ نموونە هونەر سەلیم یان یەکێکی دیکە، ئەوسا ئەوەی تۆ دەتەوێ نیشانت دابا، دڵنیام لەوەی پشتگیرییان دەکردی."

منیش سەرم بادا و دەستم بە جنینی سەوزەی سەر تەختەقیمەکە کردەوە. "چییان نیشان بدەم؟ ئاخر خۆ من نەمخوێندووە، نە پاشخانێک و نە ئەزموون..."

"لەیلا گیان خەون دەیخوا". بە دەم ئەم قسەیەوە سەری لەقاند، لە پشتمەوە وەستا و چاوی ترووکاند. "ئای ئەگەر تەنیا مارتن لوسەر کینگ بوومایە."

"ئمممم... سەوزەی قاوڵمە[84]؟" چیا نمایش ئاسا ئەو کاتەی دەفرە خۆشەکەی ئەو لە گۆشتی گوێرەکە و گیا و بەهارات و لیمۆی

---

[83] پیشەمەند: پرۆفیشناڵ.
[84] sewzi ghawlma

وشککراوه و نۆکم دانا، بۆنیکرد. دوای ئەوەی بڕوای بە توانستەکانی خۆی هێنا. هەموو کاتێک کە ویستبام زۆرتر لە ماڵ بمێنێتەوە، وەهام دەکرد و ئەو جۆرە خواردنەم بۆ لێدەنا، ئینجا ئەویش باسی ئەوەی بۆ دەکردم کەوا هەر گۆڕانکارییەک لە ژیان بە ئارەزوویەک دەستپێدەکا، ئازایەتی لە بڕواکردن بە کێویترین خەون وای لە پیاوە ئەسمەرەکە کرد ببێتە سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ژنیش هەر ئەو کاتە دەبێتە سەرکردە. منیش حەزم لێبوو چیا لەبارەی ئەو هەموو شتانەوە قسەم بۆ بکا و وا خۆم بنوێنم کە باوەڕی پێناکەم و ئەویش هەر ساویلکەیەکە و بەس.

"کارۆ خواخوایەتی بۆ ئەو جۆرە خواردنە! ئەرێ ئەمە بەشی سێ کەس دەکا؟" کاتێکیش من لە وەلامی پرسیارەکەیدا شانم هەڵتەکاند، تەلەفۆنەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و کورتەنامەیەکی بۆ برادەرەکەی نووسی.

"دەی با من زەلاتەکە دروست بکەم." بەدەم ئەم قسەیەوە، چیا تەماتە و گێزەری لە بەفرگرەکە دەرهێنا خەریکی شوشتنەوەیان بوو.

منیش سەیری شێوازە تەوساویەکەی ئەوم کرد و کاتێکیش لەگەڵ قاشکردنی ئاروودا[٨٥] پەنجەی خۆی بڕی، پێکەنینم هات.

بە دەم پێچانی پەنجەکەی بە پەڕۆی سەرسفرە گوتی: "بە چی پێدەکەنی؟" ئیدی دەبووایە زەلاتەکەش هەر خۆم بیکەم.

---

[٨٥] ئاروو: هاروو، خەیار.

"ئەرێ تۆ پەییت بەوە بردووە ئاخۆ بۆچی ئەوەندە لە بارەی مێژوو و سیاسەت و جیهان دەزانی؟" بەم قسەیە هەم هانمدا زیاتر بدوێ و لەسەر ئەنجنکردنی بەردەستەکەشم بەردەوام بووم.

"چونکە من دەخوێنمەوە."

"هەروەها لەبەرئەوەی هەمیشە من هەر چێشتم لێناوەوە و ئەو ناوەم خاوێنکردووەتەوە تا دەرفەتی کات بۆ تۆ بڕەخسێ."

ئەو لە ناندین چووە دەر و لە ژووری دانیشتن بە خۆی کتێبەکەی دەستیەوە خۆی بەسەر قەنەفەی تایین دادا، کتێبەکەش کتێبی کیڤین ماککیرنمان[٨٦] بوو بە ناوی کورد: گەلێک عەودالّی نیشتمانەکەیەتی. منیش کشامەوە ژوری نووستنم و بیرم لەوە کردەوە ئاخۆ بۆ میوانە کەشخەکەمان چی لەبەربکەم. کراسە خەتخەتەکەم ڕێکتر بوو لەوەی لەبەرمدا بوو باشتریش لەسەر تەنوورە ڕەنگ کەسکەکەم دەهات. من ئەوەندە وردیلە و بەژنکورت بووم، دەکرا جلوبەرگی نایابی منداڵان لەو دوکانانەی هەراجی دەکەن بکڕم و بۆم بلوێن. پرچم بە قردێلەیەکی ڕەنگسەوزی دارستان بەستەوە و ماسکارایەکی ڕەشیشم بە برژانگەکانمدا هێنا و لێویشم بە ڕەنگێکی خۆخ ئاسا ڕەنگکرد ئینجا گەڕامەوە ژووری دانیشتن.

لەسەر قەنەفەکە مایکەکەم لە گوێم گرت و لە بەرانبەر چیا دانیشتم و بە لاپتۆپەکەی ئەو سەیری (پێکدادان crash) سیناریۆ

---

[٨٦] Kevin McKiernan

ئاڵۆزەکەی پاول هاگنیسم[٨٧] کرد تا باشتر لێی تێبگەم، ناوە بەناویش چاوێکم لە براکەم دەکرد، کە سەری بەسەر کتێبەکەی داگرتبوو، بە تەواوی چووبووە ناوی. کەچی منیش نەمدەتوانی تیشکۆی خۆم لەسەر شتێک خڕبکەمەوە. کارۆش کەڕەپانە[٨٨] مکوڕ بوو جێگەیەک لەنێو سەرمدا بکاتەوە و لێشی نەچێتەدەرەوە. هەر کاتێک چاوم دەتروکاند، شێوەی قۆڵە بەهێز و شانە پانوپۆڕەکانی لەودیو نیگامەوە دەمبینی و دڵەی وام هەبوو لە باوەشی ئەودابم یان سەرم لە سەر سینگی دانابێ و باسکەکانی من بپارێزێ. تۆبڵێی ئارەزووی پاراستنم لەگەڵ خۆشەویستی تێکەڵ کردبێ؟ یاخود هەر سادەوڕەوان خۆشەویستی بووە، دێیتە سەر ئەو باوەڕە، کە تۆ کەسێکت دۆزیوەتەوە، کە وەڵامی هەموو شتە پێویستییەکانی تۆی لا بێ؟

بە ورتەیەکەوە کە قەڵەمیشم لە لالێو گرتبوو گوتم: "هەر کاتێک ئەو لەو ناوە بێ من بۆنی کێشمەکێش دەکەم."

"کێ؟ کارۆ؟ تۆ هەم بە ساردی و هەم گەرمیش هەر فووی پێدادەکەی."

هەر وەک کەسێک ڕازێکی خۆی بدرکێنێ، ختووکەی بێ، بۆیە گوتم: "من لەوە دڵنیا نیم ئاخۆ بۆچی تۆ دەتەوێ ئەوەندە کاتە لەگەڵ ئەودا بەسەر ببەی؟"

---

[٨٧] Paul Haggis فیلمێکی سینەماییە ناوەکەی گوزارشتە لە ڕووداوی ئۆتۆمۆبێل، فیلمەکە بەوە دەست پێدەکا، بەڵام لەناو فیلمەکە باس لە پێکدادانی ڕەگەزیی نێوان هەردوو نەژادی سپی و ڕەش دەکا لە ئەمریکا.

[٨٨] کەڕەپ: لامل، نەسەلمێن، عیناد. کەللەڕەق.

"ئەوە لەبەر بەسەرهاتەکەی ئەو خۆیەتی.... سەرنجم بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ."

سەرم هەڵبڕی و گوتم: "بەوەی کوڕی خاپینۆکێکە[٨٩]؟ چەند سەیروسەمەرەیە کە باوکی لە ماڵی خۆی گاڵتەی پێبکرێ. دیارە خۆتواندەوەش دادی نەدا."

چیا بە دەم خوراندی لایەکی لووتییەوە گوتی: "پێموایە ئەم شتە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ کەس دڵخۆش ناکا. دیارە باوکی بۆ چەند مانگێکە لێرە نەماوە، بە گەشتێکی کار و بازرگانی ڕووی لە وڵاتانی کەنداو کردووە. لەوێوە پارە بۆ ژنەکەی لە تۆرنتۆوە دەنێرێتەوە. کەوابێ ئەو لە بارەی بزنسەوە کەسێکی سەرکەوتووە."

منیش گوتم: "گرەو دەکەم هەر لایەنی ناسنامە نییە کە باوکی کارۆ درۆی لە بارەوە کردبێ."

چیا باوێشکێکی هاتێ، ئینجا گوتی: "ئەو ژنێکی خواستووە ئەگەر هاتبا و پێشتر بۆی ڕوونببایەوە، لەوانە بوو ڕەتی بکردبایەوە، یان ئەگەر شتەکە بڤە نەبووایە ئەوا تەلاقی لێوەردەگرت."

منیش بە تریقەیەکەوە: "پێمخۆشبوو هەر هاتبا و بە دزی ژنێکی کوردی هەبووایە."

چیاش سەری هەڵبڕی و لێم ڕاما. "ئەمە چیرۆکەکەی خۆش دەکرد."

---

[٨٩] خاپینۆک: لەخشتەبەر، کەڵەکچی.

"له گوندێکی دوورەدەست، تێیدا کەس هیچ زمانێکی دیکەی نەدەزانی و منداڵیشی هەبوونایە، پێدەچو ئەوانیش کە گەورە بوون، ببوونایە بە پێشمەرگە."

"ئاگات لێبێ ئەو سەرنجانە لە بیرۆکەی سیناریۆکە لە یادگەت هەڵبگری." چیا سووربوو لەسەر ئەوەی، من بۆ سیناریۆی ئایندە ئەو تێبینیانە یادداشت دەکەم و بەهەندیان هەڵدەگرم، بەڵام هەرگیز وەهام نەکرد.

"بۆ بەپیرەوەچوونی شلێر تا تێرمیناڵەکە لەگەڵت دێم."

ئەویش سەری لەقاند. من و ئەو کە بەردەوام لە بەرانبەر یەکدی دادەنیشتین، هەر یەکەمان سەر بە جیهانێکی دیکە بووین. لەو کاتەی فیلمی پێکدادانیش تەواو بوو، پرشنگی خۆر لە ناوکەوی ناندینەکەی دا و بۆن و بەرامەی شیوە خۆشەکەش لە ناندینەکەوە هات و بە نێو ژووری دانیشتنەکەدا بڵاوبووەوە.

چیا گوتی: "خەریکە لە برسان دەمرم."

بلسیمە[٩٠]. منیش هەروەک دەربڕینە منداڵییەکەی لاسایم کردەوە، ئەمما تەنیا لە مێشکی خۆمدا، ئاخر خۆ ئەویش هەروەک من کەیفی بە یادەورەییەکان نەدەهات. ئەو کاتەی لە دەوری مێزەکەدا کۆبووینەوە، کارۆ بە خۆی و پرچە کەزیکراوەکەی لە پشتەوە و ئێسقانە چەماوەکەی پشت ملی لەبن تی شێرتەکەیەوە دیاربوو، گەیشتە بەردەرکە.

---

[٩٠] Belsima

لەسەر سفرەکە بردەیەکی لێوەهات: "ئممم. وای چەند بە تام و خۆشە..." تاسە و تامەزرۆیی کارۆ بۆ خواردنەکە وای لێ کرد بە دەمی پڕ لە خواردنەوە بێتە گۆ، دەنکە برنج بە زافەران لە دەمی بپەڕێ و بەر جینزە ڕەشەکەی بکەوێ. بە دەستم داوەپرچم بردنەوە پشت گوێم و دەموچاویشم سوورهەڵگەڕا. دڵە تەنیاکەم هەموو ئاماژە ڕەفتارێکی وەک بەڵگەیەک بۆ مەیلی من بە لای ئەودا لێکدایەوە، بەڵام هەر خۆم بە خۆمم گوت ئەمە مایەی بەزەییە، بیرکردنەوەیەکی ئاواتەخوازانەیە. هەرگیز پێشتر نەمدەویست بەمجۆرە نامرادانە لە لایەن کەسێکەوە پشتگوێ خرابام، ئای ئەگەر هاتبا و لەگەڵ هەر خەندەیەکی دڵم وەها نەکەوتبایە کوتەکوت.

کاتێکیش تێروپڕمان خوارد، لەسەر قەنەفەکە پاڵمان دایەوە.

"نازانم چۆن بۆ ئەو خوانەئاهەنگە سوپاسی ئەو دوانەتان بکەم."

چیاش بە چاولێداگرتنەوە گوتی: "ڕێگا ئاساییەکە قبوڵە."

ئیدی کارۆ یو ئێس بییەکەی لە بەرکی دەرهێنا.

کارۆ لەسەر لاپتۆپە زۆر خێرایەکەی زانکۆی تاران هەندێ کۆپلەی داونلۆکراوی نیشان داین. کۆپلە و بڕگەکان بە تەلەفۆنی دەست گیرابوون، بەڵگە بوون لەسەر توندوتیژیی حکومەت، کە چۆن دژی گردبوونەوە ئاشتیخوازانەکەی خەڵک وەستابوونەوە، ئەوانەی بۆ ئەوە خڕببونەوە وەک ئاماژەیەک بۆ ڕەتکردنەوەی هەڵبژاردنی سەرۆک، ئەوەی مقۆمقۆیەکی زۆری دەرهەق پەیدابببوو.

ڤیدیۆی سێیەم دڵەکوتەی وێخستم. ئاخر زۆر سەخت بوو بڕوا بەوەی بینیمان بکەین، شتەکەش دەستکردی دەرهێنەرێکی پلە

پێنجیش نەبوو. دیسان ڤیدیۆکەمان لێدایەوە، چەندین جاریش وەستاندمان، هەر سێکمان بە یەکەوە سەرمان بۆ لای شاشەکە هێنا.

لە جامی پاسی شارەوە، یەکێک ڤیدیۆی پیاوێکی جلڕەشی گرتبوو، دەمامکیشی پۆشیبوو، بە دوو تێلای دەستی هەڕەشەی لە خۆپیشاندەران دەکرد تا سەرکوتیان بکا. بە نێو دوو تڕومبێلدا بازیدا، هەرچی دەگەیشتە بەردەمی بە هەموو هێزیەوە خۆی پێدا دەکێشا. هەروەک نینجا ئێرانییەکان تێلای لە هەوادا هەڵدەسووڕاند، ئینجا بە کەللەسەری قوربانییەکانیدا دادەدا، هیچ نەدەوەستا تا حەسیرمەیدان نەکا و نەکەوتبانە بەردەست و پێی. ڤیدیۆکە لەوکاتەدا کۆتایی دەهات کاتێ کابرای تێلابەدەست لە تاقمێک سەرباز نزیک کەوتەوە، ئەوانیش بە گەرمی پێشوازییان لێکرد و دەستیان لە پشتی دا. خۆ ئەگەر هاتوهاوریان نەگەیشتبایە بەری عەرش هەر وام دانابوو یاری و گاڵتەکردن بێ، لێ گەلۆ حەیف، هاوار و نووزەیان لە جامی پاسەکەوە بە باشی دەبیسترا.

چیاش پرسی: "ئەرێ پاشاگەردانی باشترین دەرفەت نییە بۆ ئەو کەسەی نەخۆشی دەروونی هەبێ؟"

من و کارۆ سەیری یەکدیمان کرد؛ ئاخر وەڵامێکمان پێنەبوو، چیاش چاوی لەوە نەبوو وەڵامێک وەربگرێتەوە.

من هەڵسام و چوومە ناندین تا چایەک لە دیم بنێم. تا ئاوەکەش کوڵا لەوێ وەستام دیسان لە پەنجەرەوە سەیرێکی دەرەوەم کرد. لانەوازێک لە نێوان قەدی دارەکاندا لە پێکەنینیان کەوتبووە سەر گازی پشتێ، لە خۆشییان چۆکی لە زەوی دەدا، بە کەیفەوە بۆ

پێشەوە نوشتایەوە. بیرم کردەوە، ئای چەند ئاسانە کاتێ چەند بارە توشی ئەو تەوژمە شێتییە دەبی، هۆشت لە دەست بدەی.

کاتێکیش گەڕامەوە ژووری میوان، چیا لە بنمیچەکە و کارۆش لە ناوکەوەکە نزبووبوونەوە. بە هەمووان لە تاوتوێکردنی ڕەوشی ئێران شەکەت ببووین، دارمانی دۆخی سیاسی و ئابووری و کلتووری بێ ئومێدی کردبووین.

کارۆ بەسەر هەژاندنێکەوە گوتی: "ئێرە تامی ژیانی تێدا نەماوە، چونکە لە خراپییەوە بەرەو خراپتر دەڕوا."

چیاش هەر ڕەنگێکی دەهێنا و دەبرد: "کەواتە، تۆ بڵێی هەستی مرۆ چۆن بێ کاتێ لێی دەدرێ؟ هەر لەبەر ئەوەی داوای بنەماکانی مرۆڤ دەکا، بکوژرێ."

کارۆش پرسی: "مەبەستت چییە؟"

"ئەرێ پێت وا نییە کە ئەو بێدەنگییە کوشندەیەی ئەم سێ دەیەی دوایی بە لای کەمییەوە بەشێکی هۆکاری ئەم پەلامارە دڕندانەیە بێ؟" چیا چاوێکی لە شاشەی لاپتۆپەکە کردەوە. هەرگیزیش نەمبینیبوو بەم شێوەیە ڕووبەڕووی کارۆ ببێتەوە. "کاتێک کەمایەتیی ڕەگەزی و دینی سەرکوت دەکرێن، هەرگیز لە خۆت نەپرسیوە، کە ڕۆژی تۆش دێ؟" جارێکی دیکە چیا بایدایەوە سەر برادەرەکەی و ڕاستەوڕاست تەماشای دوڕ چاوی کرد.

من هێدمەگرتی بووم.

"ئێمە... خەڵک هیوای هەبوو." بە دەم ئەم قسەیە قامکەکانی دەستی تەقاندن. "ئەوان بڕوایان بە چاکسازیی سیاسی هەبوو."

"چاکسازیی؟ ئەریٚ پێت وا نییە کە خەڵکی پەراوێزخراو مافی خۆیانە بەگومان و دڕدۆنگیەوە بڕواننە ئەو بەزمەی هاتۆتەکایەوە بەنێوی گەڕان بەشوێن دادپەروەریدا، بزووتنەوەی کەسک یان هەر شتێکی دی؟" دەنگی چیا بە پێچەوانەی وشە تاوانبارکردنەکانی نەرم بوو. "کەس نەهاتە ڕیزی بەرگریی سێ دەیەی ڕابردووی ئێمە دژی کۆماری ئیسلامی، بە پاساوی جیاخوازی و توندوتیژی ڕەتکرایەوە، چونکە شەڕەکە شەڕی هەژاران بوو."

کارۆ سەرپەنجەی پێیی لە نێو گۆرەوییەکەدا کە لەسەر مافوورە ڕەنگ خۆڵەمێشییە کاڵەکە بوو، خوراند. هەڵوێستی چی بوو؟ سەری بەرزکردەوە و سەرنجی چاوە پڕخوازەکانی منی کرد، بەڵام هەر ئەوە بوو سەیری دەمژمێرەکەی دەستی کرد. "چیا، ئەگەر بتەویٚ لە کاتی خۆی بە کلاسەکەت ڕابگەی، دەبیٚ هەڵسین و بڕۆین."

لە تووڕەییان ددانم لەسەر یەک گیرساندن و سیڕەیان هات. ئاخر هەر جارێک کارۆ لە ماڵمان دەرکەویٚ، ئەوا دەڕواتە شوێنێک و براکەشم لەگەڵ خۆی دەبا. "هەر بە ڕاستی دەمەویٚ بۆچوونت سەبارەت بە کۆمێنتەکەی چیا بزانم."

"باشە..." کارۆ قومێکی لە ئیستکانە چایەکەی خۆی دا. "باشە چی بڵێم؟" من بە بیٚ چاوتروکاندن چاوم تێبڕیبوو. چیا چووە ژوورەکەی خۆی تا خۆی بگۆڕیٚ. ئەو بە پێچەوانەی من ڕای خۆی هەبوو، هەنووکەش ڕەزامەندە، ئەو چاوەڕێی بەرسڤێکی لە کارۆ نەدەکرد، هەر هیچ نەبیٚ دەمودەست نا.

"ئەوەی چیا دەیڵێ ڕاستە. قسەکەی واتا بەخشە." کارۆ ڕدێنە یەک ڕۆژ هاتووەکەی خوارند. "هەر بە ڕاستی پێشتر بیرم لێنەکردبووەوە."

"چاکە، ئەوە شتێکە هەقە بیری لێبکەیتەوە ئەگەر هاتوو بڕیارت دا بۆ ڕەگوڕیشە کوردییەکەت بگەڕێیتەوە. خەڵک کە ئەمڕۆ بۆ خۆنیشاندان ڕژاونەتە سەر شەقام، کەچی ئەوێ ڕۆژێ لە بەرانبەردا کاتێ کەمینەکان قڕدەکران، بێدەنگ بوون. کەواتە ئەوە بۆ یەکێکی وەک تۆ چی دەگەیەنێ، بۆ ئەو کەسەی کە ناسنامەکەی نیوەکوردە و بەڵام وەک پیاوێکی شیعەی ئێرانی هەم و ماف و هەم زێدەمافیشی هەیە؟"

چیا لە دەرکەی ئەپارتمانەکە بانگیکرد: "من ئامادەم."

"ببورە، هێشتا ئەو پرسەم لەلا یەکلایی نەبووەتەوە." دوای ئەم قسەیەی کارۆ خۆی گەیاندە چیا، خۆی نوشتاندەوە تا قەیتانی پێڵاوەکەی توند بکاتەوە.

بە دەم گوتنی: "جارێ خواحافیز" چیا دەرکەی پێوەدایەوە.

بێدەنگی دوای خواحافیزیی بە هۆی دەنگی هەورەتریشقەیەکی گەورەوە شکا. ئیدی بە هەشتاو خۆم گەیاندە دەرکە و بانگمکرد" هەر دەبێ بڕۆی؟" چیاش بە هەر هەنگاوێک دوو پەیژەی دەبرین.

ئەو لە شوێنی خۆی وەستا و ئاوڕی لێدامەوە. "خۆ تۆ ئەمڕۆ ناچیتە سەر ئیش؟"

منیش سەرم بۆ بادا.

چیا گوتی: "من سێ چوار سەعاتی دیکە، هەر کاتێ وانەی کلاسەکەم تەواو بوو دەگەڕێمەوە."

دوای ئەوەی چەندین پەیژەی دیکەی بڕی بانگم کرد: "چیا" کەچی گوێی لێنەبووم. ئەمجارە دەنگم هەڵبڕی، بانگم کردەوە و چەند پەیژەیەکیش دابەزیم، هەر هاوارم دەکرد "چیا، چیا!" ئەو مەودایە هەوای تێدا نەبوو، بۆن گەنییەکی زۆر ناخۆشیش دەهات.

"گیان؟" ئەو لەبن تیشێرتی نوێ و جینزە ڕەش و پێڵاوە وەرزشییە سوور و سپییەکەی دلۆڤان دیاربوو.

"تکایە لە ماڵ بمێنەوە. من دۆغاوە[١١] لێدەنێم، هەر خواردنێکت بوێ بۆت ئامادە دەکەم." وچانێکم دا، دیسان تێهەڵچوومەوە: "ببوورە کە گوتم هێشتا ئامادەنیم تا یارمەتی پرۆژەکەت بدەم. هەنووکە ئامادەم." خینکە خینکێکم لێوەهات، دەستیشم بە شیشەبەندە ساردەکەی پەیژەکانەوە گرتبوو. ڕقم لەوە دەبووەوە، کە نەمدەتوانی بەسەر ترسەکەمدا زاڵ ببم، بەوەی چیام بەو مترووبوونەوە پێیەوە هیوابڕاو دەکرد. ڕقم لەوە بوو چەند مایەی بەزەییم، بەڵام خۆ ئەو تاکە شتی ئەم دونیایە بوو بۆم. "خۆت دەزانی دەرچوون لێرە سەلامەت نییە. تکایە چیا، مەچۆرە دەرێ."

چیا لە دوایین پلیکانەوە سەری بەردایەوە، چاوی لە کارۆ کرد پاشان نیگای لە من بریەوە. "ئاخر خۆ ناتوانم کلاسەکەم لەدەستبدەم." ئەم شتەش ڕاست بوو، گەڕانەوەی بۆ قوتابخانە لە سەربازیی بەزۆر پاراست، بەڵام خۆ ئەگەر لە وانەکەی شکستی هێنابا، نەیدەتوانی لە دەست خزمەتی سەربازیی دەربازیبێ.

---

[١١] Dokhawa

کارۆش دەمی کردەوە تا شتێک بڵێ، بەڵام تەنیا زمانی گەیشتەوە لێوی سەرووی، ئیدی وشە دەرنەبڕاوەکانی خۆی قووتدانەوە. چیا بەسەر پەیژەکاندا هەڵگەڕایەوە، بە دەست چەناگەی گرتم، ئینجا هێدفۆنە کۆنەکەی لە کۆڵەپشت دەرهێنا و خستییە گوێم. هێدفۆنەکە بە MP٣یەوەکەوە بوو. ماچێکیشی لە نێوچاوان کردم. "گیان دڵتەنگ مەبە، هەر زوو دەگەڕێمەوە." کاتێک ئامێرەکەی پێکرد، لایلایەکەی شەهرامی نازری لە گوێمدا زرینگایەوە.

چیا ڕۆیشت و منیش گەڕامەوە لای پەنجەرەی ناندیکە و تا ببمە شایەت بەسەر دەربڕینێکی تەواو سەخڵەتەوە. ئەو پیاوە شەپڕێوەی سەر شەقامە بە داروبارەکە پرچی خۆی دەردەهێنا، سەیری دەستە چەپ و ڕاستی خۆشی دەکرد، سەریشی دەهەژاند. ئینجا هاتەسەرچۆک و سەری بۆ دواوە بردەوە و لەگەڵ ئاسمان بەو نمەبارانە کەوتە قسە. تامەزرۆبووم گوێم لە وشەکانی ببێ، گوێم هەڵخست، بەڵام لەبەر گرمەگرمی ترومبێلان کە بەسەر دەنگی ئەو کەتبوون، گوێم لێینەبوو.

"گوێ مەدەرێ،" هەندێک خۆم لە پەنجەرەکەوە شۆڕکردەوە و پڕ بە دەنگم لە نهۆمی چوارەمەوە بانگم کرد: "خەم مەخۆ، باش دەبێ." کامێراکەم دانایەوە، دەستم لێک دان و هاوارمکرد: "ئێمە سەلامەت دەبین."

سەرباری بارانی بە خوڕ، ئەو بە ورتەورتەوە هەنگاوەکانی هەڵهێنان.

منیش پەنجەرەکەم پێوەدایەوە. بە هەناسەی ساردی خۆم لەسەر جامی پەنجەرەکە نووسیم "*هەموو شتێک چاک دەبێ*."

## بەندی هەژدە

تارماییەکە بەرەو لای من غاریدەدا. کاتێکیش بایی خۆی لێم نزیکبووەوە تا جەستە بە گوللە ئەنجن ئەنجکراوەکەی ببینم، ناسیمەوە، خۆی بوو، بابە بوو. لە سامناکییان چەند هەنگاوێک کشامەوە دواوە. ئەویش بە پاڕانەوەوە هەر دەیگوت: "دەی کیژم، شان بدە بەر شانم، هەڵمگرە." من ئەوەندە شپرزە بووم دەربەستی ئەوە نەدەهاتم سەیری جەستە هەلابەهەلاکراوەکەی بکەم، ئەوەندەش لاواز بووم بارتەقای قورسایی ئەو نەدەهاتم هەڵیگرم. ئیدی هاوارم کرد: "چیا ، کوڕە چیاگیان." براکەشم تەرمێکی خوێناوی بە کۆڵدا دابوو، بە دەنگەوە، بە دەنگێکی بەرزیشەوە نامەیەکی ماتەمبارانەی دەخوێندەوە. دڵیشم لە ماوەی نێوان وچانە دوورودرێژەکانی نێوان دوو ترپەدا خەریکبوو بتەقێ. دەستم توند بە گوێی خۆمەوە نا، ئەوەندە توند گوشیم خەریکبوو سەرم بقەپێنمەوە.

منداڵان بە جلوبەرگی کوردییەوە سەمایان دەکرد و لە نێو تۆز و خۆڵی پیسدا یارییان دەکرد، بە دەوری سەرە خوێنلێهاتووەکەمدا پێچەبەدەورەیان دەدا، چاوەکانیان هەر کەیف و سەفایان لێدەڕژا، قلی و بلییان بوو. دەنگی تریقەی پێکەنینیشیان نەدەبیسترا. منداڵەکان شتەکەیان نەدەبینی، بەڵام من دەمبینی: ئای خوایە، من ئایندە دارماوەکەی ئەوانم دەبینی.

شەلاڵ لە بن ئارەقەدا بە قورگسووتانەوەیەکی زۆرەوە بێداربوومەوە و بەرەو حەمام ملم لێنا و یەک دوو مستە ئاوم بە دەموچاوی خۆمدا کرد. چیا نە لە ناندین و نە هۆدەکەی خۆی بوو. کە زەنگیشم بۆ لێدەدا یەکسەر دەچووە سەر تۆماری دەنگی. پرچی خۆم لە بنەوەڕا گرت، لە شوێنی خۆم بێ جوڵە وەستام تا ئەو هورژمەی نێو سەرم خاوبووەوە. میلی سەعاتیش سواری سەر یەک بووبوون، ئاماژەیان بۆ ژمارەی هەرە سەرەوە دەکرد. ئای لەوە، خۆ دەبووایە چیا بەر لە چەند سەعاتێک هاتبایەوە ماڵەوە.

هەرچەندی لەسەر ناوکەوەکە ڕاوێچکەم دەدا، هەرچەند سەیری سەعاتە خاوڕۆیەکەم دەکرد و لە جامی پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، ئەوەندە خەونە جوڕناوفرڕناکەم بە ڕاست وەردەگەڕا. تەلەفزیۆنم داگیرساند، ڤیدیۆیەکم لێدا، کتێبێکم کردەوە، هیچیان دادیان نەدا. سەیری ژووری چیام کرد، لەوێ ئەو یادنامەیەی لە نەخۆشخانە بۆی هێنابوم، کەوتبوو. منیش چاوم هەڵگلۆفتن و لەسەر ڕۆخێکی تەختی نووستنی دانیشتم. هەر لە گۆترە لاپەڕەیەکم هەڵدایەوە و ئەوەم خوێندەوە کە لە بلۆگەکەی خۆیشی بڵاویکردبووەوە، جیاواز بیربکەوە[٩٢].

*کچەکان بە دزییەوە مێژووی کوردیان دەخوێندەوە، قوتابییەکان لەسەر گردەکە لەنێو گوڵە کێوییەکان ئەڵقەیان بەستبوو، بەسرتەوە قسەیان دەکرد، پێدەکەنین و ئەوناملکەیان دەخوێندەوە کە من ئامادەم کردبوو. بەڕێوەبەریش لە پەنجەرەی نووسینگەکەی خۆی*

---

[٩٢] مەبەست وێبلاگەکەی چیایە کە بەو ناوەوەیە.

*چاوی دابوونێ، هەر وای دەزانی ئەم کچە گوندییە شەرمنانە دەرسی زانست دەخوێننەوە.*

*منیش لەگەڵ کوڕەکان تۆپی پێم دەکرد.*

*قوتابییەکان بانگی عەلییان دەکرد: "ڕۆ-ناڵ-لدۆ! ڕۆ-ناڵ- لدۆ!" ئاخر عەلی گۆڵی کردبوو، کەچی ئەو لە هیکەوە بەرەو سەر گردەکە غاری دا، لە ئێمە دوورکەوتەوە.*

*منیش بە داویدا ڕامکرد: "بوەستە، عەلی بوەستە! چی بووە بۆ وا دەکەی؟"*

کاتژمێرەکەی سەردیواریش هەر چرکە چرکی دەهات. سەعات یەکی بەیانی نیشان دا.

*"خۆ ئەگەر من هەر بە ڕاستی ڕۆناڵدۆ بم، ئەوا فەرهادیش لە ڕیزی پێشەوەی تیمەکەی من یاری دەکرد." عەلی بە دەم ئەم قسەیە سەردەستەی کراسی لەسەر دەمی خۆی دانابوو سەیری خوارەوە، سەیری چیمەنە پڕ لە گوڵاڵەسوورەی دەکرد.*

*منیش لە کورپێژگەکەم پرسی: "مەبەستت چییە؟"*

*من پێموابوو تینی ڕۆژ، یان هیلاکبوون وای لێکردەوە فرمێسک بەسەر دەستەی کراسەکەیدا ببارن. کەچی کاتێک گەیشتمە لای و لە بەردەمیدا نووشتامەوە، بینیم ڕوومەتەکانی سوورهەڵگەڕاون و چاویشی بوونەتە گڕکان.*

ترپەی پێ هات. غارمدا و لە کونی دەرکەوە سەیری دەرەوەم کرد. چیا دیار نەبوو.

*منیش بە نەرمی بە کورە بچکۆلانەکەم گوت: "عەلی گیان، ڕۆژێک دێ، دەبیتە یاریزانێکی مەزن. کاتێکیش ناودار و دەوڵەمەند دەبی، دەتوانی شتی زۆر بۆ گوندەکەت بکەی. ئەرێ چۆنە ئەوکات بۆ جەژنی نەورۆز سەر و جووت پێڵاو یان جلوبەرگ بۆ هەر منداڵێکی گوند بکڕی؟ خۆشە ها؟"*

*عەلی سەیرێکی ناو چاوی کردم. "دەتوانم وا بکەم. پارەش دەدەمە باوکی فەرهاد."*

*سوێند دەخۆم پێتێکم لەسەر هەنیەی عەلی بینی درەوشایەوە، خاڵەکە ڕێک لەنێوان هەردوو برۆیدا بوو. من هێشتا هزرەکانی خۆم کۆنەکردبووەوە تا وەڵامێک بۆ عەلی بدۆزمەوە کاتێ دیسان بۆ سەر کردەکە غاریدایەوە، دەستی بە دوولینگەکەی وەگرتبوو. خەریکبوو جەستە لەڕولاوازەکەی لەنێو گژوگیاکەی چیای ئاویاردا ون بکەم، ئەوسا تێگەیشتم مەبەستی چییە.*

بۆ پازدەهەمین جار زەنگم بۆ چیا و کارۆ لێدا، ئیمێلم بۆ کردن، کورتە نامەم بۆ ناردن. شەقامیش چۆڵ و هۆڵ. تاکە قەڵغانیشم بۆ ئەو کێوە سامناکییەی تووشی ببووم، تەنیا و تەنیا یادنامەکەی ئەو بوو.

*ئەرێ دەزانی ئاخۆ عەلی بیری لە چی دەکردەوە؟ ئاخر ئەگەر ئەو توانیبای کۆمەکی دارایی بابە کەمئەندامەکەی فەرهادی هاوپۆلی بکا، ئەوا کورەکە ناچار نەدەبوو قوتابخانە جێبێڵی و ڕوو لە خەلفەیی وەستای دیوار بکا، ئیدی بەو دەردەش نەدەگەیشت تا لە بیستەمین نهۆمی تەلارێکی شارەکە بکەوێت و بە مەرگی حەتمی خۆی بگا. ئای لەو منداڵانەی گوند، هەمیشە هەر سەرسامم دەکەن.*

*هەوەک جاران هەستم بە ئازاری گەدەم کردەوە. مەراقمام ئاخۆ هەندێ جار لەیلاش هەستی بەو بەو ئازارە دەکرد کە داودەرمانیش دادی نەدەدا.*

منیش گوتم: "بەڵێ، هەستدەکەم، براکەم من وام." ئاخر کاتێک مرۆ بە تەنیا دەبێ، بۆی هەیە بە دەنگی بەرز لەگەڵ خۆی بدوێ، وا نییە؟ خۆ ئەگەر یەکێک لە شوێنێکی گشتییدا وا بکا، بە شێتی دەزانن، بەڵام من تەنیام و لە تاریکیدام، لە بری هەڵکردنی گڵۆپ، بە لایتی دەستی، یادنامەکە دەخوێنمەوە.

*نازانم من چی بە کوڕێژگەیەکی دە ساڵی بڵێم، کە بە هۆی هەژاری برادەرەکەی خۆی لەدەستداوە. هێنانەوەی برگەیلێک لەو وتارەم، کە لە بڵاونامەیەکی دژەکولتووری مافەکانی مرۆڤ بڵاوکردۆتەوە هیچ ئاوێک بە ئاگری ناو دڵ و دەروونی ئەو کوڕێژگەیەدا ناکات، کە دەڵێم: "پێویستیی تەرخانکردنی خانەنشینی بۆ پەککەوتووان." یان "ویستی بەرتەسککردنەوەی کەلێنی نێوان دەوڵەمەند و هەژار."*

*تۆ بڵێی مەلولی و بێچارەیی مایەی ڕەنجانی ئەو دڵە بچکۆلە بووبێ؟ بێتوانایی لە ڕزگارکردنی وەرداشەکەی[٩٣] و سبەینێش لە ڕزگارکردنی خۆی و ماڵباتە داماوەکەی؟ تۆ بڵێی ئەوە بێدەسەڵاتییەکەی بووبێ کە بۆ یەکەمین جارە تامی بکا؟*

*"نەخێر وا نییە..." هەڵسامەوە و پڕ بە دەنگی خۆی بانگکم کردە عەلی: "عەلی خۆ ئەوە خەتای تۆی تێدا نەبووە."*

---

[٩٣] وەرداش: هاوڕێ. برادەر

*سەرە تاشراوەکەی ئەو وەک پنتێکی بزۆک و درەوشاوەی نێو گوڵاڵە سوورەکان لەبەر تیشکی ڕۆژ دەبریسکایەوە.*

هەڵسام و دەستم بە ڕاوێچکەدانی خۆم کردەوە، باسکی چەپەی خۆم هەڵتەکاند، لەبەرخۆمەوە بردەبردێکم لێوەهات، بە ناسۆرەوە دیاربوو لەو پیاوە دەچووم، کە تاقی بەیانییەکەی بە بەزەییەوە لە جامی پەنجەرەکەوە لێم دەڕوانی.

سێ جاری دی هەوڵمدا تا شلێر لەو سەرەوە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. "چی قەوماوە؟" دەنگی ئەو لەو دوورە کە لە کوردستانەوە دەگەیشتە من، باوێشکی خەوی پێوە دیاربوو، سووکە هەراسانییەکەیشی پێوە بوو.

منیش لە دەرەوە و ناوەوەی ئەپارتمانەکەم بەدەر لە تاریکی هیچی دیکەم نەدەبینی، هەروەک ئەوەی ئەستێرە ڕێگەی ماڵیان ونکردبێ.

کاتێک من وەلامی یەم پرسیاری ئەوم نەدایەوە، دیسان شلێر پرسییەوە: "چی بووە؟ ئەم جارەیان دەنگەکەی خەوالوویی پێوە نەمابوو.

"چیا تا ئێستا نە گەڕاوتەوە ماڵ و زەنگیشی لێنەداوە." خۆ ئەگەر براکەم لە شوێنێک گیری خواردبا ئەوا زەنگێکی هەر بۆ لێدەدام. سەرم هەژاند تا وێنەی ئەو نینجایانەی دوای نێوەڕۆیەکە لەسەر شاشە لاپتۆپەکە بینیم، لە مێشکی خۆمیان بسرمەوە.

"پێتوایە..." ئیدی شلێر ڕستەکەی خۆی تەواونەکرد.

خۆ ئەگەر چیا بریندا‌ریش بووبێ و بردرابێتە نەخۆشخانە، ئەوا تەقەلای ئەوەی دەدا پەیوەندییم هەر پێوە بکا. ئاخر بەڵێنی دابوو هەرگیز جارێکی دیکە جێم نەهێڵێ.

بەلام ئەدی ئەگەر گیرابێ....

بە هەنسکەوە گوتم: "نازانم بیر لە چی بکەمەوە." ئەوە هەر بەلامەکانن ژیان ئالۆزوبلۆز دەکەن. بەلام لەسەر بەلام، بەسەر یەکەوە چینێک لە ترسوبیم دروستدەکەن.

تەلەفۆنکردن بۆ ئەو مەودا دوورە گران دەکەوت. قسەکردنیش دژوار بوو. من و شلێر گوێمان لە دەنگی هەناسەی یەکدی گرت. هەردووکمان دەمانزانی خۆنیشاندەرە بە گوللە زامدار وپێکراوەکان کاتێک دەگەیەنرێنە نەخۆشخانە بەرلەوەی چارەسەریان بۆ بکرێ، هێزی چەکدار دێت و دەگاتە سەریان و لەگەڵ خۆیان ڕاپێچیان دەکەن. هەردووکمان ئەوەشمان دەزانی، تەنانەت هەندێ جار پارێزەرانی خۆنیشاندەرانیش لە زیندانێ دەپەستێنران.

شلێر ئەم قسەیەی کرد "بەڵکو پاتری مۆبایلەکەی مردبێ." بەلام لەرزینی دەنگی شتێکی دیکەی دەگوت.

بن نینۆکەکانم خوێنیان لێدەهات. "برادەرەکەی خۆیشی، ئەوەی لە سەرووی نهۆمی ئێمەوە دەژی، ئەویش لە ماڵ نییە. چووم و لە دەرکەیم دا."

"کەواتە ئەمە شتێکی باشە. هەر هیچ نەبێ چیا بە تەنیا نییە. لەوانەیە خۆیان لە شوێنێک شاردبێتەوە، بەڵکو چاوەڕێی ئەوە بکەن تا قەدەغەی هاتوچۆ هەڵدەگیرێ."

هەڕەشەی فرمێسک تۆقاندمی. ئەم هەڕەشەیە تەپڵی سەرکەوتنی سەلمێنەری ئەو سامناکییە بووکە دەمویست بەسەریدا زاڵ بم. "تۆ ڕاست دەکەی. ها کە چیا وەژوورکەوتەوە بە خۆی و بیانوویەکی باشەوە بۆ دواکەوتنەکەی. ئەوە منم لە خۆمەوە نەخشەی لێ دەدەم. هەر ئەوەیە."

"لەیلا، ئاساییە بترسێی. بەیانی بە یەکەم پاس دێمە تاران، تکایە هەر خەبەرێکت زانی، زەنگم بۆ لێبدە."

"باشە وا دەکەم."

بە خۆمم گوت، ئێستا دەچم دوشێک دەکەم. کەچی لەگەڵ شامپۆدا ئەسرین و ئارەقە و ترسوبیم بەسەر جەستەمدا دادەبارینە خوارێ، بەڵام خۆ ئەوان لەگەڵ تەوژمی ئاوی دوشەکە ڕۆیشتن، ئیدی حیساب نەدەکران.

لەو نێوەشدا بە پەشتەماڵێک جەستەی خۆمم وشک کردەوە و لەسەر پێخەفەکەم پاڵکەوتم، میلی کاتژمێریش سێ و نیوی بەرەبەیانی نیشان دەدا. کۆنە هێدفۆنەم خستە گوێ و دوگمەی هەڵبوونی لێدانی موزیکەکەم داگرت. لەگەڵیدا گۆرانییەکەم دەگوتەوە: "لای لای، لای- لای." پرچیشم بالیفەکەی[٩٤] تەڕکرد.

بە چاوی نووقاوەوە خۆم لەگەڵ چیا بینییەوە یاری پۆلیس و دزەکەمان دەکرد، ئەو ڕۆژانەم هاتنەوە بەرچاو، کە ڕاوەدووی منی دەنا و هەرگیزیش نەمدەگەیشتێ. جاری وەهاش هەبوو کاتێ هەندێ چیرۆکم لە خەیاڵی خۆم بۆ دەگێڕایەوە، لێم دەپاڕایەوە بەڵکو لە

---

[٩٤] بالیف: سەرین.

چەنگ گورگەکانی قوتار بکەم. بۆ نازهەڵگرتن ئەو سەرە بچکۆلەیەی لای زۆپایەکە نزیکی دەکردەوە تا گەرم دابێ و خۆی بە ساختە وا بنوێنێ گوایە تای لێیە. حەکایەتی توتی و شوشەی ڕۆنی گوڵم هاتەوە یاد، سەد جار پێی دووبارە دەکردمەوە. یاخود حەکایەتی پاشا و کیژەکەی. ئاخر خۆ کیژی پاشا کیژێکی بەد نەبوو. وێڕای ئەوەی دایکە و بابە وایان لێکردبووم و خۆشم هەوڵمدەدا بێمە سەر ئەو ڕایە، کە من کەسێکی بەد بم، لێ متمانەم بە خۆم هەبوو وا نیم. هەرگیزاو هەرگیز. کەچی ئەمشەو هەردووکیان لەسەر ئەو بە سەرمدا دەقیژێنن، کە نەمتوانیوە ئاگام لە براکەم بێ.

وا بوو چیا منداڵی من بوو، ئاخر من گەورەم کردبوو، بەڵام خۆ تەنیا هەر منداڵ نەبوو. ئەو برا پارێزەرەکەم و باشترین هاوڕێ، تەنانەت باوکیشم بوو. هەروەها ئەو یادگارێکی سەردەمی منداڵیم بوو، یادگاریی ئەو ڕۆژانەی نە سەرئێشە، نە ترس و تۆقینمان دەزانی، ئەو ڕۆژانەی نە خشتە هەبوو نە قەرز و نە ڕقوکینەش. گۆرانییەکە بە هیدفۆن هەر دەیگوت: "لای...لای... لای." کاتژمێرەکە چوار جارانی لێدا. بە دەنگێکی بەرز، ئەوەندە بە دەنگ هەموو شتێکی ناوماڵەکە گوێی لێدەبوو، گوتم: "چیا دێتەوە، دوای خۆرهەڵهاتن ئەو دەگەڕێتەوە ماڵێ."

## بەندی نۆزدە

دەمژمێر لە چرکەی خۆی نەدەکەوت. منیش لەسەر ڕۆژژمێر ڕۆژەکانم دەژماردن، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە تا سی و یەکەمین ڕۆژ، ئینجا لاپەڕەی ڕۆژەکانی هەر مانگێکم دەدڕاند کە ڕادەبرد.

شلێریش لە گەڵمدا لەم کەس بۆ ئەو کەس، لەم باڵەخانە بۆ ئەوی دیکە غارمان دەدا: هەرچی نەخۆشخانە، پەناگە، قوتابخانە، پۆلیسخانە، زیندان و گرتووخانە، هەر کوێیەک و هەر کەسێک پێمان وابێ سۆراغێکی چیا و کارۆیان لایە سەرمان پێدادەکرد و لێمان دەپرسین. نووسین و پۆستەری سەر دیوارەکانی شارەکەش وەک ئێمە ئەوەندەی بگەڕێین بە جۆش و نارێکوپێک بوون، تەنانەت هەندێکیان هەر نەشدەناسرانەوە، ئەو نووسینانە سەیر و سەمەرەبوون، تێکەڵەیەک بوون لە ئەستێرەکانی هۆلیود، بە سپرا لەگەڵ دروشمەکانی دژ بە ئیمپریالیزم و ئاینزا و زیندانی سیاسی تێکەڵاو بووبوون.

کاری ڕۆتینی نوێی من ڕۆژانە لەگەڵ گزنگی بەیانیان دەستپێدەکرد. لە فەرمانگەیەکی گەندەڵی میرییەوە بۆ یەکێکی دیکە ڕەوانە دەکرام. منیش لە شوێنی خۆم، لە چاوەڕوانی کاربەدەستێک گوایە بەڵێنیان پێداوم زانیاریی گرنگی سەبارەت بە سۆراغی براکەم لابێ، بێژمار لەسەر دەفتەرەکەم وێنەم دەکێشان. کاتێکیش لە دەرگای فەرمانگەکە دەردەچووم نیگارەکانم پارچەپارچە دەکردن و دەمخستنە زبڵدانەکەی بەردەرکە.

کاتێک بۆ یەکەم جار چیا دیار نەما، نامەم بۆ دایبابم نووسی گوایە ئەو بە بەرنامەیەکی خوێندن چووەتە دەرەوەی وڵات، چووەتە مالیزیا، ئیدی پێویستی بەوە نەدەکرد ئەوان بێنە تاران و ڕێگەی گەڕان و سۆراغ پرسینم بە دوای چیادا لێ بگرن. دەترسام فشارم بۆ بێنن، بەتایبەت کە ئێستا لەسەر لێوی خەرەندی تەنگوچەڵەمە بووم. بەردەوامیم لەسەر ئەو فێڵکردنە لە دایباب ئاسان بوو، چونکە تا ئێستا لەگەڵ یەکدا لە گفتوگۆدا نەبووین.

پێنجشەممەیەکی کۆتایی هەفتە، دوای ئەوەی بۆ چەندین مانگ لە شارەکەدا هەر لە گەڕان و سۆراخکردندا بووم، هێشتاش بە هیچ نەگەیشتبووم، هیچ زانیارییەکەم لەسەر سۆراغی ئەوان بە دەست نەکەوتبوو، ئیدی شلێر قەناعەتی پێهێنام بەوەی ئەگەر بمانەوێ هۆشمان لە دەست نەدەین، ئەوا پێویستمان بە ڕۆژێکی پشووە لە کێوی ئەلبورز هەیە. ئێمەش بەسەر کێوەکەدا، بە نێو تەڕاش و توولەڕێیەکاندا، بەسەر بەردە دێرینەکاندا هەڵگەڕاین، لەوێ لەسەر یەکێ لە گردەکاندا پشووومان دا. لەوێ لەناو دیمەنی دڵڕفێنی دۆڵە کەسکە هەزاربەهەزارەکەدا، هەوای پاک و سازگاری چیاکەم هەڵمژی، بۆنوبەرامەی داروبار و گوڵ و گوڵوکە کێویلکەکان و شنەباکە، کە لە دەموچاوی دەدام هەندێ هیلاکی و شەکەتی ڕەواندمەوە. ئەو گردانەی ئەوێ لە خەڵکی دڵخۆش و شادمان جمەیان دەهات، کەسانێک گۆرانیان دەگوت و لە قاقای پێکەنینیان دەدا، منداڵان لە بەینی خۆیاندا وردە سەمایان دەکرد و ژنانیش بە کەیف و سەفاوە لە دیاریان دانیشتبوون. هەرچی پۆلیسی ئاکارایش بوو نەیاندەتوانی خۆیان بگەیەننە سەر چیاکە، چونکە ترومبێلەکانیان

نەدەگەیشتنە ئەوێ و بە خۆشیان تاقەتی بەشاخداهەڵگەڕانیان نەبوو.

شلێر بە ڕوخساری پەمەیی بە هۆی هەوای سازگار و وەرزشەوە گوتی: "هەقە هەموو جارێ وا بکەین." بە دەم ئەم قسەیەوە لەچکەکەی لە پشت ملەوە قایمکردەوە و گوارە گەورەکەی بەدیارکەوت، ئینجا قسەکەی تەواوکرد: "هەست بە زیندوێتی دەکەم!"

منیش هەستم بە زیندوێتی کرد. بە هێواشی دابەزینەخوارەوە. چۆمێکی بچووک لەوێ بەدیارکەوت، لەجووڵەیدا واتایەکی بۆ هەبوونی خۆی دەدی نەوەک لە گەیشتنی.. لە دامێنی گردەکەشدا گوندێکی سەرنجڕاکێشی نائاسایی هەبوو، ناوی دەربەند بوو، پڕ لە چاخانە و فوارەی دڵڕفێن بوو، لە شاخەوانان جمەی دەهات. لەوێ لە هۆڵێکی ڕازاوە بە دەسکاری دەسترەنگینانەی ئێرانی، لە بەرانبەر دەستەخوشکەکەم لە سەر تەختەبەندێک دانیشتم، کە بە ڕایەخێکی ئێرانی داپۆشرابوو. شلێر بە ڕووکەش ئۆقرەگرتوو دیاربوو، بەڵام زۆر شەوان گوێم لێبوو هەر بە خۆی و بە تەنیا ئەو کاتەی لەسەر پێخەفی یارەکەی دەنوست، دەگریا.

ئێمە داوای کەباب، تکەی تەماتە و برنج و نانی سەنگەکمان[٩٥] کرد. ئەمە ئەو ڕۆژە بوو، حەزم دەکرد تۆمارم کردبا، بەڵام خۆ چیدی نەمدەتوانی قیستی مانگانە بدەم، بۆیە کامێرا کامکۆردەکەم بۆ دوکانەکە گەڕاندەوە و پارەی پێشوەختیشم فەوتا. ئاخر ئەو ڕۆژانە پارەکەم هەمووی بۆ بەرتیلی سکرتێرەکانی کاربەدەستە دەستڕۆیشتووەکان دەڕۆیشت، کە دیداریان سەبارەت بە سۆراغی

---

[٩٥] Sangak نانێکی ئێرانیە لەسەر بەرد و زیخی داغ دەبرژێندرێت.

براکەم بۆ ڕێکدەخستم، بەڵام هەر دەبێ بەرتیلەکەم بۆ ئەوان کەم بووبێ، چونکە زۆر لە کاربەدەستە گەورەکان ئامادەنەبوون بمبینن. منیش هەندێک پارەم لە جوانە قەرزکرد، ئەو دەستێکی ئارامبەخش بوو بۆ من و منیش تامەزرۆی بووم هەروەک ڕووەکێکی تێنوو بۆ ئاو. وزەی منیش ئەو ڕۆژانە لەوپەڕی جۆشی خۆی دابوو، ئاخر لەو هەفتانەی لە ژمار نەدەهاتن، هەموو بەیانیان لەگەڵ گەردی بەیانی هەڵدەستام و بەنێو شاردا دەسووڕامەوەو و هەموو ئێوارانیش لە کتێبفرۆشییەکەمدا کارم دەکرد و هەڵبەتە نیوەی شەوانیش دەگەیشتمەوە ماڵێ. شتەکەش ئاسان بوو، ئاخر خۆ دەبوو هەموو شتێک لە پێناو ڕزگارکردنی براکەمدا بکەم.

شلێر چاوی لێداگرتم. "ئێستا سەیری ئەولا مەکە، بەڵام ئەو پیاوە کەشخانەی لەوسەری چێشتخانەکە هەر تەماشایان دەکردین، ئێستا وا بەرەو لای ئێمە دێن."

منیش شانم بۆ هەڵتەکاند، شلێریش هاوڕابوو لەوەی خولق و حەوسەڵەی دواندنی هیچ کەسێکمان نییە، بەڵام ئەو کوڕە کەشخانە، پیاوی خوێندەواربوون و جێڵیان لە پرچییان دابوو و جلوبەرگی گرانبەهاشیان لەبەردابوو، ئەوەندە کەشخە و سەرنجڕاکێش بوون توانیان بێنە سەر مێزەکەمان لە شیشەکێشان هاومەجلیسمان بن. ئەوان هاتنە لای ئێمە دانیشتن، ئیدی هەر چوارمان شیشەی تام شوتیمان کێشا، شیشەکەشمان دەستاودەستی دەکرد، باسوخواسی میوزیک، ئەدەب هەروەها باسی ئەوەی چۆن ئێرانییەکان بە ژمارەیەکی زۆر کۆچدەکەن و هەر زووش غەریبییەکی قوڵیان هەڵدەستێ بۆ ئەو گوندەی کە ئێستا لێی دانیشتووین.

کاتێکیش ئەو دوو پیاوە زانیان ئێمە کوردین، بە پەرۆشەوە پرسیاریان سەبارەت بە سروشتی کوردستان لێکردین و گوتیان موزیکی ئێرانی چەند قەرزاربارى هێزوگوڕی گۆرانیبێژی کورد و ئاوازەکانیانن. ئینجا باسی ئەوەمان هێنایە گۆڕێ چۆن دکتۆرە کوردەکان، دکتۆر ئارەش و کامیار عەلائی، ئەوانەی لەسەر بەرەوپێشبردنی بەرنامەی فێرکاری ئایدز AIDS بۆ پیشمەندەکانی بواری تەندروستی بە تاوانی سیخوڕیکردن بۆ سی ئای ئەی گیراون. گەنجە هەرە کەشخەکەیان کە تازە گەیشتبوە بەهاری بیستەمی ژیانی، باسی لە پێویستیی پەروەردەیی سێکسی کرد، کە بۆ کۆمەڵگە شتێکی زۆر چارەنووسسازە و دایبابیش وا ڕەفتار دەنوێنن کە سێکسکردن لە دەرەوەی پرۆسەی ژن و مێردایەتی هەر بۆ دراوسێکانە و قوتابخانەکانیش بۆ هەرزەکان لە قەدەغەکردن زیاتر شتێکی دیکەیان بە دەستەوە نییە. هەرچی پیاوە بەتەمەنترەکەی دیکە بوو، کە لەسەرەتای سییەکانی تەمەنیدا بوو، لەو بڕوایەدابوو گەنجانی ئێرانی "لەنێو هەوەسدا ون و بۆ خۆشەویستیش برسین." منیش چیدی نەمدەزانی مەوداگرتن لە نیشانەیەکی پاکیزەییە یان پاشکەوتنە لە کۆمەڵگایەکی دینیی کە بە خێراییەکی شێتانە بەرەو مۆدێرنیزەبوون هەنگاودەنێ.

خاوەنی چایەخانەکە دەرچوو خزمێکی نزیکی پیاوەکان بێ، شەرابی سووری لە ئیستکانی چایەی دامەنزێڕ لەگەڵ شەکردانێکی پڕ لە کڵۆی شەکردا بۆ هێنایین. ئەوە بۆ من یەکەمین جار بوو لە شوێنێکی گشتیی مەشروب بخۆمەوە ئەویش لە نێو وڵاتێکدا کە لەسەر ئەوە فەلاقەت دەکا. کاتێکیش پۆلیسی ئەمر بیلمەعروف و نەهی عەن مونکەریش لەو کاتەی ڕۆژ وەک پرتەقاڵێک لە تاقی

ئاسماندا پرشنگی خۆی پەخشدەکرد دەهاتن، ئیدی دەمیان چەور دەکرا و بێ ئەوەی کەس هەراسان بکەن بە ڕێگەی خۆیاندا دەگەڕانەوە.

ئێمە 'چا'ی زیاترمان خواردەوە و گوێشمان لە موزیک گرت و لەگەڵ دەستەی گۆرانیبێژەکەش گۆرانیمان گوتەوە. تا دەهات دەمەتەقێکەشمان بەرەو نازونوزی دڵدارییانە دەڕۆیشت. ئەو شەوە من و شلێر زۆرپێکەنین. پیاوەکان هەروەک نەریت بوو پارەی خواردنیان دا، کاتێکیش ویستمان پارەکەیان بدەینەوە، بە سووکایەتی تێگەیشتن، پاشان هەر بە پیژۆی ٢٠٦ ئێمەیان گەیاندەوە ماڵ و ئێمەشیان بۆ پشووی پێنجشەمە لەسەر هەینی بانگهێشتی ئاهەنگێک لە ژێر زەمین کرد. کاتێک داوای ژمارەی تێلیان لێکردین، من و شلێر ژمارەی هەڵەمان پێدان و لە یەک دوو کۆڵان بەولاوەی ماڵەکەشمان دابەزین تا شوێنەکەمان پێنەزاننەوە. شتەکە وەها ڕۆیشت بێ ئەوەی بڵێی ئێمە وەک دوو کچ ئەو سەرچڵییە ناکەین لە ئاهەنگێکی تێکەڵە لە کوڕ و کچ ئامادە بین، کە ئەگەری ئەوە هەیە لەهەر ساتێکدا بەسەریدا بدرێ.

شلێر پرسی: "پاش ئەو هەموو هەفتە پڕ چەرمەسەرییەی ئەم دواییە، خۆ چیا بۆ رابواردنێکی پاکیزانەمان دڵی هیچ ناکا، تۆش پێتوانیە؟" ئەمەی گوت و قۆڵیشی گرتم کاتێک بە نێو شەقامەکەی کۆڵانی دراوسێماندا شۆڕدەبووینەوە و بەرەو ئەپارتمانەکەمان دەڕۆیشتینەوە، ئەو شەقامەی ئەملاو و ئەولای باڵەخانەی خەڵکانی چینی مام ناوەند بوون.

"دڵنیام پێی شتێکی ئاسایی دەبێ. دەی لەگەڵ ئەوەشدا با پێتبڵێم، کارۆ زۆر کەشخەتر و سەرنجڕاکێشترە." سەبارەت بە خواردنەوە و کەیفکردن هەستم بە خەتاباریی نەکرد.

شلێر بە لاقرتێیەکەوە گوتی: "ئەرێ دەکرێ چیدیکە باسی ئەو کابرایەی نەکەی. دەڵێی شتێکت لەگەڵیدا هەیە؟ ئۆو، یان کەوتوویتە داوی خۆشەویستی ئەوەوە؟"

"هیچ کامیان! چییە، ئەرێ شێت بووی؟ لەگەڵ وی ئاسمان و ڕێسمانین. خۆت دەزانی یەکەمین شت کاتێ چیا و کارۆ دەدۆزینەوە، چی دەکەین؟ یەک تۆن شەرابی خۆماڵی لە ماڵەوە دروستدەکەین. پەککوو ئەو شەرابە بۆ خۆشە."

ئەویش هاوڕا بوو. شەوەکەی خەوێکی ئارام و دوور لە خەونی جوڕناوفڕنام بەسەربرد.

کاتژمێر لێیدایەوە. هەر بە ڕاستی خۆ ئەگەر ڕۆژەکان هەر ناوێکیان هەبووبێ، ئەوا تەمموز و ئاب و ئەیلوول بۆ من بەرزەخێک بوون یەک لەوی دی داغتر.

هەرچەندی داماوی و بێچارەییم لەگەڵ لێدانی هەر دەرکەیەک بۆ سەروسۆڕاغ بە دوای براکەمدا زیادی دەکرد، ئەوەندە زۆر شلێر لێم دووردەکەوتەوە، داوای دەکرد بە خۆی و گەڕانە ئارامەکەی تەنیا جێیبێڵم، ئەوەشی ڕەتدەکردەوە ئاخۆ ئەم کردەوەیەی واتای چی دەگەیەنێ، پیاسەی دوورودرێژی دەکرد تا بەرگە بگرێ.

منیش لەسەر پەتی نێوان باوەڕ و سامناکی، لە نێوانی وروژاوی و شەپرەلێداندا[٩٦] بووم. هەرگیز ئەوەندە هەستم بە تەنیایی نەکردبوو. سەرباری ئەوەی هێشتا شلێر لە ژووری نووستنی چیادا دەڕازا، زۆر بە کەمی دەمبینی، تا دەهات کەلێنی نێوانمان بەرینتر دەبوو. هەرچەندە هەندێ جار مەیلی ئەوەم بۆ پەیدا دەبوو ڕاستییەکە بە دایبابیشم بڵێم، کەچی هەمیشە ئەوە ئاسانتر بوو هەر لەسەر درۆکەم بڕۆم، ئەمەش بەشێکی لەبەر ئەوەی تووشی ئەو دۆخە سامناکە نەبن، کە خۆم تووشی هاتبووم، بەشێکی دیکەش لەبەرئەوەی ئەوانیش هیچیان لەدەستنەدەهات بیکەن. دەشترسام لەسەر ئەمە لۆمەم بکەن، هەر یەکەیان لۆمەی ئەوی دیکە بکا، لۆمەی خۆیان بکەن، بە شێوەیەک تووشی حاڵەتی ترس و توقین بێن، ئەو کەمە هێزەی هەشم بوو لێم وەرگرنەوە، ئیدی بەیانیان هیچ هێزوگوڕی سۆراخپرسینم نەمێنێ.

هەبوونی جوانە هەندێ باری سەرشانی سووک دەکردم، بەڵام لە خۆم ڕانەدەبینی شارەکە جێبێڵم، ئەو شارەی براکەمی لێیە و چاوەڕێی ئەوە دەکا بیدۆزمەوە. خاوەن کارەکەشم چیدی ئامادەنەبوو گوێ لە هەوڵی گەڕان و سوڕانە بێهوودەکەم بگرێ، تەنانەت ئامادەنەبوو سەیری ڕوخسارە بزرکاوەکەشم بکا. تۆز و تەونە داپیرۆشکە باڵیان بەسەر ئەپارتمانەکەماندا کێشا، تەنانەت داپیرۆشکەکانیش لە من بێزاربوون لەوەی تەونەکانیان داگیر دەکەم.

هەشتا و شەشەمین ڕۆژ، لەکن یادنامەکە لەسەر زەوی دەستم لە چۆکان وەرێنان، ئینجا قاچم لێراکێشان. لەناو بێدەنگیی

---

[٩٦] شەپرە: پەککەوتەیی، ئیفلیجی. گۆدبوون.

ئەپارتمانەکەدا، بە پشتە دەست چاوم خوراندن و لە سەعاتە ئەلارمە زیوینەکەی سەر مێزی چیا رامام، نەمدەزانی چ هەستێکم هەیە بۆ ئەو چکەچکە بێوچانی کاتژمێر. کات دوو ڕووی هەبوو، هەم دۆست و هەم دوژمنیش. حەزمدەکرد خێرا بەرەو پێشەوە بڕوا تا جارێکی دیکە براکەم ببینمەوە دەست بە قوڕمیشی زەنگەکەوە بنێ و خامۆشی بکاتەوە و سەرینەکەش بەسەر دەموچاوە خەواڵووەکەیدا بدا. هەر ڕۆژێکیش بە هەواڵێکی متمانەدار ئاوادەبوو، دایدەچۆڕاندم.

دەرکە کرایەوە. بچمە ئاشناکەی شلێر خۆی بە ژووردا کرد. گڵۆپی ڕاڕەوەکەی لە پشتەوە داگیرسا، هۆدەکە بەهۆی دەرکەکردنەوەکەوە ڕووناک بوویەوە، ئیدی بیچمەکەی ڕوخساری خۆی وەرگرت. "وامزانی خەوتووی."

منیش گوتم: "هەر بە ڕاستیش ناتوانم بڵێم بێدارم."

ئەویش لای من دانیشت، سەرپۆشەکەشی بە دیواردا دا. "ئای لەو شتە پیسە خنکێنەرە."

منیش دەستم بۆ درێژکرد.

"خۆ ئەگەر ئەو لە زیندان بێ، ئەگەری زۆریش ئەوەیە هەر لەوێ بێ..." وەها هاتمە قسە: "پێمبڵێ زیندان چۆن چۆنییە؟ چەند سامناکە؟ شلێر، ببورە کە وا دەڵێم، بەڵام پێویستە بیزانم. تۆ لە یادت ماوە زیندان چۆن بوو؟ من دەزانم تۆ ئەوکات ساوا بووی، بەڵام خۆ هەر دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان دایکت بۆی گێڕابێتەوە؟ تۆ بڵێی ئەوان..." زمانم تەتەڵەیکرد، باش نەهاتمە گۆ، ئاخر هزرەکانم بۆ گۆکردن سامناک بوون؛ چیاش وەک بابە ئەشکەنجە دراوە، ڕووخێنراوە، سەرپشت و شان و ملی ئەویش بوونەتە جێنەخشەی قامچی. هیچ

شتێک لەوە زیاتر نەیدەتۆقاندم کە چیا ببینم – ئەو پیاوەی دەیویست تاوانبارانی کۆمەڵکوژی بە دادگا بگەیەنێ- هەروەک قوربانییەکی تێکشکاو بە وەنەوزەوە ڕێبکا.

ئەو تەوقی سەری ماچکردم و دەستێکی ئارامبەخشانەی بە سەر ملمدا هێنا. منیش لێگەڕام سەرم لە کۆشی ئەودا بگیرسێتەوە. ئیدی ئاوا کەوتە قسە: "من کیژۆڵەیەکی نازاندی بووم، لەناو کۆمەڵێک ئافرەتدا کە لەسەر لەباوەشگرتنم کێبڕکێیان بووە، یەکێ یاریی لەگەڵ کردووم، ئەوی دیکە جلی بۆ چێکردووم. تڕ و فسیشم دەبوویە مایەی پێکەنینیان. هەر چۆنێک بێ، جوانە پتر ئەو لایەنانەی زیندانی بۆ باس کردووم کە وێنایەکی وەهای نەداومێ زیندان شوێنێکی هێندە سامناک بێت، بە تایبەتیش بۆ کەسێکی وەک چیا. لەوێ لە هەندێ ڕۆشنبیر و چالاکی مەدەنیی بنەپیتۆڵ ڕاست دێی. لە نێو زیندان لەگەڵ هاوبیرە سیاسیەکانتدا هەڤاڵێتیەکی وا مکوم دێتەئاراوە کە لە دەرەوەی زیندان لە خەویشدا نایبینی. کاتێکی زۆتری دەبێ بۆ خوێندنەوە و نووسین. بێ لەوانەش، چما نابینی دونیای دەرەوەی زیندان چ بەهەشتێکە؟ کچێ چیا باش دەزانێ ئەم وڵاتە خۆی زیندانێکی گەورەیە."

منیش بە دەم فرمێسک سڕینەوە، کە هەندێکیش ئاسوودەبیوومەوە گوتم: "شلێر، سوپاس. خۆ ئەو لە کۆتاییدا هەر دێتەدەرێ. وا نییە؟ خۆ ئەوان بۆ هەتا هەتایە هەر لای خۆیان گلی نادەنەوە. تەنانەت ئەگەر ڕازی وتارە قاچاغ و بلۆگەکە و شتی دیکەشیان بۆ دەربکەوێ. کاتێکیش ئەو دەگەڕێتەوە ناومان، ئەوا

پێویست ناکا وەک باوکم بە ڕووی ژیاندا هەڵبشاخێ و قینی لێدابگرێ. دەمەوێ ئەو وەک جوانەی لێبێ."

شلێر منگەیەکی لێوەهات: "من بۆ ئەو بەدبەختیم هێنا." ئاخر ئەو لەو ڕۆژەی باوکی لەداردرا هاتبووە دونیاوە، هەرگیز لە بن باری ئەو گەندەباوەڕە دەرنەدەچوو.

"شلێر، ئەو لە ڕێی تۆوە ئەزموونی خۆشەویستیی پەیداکرد. من بە هۆی هۆگرییە زێدەڕۆییەکەمەوە ماندووم کرد. لەوانەیە ئەو ویستبێتی لە ماڵ بمێنێتەوە، ئەگەر هاتبا من بەبارگرانکردن هەراسانم نەکردبا."

"ئەرێ تۆ دەزانی چیا دوا سات چی پێیگوتم؟" کە ئەم قسەیەی کرد لە شوێنی خۆی هەڵسا و دەستێکی بەسەر پێخەفەکەدا داهێنا و پێیگوتم کەوا لەسەر گردەکە لەنێو گژوگیاکەدا دانیشتبوون، لەوێ بەدیار خوشینی هەورەکانەوە چیرۆکی خەیاڵییان بەسەریەکەوە دەنا: "شوانێک بە خۆی و کەردەمەڕێک[٩٧] بەوێدا ڕەتبوو، چیا گوتی ئیرەیی بە پەزەکان دەبا."

"نا ئەمە لەو ناچێ. ئەو شێر بوو شێر."

"ئەو گوتی مەڕەکان خۆشبەختن، ئاخر ئەوان لەبەر ئەوەی بەریتانیا و فەرانسە و ڕوسیا وڵاتەکەیان خەت خەت دابوو، نەیان دەناڵاند. هەروەها کەسیش زۆری لێنەدەکردن، هەر لەبەر ئەوەی بەراز دەسەڵاتدارە، ناچاربکرێن بە زمانی بەرازەکان بدوێن."

---

[٩٧] کەردەمەڕ: مێگەلە مەڕ.

"حەیرانی ئەو قسانەت بم چیا گیان." دیواری یادەوەرییەکانمان لەگەڵ چیادا نەیهێشتبوو من و شلێر بە پشدابکەوین. دەشمانزانی ئەوە هەوڵێکی بێهودەیە بۆ گۆڕینی حاڵەتە ناخۆیاکە بۆ شتێکی بەرجەستە و کۆنکریت تا بیخەینە سەر جۆخینی ئومێدە لاوازەکەمان. خۆی ئەمە حاشاکردنێکی نەزۆکانە بوو لەوە راستیەی زەندەقمان چووبوو.

دەستی شلێر لەبن سەری بوون، نیگاشی لەسەر بنمیچەکە، تروسکاییان لە کزیی دەدا. ئەو بەر لە گزنگ هەڵدەستا و بەسەر ئەو بەرزاییەی بەرانبەر ئەپارتمانەکەماندا هەڵدەگەڕا. خۆر هێشتا ڕمێک هەڵنەدەکشا کە ئەو دەگەیشتە سەری سەرەوە. جارێکیان لە پەنجەرەوە بەدزییەوە چاودێریم کرد، وەک سێبەرێکی بچووک دەچووەوە لە بەردەم شەبەنگەڕۆژی بەیانیدا.

پرسیم: "چ هەستێکت دەداتێ کە هەموو سپێدەیەک خۆت دەگەیەنیە سەر ئەو دوندەی؟

"خۆی شتەکە ئەوە نییە بگەیتە سەر دوند. پیادەڕەوی ئەو تراویلکەیەم لا دەخولقێنێ کە بەسەر ئازاردا زاڵبم."

منیش بە خەندەوە: "تۆ کوردێکی تۆخی." قسەیەکی باو هەیە دەڵێ: کورد لە چیا بترازێ دۆستێکی نییە.

شلێر بە توندی خویزی خۆی قووتدایەوە، تێکۆشا تا بەهێز بێ. "لەیلا، ناتوانم چیدی وەها بمێنمەوە، بەم شێوەیە ناگەمە هیچ. ئێمە ناگەینە هیچ شوێنێک."

"باشە، لەوە زیاتر چی دی بکەین؟ هەر شتێک خەیاڵی بۆ بچێ کردوومە." دیار بوو شلێر گوێی لێ نەبووم. ڕوومەتم لە ناوەوە

گەزتەوە، هەڵسام و دۆلابی چیام کردەوە، تا بۆنی بکەم، تا دەرەتانێک بدۆزمەوە گیانە وشک و برینگەکەمی پێ تەڕبکەمەوە.

"لەیلا، سەیری ئەمە بکە." شلێر لە پشت من وەستا بوو، ئاماژەی بە زنجیرەیەک لە چوار وێنەی سەر دیوار کرد، یەکێکیان لە ئابی ١٩٧٩دا لە سنە گیرابوو. وێنەکە هی کوردە گیراوەکان، ئەوانەی چاویان بەسترابوونەوە و بە شێلکەی گوللەی پاسدارانی شۆڕش تۆزی لێ بەبا کردبوون.

"زۆر بە وریایی تەماشا بکە. خۆی ئەمە ڕەوشی ڕاستەقینەی ئێمەیە." ئەو بە پەنجەی لە وێنەکانی دا وەک ئەوەی لەوێ شتێک هەبێ نەمبینی بێ. هەڵبەتە دەستڕێژی گوللەی چەندین ژێسێ بوون گۆشتی مرۆڤیان کون کون کردبوو. "سەیری ئێرە بکە، بزانە چیا چی نووسیوە."

پێشتر ئەم نووسینەی چیام بە ملیۆنان جار خوێندبووەوە. "لەگەڵ کەوتنی هەر کەسێکمان بە زەبری فیشەک، بەشێک لە شانازی و شکۆی ئێمەش دەمرێ. لەگەڵ هەر دێڕێک وەک پڕوپاگەندە لە دژمان چاپدەکرێ و لە ژێر نێوی موفسیدولئەرز - گەندەڵەکانی سەرزەوی- کە لە ڕادیۆ پەخشدەکرێ، بەشێک لە میراتی جێماوەی ئێمە وردوخاش دەبێ. ئێمە لە ناسنامەمان بێبەش کراوین، کاتێکیش نارەزایی دەردەبڕین لە ژیان بێبەش دەکرێین."

لێوە کرۆشتووەکەم دەجوویەوە و دەستم لەسەر قوڕگم دانابوو. "مەبەستت چییە؟"

شلێریش پرسی: "چی لەم چوار وێنەیەدا دەبینی؟"

لەوێنەکەدا ڕیزێک لاوی کورد بە چۆکداکەوتوون، لە شوێنێک لە نێوان زەوی و ئاسمان گیریان خواردووە. "دەبینم کە یەکەمین پیاو لە ڕیزەکە، لەکاتێکدا ئەوانی دیکە کەوتوون ئەو هێشتا ڕاوەستاوە. ئەمەیان کە دەستی ڕاستی لە باندیج گیراوە، ئەم ڕاوەستانە هێمایەکە بۆ مردن بەپێوە."

"لەیلا، نەخێر. سەیری جەلادەکان بکە. ئەوانە ئەو کەسانەن کە تۆ داوای یارمەتیان لێدەکەی."

مێشکم قوفڵ بوو.

"پێتوایە ئێستا بکوژەکان لە کوێن؟" ئیدی درێژەی بە قسەی خۆی دا. "ئەوانە ئێستا حوکمی وڵات دەکەن. هەر بە ڕاستی ئەوەیان لێچاوەڕێ دەکەی کە بەزەییان بە من و تۆدا بێتەوە؟

شلێر لەسەر هەق بوو. ئێمە هەر بە دەستی ئەنقەست خرابووینە دۆخی وندابیەوە. ئامانجیش ئەوەبوو ماڵباتەکان هەر لە مەراقدا بهێڵنەوە - بێبەشیان بکەن لە بەخاکسپاردنێکی شایستە، لە گۆڕێک بۆ سەردانیکردن، لە دەرفەتێک بۆ قبوڵکردنی واقیع و ڕاهاتن لەگەڵ دۆخی نوێ – تا هیوا لەسەر بێهوایی هەڵچنن و عەقڵ و هۆشیان بخەنە بەر هەڕەشە و بە هێواشی لەناو نائومێدیەکی پیسدا وشکهەڵگەڕێن. کاتێکیش گۆڕێکی بە کۆمەڵ دەدۆزرێتەوە و هەڵدەدرێتەوە، کە ئەمە لە کوردستاندا زوو زوو ڕوودەدات، ئەوا هەندێ ماڵبات لەنێو ئێسک و پروسکی ئازیزانیاندا ئۆقرەیی و دڵنەوایی دەدۆزنەوە، بەڵام هەندێکی دیکە، کە چاوەڕێی گەڕانەوە و دیداری نوێی کەسەکانیان بوون و ئەو ئومێدەیان کردبووە بیانوێک بۆ درێژە بە ژیان، ئەویشیان لێدەسەنرێتەوە.

"ئەرێ دەتەوێ من چی بکەم؟"

ئەوان بەڵێنی پووچت دەدەنێ و لەم فەرمانگە بۆ ئەویدیکەت دەنێرن. ئەوان باکیان بە ئازاری تۆ نییە. پێدەچێ ئەو نەفرەتییانە بە بینینی سەروسیمای داماوی خوشکی چالاکێک ڕەحەت بن و ئاویان بێتەوە."

منیش بە گریانەوە: "باشە هیچ دەرەتانی دیکەم هەیە؟ ماکیاج بکەم؟ بۆ زانیاریی لە بن دەرهێنان چاویان لێدابگرم؟ قەیدی ناکا شلێر، من هەر شتێک بێ دەیکەم. هەر شتێک! تەنها لە کابووسە وەخەبەر بێین و کۆتایی بێ. هەر ئەوەندەمان لەسەرە بە بەهێزی بمێنینەوە."

"هەندێ کابووس بە ناسۆر کۆتاییان دێ." ئەو بردەبردێکی لێوە هات، بەڵام گوێم لێبوو. "من دەبێ بڕۆم."

"بۆ کوێ؟"

"بۆ دەرێ، بۆ ناو کێوان."

"چی؟ ئەدی هەموو ڕۆژێ ناچیتە ئەوێ؟"

"مەبەستم ئەوەیە ببمە پێشمەرگە، بچمە شەڕ."

"بۆ؟"

"بۆ؟ سەیری دەوروخولی خۆت بکە. ئەوەی تۆ دەیکەی خۆکوشتنە. ئەوان سەرەنجام تۆش دەگرن. ئەم شتە هەمووی بێ سوودە."

لێوم بە بێ دەنگی جووڵان.

"لەیلا، بەم جۆرە سەیرم مەکە. من چی دیکە بەرگەی ئەو سووکایەتیە نەفرەتییە ناگرم. ئەگەر تۆ چەپگەرا بیت، دەتکوژن؛ ئەگەر چالاکوانیش بیت هەر دەتکوژن؛ تەنانەت ئەگەر هاتوو بڕوات بە هیچیش نەبێ و هەر بڵێی بەڵێ، بەڵێ گەورەم، هەر دەتکوژن. ئەگەر بە شێوەیەکی فیزیکیش لەناوت نەبەن، ئەوا ئەوەی لە دەروونتدایە، ئەوەی بیری لێدەکەیتەوە دەکوژن. لەیلا، من ئیدی گەیشتۆتە بیناقاقەم، پڕبووم لەو هەموو قانونانەی سەردەمی جەهالەت... لەم هەموو سووکایەتییە، لە هەموو شتێک. لەم وڵاتەدا ئێمە مرۆڤی پلەدووین. ئێمە هەم ژنین هەم کوردیش. من پێویستیم بە گێڕانەوەی هەندێ شکۆ هەیە، هیوایەک دەستی پێوەبگرم. دەمەوێ کاریگەرییەکی ڕاستەقینەم هەبێ، هەر بە ڕاستی بجەنگم. دەنا تووڕەییەکەم لێهەڵدەگەڕێتەوە و سەرم دەخوا. سەیرم کە، خەریکە لێرە دادەڕزێم. لە تۆ خێراتر دەپووکێمەوە." شلێر دەستێکی لە هەوادا ڕاوەشاند و درێژەشی بە قسەکەی دا: "خۆ من هەر دەمرم دەمرم، ئەدی باشە بۆ بە هەندێ شانازی و شەڕەفەوە نەمرم؟ باشە بۆ بەر لە مردنم هەندێ لە داگیرکەران نەتۆپێنم؟"

"من... من لە تۆ تێناگەم."

"باشە، لەیلا، لە چی تێناگەی؟ خۆ من ناتوانم هەموو ڕۆژێکی ژیانم سەر بەردەمەوە و بڵێم بەڵێ گەورەم بۆ حکومەتێک کە باوکمی لەسەر ئەوە کوشت خەباتی بۆ یەکسانی دەکرد و دایکیشمی خستە ژیانێکی کولەمەرگی هەر بۆ ئەوەی خۆی لە قاتوقڕیی دەرباز بکا و لە منیشیان دا و گورچیلەیان وێران کردم، هەمووشی لەپێناو هیچ، دواییش خۆشەویستەکەمیان ڕفاند. چما لە

نێو ئەو زبڵدانەدا بمێنمەوە؟ باشە تۆ لێرە هیوات بە چی هەیە، دەگەیت بە کوێ؟ باشە تا کەی دەسووڕێی و دەگەڕێی و سۆراغ دەکەی، تاکەی پارە بۆ کرێ لەم و لەو قەرز دەکەی؟"

منیش دەستێکم لەسەر سینگ دانا و گوتم: "تا ئەوکاتەی چیا دەدۆزمەوە."

"من و چیا هەمو کاتێک لەو بارەیەوە بە تێروتەسەلی قسەمان کردووە. ئەو کەسێکی ئایدیالیستە، پیاوی نووسین و ڕاڤەکردنە. لێ لەیلا، ئەمە شەڕێکی نەگریسە. ئێمە لەگەڵ ئێران و تورکیا تێکەوتووین نەوەک سویسڕا و کەنەدا. ئەرێ تۆ لەمە دەگەی؟ ئێمە دەبێ واقیعی بین. من زۆرم پێباشترە لە سەنگەرێکدا بکوژرێم لەوەی لەم زۆنگاوەدا بە هێواشی نغرۆ ببم."

"ئەی دایکت؟"

"ئەویش سەرەنجام دێتە پاڵم. لەوانەیە تۆیش بێیت. کاتێک وەک من لە هەموو شتێک پڕ دەبی. بۆ کوێی دیکە سەری خۆت هەڵدەگری؟ دەچیەوە ژێر سێبەری دایبابت و ژێر باری یاسا و ڕێساکانیان؟"

منیش لاجانگم خوراند، ئەوسا پشتم بە دیوارەکەدا دا. "شلێر خۆ تۆ ناتوانی هەنووکە دەستبەردارم بی. تۆ دەبێ لەگەڵ مندا بمێنیتەوە. جارێ پێویستم بە کۆمەکی تۆیە بۆ دۆزینەوەی چیا. پاشان لەوانەیە هەموومان بە یەکەوە بچینەدەرێ."

لە کاتێکدا بە نێو ژورەکەدا ڕاوێچکەی دەدا بۆ جاری پێنجەم دەستی بە پرچیدا هێنا. هەر تەنیا دەنگی سیسرکە لە دەرەوە و

دەنگی هەناسەی ئێمەش لە ژوورەوە دەهات. "لەیلا، پێویستە تۆش ڕەگەڵم بکەوی. ئەمە تاکە ڕێگەیە بۆ تۆڵەکردنەوەی ژیانی چیا."

منیش قسەکەم پێبڕی: "تۆڵەی چی؟ تۆ وابیر دەکەیتەوە وەک ئەوەی.... ئاخر براکەی من لە ژیاندایە. هەر ئەوەندە بیدۆزینەوە. دەشیدۆزمەوە."

شلێر هەردوو دەستی لەسەر شانم دانان. "دەی هێور بەرەوە."

قیژاندم: "چیا ماوە! هەستی پێدەکەم. دەیزانم. لەوە ئەرخایەنم."

"ناکرێ دڵنیا بیت. تۆ پێتوایە ئەو خەڵکەی لە گۆڕە بە کۆمەڵەکاندا نێژراوەوە و لەعنەتاواش خێزانی زۆر خۆشەویستی خۆیان نییە هەروەک ئێمە چۆن چیامان خۆشدەوێ؟ ئەرێ تۆ پێت وایە ـــــ"

پاڵم پێوەناو و گوتم: "لە خۆت هەڵدە. دەی ئەو دەمە حیزەت دابخە. خۆ ئەگەر بە دوای یارێکی دیکەدا دەگەڕێی، بڕۆ بە سەلامەت."

"تۆ هەقە ئەو پرکێشییە بە جۆشەی خۆت بۆ ئەو زۆڵانەی ڕۆژانە لێیان دەپاڕێیتەوە هەڵبگری." بە دەم ئەم قسەیەوە چاوی ترووکاند و دەستی بە خۆیدا بەردانەوە وەک ئەوەی گرژیی ماسولکەی خاوبکاتەوە، ئینجا هەڵیدایێ: "ناتوانم چیدی بەرگەی ئەو دۆخە بۆگەنە بگرم. من تەواو لێی پڕبووم، چیدی ناتوانم بچمە سەر پێیانیش، لەهەموو شتێک بێزارو کەوڕێم، نەک هەر لە قەبزی و خوێن دیتن."

"کەواتە پێویستمان بە پزیشکێک هەیە. حەوجەم بە یەک دوو سەعات خەو هەیە. بەیانی پەرلەمانتارێک دەبینم، ئەو لە دۆزینەوەی

چیادا یارمەتیم دەدا." ئیدی جلم داکەند و چوومە بەر دووشی حەمامەکە، بە توندی کەللەی سەرم شێلا. کەفی سابوون تێکەڵی فرمێسکی داماویم بوو کە بەسەر دەموچاو و جەستەمدا دەهاتنەخوارەوە.

شلێریش بە سەرمدا هاواریکرد: "تۆ دەبەنگی، دەنا بەرلەوەی بچیەوە نێو ئەو زبڵخانەیەی دەرەوە خۆت نەدەشوشت."

تۆ بڵێی ژیانی چیا لەبەردەستی کێدا بێ؟ خۆ زۆر لە خانەوادەکان هەرگیز تەرمی منداڵەکانیشیان پێنادرێتەوە. بەختەوەرەکان ئەو ماڵباتانەن نرخی ئەو پازدە بیست فیشەکەیان داوە کە جەستەی خۆشەویستەکانیانی کون کون کردووە.

ئەژنۆکانم لەسەر کاشیی حەمامەکە خاوبوونەوە. هەستمکرد بە دەستێکی نادیار دەخنکێنرێم.

بە هەشتاو و هەڵەداوان لە بن دووشەکە هەڵاتم، هێشتا کەفاو لە پرچم دەچۆڕایەوە. بانگم کرد: "شلێر تکایە مەڕۆ، هەر هیچ نەبێ جارێ مەڕۆ." بەڵام خۆ شلێر لە هیچ شوێنێک دیارنەبوو. کۆڵەپشتەکەشی نەمابوو. پڕ بە قوڕگم هاوارمکرد: "شلێر!" کەچی هەر سەداکەم بوو بە دوای مندا دەنگیدایەوە.

## بەندی بیست

زۆر نابا براکەم و کارۆ دەگەڕێنەوە ماڵ و ئەوسا جارێکی دیکە بۆ شاخەوانیی تێهەڵدەچینەوە. لەبینینەوەی ئەو دیمەنە زۆر دڵنیابووم، لانیکەم تا خۆر بەدەرەوە بوو ئەوەم لەکن ڕوون و ئاشکرا بوو، پێش خۆرئاوابوون، بەر لەوەی شێتایەتی بپەڕێتە ناو دڵم. فڕێکم لە چایە ڕەشە بە دارچینیەکە دا، لەسەر ڕۆژژمێرەکەش نەوەد و سێ ڕۆژی پێواری[98] ئەوانی نیشان دا، مۆمێکی بخووردارم پێکرد و تۆزیشم لەسەر تەلەفۆنەکە تەکاند، ئاخر چەند هەفتەیەک بوو زەنگی لێنەدابوو. شلێریش هەرگیز نەگەڕایەوە، بەڵام پەردە و دۆلابی جلوبەرگ و کتێبەکان، هەموو شتێک کە چیا ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستی لێدابوون، بە بڕواوە چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەویان دەکرد تا بەگەڕبکەونەوە.

کاتێک پێخەفەکەی ئەوم لادا تا چەرچەفەکەی بشۆم، شتێک لە ژێرییەوە دەرچوو. ئەو یادنامەیە بوو کە چیا پێشتر نیشانی دابووم، یادنامەیەکی گەچراو، پەڕەکانی لۆچ بوون، پێشتر بە فرمێسکەکانمان شێدار ببوو، ئەو فرمێسکانەی لە شوێنی جیاجیادا ڕشتبوومانە سەری. کاتێ بۆ یەکەم جار چیا ون بوو، ئەو یادنامەیەم خوێندبووەوە، چەندبارە خوێندبوومەوە، بەڵام دواتر لێگەڕام شلێریش ببینێ و سەری بەسەردا بگرێ. پێموابوو شلێر لەگەڵ

---

[98] پێوار : نائامادەیی، ئامادەنەبوون، غیاب.

خۆی دەیبیا. ئیدی لەسەر ڕۆخێکی سیسەمەکەی دانیشتم و هەر لە گۆترە لاپەڕەیەکی بچووکم کردەوە.

*کوڕوکاڵ بە دزییەوە مێژووی کۆماری کوردستانیان دەخوێند، مێژووی پێشەوا، ئەو کەسەی دوای ئەوەی خەونەکەی هێنایەدی سەری لە پێناودا دانا، هەرچەندە هەر بە تەنیا یانزە مانگیش لە ساڵی ١٩٤٥دا درێژەی کێشا. عەلی بە دەنگێکی دلێرەوە بۆ هەموو کەسێکی دەخوێندەوە. قوتابییەکانیش بە بێدەنگی گوێیان لێگرتبوو و سەریان بۆ دەلەقاند. لەبەر تیشکی خۆریش چاویان نیوە نووقاو بوو. هەر کاتێکیش بەڕێوبەرەکەیان لێ وەدەرکەوتبا، ئەوا عەلی باش دەیزانی یەکسەر بابداتەوە سەر خوێندنەوەی دەرسی کلاسەکەی خۆیان.*

*قوتابییەکان دەستی یەکیان دەگرت و بە بازنەیەک دەجووڵان و گۆرانیان دەگوت. هەواڵی مەرگی شیرینیش وەک بەندوباوێک هات. خۆی دەبووایە شیرینیش یەکێ لە قوتابییەکانی ئەم قوتابخانەیە بووایە. هەر سێ مانگ بوو دووگیان بوو، ئیدی خۆی و کۆرپەلەی ناو زگیهەڵدایە نێو ئاگر. منیش بە لای کورسییە بەتاڵەکەی ئەودا تێپەڕیم، دەستم لەسەر ئەو رستەیەی لەسەر مێزەکەی هەڵکۆلیبوو، خشاند. نووسیبووی: "ئارەزووم بوو وەک ئافرەت لەدایک نەبووبام". دڵنیام ئەگەر بە هەژاری لەدایک نەبووبا خەریکی واژۆکۆکردنەوە دەبوو بۆ کەمپەینێکی ژنان.*

*عەلی لە پشت منەوە، هەر ڕێک لای مێزەکەی شیرین بەدیارکەوت و لە دێرە تاڵتامەکە ڕاما، کە کاتی خۆی کیژۆڵەکە بە*

*چەقۆ لەسەر مێزەکە هەڵیکەندبوو، گوتی: "مامۆستا[١٩]، ئەرێ بۆچی خۆی سووتاند؟"*

لەسەر پێخەفەکە خۆم گەوزاند، سیخناخ بەهەستێکی تێکەڵ لە ئازار و شانازی. حەزم دەکرد زیاتر بە برا بچووکەکەم بچم، دوورکەوتبامەوە لە گرفتە تایبەتەکانی خۆم و تێکەڵ بە کێشە و ئاریشەی خەڵکی دیکە بووبام. خۆر بە گەشی هەڵاتووە، تیشکەکەی لە ژوورەکە دەدا و پێخەفەکەی گەرم داهێناوە.

*دانی پێدادەنێم کاتێ قوتابییەکان بە مامۆستا بانگیان دەکردم، هەستم بە مەستی و شەیدایی دەکرد، ئەمە وایلێکردم بڕوا بەوە بکەم مامۆستایەکی ڕاستەقینەم، نەوەک خوێندکارێک لە ڕاژەی ناچاریی سەربازیدا، بەڵام هەناوم ئاگری تێبەربوو کاتێک ئەو کوڕێژگەیە گوتی بۆچی خۆسوتاندن، نەیپرسی بۆچی خۆکوشتن. تۆ بڵێی خۆکوشتنی لەکن ئاسایی بووبێ؟ یان هیچ نەبێ هەقی بەو کیژۆڵەیە داوە گیانی خۆی بستێنێ؟*

*منیش پرسیم: "لە خوێندنەوە بوویەوە؟"*

*"یەکێکی دیکە دەخوێنێتەوە. ئەرێ بۆچی بە ئاگر؟ چما؟"*

*دواجار کە سەروسیمای شیرینم بینی، جلێکی سپیی بووکانەی لەبەردابوو، کە کفنی بوو. چاوەکانی هەر ئازار و سکاڵای لێدەتکا. ئاخر باوکی بە پارە دابوویە پیاوێکی دەوڵەمەند و خواپێداوی تەمەن شەست و دوو ساڵان لەبەرانبەر قەرزێک کە هیچ ڕێگایەکی شک نەبینیبوو.*

---

[١٩] Mamosta

*گوندنشینان گوتیان؛ "زاوا حاڵخۆشه" ئەو دەرکی لە سەر خۆی گاڵەدا، لێنەگەڕا هیچ کەسێک موڵکە جوانەکەی ببینێ.*

*شیرین بە هەنسکەوە: "خۆ من تاوانبار نیم تا لە زیندانم بپەستێ"*

*دایبابی شیرین لە جیاتی زاوا هاتنە وەڵام: "شوکرێ خوای بکە، کە ئەو ئەوەندە تۆی خۆشدەوێ"*

*"خۆ وەنەبێ من متمانەم بە تۆ نەبێ، بەڵکو متمانەم بە پیاوەکانی ئەو ناوە نییە" ئەمە قسەی مێردەکەی بوو ئەم شەکرەی شکاند کاتێ پەردەکەی دادایەوە و هۆدەکەی تاریک کرد. ئەو دەیتوانی وا بکا، هەر چی دڵی بخوازێ بیکا. قانونیش ڕێگەی دابوو، هەموو مافێکی پێدابوو.*

*دایبابی لێم پاڕانەوە: "جەنابی مامۆستا قسەکانی تۆ... قسەکانی تۆ هەستێکی دنەدەرانەی باشی لا دروست دەکا"، بەڵام خۆ مێردەکەی ڕێگەی بە کیژۆڵەکە نەدەدا قسەم لەگەڵدا بکا.*

داوەپرچی بۆز لە سەرم هەروەک گەڵای خەزان وەرینە سەر رایەخەکە. کاتێک چیا دەدۆزمەوە پرچم بۆیە دەکەمەوە. بۆ ئێستاش لەچکەکەم ڕێگەنادا کەس ئەوە بزانێ کە من لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا دوو سەد ساڵ ژیاوم.

*عەلی مشتە چکۆڵەکەی بۆ سەروو و خواروو دەجووڵاند، داوای لۆژیک و دادپەروەری، داوای هەموو شتێکی دەکرد کە ئارەزووم بوو بتوانم بۆ ئەو و باقی منداڵەکانی دیکەی دابینبکەم.*

*"باشە بۆچی ئاگر؟ بۆچی؟"*

*ئەرێ دەزانی کەوا هەرێمەکەمان ڕێژەی هەرە بەرزی لە خۆسوتاندنی ئافرەتان هەیە؟ لەوێ، ئێمە ڕێژەی پێوانەیی نێودەوڵەتیمان تۆمارکردووە. سەرباری ئەو نەریتە دوور و بەردڕێژەی ئێمە لە فەرمانڕەوایی مێینە وەک دەسەڵاتدار، کەچی گۆڕاوین بۆ نەتەوەی ژنانی سوتاو.*

*دیسان دەپرسمەوە، ئەرێ بۆ ئاگر؟*

من دەتوانم بەرسڤی پرسەکەی بدەمەوە. ژنان کە تامی هەموو هۆکارێکیان بۆ ژیان لەدەستداوە، ویستوویانە دەهریبوونی پەنگاوی نێو هەناویان وەک مانیفێستێک بۆ دەرەوە نیشان بدەن. مەرگێکی کێفەڕاتبار شاهیدبوو بەسەر ژیانێکی کولەمەرگییەوە.

بە ئازارەوە فشارم خستە سەر باسکی چەپم و پەنجەرەکەم کردەوە. ئیدی تەمومژ تویژاڵێکی نەسمراوی لە نێوان ئاسمان و شارەکەدا پێکهێنابوو، دیاربوو فێنکایەتی بەهار ڕێگەی بۆ گەرمایە تاقەتپڕوکێنەکەی هاوین خۆشدەکرد. خۆریش هەڵاتبوو. بە زەحمەتییەکی زۆرەوە، هەندێ چایەم فڕکرد، بێباک لەوەی تامەکەی چۆنە یان نا، مەراقمام ئاخۆ کوێ مابێ تا لێیەوە سۆراغی چیا بکەم. ئەرێ شلێر لە کوێیە؟

*لە کۆتاییدا چاوم بۆ دوور هەڵبڕی و گوتم: "باوانم[100]، ئەو پەیامێکی ناردووە."*

*عەلی کۆڵی نەدەدا. "پەیام؟ چ پەیامێک؟" گەدەم پێچی کرد.*

---

[100] Bawanem

*عەلی دیسان پرسییەوە: "چ پەیامێک؟" ئەمەش خووخدەی عەلی بوو، پرسیارەکەی هەر دەگوت و دەگوتەوە تا وەڵامی دەستدەکەوت و منیش سەرەداوی وشەکانم لەدەستدابوو، حەیران مابووم، بەڵام تروسکاییەکم لە تەوێلی ئەو بینی و ویستم بیگەمێ، بە دوای چارەوسەرێکدا بگەڕێم. ئینجا لە بەردەم جەستە بچکۆلانە و عەقڵە گەورەکەی دانەویم و لەبری وەڵام بە ئاوازەوە ئەمەم گوت: "ئەرێ وا فیدای باڵات بم ئازیزم، ڕۆژێ چوار جارا[١٠١]..."*

*ئەویش گۆرانییەکەی بۆ هەڵگرتمەوە "لای- لای- لای..."*

"لای-لای-لای.." منیش بە منگەیەکەوە، سەریشم بەسەر یادنامەکەمدا گرتبوو، بۆنی کاغەزەکەم کرد. وێڕای ئەو ژان و ناسۆرەی بە نووسینەکەی بەڵگەداری کردبوو، بەڵام وشەکانی چیا مایەی چارەسەر بوون، هەر خۆشەویستی و مرۆڤدۆستییان لێ دەچۆڕایەوە.

لەسەر ئەو قەنەفەیە دانیشتم، کە چیا لەسەری دادەنیشت. هیچ کەس و شوێنێکی نوێ نەبوو تا بۆی بگەڕێم. هیچ سەرەداوێک نەبوو. گۆشەیەکی سەر قەنەفەکەم لە باوەش گرت و جوویم.

هێشتا کتێبەکانی چیا هەر لەسەر مێزی قاوەکە بوون. دوا ڤیدیۆی ئەو کە لەناو لاپتۆپەکەم هێشتبووەوە و لێمدا و دیسان لێمدایەوە. "ئۆو لەیلا گیان، خەون گرنگە، خەون دەیخوا. ئارەزوو گرنگە، ئارەزوو دەیخوا، ئەوانە بە هەند وەربگرە."

---

[١٠١] "Are wa fedai ballat bem aazizem rohze chowar jara . . ."

له ڕێی هێڵی ئەنتەرنێتی خاوی مۆبایلەکەمەوە، بە بەکارهێنانی فلتەرشکێنێک چوومە نێو تۆڕەکە، چوومە نێو ئەو ماڵپەڕانەی کە حکومەت سانسۆری کردبوون، هەر بەو خەتە چوومە نێو ئەکاونتە تایبەتییەکەی خۆم لە یاهوو، بینیم ئیمێڵێکم لە کەسێکی نەناسراوەوە بۆ هاتووە.

*لەیلا،*

*هەوڵمدا لە ڕێی کوشکی کتێبفرۆشییەکە بێمەلات، بەڵام لەوێ نەبووی. من و (چ) بە یەکەوە گیرابووین؛ فیلمی حکومەتمان دەگرت. ترومبێلێک بەسەر خۆپیشاندەران کەوت. ئێمە لە ئیتلاعات دەستبەسەرکراین، بەڵام دوای سێ هەفتە لە یەکیان جیاکردینەوە. من دوێنێ بەردرام. ئەویش هەر دەبێ بەم زوانە ئازاد بکرێ. هەر دەبێ سۆراغی بکەم. پێدەچێ ئەو گواسترابێتەوە زیندانی ئێڤین، پاشان بۆ زیندانی سنە، ئینجا دیسان بۆ ئێڤین. دەیدۆزیمەوە و ئاگادارت دەکەمەوە. خۆت بەهێز ڕابگرە.*

من ئیمێڵە سێ ڕۆژ کۆنەکەم خوێندەوە، خوازیاربووم ترپەی لێدانی دڵم لێم بگەڕێ تیشکۆی بیرمی بخەمەسەر. جارێکی دیکە بەر لەوەی لەسەر پارچەکاغەزێک تێبینییەکان بنووسمەوە، ئیمێڵەکەم خوێندەوە.

*تێبینی: هیچ وشەیەک دادی پەشیمانیم نادا کە من ئەوی ڕۆژێ ئەوم لەگەڵ خۆمدا لە ماڵ بردەدەر. ئەمە هەڵەی من بوو.*

*ک*

ئەمە لەخشتەبردن بوو. ئاخر ئەمە ئیمێڵە ئاساییەکەی کارۆ نەبوو. خۆی بە دڵنیاییەوە دەبووایە زەنگم بۆ لێبدا تا شتەکەم

پێڕابگەیەنێ، تا لەو ڕۆژە زیادانەی ژان و ناسۆر ڕزگارم بکا. خۆ ئەگەر نیگەرانی ئەوەبێ تەلەفۆنەکەی چاودێری دەکرێ، دەبووایە لە دەرکەی دابا و خۆی نیشاندابام. ئای لەوە، خۆ ڕەنگە واشی کردبێ، ئێ خۆم بە دەگمەن نەبێ بە ڕۆژ وەماڵ نەدەکەوتمەوە.

دوای ئەوەی دووبارە و سێبارە دوگمەی ئەسانسۆرەکەم داگرت، بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم، بە یەک هەنگاو دوو پەیژەم دەبڕی، تا خۆم گەیاندە نهۆمی دوازدەهەم و لە دەرکەی کارۆم دا. هیچ وەڵام نەبوو. ئیدی هەر ئەوکات بە بیرم هاتەوە، من لە هەژمەتان و هەشتاویمدا لە بیرم چوبوو لەچکەکەم ببەستم. دیسان هەر بەغار بە پلیکانەکاندا دابەزیمەوە، پرچی خۆم داپۆشی، ئینجا تێبینیەکەم لەسەر پەڕە کاغەزێک نووسی و لە ژێر دەرکەکەی کارۆوە خستمە ژوورەوە. "هەموو ڕۆژەکە هەر لە ماڵ دەمێنمەوە. هەر دەبێ بە زووترین کات قسەبکەین. وا دەمرم لە هەژمەتان."

چیا ماوە. لەنێوان سووکە هەستێکی دڵنەوایی و بەرەڵاکردنی ئاژەڵێکی سەرکێش دامابووم، پرچی خۆم گرت و ڕامکێشا، بە ڕیتمێکی ڕێکیش سەرم بە دیواردا دەکێشا.

ئای خوایە، چەند پێویست بوو کەسێک لە باوەش بگرم، بەڵام تاکە کەسم لە تاران هەر داپیرەم بوو، کە گۆڕستانەکەی چەندین کیلۆمەتر لە منەوە دووربوو.

ئیدی لە تەلەفۆنەکەوە هاوارم کرد: "جوانە. جوانە. جوانە. چیا ماوە. برادەرەکەی ئەو بەردراوە. ئەو ئیمێلێکی بۆ کردووم. هەر کاتێ ئەو لە زیندان تۆماربکرێ و جێگیر ببێ، دەتوانم پەیوەندی پێوەبکەم؛ دەتوانم سەری بدەم. ئەو درەنگ یان زوو ئازاددەکرێ."

تۆ بڵێی سزای ئەو کەسە چی بێ کە ڤیدیۆی دیمەنی کوشتن بە دەست حکومەتەوە بگرێ؟ ئەرێ چەند ساڵ زیندانی بۆ دەبڕێتەوە؟ ئەدی چەند قامچی لێدەدرێ؟

جوانەش لە تەلەفۆندا پێی گوتمەوە: "ئەڤینا من! ئای لەو هەواڵە خۆشە. ئەرێ برادەرەکەی ئەو وای پێڕاگەیاندی؟"

منیش وچانێکم دا. "نەخێر."

"بەڵام خۆ تۆ بە هەر شێوەیەک بێ، زانیوتە؟"

دڵم بە توندی لێیدا. پاشان لە پڕمەی گریانم دا. ئاخر نەمدەتوانی دڵنیابم. تۆ بڵێی جارێکی دیکە خۆم بخاپێنمەوە؟

"لەیلا گیان، باوەڕ بە دڵی خۆت بکە. تۆ ئەو هەموو کاتە دەتزانی ئەو ماوە و زیندووە، لە کاتێکدا کەس باوەڕی نەدەکرد مابێ. هەر تۆش ڕاست بووی."

منیش پەنجەرەکەم کردەوە و بەسەر شەقامەکەدا و پڕ بە گەرووم هاوارمکرد: "ئەو ماوە. براکەم ماوە."

## بەندی بیست و یەک

دیوارە بەردینە دووورودرێژەکەی زیندانی ئیڤین بە خۆی و تێلدڕەکەی سەرووی وەک بەربەستێک، ببووە دیمەنە ئاشناکەی پێش چاوانم. گەڵا ئاڵتونی و سووورباوەکان، چ ئەوانەی هەڵوەریبوون و چ ئەوانەی هێشتا بە دارەکانەوە بوون، وردە وردە سروشتی شارەکەیان لە کەسکەوە بۆ پڕتەقاڵی و زەرد دەگۆڕی. منیش لەو جادەیەی بەردەم زیندانەکە هەر دەهاتم و دەچووم، بە دوای چارەسەرییەک و هیوایەکدا بۆ ڕوودانی پەڕجوویەک وێڵبووم.

شلێریش لە چیای قەندیل مەشقی خۆی دەکرد و لە جڤاتە نوێیەکەیدا نەشونمای دەکرد. ئەو لەبارەی هاوڕێکانی؛ دەربارەی ئەوەی تا ژن ئازاد نەبێ کوردستان ئازاد نابێ، کە باوەڕی ئەو گەریلایانەبوو چووبووە ڕیزەکانیانەوە، هەروەها لەبارەی تۆپتۆپێن، لەبارەی ئاگرەخۆشە، لەبارەی ڕاو، لەبارەی تامی ناياب و دەگمەنی چایەی کتری ڕەش. لەبارەی ئەو شانۆنامە سەرەتاییانەی لە نێو خۆیاندا نمایشیان دەکرد، لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە بۆ نووسیبووم.

منیش پێمگوت چیا دۆزراوەتەوە. ئەویش هەندێ بیرۆکە و ناوی چەند کەسێکی بۆ پێشنیازکردم. منیش بریگرتەی زامنکارییم کۆکردەوە، پارێزەرێکی خۆبەخشیشم دۆزییەوە، تکامکرد و پاڕامەوە، لەبەردەم زینداندا مانمگرت، تەنانەت گەفی ئەوەشم کرد لەوێ ئاگر بەردەمە جەستەی خۆم، کەچی هیچ شتێک نەیخوارد و

دادی نەدا، بەڵام لە کۆتاییدا و بە پێچەوانەی ئەو ماوەیەی پێشوو، کە ڕۆژەکان زۆر سست و خاو دەڕۆیشتن، ئەم جارەیان کات تیژڕۆ ببوو، ڕۆژەکان خێرا تێدەپەڕین.

بە دەر لەو دوو ئێمێڵەی پێمگەیشتن، کە دووەمینیان دڵنیاییدا چیا لە ئێڤینە، کەچی ئێستا کارۆی بەردراو بە تەواوی خۆی لە هەوڵەکانی من بۆ پەیوەندیی پێوەکردن نەبان دەکرد. ئەو لەخۆشیدا برابەشمان بوو، کەچی ئێستا لە کاتی تەنگانە و زۆر پێویستدا خۆی ونکردووە. سەرباری ئەو هەموو شتەش، هەر ئامادە نەبووم ڕقم لێی بێتەوە. دەکرێ ئەو خۆ بە خەتابار بزانێ بەوەی ئەو لەبری چیا ئازاد کراوە، یان دەکرێ ئەو لەودیوی تراومای خەمۆکی زینداندا بێ. ڕەنگبێ ئەو بەم خۆبەدوورگرتنەی لە من، بیەوێ لە کێشە و بەڵای دیکە بە دووربێ. بەڵێ، هۆکاری ئەو هەر چی بووبێ، بەرە بەرە منیش ئەوم لەبیرکرد.

من چاوم بە ماڵباتی زیندانییەکانی دیکە کەوت و پەیوەندییم لەگەڵ دوو ژن و دوو کوڕ پەیداکرد کە هاوزمانم بوون. ئێمە وەها خۆمان بە یەکدی ناساند: خوشکی چیا، دایکی شیرین و ژن و کوڕەکانی فەرهاد. ئاخر ناوەکانی ئێمە ئەوەندە گرنگ نەبوو. ئێمە تەنیا بۆ ئەوە دەژیاین بەڵکو جارێکی دیکە زیندانییەکان بە ئازادی ببینینەوە.

ئەو ژنە و کەسانەی دیکە، کە لە ڕاڕەوەکە و لە ڕیزی نۆرەبەستندا تووشیان دەهاتم، هەژار و نەدار بوون و ئەو کاریگەرییەشیان نەبوو تا کێشەوبێشەکانی ئەم وڵاتە چارەسەربکەن. هەمو ئەوەی ئێمە دەمانکرد زاتدانەبەرخۆ بوو تا لە

بەرانبەر سەربازە چەکدارەکاندا بوێر و ئازا دەربکەوین. ئێمە هەروەک قوتابیانی قوتابخانە دەستی یەکمان دەگرت، چیرۆک و یادەوەریی زیندانییە خۆشەویستەکانمان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە. بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ببووینە پشتوپەنای یەکدی- کۆمەڵێک لایدە کە پەیوەندییەکی قووڵیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە، کەسانێک هەنسک و نزا و تووک و دوعایان بە یەکەوە بوو. هەردوو کوڕەکانی فەرهاد، هەورام و هەوراز خۆیان بە هەردوو لای دایکیاندا شۆڕدەکردەوە و بە بێدەنگی چاویان لە سەر ئێمە بوو، کە بە دوای قسە و هەواڵی ئەرێنیدا دەگەڕاین تا بە یەکدی بڵێین. ئامادەبوونی ئەو منداڵانە، بە خۆیان و چاوی گەش و ڕوخساری جوانیانەوە زاتیان وەبەر ئێمە دەنا.

ڕۆژانی سێشەممان دەمانتوانی داوای سەردانیکردن پێشکەش بکەین. ئیدی سەروسیما لە چاوەڕوانی دیدارەکاندا دەگەشایەوە.

پاسەوانە ڕیشدارەکە بە خۆی و ددانە کەوتووەکانییەوە مۆری لە داوانامەکەم دا، دەنگی مۆرلێدانەکەی هەروەک زللە وابوو.

"دیسان؟"

"براکەت تازەبەتازە هاتووەتە ئێرە." بە دەم ئەم قسەیەوە، دەستەسڕێکی سپی لە گیرفانی دەرهێنا و کەپووی کە هەر یەک دوو پەنجە لە من دوور بوو، فنکرد و سڕی.

منیش چاوم ترووکاند. "ئاخر خۆ براکەم سەد و دوو ڕۆژە گیراوە، ئەو هەموو ماوەیەش من نەمزانیوە هەر لە کوێ بووە."

"ئەرێ ئەو لووتبەرزییەت لە چییە؟" بە دەم ئەم قسەیەوە چڵم و بەڵغەمی خۆی هەڵکێشایەوە. ئینجا درێژەی بە قسەکەی دا: "ئەتۆ پرۆفیسۆر و مرۆفیسۆری یان چی؟"

منیش بە لای دەستە چەپ و ڕاستمدا ئاوڕێکم دایەوە، گەرماش گەیشتبووە گۆپکەی گوێم. "چی؟"

"سەردانکردن بۆ تۆ نییە، تا ئەو کاتەی فێر دەبی وەک ژنێکی شایستە بدوێی."

منیش پێیەکم لە پاردە چیمەنتۆکەی نێوانمان دا.

ئەویش لە شوێنی خۆی هاواریکرد: "دوای ئەو."

منیش لەچکەکەم بۆ پێشەوە هێنا، دەموچاوم بە هەردوو لەپی دەست گرت و لە باڵەخانەکە هاتمەدەرەوە. بە دەم ڕۆیشتنەوە کەوتبوومە دەریای هزر و خەیاڵاتم تا لە پڕ خۆم بە زەبەلاحێکدا کێشا.

"لەیلا!"

من کەوتبوومە بن باری ڕەشبینییەوە و ئەویش ئەوەندە گۆڕا بوو، ئیدی دەستبەجێ نەمناسییەوە، ئاخر ئەو قژە درێژەی نەمابوو کە لە دواوە وەک کلکە ئەسپ دەیبەستەوە، هەروەها کراسە قۆڵکورتە ڕەنگاورەنگەکانی جارانیشی لەبەردا نەمابوو. ئەو کراسێکی ڕەشی فەرمی لەبەردابوو، ڕەنگی پێستیشی لەبن چاوە هەنگوینییەکانی ئەسمەر بووبوو.

ئەو پرسی: "ئەرێ تۆ بۆ دیتنی چیا لێرەی؟ ئەو چۆنە؟" ئیدی دەربڕینەکانی سەر ڕوخساری کارۆ بە زەحمەت دەخوێندرایەوە و خۆیشی لە بەریەککەوتنی چاو بەدووردەگرت.

منیش بە دەنگێکی بەرز و لێبڕاوانە پێمگوت: "چیا ماوە و بەم زووانە ئازاد دەکرێ." هەروەک ئەوەی بە هەموو گەردوونی ڕابگەیەنم، کە دوای ئەوە چی دەکەم. ئەوە بوو سەری بۆ لای من وەرسووڕاند و لەبەر دەنگی بڵندیشم هەر چاو بوون سێرەیان لێدەگرتم و هەر مل بوو بۆ سەر من ئاوڕیان دەدایەوە. دڵیشم لە حەیفان خەریکبوو شەقی دەبرد.

لە کۆتاییدا نیگای کارۆم بە بێدەنگی بەرچاو کەوت. ژنی فەرهاد و منداڵەکانیش هاتنە دەوروخولم. کوڕەکان وەستان، مشتەکۆڵە تەیار و ئامادە لە سەرم هەڵبدەنێ. داکیشیان دەستێکی لەسەر شانم دانا. ئیدی هەرسێکیان لە کارۆ ڕامان، ئەویش دەمێکی خۆش بوو سەیری بەرپێی خۆی دەکرد. کاتێکیش لە دواییدا سەری بۆ من بەرزکردەوە، چاوەکانی تەڕ ببوون. ئینجا بەپەلە بێ ئەوەی متەقیشی لێوەبێ لە ئێمە دوورکەوتەوە. چاوی منیشی هەر بە دواوە بوون.

هاوڕێکەم دەستێکی لە ڕوومەت دام و گوتی: "ئازیزەکەم، تین بدە بەر خۆت.."

"منیش هەوڵدەدەم! بڕوام پێبکە. بە هەموو توانامەوە هەوڵدەدەم."

ئیدی ژنە باوەشی کردەوە، منیش بۆ ساتێک هەستمکرد، لە ئامێزی ئەودا ئارامم. دلۆڤانییەکەی ئەو، جوانەی بیرخستمەوە. کاتێکیش پاسەکەیان گەیشت، دایک و کوڕەکانی غاریاندا تا پێی

ڕابگەن. منیش وەستام، بە دوای ئەواندا سەیری هەرسێکیانم کرد، کە ڕۆیشتن. لە جامی پەنجەرەی پاسەکەوە دەستیان بۆ هەژاندم.

پاش دوو سەعات منیش گەیشتمەوە ماڵێ، هەر کەوچکم لەو سووپە وەردەدا کە پێش یەک دوو ڕۆژ لێمنابوو، بۆم قووت نەدەدرا. بیرم نەدەهاتەوە کەی بوو دواجار خواردنێکی چاکم لێنابێ. دایکەش تەلەفۆنی بۆ کردم و پرسی ئاخۆ کوڕەکەی کەی لە گەشتی دەرەوەی ئێران دەگەڕێتەوە، بە خۆشی و زەوقێکی وەها پرسیاری لێدەکردم وەک ئەوەی بیریچووبێتەوە نزیکەی دووساڵە قسەمان لەگەڵ یەکدی نەکردووە. بەوەش هەراسان بووم کە بابە و دایکە لە وەڵامە خاپینۆکەکەی منیان نەدەپێچایەوە.

جارێکی دیکە لە دەنگی لەرینەوەی مۆنایلەکەم سڵەمیمەوە.

*نەمتوانی ڕووبەڕو پێت بڵێم. ڕاستییەکەت پێ بڵێم، کە هەقە بیزانی. بە تەلەفۆنەکەی من شتەکەمان تۆمارکردبوو نەوەک هی ئەو.*

منیش ژمارەکەم نەناسییەوە، بەڵام خۆ سەخت نەبوو تا بزانم نێرەرەکەی کێیە.

*دەزانم ئەم ڕاستییە لە چاوی تۆ من خەتابارتر دەردەخا، بەڵام ئەمە هیوایەکم دەداتێ ئەویش بە زوویی ئازاد بکرێ.*

لە هیکەوە هەستم بە ئازارێکی لە ڕادەبەدەری سینگم کرد، ئازارێک هی بەرگەگرتن نەبوو، وەک ئەوەی سینگم بدەنە بەر چەقۆ. منیش لە تەلەفۆنەکە بە دەستی لەرزۆک، بە دەمی بەش و بە هەناسەیەکی بە دەنگ ئەوەم بۆ تایپکردەوە: "تۆ براکەی منت کوشت!"

لێ خۆ نەکرا دوگمەی ناردن دابگرم.

لەبری ئەوە، ئەم ڕستەیەم بۆ نارد: "ئینجاش تۆ ئازادی. ئەویش لە زیندان. سەردانکردنیش نییە."

ئەوسا بەسەر سەرینەکە لە هاوارمدا.

## بەندی بیست و دوو

زەنگی تەلەفۆنەکەم لە بەیانییەکی زوودا لێیدا، ئەم جارە هەواڵێکی خۆشی بە دواوە بوو. ماخۆی کتێبفرۆشییەکەم ویستی بمبینێ تا بپرسێ ئاخۆ دەتوانم لەم هەفتەیەدا فول تایم کاربکەم. خۆی سێ هەفتە بە سەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیبوو کە گوتی بۆ شەفتی تەواوی کارکردن خەبەرت بۆ لێدەگێڕمەوە. خۆی ئەمەش هی ئەوە نەبوو پیاوە پیرەکە لۆمەبکرێ، ئاخر تەنها داوای چەند ڕۆژێک مۆڵەتم کردبوو تا لەبەر دۆزی براکەم سەردانی ئەم و ئەو، ئەم شوێن و ئەو شوێن بکەم. کاتێکیش چوومەوە شوێنی کارەکەم، لەوێ چاوم بەو خانمە کەوت کە لە شوێنی من کاریدەکرد. ئەو جلێکی سپۆرتی دامەندرێژی لەبەردابوو، نینۆکەکانی خۆی بۆیەکردبوون و ژمارەیەکی زۆر کڕیاری لە دەورەی خۆی کۆکردبوونەوە، بەڵام فرۆش کەم بووبووەوە و ئەوانەی لەوێ خڕببوونەوە بۆ ئەو چووبوون نەوەک بۆ کڕینی کتێب.

کتێبە نوێیەکان سەرنجی منیان ڕاکێشا و حەزی دووبارە دیتنەوەی کڕیارەکانیش مایەی کەیف و خۆشی بوو. بە گەڕانەوەم بۆ سەر کارەکەم زۆر دڵخۆش بووم، بە حوکمی ئەوەی خاوەنەکەشی دەیەویست کاتی زیاتر لەگەڵ نەوە تازە لەدایکبووەکەی بەسەر ببا، داوایکرد بەڵکو بە فول تایم بچمەوە سەرکار. جارێکی دیکە سەرچاوەی داهاتم پەیدابووەوە و دەرفەتی ئەوەشم بۆ پەیدابوو بە بێ پارە کتێب و فیلمی نوێم دەست بکەون

تا بیانخوێنمەوە و تەماشایان بکەم. کاتێکیش چیا دەبینم ئەوا هەواڵی خۆشم لا دەبێ پێی ڕابگەیەنم.

کاتێک مووچەکەشم وەرگرت، بێ چەندوچوون قەرزەکەم دایەوە جوانە و بازاڕیی خۆشم کرد، بیرم کردەوە تۆ بڵێی چ شتێک بۆ زیندانی سیاسی باش بێ تا بۆی بکڕم و بیبەم. دیاربوو ئەوەی چیا زۆر حەزی پێبوو کتێب و کاغەز و قەڵەم بوو، هەمووشی قەدەغە بوون. ئەوەم باش دەزانی.

ئەم جارەیان یەکەمین سێشەممەی مانگ لە جاری جاران زوتر هات. هێشتا دنیا هەر تاریک بوو کاتێ لە ماڵ دەرچووم، چاکەتێکی سووکەڵەم بۆ چیا برد بۆ ئەو کاتانەی ڕێگەی پێدەدەرێ بێتە حەوشەی زیندانەکە. هەروەها دوو کراس و هەندێ جلی ژێرەوە و حەبی ئەسپرین و فڵچە و هەویری ددان شوشتن و شانەیەکم بۆی برد. بە نێو ئەو هەموو سەرنشینانەی پاسەکەدا خۆم کوورکردەوە و دیارییەکانم بە ڕوومەتم وەنان و ماچم کردن و گوتم: "لەگەڵ خۆتان خۆشەویستیم بگوازنەوە بۆی."

لە سەعات ٧:٣٠ی بەیانیدا کەسوکاری زیندانییان گەیشتبوون و ڕیزی دووورودرێژیان بەستبوو، هەرچەندە کارمەندانی نووسینگەی ڕێپێدان تا سەعات نۆ نەدەهاتن. منیش پاڵم بە دینگەیەکی هۆڵەکەوە دابوو، هەوڵم دەدا ئارام بم، بە شێوەیەک زیاتر لە براکەم بچم. تەلەفۆنەکەشیان هەر لە پرسگەی چوونەژوورەوە لێ وەرگرتبووم. ئیدی شتێکم نەبوو کاتەکەی پێ بکوژم. لەسەر هەموو ئافرەتانیش پێویست بوو لەنێو زیندانەکەدا عەبا[١٠٢] بەسەرخۆیاندا بدەن. عەباش

---

[١٠٢] Chadors

ئەو کفنە ڕەشە هەراسانە بوو کە هەر لە تەوقی سەر و دەموچاو و دەست تا قولەپێی دادەپۆشین. کاتێکیش لەنێو ڕیزەکە بە دەمارگرژییەوە دەجوولامەوە، هەر پێم لە دامەنی عەبای خۆم دەئالا.

ژنێک بە ڕوخسارێک لە شێوەی دڵ و چاوێکی ڕەشی قەترانی لە ڕیزەکدا لە دوای منەوە بوو. کیژۆڵەیەکی شەش ساڵانیش خۆی بە عەبایەکەیەوە گیرساندبوو. پێستەکانیان تاوەسووت بووبوو. ژنە بە زمانی عەرەبی شتێکی گوت، بەڵام من هیچی لێتێنەگەیشتم. ژنەکە فارسی نەدەزانی، کەواتە ئێمە بەدەر لە هاوسۆزبوون لەگەڵ یەک لە ڕێی غەمزە و بزەی دەموچاو هیچی دیکەمان نەبوو بۆ لەیەک تێگەیشتن.

جارێکیان دایکی شیرین لێیپرسیم، "ئەرێ بە فارسیی بە "کیژەکەم" چی دەڵێن؟" ئاخر ئەو ژنە هەرگیز نەچووبووە مەکتەبێ، فێری زمانە فەرمییەکەی وڵات نەکرابوو. ئینجا پێی گوتم کەوا چۆن کاتێک لە شیرینی پرسی، "باشی چاوەکەم؟"[١٠٣] بە کوردی پێی گوت، ئەرێ کیژەکەم چۆنی، سەلامەتی؟ کەچی پەردەی دیواربەندییەکە دادرایەوە و خەتی پەیوەندییەکە پچڕا.

دوای سەردانی پاشتر، کە دوای چەندین مانگ لە تکاو پاڕانەوە بۆی مەیسەر بووبوو، ئەو بە زۆری ڕوومەتی خۆی بە شووشە ئەستوورەکەوە وەنا و ماچیکرد. شیرینیش لە هاوزیندانی قاوشەکەی یەک دوو وشەی فارسی فێربووبوو، بەڵام خۆ دایکەکەی لە "خوبی؟"[١٠٤] -ئەرێ باشی؟- پتر نەدەزانی. ئەویش ئەم وشەیەی هەر

---

[١٠٣] Bashy kchakam

[١٠٤] Khoobi

دەگوت و دەگوتەوە، هەندێ لەو چەند وشەیەی فێرم کردبوو لەبیریچووبووەوە. ئیدی هەر خوبی و خوبی! "هەر جارێک بێمە سەر ئەوەی بڵێم "کیژەکەم" یان پرسیاری لێ بکەم ئاخۆ پێویستی بە چی هەیە، دەبێ زمانی خۆم قووتبدەمەوە." ئاخر کیژەکەی لە دادگایەک حوکمداربوو کە بە باشی لە زمانەکەیان نەدەگەیشت.

لە کۆتایدا لە سەعات یازدە و چارەک نۆرەی من هات تا داوانامەی خۆم لەگەڵ بڕوانامەی لەدایکبوونم پێشکەش بکەم. کاتێک هەنگاوم بەرەو نووسینگەکە نا، پێم لە عەباکەم هەڵنگوت و کەوتمە خوارەوە. ئەوانەی لە ڕیزەکەشدا وەستابوون، کە منیان بەم جۆرە بینی هەناسەی خۆیان ڕاگرت، خەمی ئەوەیان بوو مەبادا ڕەفتارە نەشیاوەکانم ببێتە مایەی ئەوەی دەرفەتی دیداری ئازیزانیان لە دەست دەربچێ. ژنە عەرەبەکە لە پشتەوەی من بوو، بە هانامەوە هات تا هەڵبستمەوە و لەوێ نەمێنم.

ئەو دەمەی کارتی شینم وەرگرت خۆری ئاسوودەییم هەڵات، ئەمە واتا ڕێگەیان دەدام لە پشت شوشەبەندێکی ئەستوورەوە دەموچاوی چیا ببینم و بە ئامێری تەلەفۆنیش گوێم لە دەنگی بێ. ئیدی دەستێکم لەسەر دڵم دانا نەوەک هەڵبەزێ و باز بدا، ئەوسا چوومە ڕیزی دووەم؛ خێزانە ڕێپێدراوەکان بۆ سەردانیکردنی کەسوکاریان، بەڵام هێشتا تەواو مسۆگەر نەبوو.

ئەو ژنەی لە پشتەوەی من بوو هێشتا هەر وەک بڵێی نزا بکا، لە حاڵەتی لاواندنەوەدا بوو.

ئەفسەرەکەش بانگی کرد: "ئەوەی دواتر."

لێ گەلۆ خۆ ژنە هەر لە شوێنی خۆی چەقی و نەجوولا، بە دەنگ گریا، بە دەستیشی گوێیەکانی خۆی گرتبوون، هەر بەملا و بەولاشدا دەکەوت، کیژەکەیشی سەیری دەکرد.

ئەفسەرە ڕیشدارەکە لە شوێنی خۆی هاواریکرد: "دەی بێدەنگ بە و دەمت داخە، دەنا بانگی ئاسایش دەکەم."

منیش هەنگاوێک لە ئەفسەرەکە چوومە پێش و ڕوونمکردەوە: "ئاخر ئەو ژنە لە شوێنێکی دوورەوە هاتووە."

پیاوە تووڕەکە بە قیزێکەوە سەیریکردم. بۆ ساتێک وام بیرکردەوە ئەو لە عەرەبی گەیشتووە و دەشزانێ کە من بۆم هەڵبەستووە.

"مشووری خۆت بخۆ و بەس، هەقت بەسەر خەڵکەوە نەبێ!"

کیژۆڵەکەش ڕاستەوخۆ نیگای تکاکارانەی لە من بڕی .

ژنەکەش هەندێک دوورکەوتەوە، سەرەتا تەماشای منی کرد پاشان تەماشای کابرای تایین. منیش بە تەتەڵەوە گوتم: "دەبینی... ئەم ژنە نەساغە. ئەو هەفتەی دادێ نەشتەرگەری دڵی بۆ دەکرێ دەیەوێ هەرهیچ نەبێ بەر لەو وادەیە، بۆ یەک جار چاوی بە مێردەکەی بکەوێ. تکایە مۆڵەتی پێنج خولەکی بدەرێ. دەی لەو ژنە و کیژەکەی بگەڕێ ببینن. خوا دەست بە باڵی تۆ و منداڵەکانت بگرێ."

پیاوەکەش جامی چاویلکەکەی خاوێنکردەوە و ئینجا لە چاوی کردنەوە، لە نزیکەوە سەیری فرمێسکە گەورەکانی سەر ڕوخساری ژنە و کچەکەی کرد.

منیش زاتم دایە بەرخۆم و بە دەرفەتم زانی، درێژەم بە قسەکەم دا: "سێ ڕۆژە ئەم بەستەزمانە نەنووستووە. ئەو ژنە و کیژەکەی هەموو شەوەکە هەر لێرەوە لە دەرەوەی ئەم زیندانەیان بەسەربردووە. بەر لەوەش بۆ ماوەی دووڕۆژ لەنێو پاسدابوون، ئاخر ئەوان لە باشوورەوە هاتوون. تکایە ڕێگەی بدە مێردەکەی ببینێ. تەنیا بۆ یەک خولەکیش بێ. خوا لەم دنیا و قیامەتێ پاداشتی چاکەکەت بداتەوە! لەوانەیە ئەمە دوا دەرفەتی ئەو ژنە کلۆڵە بێ، باوکی منداڵەکانی خۆی ببینێتەوە."

بۆ مایەی سەرسامیم، ئەفسەرەکە کارتی شینی دایە ژنەکە. لە خۆشییان ژنەکە باوەشی پێداکردم و ڕوومەتی دامە بەر ماچان. لێی گەڕام سەرم لەسەر شانم دابنێ و بە زمانەکەی خۆی قسەم بۆ بکا. منیش بە زمانەکەی خۆم وەڵامم دەدایەوە. کیژەکەش بە ڕوومدا خەنییەوە، و ددانە شکاوە ڕەشبووەکانی نیشاندام. منیش چاوێکم لێداگرت. ئەو کچە تاکە کەس بوو خۆشی لە خۆوێژییەکەم بینی. ئیدی بە یەکەوە چووینە ڕیزی داهاتووەوە.

پیاوە مرۆمۆنەکانی بن یەکبەرگی فەرمی یاوەری خێزانەکانیان بۆ هەڵگەڕان و داگەڕان بە سەر پلیکانەکاندا دەکرد تا کەسوکارە زیندانییەکانیان ببینن. خەڵکەکە بە چرپەوە بە یەکدییان گوت؛ شوێنەکە بایی ئەوە دەکا دە خێزان لە یەک کاتدا زیندانییەکانیان ببینن، بەڵام لەبەرئەوەی گفتوگۆکانی نێوان زیندانی و کەسوکارەکانیان گوێی لێ دەگیرا، بۆیە کاربەدەستان پێیان باشتر بوو شوێنەکە ئارام و کڕ بێ. هەمووومان ڕێسا گوتراو و

نەگوتراوەکانمان دەزانی، بەڵام ئەو پاسەوانانەی یاوەریی ئێمەیان دەکرد دەوەستان تا گوێیان لە هەموو دەمەتەقێیەکان بێ.

میلی کاتژمێریش هەر بە مەوداکەی خۆیدا دەڕۆیی، بەڵام بە شێوەیەکی نەکردە خێرا و بێ باک بوو لەوەی ترس و تۆقینی ئێمە لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر خولەکێک زیاتر هەڵدەکشێ. لەوێ لە ژووری چاوەڕوانی و دیدار هیچ هەواگۆڕکێیەک نەبوو، ئاوساردکەرەوەکانیش لەمێژبوو چۆڕیان تێدانەمابوو. گەرمایەکە تاقەتپڕوکێن بوو. خەڵکەکە بە گوێی ئەوەی تەنیشتیدا دەچرپاند، ئاگاداریدەکردەوە، بە هۆی پیسی شوێنەکە و بەرزبوونەوەی پلەی گەرماوە شوێنەکە پڕبووە لە قالۆنچە و سیسرکە.

هەر خێزانێک بیست خولەکی هەبوو تا لەگەڵ کەسە زیندانیکراوەکەی بە تەلەفۆن قسەبکا، کە لەودیوی شووشەبەندە ئەستوورەکەدا دایاننابوو، بەڵام ئەگەر یەک وشە سەبارەت بەوەی ڕێگەی پێنەدراوە بدوێن، ئەوا نەوەک هەر سەردانەکەی پێدەبڕین، بەڵکو سەردانی دادێش هەڵدەپەسێرن و زیندانییەکەش سزا دەدەن. سەردانەکە لەوپەڕی سۆزبزوێنی و پەستاندا بوو، زیاتریش بۆ ئەو کەسانەی فارسییان نەدەزانی: بۆ بە تەمەن و نەخوێندەوار و کڵۆڵەکان.

ئەوانەش بە بەخت بوون کە ئازیزەکانی خۆیان دەبینی بە نامرادی لە پلیکانەکان دەهاتنەخوارەوە، لەبەر بێ ئومێدییان لەسەر پەیژەکان لالا دەچوون، لەبەر لەڕولاوازیی زیندانییەکان هێدمەگرتی دەبوون، دواتر بۆم دەرکەوت هەندێکیان بە ڕوونی نیشانەی ئەشکەنجەیان پێوەدیار بوو. منیش پێم لە جەرگی خۆم ناو خۆم

ئامادەکرد. خۆ وەنەبێ ماڵباتەکان نەزانن چی چاوەڕێیان دەکا، ئاخر زیندانی ئێڤین نەوەک هەر لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناویندا، بەڵکو لە سەرتاپای جیهانیشدا ناوی بە بەد و شووم ڕۆیشتبوو. هێشتاش ئەوەی جێ پۆستاڵ لەسەر ڕوخسار و جەستەی خۆشەویستانت ببینی و ڕێگەشت پێنەدەرێ مشووری بخۆی، برینەکەی تیماربکەی تەنانەت لە باوەشی بگری، خۆی لە خۆیدا هاوبەشبوونی ماڵباتەکان بوو لە ئازار و ئەشکەنجەی کەسە زیندانییەکەیان. گەدەم هەر هەڵبەزودابەزی بوو، لە کاتێکدا دانم بە خۆمدا گرتبوو تا ڕووی براکەم ببینم، دەبوو فرمێسکەکانم لە قووڵایی چاوانم حەشاربدەم و هەنسکیشم لە قوڕگمدا بخنکێنم.

پاشان بیرم لە بابە و هەمان زیندان کردەوە، لەو شوێنەی بە خەتی زۆر درشت نووسراوە: "خودایە، خودایە خومەینی بهێڵی، تا هاتنی مەهدی،" و ئەوەی کە تەنیا یەک سەردانکەری هەبوو و ئەو کاتەش کە دایکی مرد و کیژەکەشی لەدایکبوو هەر لەنێو چوارچێوەی ئەم زیندانەدا هێلڕایەوە. من بیرم لە جوانەی مارانگاز بە ترسوتۆق کردەوە، ئەوەی جارێکیان تالاوی لەسێدارەدانی لەخشتەبەرانەی وەک شێوازە ئەشکەنجەیەکی هۆڤیانە و نائاساییانە چەشت، بیرم لە شلێر کردەوە، کە لە نێوان چوار دیوارەکانی ئەم زیندانە گەورەیەدا بووبوو، ئەو زیندانەی قاوش و هۆدەکانی پڕاووپڕ بوون لە سەرنشین. ئەو زیندانە قوڕبەسەرانەش لەبەر بەدخۆراکی و تووشبوون بە پەتا، بەر لەوەی گەردنیان بگاتە قەنارە مردن و لە شوێنی خۆیان ساردبوونەوە. ئەو زیندانییانەی هەرگیز ڕێگە بە کەسوکاریان نەدرا تا بێن و سەردانیان بکەن و ئادگارە تێکشکاوەکانیان ببینن. خۆ ئەگەر دیواری زیندانەکانی ئێران

شاهیدی دەستی یەکەم بن لەسەر ئەوەی لەنێویاندا ڕوویداوە، ئەوا دڵی خوا دەبووە ملیۆنێ پارچە.

خۆم بەرگەگر و ڕەق ڕاگرت. پیاو و ژن ڕیزی لە یەک جیایان پێکهێنابوو، هەر نیو سەعات جارێک پێنج پیاو و پێنج ژن بانگدەکران، لێ لەبەرئەوەی زۆرینەی سەردانکەران ژن بوون، هێشتا نۆرە ڕیزی دووورودرێژم لە پێشدا مابوو. خۆ ئەگەر تا سەعات پێنج نۆرەم نەگاتێ، ئەوا تا مانگێکی دیکە دەرفەتەکەم لە دەست دەردەچوو. هێشتاش کیژۆڵە ئەهوازییەکە نیگای چاوی هەر لەسەر من بوو. ئەو لەسەر ناوکەوەکە دانیشتبوو، لە ماندوێتیدا چاوی نیوە نوقاو بوو.

منیش لە تەنیشتی دانیشتم. ئەو هەر بە عەرەبی لەگەڵ دایکی دەدوا، منیش نەمدەزانی چەند فارسی دەزانێ، بەڵام کە لێم پرسی: "ئەرێ پێتخۆشە پرچە جوانەکەت بۆ بکەمە کەزی؟" سەری هەژاند. کیژەکە لە کۆشم دانیشت. منیش بە مەبەستی وەرگرتنی ڕەزامەندی سەیرێکی دایکیم کرد، بەڵام خۆ ئەو وا لە گژ هزر و داڵغان ڕاچووبوو، هەر ئاگاشی لە من نەبوو. منیش لە جانتاکەمدا شانەیەکی بچکۆلەم دەرهێنا و خەریکی داهێنانی پرچە خاوەکەی کیژۆڵەکە بووم. هەر دەبێ چۆنیەتیی پرچداهێناون و شوێنەواری نەرمی شانەکە هەم ئەوی هەندێک هێورکردبێتەوە و هەم خۆیشم، چونکە پرچە درێژەکەی لە سینگی منی دەدا و ئەویش هەر باوێشکی دەهاتێ. ئەو چیای لە تەمەنی خۆیدا بەبیر هێنامەوە.

سەعاتەکان ڕابردن. بە تەمەنە ڕاوەستاوەکانی ڕیزەکان داد و بێدادیان بوو لە دەست ئازاری سینگ و شلبوونی قاچەکانیان.

خاوەن جەستە بەهێزەکان خەریک بوون لەسەر نۆرەبڕی بەشەڕبێن.

میلی کاتژمێرە زلە ژەنگاوییەکەی سەر دیوارەکە چوار و نیوی نیشاندا. ئەفسەرەکانیش ماوەی سەردانکردنەکەیان کەمکردەوە تا بتوانن زۆرترین خێزان کەسوکاریان ببینن و قسەیان لەگەڵدا بکەن. کەسە یەکەمەکانی ڕیزەکەش ناڕەزایەتییان نیشاندا. کیژۆڵەکەش لە وەنەوەزدانەکەی بە ئاگا هاتەوە. پێی سەیر بوو خۆی لە کۆشی مندا بینییەوە، ئینجا دەستی بە دامێنی دایکیەوە گرت. لە بەشی پیاوانیشدا، یەکێک لە تەمەنی حەفتاساڵیدا لە شوێنی خۆی ڕاقەنا و کەوتە سەر ناوکەوەکە، تەنانەت هەر لەو کاتەشدا ناوی خوێنرایەوە، بەڵام خۆ نەیتوانی هەڵسێتەوە و ڕۆڵەکەی ببینێ. یەکێ لە پیاوە چوارشانەکان هاتە پێش و گوتی: "دەکرێ بۆ سەرخستنی لە پلیکانەکان لە کۆڵی بکەم"، بەڵام خۆ سەربازەکان هەر گوێشیان پێنەدا.

ژنێک لە نزیک کۆتایی ڕیزەکە ڕایگەیاند: من پزیشکم، لەوانەیە بتوانم فریای بکەوم." لێ لێنەگەڕان هەر نزیکی بازنەی پیاوان بکەوێتەوە. ئیدی دڵی من لە چکەچکی کاتژمێرەکە خێراتر لێیدەدا.

دوای ئەو هەموو هەرا و تاڵوکەیەی ناوەوە و دەرەوەم، کەچی کۆتاییەکەم ئەوەبوو زیندانەکە بە بێ ئەوەی چاوم بە چیا بکەوێ، جێبهێڵم.

کاتێکیش لە زیندانەکە دەرچووم و کەوتمە سەرجادەکە، لەبەر سەرئێشە میگرێنەکەم زۆر سەخت بوو چاوم هەڵبێنم. ئەو کاتەی لە جادەکەش پەڕیمەوە، ترومبێلێک کە خەریکبوو پانم بکاتەوە بە

هۆڕنلێدانەوە بە لامدا تێپەڕی. دنیا لەبەر چاوم بولێڵ بوو. ئیدی یەک دوو حەبی ئەسپرینم لەوانەی بۆ براکەم بردبوو، هەڵدان.

## بەندی بیست و سێ

لەو کاتەی خەریکبوو لە کاری کۆشکی کتێبفرۆشییەکەم دەبوومەوە، لەرینەوەی تەلەفۆنەکەم نیشانەی پەیامێک بوو.

*مانگرتن لە بەردەم ئێڤین.* هاوڕێنەکەی فەرهاد بوو وایکرد. *داواکردنی سووککردنی ڕێکاری سەردانکردنی زیندانییە سیاسییەکان.*

هەروەک چیا پێشتر کردبووی، منیش لافیتەم لە کۆنە کارتۆن دروستکرد و دروشمم لەسەر نووسی. کاتێکیش دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتمە بەردەم دەروازەی ئێڤین، دووسەد کەسێک لەوێ خڕبووبوونەوە. تیشکی خۆر بە فلتەری گەڵای درەختی جاکاراندا[١٠٥] تێدەپەڕی. بۆ زیاتر لە سەعاتێک دروشممان کێشا، بەڵام خۆ دەسەڵاتداران ئێمەیان پشتگوێخست. چەند پەیامنێرێکی میدیای دەرەوە لێمان پەیدابوون، بە دزییەوە نیشانەی ڕۆژنامەوانی خۆیانیان نیشانماندا و دیداریان لەگەڵ چەند کەسێکی ئازاو بوێردا کرد. ئەوان پەخشی خۆیان ڕاستەوخۆ نمایشکرد، کاتێکیش ماتۆڕسوار پەیدابوون، ئەوەندە بە ترس و بیم هەڕەشەیان کرد تا ڕۆژنامەنووسانیش بڵاوەیان لێکرد.

بەسیجە ماتۆڕسوارەکان، ئەو مێلیشیا نافەرمییەی بە ڕیشی درێژ و شاڵی خەتخەتی ڕەش و سپی دەناسرانەوە، بەسەر ئێمەیان

---

[١٠٥] جاکاراندا jacaranda دارێکی گەرمێنییە، ڕیشییە گوڵێکی مۆر دەدا، لە دارکەپر دەچێ. بەداخەوە ناوی کوردییم بۆ نەدۆزرایەوە.

دادا. بانگیان دەکرد: "حەیوانینە، دەی بڵاوەی لێبکەن." هەندێکیان دەبەی گەورەی ئاویان پێبوو، یەکسەر ڕشتیانە سەر ئەو شۆستەیەی، کە هەندێ لە بە تەمەنەکان خاولیان بۆ دانیشتن ڕاخستبوو.

بەسیجەکان هاتن پاڵیان پێوەنایین، جوێنیان پێداین، تفیان تێکردین و پیاوەکانیان بە کافر و ژنەکانیشیان بە قەحپە ناوبرد. سەربازە چەکدارەکانیش بەو بەزمە هەراسانکردنەی ئەوان دڵخۆش بوون و پێدەکەنین و گاڵتەشیان بە ئێمە کرد کاتێ هانامان بۆ بردن بەڵکو لە چنگی ئەوان بمانپارێزن.

منیش بە بێ دەنگی تەماشای ڕاستەوڕاستی ئەوانم کرد. هەندێ لەو ئەندامانی ئەو تاقمە زۆر گەنج بوون، تەمەنیان هەر سێزدە ساڵان دەبوو، ئەوانی دیکەش بە تەمەنتر و شەشت ساڵان دەبوون. بێشک زۆریان هەلپەرست و هەندێکیشیان سادیست بوون. دیاربوو مێشکی هەندێکیان شورابووەوە؛ هەندێکیشیان شەڕکەری دێرین بوون، هی سەردەمی جەنگی هەشت ساڵەی ئێران-عێراق بوون، ئەوانەی لە شەڕەکەدا و لەپێناوی وڵاتەکەیان ئەندامێکیان لەدەستدابوو، هێشتاش هەر لەو بڕوایەدابوون کە حکومەت پیرۆزە و ئێمەش ئەو گەف و هەڕەشەین دەبێ لەناوببرێین. خۆ ئەگەر ئەو کاتەی لە قوتابخانە بووم و بچووومایە ڕیزی ئەو تاقمەوە، ئەوا ئێستا دەرچووی زانکۆ دەبووم، ئاخر سووسەکاری بۆ حکومەت بەدترین و شومترین تاکتیک بوو تا خەڵک لە زانکۆکان وەربگیرێن. کەچی لە کاتێکدا ئەوانی دیکە نمرەی باڵا و باشیان لە تاقیکردنەوەی

نیشمانیدا دەهێنا، لە خوێندنی بالآ بێبەشدەکران، هەر لەبەرئەوەی چالاکوانن یان سەر بە ماڵباتی چالاکوانەکانن.

منیش خۆم لەنێو حەشاماتەکە خشاندە دەرەوە و بە مەودایەکەوە سەیرمکرد و هەوڵمدا بە کامێرای تەلەفۆنەکەم، کە لەبن سەرپۆشە فش و بەرینەکەمدا شاردبوومەوە، گرتەی دیمەنەکان بگرم. پیاوێکی تەمەن چل ساڵە، بە هیوای ئەوەی بتوانێ کچە هەرزەکەی لە دەست بەسیجەکان دەربێنێ، کە لە میانەی ڕاوەدوونانەکە گرتبوویان، ئیدی هەر ئەوەندەم بینی، کابرا لە تاوان جڵەوی خۆی لەدەستدا، پاڵێکی بە بەسیجە ماتۆڕسوارەکەوە ناو مستێکی سرەواندە دەموچاوی. خەڵکەکەش لە خۆشیان کردیانە هەراوزەنا، ئینجا تاقمە ملهوڕەکە هاتن و کەوتنە سەرکابرا و لێدان ئەمما لێدان. خەڵکی ئەو ناوەش هەوڵیاندا کابراکە بپارێزن و لە دەستی تاقمەکە دەریبێنن، بەڵام زۆری نەبرد هەموویان بە یەکدا هەڵشاخان و هەراکە گەرمتر بوو.

ژنێک بە هەڵەداوان خۆی گەیاندێ و بە جانتاکەی دەستی لە یەکێک لە بەسیجە پەلاماردەرەکانی دا. ئەویش پاڵێکی پێوەنا. ژنەکە ڕاقەنا و کەوتە سەر زەوی. ئینجا چەند ژنێک و من، ئەوانەی بە دەمارگرژییەوە لە لایەک وەستابووین، غارماندا و بە هانای ژنەکەوە کەوتووەکەوە چووین. لێ پاسەوانانی زیندانەکە دەستبەجێ گەیشتنێ، فەرمانیان پێکردین ئەگەر بمانەوێ بە زیندوویی بمێنینەوە دەبێ بڵاوەی لێبکەین.

بە هۆی پاڵەپەستۆی قەراپەستانێی ئاپۆرایەکەوە بەرەو پێشەوە، بۆ نزیک پیاوە چەکدارەکان پاڵم پێوەنرا. ئەوەندە نزیک تا لووتم بەر

لووتیان بکەوێ. ئیدی گوتم: "ئێمە ئەو سووکایەتییە ناپەژرێنین." ئەو تووڕەییەی لە هەناومدا پەنگی خواربووەوە، دەکوڵا و ئازاری دەدام. ئەوسا بە ڕووی ئەو پاسەوانەدا هەڵشاخام کە پێیگوتم هەی هیچوپووچ، بکشێوە و دەفن بە، ئیدی منیش نەمکردە نامەردی و هاوارمکرد: "زۆری پێناچێ بەهاناهاتنی نێودەوڵەتی توندوتیژییەکەت دەوەستێنێ!"

سەربازەکە بە تەوسەوە پێکەنی و گوتی: "بەڵێ. دڵت بەوە خۆشکە، چاوەڕێی جیهان بکە بێت پیلت بگرێ و ڕزگارت بکا!" ئەوە بوو چاوەکانمان بەر یەک کەوتن. هەردووکمان ئیستێکمان کرد. بەرلەوەی ڕوخساریی گرژببێ، لێوەکانی ئەو بەلاقرتێوە خەندەیەکیان کەوتەسەر. پێموابوو ئەوە خەندەیەک بوو بۆ گرژیی وەرگەڕا. هەردووکمان قیت لەبەردەم یەکدا وەستاین.

توێژاڵێک لە گۆشت بەسەر ئەو کونە بڕاوەی سەر گوێی چەپیدا هاتبوو.

ئەو بە مشوۆڕێکی زۆرەوە هەوای بە کونەلووتەکانی هەڵلووشی، ئینجا ڕاستەوخۆ لوولەی تفەنگەکەی لەسەر نێوچاوانم ڕاگرت، هەر ڕێک ئەو شوێنەی دواجار چیا ماچی کردبوو.

"دەی لێرە بڕۆ، دەنا بە قوربانی یەک گوللەت دەکەم."

منیش وێنەی ئەو تاقمە چەکدارەم هاتەبەرچاو کە قوربانییەکانیان تیرباران دەکرد، ئەوی تیایدا قوربانییەکان سەرباری ڕێژنەی گوللە، سەرباری هەڵکوڕمان و کرووزانەوە لەتاو ئازار، هەوڵیاندەدا چۆک دانەدەن. چەکی کوشندە وا لەسەر هەنیەم. ڕوخساری سەربازەکەش هیچی دەرنەدەبڕی. لوولە ئاسنە ساردەکە

لەسەر پێستم گیرسابووەوە. قامکی کابراش لەرزین، دەستی بە پەلەپیتکەکە کەوت.

ئەو ئاپۆرایەی دەوروبەرم لە شوێنی خۆیان چەقیان بەست. منیش هەناسەم ڕاگرت.

هەرچەندە دەستم بە دەردانی ئەدرنالینەوە لەرزین دەنگیشم نزم بوو کە گوتم: "پێت وایە ئێمە لە مەرگ دەترسین؟"

"من سوێندم بە منداڵە شەهیدەکەم خواردووە، ئەگەر تەقە بکەی دەتکوژین." ئەمە دەنگی ژنێک بوو لە نزیکم بوو، بەم جۆرە هەڕەشەی لە سەربازەکە کرد. ئیدی ئاپۆرای خەڵکەکە بە پەسەندکردنەوە دروشمیان کێشا و بە هێواشی بۆ ناوەوە پاڵەپەستۆیان دروستکرد. ئامێری واکی تاکی لاسکی لەبەر قایشی سەربازەکە غژەغژێکی لێوە هات. ئینجا ئەویش لوولەی تفەنگە ژێسیێکەی[١٠٦] نەویکرد و دەستی دایە ئامێرەکە. منیش هەروەک جاڵجاڵۆکە پشتاوپشت بە هێواشی کشامەوە نێو ئاپۆرای گوڕدەمی خەڵکەکە و چاویشم هەر لە سەر چاوی ئەو بوو. ئەوە بوو ئەو ڕووی خۆی وەرسووڕاند و منیش ڕێگەی خۆم گرت و ڕۆیشتم.

بە کەڕیی لەبەر هۆڕنی ترومبێلان و هاتوهاواری سەر جادە، نابیناش لە هەموو ئەوانەی بەلامدا تێدەپەڕین، بە گورگەلۆقە و بەو لێکەوتەیەی ڕووبەڕووبوونەوە کە لە ناوەوە دەیهەژاندم خۆم گەیاندەوە ماڵێ.

---

[١٠٦] گی سێ (ژێسێ) G٣ چەکێکە لە لایەن کۆمپانیای Heckler & Koch دروستکراوە. لە ساڵانی ١٩٥٠ -١٩٥٥ لە ئاڵمان و وڵاتەکانی دیکەی ئەندامی ناتۆ بەکارهاتووەوە و چەکی دەستی سەربازەکانیان بووە. لە کوردەواریدا بە ژێرسێ یان ژێسێ ناوی ڕۆیشتووە.

تا ئەو کاتەی ڕووبەڕووی مەرگ نە ببوومەوە، پرسی هۆڤیگەریم وەک بابەتێکی شەخسی تەماشادەکرد، بێئاگا لەوەی ڕەگی قووڵی دڕندەیی مرۆڤ ڕۆچووەتە نێو مێژووی مرۆڤایەتییەوە. ئاخر خۆ هیچی لە پرسەکە نەدەگۆڕی ئەگەر ناوم لەیلا یان نۆرج[107] بووایە، ئەگەر هاتبا و بە عیبری یان بە ناڤاهۆیی[108] قسەم کردبا- ئەوە زۆر دڵنیا بوو شتەکە پەیوەندی بە خودی منەوە نەبوو.

کاتێک گەیشتمەوە ماڵ، لە قەپەنگەکە دانیشتم، هەروەک ئەوەی دانیشتنی نێو چوار دیوار ئەو کەمە بەرچاوڕوونییەم لێبسەنێتەوە. هەستم بەوە کرد باری گرانی سەر شانم سووک بووە، لە دەست سۆزی خۆکرۆزانەوە ئاسوودە بووم. ئەژنۆکانم لە باوەش گرتن و پێیە بە ئازارەکانم داماڵین، ئینجا سەرم هەڵبڕی، سەیری پەڵە هەورە بۆرەکانم کرد، کە بەسەر سەرمدا و بە تاقی ئاسماندا ڕەت دەبوون. خەڵکی شەڕانگێز لەم جیهانەدا ژیاون، ئەمەش هیچ خەتای منی تێدا نەبووە. ئەمە هەمووی بەشێکی یارییەکە بوو. جارێکیان جوانە ئەمەی پێگوتم و هەر هەنووکەش لێی تێگەیشتم: "منگەمنگ لە دەست ڕێساکان، گلەییکردن لە دەستی خراپ... بێ هودەیە و دادت نادا. سەرنجت بخەرە سەر ئەوەی بۆت هاتووە، چیت دەدەستدایە بە باشترین شێوە گەمەی پێبکە و ئینجا جیاوازییەکە ببینە."

دوای هەورە تریشقەیەکی بە دەنگ، بارانیش بە لێزمە باری. منیش دەموچاو و لەپم بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە. خۆ هەر من بە

---

[107] Njorge

[108] Navajo زمانی ئەمریکاییەکانی باکوور.

تاقی تەنیا نەبووم، ئەوانیشم بینین. خەڵک لە ڕواندا، بۆسنیا، خەڵکی کشتکار و فێرگە شەووڕۆژیە زۆرەملێکانی هیندیەسوورەکانی باکووری ئەمریکا[109] شان بە شانی کورد وەستاون. ماوەیەکی زۆر، بایی ئەوەندە لە ژێر بارانەکەدا مامەوە تا دواتر پەلکە زێڕینەی پاش باران ببینم.

لە سپێدەشدا تەمومژ ڕەوابووەوە. چەند لاپەڕەیەکم لە یادنامەی چیا بۆ جارێکی دیکە خوێندنەوە و هەستمکرد لە هی ئەو خۆراکی هزرم هەڵێنجاوە.

ئیدی دەمزانی چی بکەم.

---

[109] مەبەست American Indian boarding schools کە ڕەوتێکی بوو لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و لە بەرایی سەدەی نۆزدەهەم و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم دامەزرا، مەبەستیش بە مەدەنیکردنی خەڵکی خۆجێی ئەمریکا و گونجاندن و سازاندنی بوو لەگەڵ کلتووری ئەمریکی –ئەورووپی.

## بەندی بیست و چوار

شلێر ڤیدیۆیەکی خۆی لەگەڵ فەرماندە نوێیەکەی سەبارەت بە ڕێنماییەکانی ئاسایشی کاروباری ئەلکترۆنی بۆ ناردم تا هەندێ وانەی لێ فێرببم. یەکینە مێینەکەی حیزبە سیاسییەکەی شلێر هەر شەش مانگ جارێک فەرماندەیەکی نوێ بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، تا خۆیان لە پرسی قۆرخکردنی دەسەڵات بپارێزن. بێریڤان، کە ئەندازیارێکی کۆمپیوتەر بوو و لە (وان) گەورە بووبوو، لە گوندێک لەدایک ببوو سەرلەبەری بە دەست تورکان سوتێنرابوو، ئەوکات منداڵ بووە، ئەو زۆر لەسەرخۆ نیشانیدام چۆن کردەی پشتڕاسکردنەوەی دووقۆناغی بەکاربێنم[١١٠]، خۆم لەو ئاپانە بە دووربگرم کە دەکرێ لە لایەن ئەم و ئەو بەسانایی چاودێریی بکرێن، هەروەها چۆن کۆدی تایبەت لەسەر کۆمپیوتەرەکەم دانێم، تۆمارکردنە ئۆتۆماتیکەکانی ناو تەلەفونەکەم دابخەم و هەموو چاتەکانیشم بە یەکجاری ڕەشبکەمەوە.

ئەو هۆشیاریی دامێ: "هەر کاتێک نووسینەکانی ئەو بە شێوەیەکی بەرفرەوان بڵاوبوونەوە، ئەوا تۆ لە چاوی ئەواندا بە تاوانباری یەکەم دادەنرێی. تۆ نابێ هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە بدەی مەبادا ئەو دێوەزمانە لە زیندانت بهاون. خۆ ئەگەر هەوڵبدەی سەرنجی خەڵکی بۆ ئەو دۆزە ڕابکێشی ئەوا یاری بە ئاگر دەکەی."

---

[١١٠] Two-factor authentication کردەیەکی ئەلیکترۆنیە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت بۆ بەهێزکردنی ئاسایشی لاپەڕەکانیان بەکاریدێنن بۆ خۆپارێزی لە هەوڵەکانی دەسەڵات و دەزگاکانی چاودێری و سیخوڕی لە هاککردنی هەژمارەکانیان.

تفەنگەکەی وەک ئەوەی ئاژەڵێکی ماڵی بێ لە کۆشیدابوو، ئەو کاتەی هەموو شتێکی پێ دووبارە دەکردمەوە کە فێری کردبووم.

دوای ئەوە وانەکەی تەواو بۆ ڕوونکردمەوە ئینجا شلێر هاتەوە سەر شاشە.

کاتێ شلێرم لە سەر شاشەکە بینی سەرسام بووم و گوتم: "تاوبردە بووی."

"دەکرێ خۆشت کەمێک ڤیتامین دی بەکاربهێنی."

منیش ئەو ڕازەم بۆ شلێر درکاند کە خەمی ئەوەم نییە خەڵک لە دەوری نووسینەکانی چیا کۆببنەوە و سەرنجیان ڕابکێشێ، بەڵکو ئەوە ناخۆشە کە کەس باکی پێ نەبێ. "سەیری ئەو خۆشیفتەگەریەی سۆشیال میدیا بکە، شتی هەرە بڵح و پووچ دەتەقێتەوە و دەبێتە مایەی کۆمێنت و سەرنج."

تۆ پێت وایە ئەو برادەرانەی ئێرە ئاوا مشووری زۆری بۆ دەخۆن لەبەرئەوەی من داوامکردووە؟ نەخێر هەڤاڵ[111]. گوێم لێبگرە: چیا هەر بە خۆی دەکەوێتە ناو ناوان، ئەمەش وەنەبێ لەبەر ئەوەبێ من و تۆ خۆشمان دەوێ. تۆ لەوێوە ڕەنگە دۆخەکە بەشێوە ڕاستەقینەکەی نەبینی." شلێر دەستی دایە لاپتۆپەکە لە هۆدەیەکی دیکەی بنکە سادەکەی خۆیان وەژورکەوت. دیواری پشتەوەی خۆی درزی دابوو، ئەوەی دەردەخست کە بە قوڕ و کا دروستکراوە، ئەمەش خۆی شێوازێکی کۆنی سیستمی هەواگۆڕکێ بوو. "چیا دەنگی یەکخەرەوەی ئۆپۆزسیۆنی لەیەکترازاوە، چونکە ئەو بەڵگەیە

---

[111] Haval

لەسەر ئەوەی هەموو شتێک لەو زۆنگاوەدا نغرۆ نەبووە، هەروەها خامەیەکی بزۆزی نایابیشی هەیە."

پەیوەندییەکە پچڕا، بۆ خولەکێک ڕووی شلێر بە شێوەیەکی خاڵدار هەر لەسەر شاشەکە مایەوە.

"چاکە، تۆ ئەم شتانە بکە: سەرلەبەری یادنامەی چیا، شیعرەکان، پەخشانەکان، هەموو شتێکی تایپ بکە. منیش هەموو نامەکان، ئەوانەی لە ماوەی ئەو هەموو ساڵانەی ڕابردوو بۆیناردووم، پاراستوومە، دەتوانم هەندێکیان لێ بڵاوبکەومەوە. کاتێکیش هاوزیندانییەکی بەردەدرێ، دەکرێ هەندێ نووسینی نوێشی بە قاچاغ بنێرێتە دەرەوە. ئەگەر... نەک ئەگەر، بەڵکو کاتێک ئەوان هاتنەسۆراغت، پێیان بڵێ تۆ نامەکانی ئەوت تەنیا بە دایباب گوتووە، دەکرێ ئەوان بە یەکێکی دیکەیان گوتبێ ئیدی لەوێوە بڵاوبببێتەوە. تۆ وەها ڕەفتار بنوێنە وەک ئەوەی هیچ شتێک لەبارەی کاری ئینتەرنێت نازانی. ئەوان چاودێریی تەلەفۆن و پەیوەندییە بێتەلەکانی دیکەت دەکەن. هەر کاتێک تۆ هەموو نووسینەکانی ئەوت پۆستکرد، ئێمە یارمەتیدەر دەبین تا بە تەواوی بڵاوببنەوە.""شلێر، زۆر سوپاس. هەر بە ڕاستی من ئەمەم بە بێ تۆ پێ نەدەکرا. من هەر نەشمدەزانی لە کوێوە دەستپێبکەم.

"لەیلا، بمبەخشە کە ئاوا ڕۆیشتم بەتەنێ جێمهێشتی. بە گیانی دایکم، یەک دانە ڕۆژی دیکە لەوێ بمابامەوە، وەکو شێت و دێوانان وە چیاوچۆلان دەکەوتم. ئاخرەکەی تێگەیشتم ئەو ژمارە زۆرە لە ژنان بۆ خۆیان دەکوژن. ئاخر ڕووم لە هەرلایەک دەکرد هەر بنبەست بوو."

"ئەری هەر بە ڕاستی لەوێ دڵخۆشی؟ بە ڕاستگۆیی پێم بڵێ؟"

"من درۆت لەگەڵ ناکەم. ئێرە لەسەرەتادا بۆ جەستەی من زۆر سەخت و تاقەتپڕوکێن بوو، بەڵام هەست بەوپەڕی ڕەهایی دەکەم. تۆش ئێرەت بە لاوە خۆش دەبێ. ئێرە پڕە لە پەپوولە و گوڵە کێویلکە. لێرە ڕێ زۆر دەبڕین و ماسی دەگرین و تکەی تەڕوتازە لێدەدەین. باخچەی خۆشمان چێ دەکەین و ...."

"ئەدی کاتێک فڕۆکەکانی تورک و ئێرانی دێن و بۆمبابارانتان دەکەن؟"

"زۆر جاران بە زیرەکی بە سەریاندا زاڵدەبین و ئەوان ناتوانن شوێنمان بدۆزنەوە، بەڵام زۆر مایەی دڵشکانە کاتێ فڕۆکەکان گوندنشینان دەکەنە ئامانجی بۆمبەکانیان. لەیلا، ئەرێ تۆ دەزانی؟ ڕاستییەکە ئەوەیە، ئەوان نایانەوێ ئێمە هەر هەمووومان بکوژن. ئاخر ئەگەر وەها بکەن، ئەدی چۆن لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا خەڵکی خۆیان بخاپێنن و ئەگەر هاتوو هەندێ "دوژمن" لە دەرەوەی بازنەکە نەبن؟ من ئێستا شتەکان زۆر بە ڕوونی دەبینیم. نەمانی نەژادپەرستی و فۆبیاکانی دیکە دەبێتە هۆی نەمانی دیکتاتۆرەکان. چەکەکانی دەستمان لە هەمبەر تۆپخانەی ئەوان هەروەک یاریی دەستی منداڵان وایە، بەڵام ئەوەی ئێمە لە پێناویدا وەستاوین ترس دەخاتە دڵیان. بۆیە تیشکۆی ئەوان زیاتر لە سەر شێواندنی وێنەی ئێمەیە لەوەی بمانکوژن، جا هەرواشیان کردووە. ئاخر ئەوان لە ڕێی میدیاوە جڵەوی جەماوەریان لە دەستدایە."

"کەواتە دەقاودەق تۆ چی دەکەی؟"

"زۆر شت. شتی بچووک بەڵام باش. ئێمە دەچینە گوندەکان و ژنان فێری دروستکردنی تورشیات فرۆشتنیان دەکەین تا بیفرۆشن و ببنە خاوەنی گیرفانی سەربەخۆ. ڕێگەی بەرگرتن لە دووگیانبوونیان فێردەکەین. منداڵان فێردەکەین چۆن بنەتەقە[112] بناسنەوە و خۆیانی لێ بپارێزن. خۆت دەزانی لە دوای جەنگەکەوە، ئەوە سێ دەیەیە هێشتا کێڵگە و مەزراکان لە بنەتەقە پاکنەکراونەتەوە، هێشتا منداڵان بە هۆی تەقینەوەکانەوە دەست و قاچیان لەدەستدەدەن. هەندێکیشیان دەمرن. کەسیش نە مشووریان دەخوا و نە هەواڵیشیان بڵاودەکاتەوە، کەچی شتەکەش ڕوودەدا. هەندێ لە هاوڕێکانمان لە گەڵ مەلای گوندەکان دادەنیشن و قەناعەتیان پێدەهێنن بەڵکو بە خەڵکی بڵێن کەوا خەتەنەکردنی کچان شتێکی ڕاست و دروست نییە. پیاوانی لادێ فێردەکەین زێدەڕۆیی لە ڕاوکردن نەکەن و ئاگایان لە پاراستنی سروشت بێ.

"ئەدی چی ڕوودەدا کاتێ پاسدارانی ئێران بەسەر ڕێکخستنەکانتدا دەدەن؟"

"کاتێک یەکێک ئاشکرا دەبێ، ئەگەر هات و نەگیرێن ئەوا تەڤلی ئێمە دەبن یان دەچنە دەرەوە و لەوێ درێژە بە خەبات دەدەن، بەڵام لەناوخۆ هەمیشە ئەندامی نوێ دێنە ڕیزەوە. لەیلا ئەو خەڵکە لەوە زیاتری لەدەست دێ کە من و تۆ دەیزانین. یان لەوانەشە ئەوانەی لێهاتوو و بەتوانان ئەوان تەڤلی شۆڕش بن، چونکە بە تەنیا بواری هیچیان بۆ نارەخسێ."

"ئەرێ چیا هەموو ئەو شتانەی دەزانێ، وا نییە؟"

---

[112] بنەتەقە: مین، لوغم.

"بەڵێ زانیویەتی، بەڵام ئەو مەیلی پتر بەلای کارکردنی بە تەنیادا دەچوو. حەزی لەوەنییە ملکەچی فەرمانەکان بێ. گوێبگرە، من ئیمێلێکی هاوبەشم دروستکردووە، دەکرێ هەردووکمان بیبینین، منیش هەموو پێشهاتێکی تازە لەوێ دادەنێم، لێ هەرگیز بە ئینتەرنێتی ماڵی خۆتان ئەم ئیمێلە مەکەرەوە."

شلێر لێوەکانی بە شاشەی لاپتۆپەکەوە نان.

منیش ماچێکم بۆ هاوێشت. ئێمە هەردووکمان لاپتۆپەکانمان لە باوەش گرت و پێکەنین.

من چەند لاپەڕەی ڕۆژانەی یادنامەی چیام تایپکرد، لاپەڕەیەکی فەیسبوکم دروستکرد، لەگەڵ بلۆگەکەم لینککرد و وشەکانی ئەوم تێدا بڵاوکردنەوە.

من هەموو ڕۆژەکە هەر بە دیار کۆمپیوتەرەکەوە دانیشتم و زۆر وێنە و وتار و ئەو چیرۆکانەی بە پێی توانا بۆم دۆزرانەوە، پۆستمکردن. بە دوای ماڵپەڕ و بلۆگەکانی تەرخان بۆ زیندانییە سیاسییەکاندا گەڕام و زانیارییەکانی چیام تێدا ئاخنین، ئیمێلم بۆ ئەو چالاکوانانە نارد، کە ناوەکانیم دەدۆزینەوە و داوام لێکردن بەڵکو بەرگرینامەیەک بۆ براکەم ئامادەبکەن، ئەو کەسەی تاوانەکەی هەر ئەوە بووە گوایە یاوەریی کەسێک بووە کە بە مۆبایلەکەی گرتەیەکی تۆمارکردووە تیایدا پیاوەکانی حکومەت خەڵک دەکوژن.

شلێر بە پێچەوانەی منەوە دەستی بە هێڵی ئەنتەرنێتی بێ سانسۆر ڕادەگەیشت، ئەویش هاتە پاڵ هەوڵوتەقەلاکان و هەڤاڵەکانی خۆی بەگەڕخستن تا وتەکانی چیا بکەنە تورکی،

عەرەبی، ئەڵمانی، فەرەنسی، هۆڵەندی و زمانی زیاتریش. بە هۆی ئەوەی حیزبەکەی ئەو ئەندامی چەپخوازیی زۆری بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو و هاوسۆزیشی لە هەر چوار کەناری دونیایێ نەخاسمە ئەورووپا، هەبوو، بۆیە ڕایەڵەیەکی پەیوەندیی ئینتەرنێتی قەبە و بەرفرەوانی بەگەڕخست.

ئیدی وتەکانی چیا بڵاوبوونەوە.

هەفتەیەک دواتر کاتێک دایکە زەنگی لێدا، لە توورەییان هەر ئاگری لێدەباری، ئاخر من سەبارەت بە چیا درۆم لەگەڵ کردبوو، بۆمدەرکەوت شلێر ڕاستیدەگوت لەبارەی ئەوەی نووسینەکانی چیا دەتەقنەوە.

" دایکە، من ویستم بە نەگوتنی هەواڵە ناخۆشەکە لە جەڵتەی دڵ بتپارێزم. هەر خەریکبوو منیش بکوژێ، ئاخر نەمدەزانی لە کوێیە، ئایا سەلامەتە یان تەنانەت ماوە یان نا. هەرچی دەربارەی درۆکردنیشە، ئەرێ تۆ هەرگیز کەتنە سێکسییەکەت لەگەڵ قلەکەت بە بابە گوتووە؟" لە کۆتاییدا ڕووبەڕووی بوومەوە. ئەویش هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

"هەڵەیەک بوو کردم. هەڵەیەکی کاتی بوو. ئێستا بە تەمای لەناوجەرگەی ئەم تەنگژەیەدا پێی بڵێی؟ ئایا بە نیازی جەڵتەی دڵ تووشی باوکت بکەی؟ ئەو وێران بووە. کاتێ هەواڵی چیای بیست، هەر وەک ساوایەک خۆی لە گەوز دەدا[113] و چەندین سەعات هەر گریا و شین و ڕۆڕۆی بوو."

---

[113] خۆ لەگەوزدان: خۆ بانگلوزکردن، خۆ غلورکردنەوە، خۆ لە عەرد وەردان.

ئەوە بوو لەو ئانوساتەی تەلەفۆنەکەدا تێبینینامەیەکم لە سەر جامی کوشکە کتێبفرۆشییەکەم دا و نووسیم: "دوای پێنج خولەکی دیکە دێمەوە". ئینجا خۆم لە پشت مێزەکەمدا شاردەوە. لە دەنگی دایکەدا پەیم بە ترسەکەی ناو دڵی برد. "نەخێر دایکە. بە تەما نیم ئێستا هیچ شتێکی پێ بڵێم. هەر بۆ ئەوەم بوو بڵێم هەندێک شت وا باشترە نەگوترێن."

گوتی تەلەفۆنم لە تیڤی و ڕادیۆکانەوە بۆ دەهات و بە دوای ئەوەدا دەگەڕان زانیارییم لە بن سەر دەربهێنن و دەیانپرسی: "ئەری کەی چیا ئازاد دەکرێ؟"

هەر لەوێ و بە دەم قسەکردنەوە بۆرژام. "دایکە، کاتێ غەریبە زەنگت بۆ لێدەدەن، تۆ دەبێ دەستبەجێ تەلەفۆنەکەت دابخەی. باشە؟ لەبیرت بێ، شتەکە سەلامەت نییە. تەلەفۆنەکە لە وایەرەکە دەربهێنە یان ژمارەکەت بگۆڕە. خۆ تۆ ناتەوێ لەو تەمەنەدا بچییە زیندان؟ لەگەڵ هیچ کەسێک قسە مەکە، تەنانەت لەگەڵ یەک کەسیش. خۆ ئەگەر وەها بکەی ئەوا ئەوان ئەشکەنجەی چیا دەدەن. خۆ یەک وشە بەسە تا کێشەوبێشەی زۆر بنێتەوە."

"باشە من چی بکەم؟ خەڵک لە دەرکەمان دەدەن. ناسیاوەکان، دەروجیران و کەسوکار، هەمووان هەواڵەکەی چیایان بیستووە."

قاچەکانم لەبەر نوشتانەوە لە پشت مێزە شلۆقەکە دەستی بە ئازار کرد، بەڵام خۆ شادییەک ڕوخسارمی داگرتبوو. من دەبوایە بزەی نێو دەنگم بشارمەوە. ئیدی کەوتمەوە سەر قسان: "هەر ئەوەیە وەڵام مەدەرەوە. سوک و ئاسان دەکرێ ئەوان شۆفار بن. خۆ ئەگەر وەهاش دیار بێ دۆستیش بن، ئەوا لە بیرت بێ چۆن

دراوسێکەت خەبەری بابەی دا و ئیدی ئەوانیش بە سەر ماڵەکەی تۆیان دادا."

"ئێمە دەمانەوێ سەردانی بکەین."

من هێشتا نەمتوانیوە ببینم، کاتێ هەوڵی سەردانکردنی دەدەمەوە، پێت ڕادەگەیەنم. هەندێک ئارام بگرە تا ڕێکیدەخەم."

"من بە هەموو کەسێک دەڵێم کوڕەکەم بێ خەتایە."

" هەڵبەتە وایە. هەموو کەسیش ئەوە دەزانێ. بۆیە تکایە، کارێکی وەها نەکەی کێشەی زیاتری بۆ دروست بێ. هەر هەمووشی بەندە بە درکاندنی وشەیەک لای کەسێکی هەڵەوە."

"باوکت دەڵێ، پێویستە تۆ بێیتەوە ماڵێ. بە تەنیا ژیان لەوێ بۆ تۆ سەلامەت نییە."

"تازەبەتازە خۆم لێ بە خاوەن دەکاتەوە؟"

"تکایە لەیلا. باوکت دەیەوێ بگەڕێینەوە هەڵەبجە."

"نایابە! ئەمە بیرۆکەیەکی زۆر بەجێیە. بڕۆن. ئەم وڵاتە جێبێڵن. لەوێ کێڵگەیەک بدۆزنەوە. من و چیاش بە دواتاندا دێین. دەمانەوێ بە یەکەوە دارهەنار بچێنین."

دایکە بە هەنسکەوە: "هێشتا نا! ناتوانین چیا لێرە بەم جۆرە جێبهێڵین. دوای ئەوەی ئەو ئازاد دەکرێ. ئەرێ بە ڕاست کەی ئازاد دەکرێ؟"

"دایکە، من دەبێ بڕۆم." ئیدی تەلەفۆنەکەم دانایەوە. ئەژنۆکانم سڕ بووبوون. دیسان دەرکەی کوشکەکەم کردەوە و تا سەعات هەشت لەسەر کار بووم.

پاش داخستنی کوشکەکە، بۆ دەستگەیشتن بە ئینتەرنێت بە سواری پاس چوومە قاوەخانەیەکی ژێرزەمین، ئەوەش لەیەکێ لە سەردانکەرانی زیندان پێمگوترابوو کە ببووینە هاورێ. قاوەخانەکە لە بنهۆمی مەڵبەندێکی بازرگانیی گراندا هەڵکەوتبوو، بەڵام ئەوە هەبوو ئەنتەرنێتی بێ چاودێری و بە خێرایییەکی زۆر بۆ هاموشۆکەرانی دەستەبەردەکرد، ئەم شتەش لە قاوەخانە ئاساییەکان دەستنەدەکەوت. نێو قاوەخانەکە تاریک و توێژاڵێک مژ و بە دووکەڵی جگەرە باڵکێش بوو. ڕۆشنایی هەر لە شاشە شینە سەوزباوەکانەوە دەهات. هەر هاموشۆکەرێکیش هیدفۆنێکی لە گوێ کردتبوو، سەری بەسەر شاشەکەدا گرتبوو، بە تەواوی ئاگای لە خۆی نەمابوو. ئەو کاتەی ڕێگەی خۆم بەرەو مێزە بەتاڵەکەی گۆشەکە تەیکرد تا سەیرێکی ئەو ئیمێڵەم بکەم کە شلێر بۆی ڕێکخستبووم، تێبینی چاوە قورسەکانی پیاوەکانم کرد و خۆشم بە دوور گرت لەوەی سەیری شاشەی کۆمپیوتەرەکانیان بکەم.

بەڵێ هەموو ئەمانەم بۆ هاتبوو: کۆمێنتی دەستخۆشی و هاوسۆزی و نامەی لایەکان، ئەوانەی سەردانی ماڵپەڕەکەیان کردبوو، ئەو ماڵپەڕەی من و شلێر نووسینەکانی چیامان تێیدا پۆستکردبوو. هەر بە ڕاستیش خەڵکێکی زۆری لە دەورەدا خڕبووبووەوە. لەوەشەوە پرینتکردنی پەیامەکان بۆ من مایەی سەرئێشە بوو گەر هاتباو لێم گیرابان، بۆیە دانیشتم و پەیامەکانم جارێک و دووان و زیاتر خوێندنەوە، هەوڵمدا ئەو دێڕە گەرمە هاوسۆزیانە لەبەر بکەم. یەکێک نوسیبووی، وشەکانی چیا، ئەندێشەی ئەو، توانستی ئەو بۆ گەیاندنی ژان و ناسۆری ئەوانی دیکە کردوویەتیە هێمای زیندانە سیاسییەکان.

ئەوێ شەوێ بە فرمێسکەوە قاوەخانەکەم جێهێشت. ئەوە بوو یەکێک لە کوڕوکاڵەکان لێی پرسیم: "چیە دەڵێی پارەکەت لە خشتەی بردووی؟"

نارەزایەتییەکانی دەرەوەی زیندانی ئێڤین سەرنجی نێودەوڵەتی بۆ خۆی ڕاکێشابوو، لە دونیای بەرفرەواندا سەرکۆنەی زۆری ئێران لەسەر جۆری ڕەفتار لەگەڵ کەسوکاری زیندانییە سیاسییەکان کرابوو، ئەمەش لە دوایدا وایکرد دەسەڵاتداران ڕێگەی زیاتری سەردانیکردن بدەن. لەو نێوەشدا تاکە بەڵگەیەکیش لە دژی چیا نیشاننەدرا؛ ئیدی خەڵک و کاربەدەستانیش وەک یەک زانیان ئەو بێ تاوانە.

کاتێکیش لە کۆتاییدا و لەپشت شووشەبەندی ئەستووری پەنجەرەوە چاوم بە چیا کەوت، ١٨٣ ڕۆژ بەسەر ونبوونەکەیدا تێپەڕیبوو، هەنسک و فینگە فینگی خۆمم پێ جڵەونەدەکرا. ئاخر چۆن دەمتوانی وەها بکەم؟ چاوە هەنگوینەکانی شین و مۆر ببوونەوە، پێستی زەردهەڵگەڕابوو، باسکە ڕاستیشی لەبەر لێدانی کارەبایی دەلەرزی. ڕوومەتەکانی چاڵببوون، پرچەکەشی کە پێشتر تەواو پڕ و ڕەش بوو، هەنووکە بۆز و بەرەو سەرەوە هەڵکشابوو، ڕووتابووەوە. ڕیشە بێسەروبەرەکەی بە پرشوبڵاوی زۆر درێژبووبوو.

ئەویش نەیتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانی بگرێ و هەردوو لەپی خستنە سەر پەنجەرەکە. وتە شیرینەکانی چیا بە دوای مندا هاتن، لەگەڵ هی منیش تێکەڵدەبوون. منیش پڕ بە دەمم گوتم "دڵەکەم"[١١٤]

---

[١١٤] Dllakam

هەڵبەت لە جاران پڕماناتربوو، کە سەیرم کرد ئەویش بە دوای مندا گوتییەوە "دڵەکەم." لە کاتێکدا ئاسوودەیی بە نێو هەموو گەردیلەکانی بوونمدا گوزەرا، نەدەکرا لەوە دڵنیابووبم ئاخۆ لەو خۆشەویستییەدا من وەرگرم یان نێرەر.

چیا بە لێوبزواندنەوە پرسی: "چۆنی خوشکەکەم[١١٥]؟" هەرچەندە شووشەبەندی ئەستووریش لە نێوانماندا بوو، بەڵام وای نواند کە فرمێسکەکانم دەسڕێتەوە. ئێمە بە یەکەوە هەم پێکەنین و هەم گریاین. ئەو دەستی لە سەر دڵی دانا، دیسان بە لێوبزواندنەوە گوتی: "ئای چەند بە بینینت دڵشادم."

"هەروەها ئەزیش." ئیدی پێویستمان بە وشەنەبوو بۆ دەربڕین. هەر ئەوەندەمان بەس بوو چاو دە چاوی یەکدی ببڕین، ئەمەش دڵمەندترین شت بوو لە دونیادا.

ئینجا دەستم دایە مایکەکە تا قسە بکەم. " ئەرێ چییە، دەڵێی ماسولکەت پەیداکردوون، وا نییە؟" خۆ ئەو نۆ کیلۆش دابەزیبوو، ئەگەر لەوەش پتر نەبووبێ.

"ئاخر هەموو ڕۆژێک نزیکەی هەزار جار شناوی زگ و سێسەد جاریش یاریی شناوی پشت دەکەم."

"گیانەکەم، ئەمە بۆ تۆ زۆر باشە. چیا. چیا گیان. ئەمە هەر زۆر بۆت باش دەبێ." منیش چەناگەم لەسەر پەنجەرەکە دانا و ئەویش لەپی لەودیوەوە بۆ درێژکرد. من زۆر تینووی بینینی بووم، هەنووکەش لە بەردەم نیگای ئەو نەوسنم، بە هەموو

---

[١١٥] Choni khoshkakam?

وردەکارییەکەوە دیقەتی دەدەم و دەخۆمەوە، هەموو خاڵەکانی، هەموو قەتماغەی برینەکانی لە شین و مۆرییەوە بەرەو زەردی دەڕۆن.

"تۆ ئەم مەتەڵە هەڵبێنە، یەکێ لە هاوژوورەکەم زۆری لەسەر شیعر دەزانێ. من زۆر لەو شیعرانەی بۆم دەخوێنێتەوە لەبەرمکردووون. شیعرەکانی ئەو نەرمە گۆرانییەکانی تۆم بیردەخاتەوە. لەیلا، شتێکی زۆر خۆشە. هەرگیز وەهام نەدەزانی. ئای کە شیعر چ دەرمانێکە لە تەنیایی. خۆت دەبینی، خۆ ئەگەر لە شوێنێک، لە دوورگەیەک گیرتخواردبێ و هەر بە تەنیا مابیتەوە، شوێنێک کە چۆڵ و دوورەدەست بێ، ئەوا دەتوانی شیعر بخوێنیتەوە ئەوسا دەبینی، ئای لەوە! ئیدی تەنیایی دەڕەوێتەوە. کاتێ هاتمەدەرەوە، دەبینین ئاخۆ کامەمان زۆرترین غەزەلی[116] لەبەرە."

لە دوورگەیەکی چۆڵ و دوورەدەست یان لە زیندانێکی تاکەکەسی؟

"ئۆو، من دەیبەمەوە. خۆت ئەمە دەزانی."

کاتێکیش کاربەدەستان لێنەگەڕان بۆ هەفتەی دواتر بیبینم، هەڕەشەی ئەوەم کرد سەبارەت بە نیشانەکانی ئەشکەنجەی سەر جەستەی براکەم بە میدیای بیانی بڵێم. ئەوانیش بەڵێنی ئەوەیان لێوەرگرتم، لە بەرانبەر سەردان و تەلەفۆنی هەفتانە لەگەڵ چیادا، ئەو شتە بە "میدیای دوژمنان" نەڵێم. منیش قایلبووم.

---

[116] Ghazals

هەر زوو من و چیا کۆد و هێمای زمانێکمان داهێنا، وشە تەنیا بە لێو بزواندن و نووسین بە سەری پەنجە لەسەر شوشەبەندەکە. ئێمە لەسەر ئەوە کۆک بووین هەر کاتێک ئەو ئازاد کرا، وڵات جێبهێڵین و بەڵێنیشماندا پەرە بە توانای فێربوونی ئینگلیزیمان بدەین. ئەمەش وای لێکردم پتر سەیری فیلمە سینەماییەکان بکەم، کە بووە مایەی خاوکردنەوەی دەمارگرژی و حاڵەتی پەشێوییم. ئیدی شەوان بە بێ حەب و دەرمان خەوم لێدەکەوت.

چیاش پەخشانی نوێی لە زیندان نووسین، قەڵەم و کاغەزیشی بە نرخێکی دە هێندە زیاتر لە پاسەوانە هێرۆگێڵەکان دەکڕی و لە تەلەفۆنیشدا بۆی دەخوێندمەوە. منیش هەموو تەلەفۆنەکانی ئەوم تۆماردەکردن و قسەکانیم وەردەگێڕان و هەر دەمخوێندنەوە و دەمخوێندنەوە تا ئەزبەرم دەکردن.

ڕۆژێکیان چیا وێنەیەکی ڕەونەقداری شاری سنەی کێشا، گەڵاڕێزانی پایز، شتگەلێک لە پەنجەرەی زیندانەکەیەوە نەیدەبینی، بەڵکو بە خەیاڵ کێشابووی. بە شێوەیەکی گشتی لە پەخشانەکانیدا تەنیا و تەنیا ئاماژەی بۆ کوێرەوەریی خۆی کردبوو؛ لە بری ئەوە زۆری لەبارەی ساتەکانی کەوتنە داوی خۆشەویستییەوە نووسی، یان کاتێ گوێگرتن لە گۆرانییە ئەوینیەکانی عەباسی کەمەندی و ڕۆژگاری شاخەوانی لە شاخی ئاویەر. تەنیا ئەوکاتەیش لە یادەوەرییەکانی هەڵبڕا، کە تالاوی خوێنەکەی بە ڕێکەوت قووتدایەوە و خەریکبوو بیخنکێنێ.

"پاسەوانەکەی زیندان هات دڵنیابێتەوە تا بزانێ ئاخوا دوای لێدان و کوتانە توندەکەی دوایین جار ماوم، من دەمزانی ئەو حەزدەکا

لەبەردەستی لێکۆڵەرەکاندا بمرم نەوەک لە بەردەستی ئەودا. لە ڕێی دیوارەکانی زیندانیشەوە گوێم لە دەنگی موزیکی شادی ئاهەنگی ژنهێنان بوو. پاسەوانەکە نەیدەزانی. نەیدەتوانی درک بەوە بکا، کە موزیکەکە داڵغەمی بۆ داوەتی شایی خۆم هەڵفڕاند، لەوێوە لە سەرچۆپییەوە دەسماڵم ڕادەوەشاند و بە شاباش و خۆشییەوە، شاباش لە سەر هەموو ماڵباتی زیندانییەکان، ئەوانەی چاوەڕێی گەڕانەوە و دەستلەملانێی منداڵەکانیان دەکەن. خۆشی و شاباش لەسەر هەموو ئەو ژن و پیاوانەی ژیانی خۆیان خستۆتە سەر لەپی دەست تا گۆڕانکاریی بهێننەکایەوە."

ئێمە ئەو وتە بە جۆشانەمان خستە نێو تۆڕی تامەزرۆی ئینتەرنێتەوە. یونیسێف، پێن[117] و یەک دوو ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دیکە لەبارەی چیاوە لێدوانیان دا.

دەزگای هەواڵگریی بۆ سین و جیم بانگی کردم و منیش لە وەڵامدا پێمگوتن ڕایەڵەی ئینتەرنێت ڕێسا و قانونی خۆی هەیە. من گوتم، هیچم بۆ گوتن سەبارەت بە بڵاوبونەوەی وتەکانی چیا نییە. چیدی لێیان نەدەترسام. خۆ ئەگەر هەر شتێکیان لێ کردبام، ئەوا فشاری سەریان بۆ ئازادکردنی چیا پتر دەبوو.

کاربەدەستان ناچاریان کردم بچمە سەر شاشەی تەلەفزیۆنی دەوڵەت و لێدوانێک بدەم بەوەی براکەم لەم چەند مانگەی دواییدا ڕەفتارێکی شیاوی لەگەڵدا کراوە و ڕێگەیان داوە پزیشک ببینێ هەروەها سابون و کەرەستەکانی شوشتن و گەرماویان بۆ دابینکردووە. ئەمەش هەر تەنها ئەو کاتەی کە ئەو ئەم شتە

---

[117] PEN

سەرەتاییانەی پێگەیشت- ئاخر زیندانییە سیاسییەکان، بە پێچەوانەی خودی قانونەکانی ئێران، لێی بێبەشکرابوون - منیش قایلبووم لە بەرنامەکەیاندا دەربکەوم. لە پەخشی ڕاستەوخۆشدا من توتی ئاسا قسەکانی ئەوانم وتنەوە و هیچم لێ زیاد نەکرد، هەرچەندە میدیاکارە بەرپرسەکەی ئەوان بێهوودە هەوڵیدا بمخاتە سەر ئەو قسەیەی بڵێم، گوایە میدیا نێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە باسکردنی ڕەوشی زیندانەکانی ئێران پێیان لێهەڵبڕیوە و هەرزەگۆیی دەکەن. من هەر ئەوەم دووبارە کردەوە گوایە هیچ دەربارەی ئەو هەواڵە میدیاییانەی جیهانی نازانم. کاتێکیش بێژەرەکە لە میانەی پەخشی ڕاستەوخۆدا ئاماژەیەکی وایدا کە من وەک کاڵفامێک دەربخا، لێمپرسی، "ئەرێ بۆچی نەتپرسی ئاخۆ چەند ڕۆژی پێچوو تا سەرەنجام براکەمم بینی؟ ئایا دەتەوێ بزانێ کاتێ بۆ یەکەمین جار ئەوم بینییەوە، لە چ حاڵێکدا بوو؟"

هەر لەو کاتەدا بوو گوتی: "کاتی بەرنامەکە تەواو بوو."

شلێر بە بەدەرکەوتنم لە میدیای دەوڵەت خۆشحاڵ نەبوو. ئەو لەو بڕوایەدا بوو هەردەبێ چیا کەوتبێتە بن ·فشارێکی یەکجار زۆرەوە تا "دانپێدانێکی" ساختەی لێ دەربهێنن. ئاخر هەندێ لە هاوڕێکانی ئەو زیندانی سیاسی بوون و لەبارەی ڕێوشوێنی ئێران بۆ هەڵسوکەوتکردن لە گەڵ زیندانیان دەزانی.

پارێزەری چیا زەنگی تەلەفۆنی لێدا.

# بەندی بیست و پێنج

جومگەی بازندی دەستم توند گرتبوو تا لێنەگەڕێم خوێنی لی بتکێ دوای ئەوەی لەسەر ناوکەوە چیمەنتۆکە بەرببوومەوە، هەرچەندی دەمکرد و دەمهێنا هەراوزەنای خەڵکەکە بەری پێ گرتبووم، ئیدی پاڵم پێوەنان تا بۆ پێشەوە ڕێگەی خۆم بکەمەوە. لە دەرەوەی دادگاکەش بە لاچکی لەچکەکەم قامکەکانم بەستنەوە و پەستانی توندم خستەسەر، بەڵکو بەر بە شلە سورە ڕژاوەکە بگرم. هەواڵە حەپەسێنەرە و تاسێنەرەکەش سڕیان کردبووم و هەستم بە ئازاری دەستم نەکرد.

هەوراز، کوڕە بچووکەکەی فەرهاد دامێنی مانتۆکەی گرتم و بە کوردی لێی پرسیم: "شەهید نامرێ[118]؟" دایکیشی بۆ نیشاندانی پاڵپشتی لە دەرەوەی دادگا چاوەڕێی دەکرد.

"چی؟"

"شەهیدی ڕێگای ئازادی نامرێ[119]." ئەم جارەیان وەها وشەکانی گۆکردن وەک ئەوەی لێدوان بێ نەوەک پرسیار. منداڵە بچکۆڵەکە هەر ئەمەی دووبارە دەکردەوە: "شەهیدان هەرگیز نامرن. تێکۆشەرانی ئازادی هەرگیز نامرن."

---

[118] Shahid namre?

[119] Shahid regai aazadi namre.

منیش هاوارم بە سەردا کرد: "بێدەنگ بە! دەمت داخە." بەڵێ هەر یەکسەر دوای ئەوەی پارێزەر بانگی کردمە نووسینگەی خۆی تا بڕیاری لەسێدارەدانی چیام پێ ڕابگەیەنێ، لەو کاتەدا دوا شت کە ویستم گوێم لێبێ قسە دووبارەکەی ئەو منداڵە بچکۆڵەیە بوو کە گوتی: "شەهیدان هەرگیز نامرن."

منیش دەستە خوێن لێتکاوەکەم لە هەوادا بۆ ڕاوەشاند و گوتم: " کوڕیژگە، گوێم لێبگرە، ئازادی بێ یان ئازادی نەبێ، کاتێک کەسێک دەمرێ ئەوا دەمرێ، جارێکی هەرگیز ناگەڕێتەوە. بیرت بێ."

هەوراز هەندێ سەری خۆی لارکردەوە، سەیرکردنی چاوەکانی هاوشێوەی براکەم بوو کاتێ لەو تەمەنەدا بوو.

دانەویمەوە تا ئاستی دەموچاوی ئەو، ئینجا پێمگوت: "چیا نامرێ. هەروەها باوکی تۆش نامرێ، باشە؟ ئێمە ڕزگاریان دەکەین. ئەوان هەم دەمێنن و هەم ئازادیش دەکرێن. گوێت لێمە؟" پەنجەکانم لەسەر دەفەی شانی منداڵەکە گیرساندنەوە، لەوانەیە زۆریش بە توندی بێ، بەڵام هەر بە پەشێوی سەیری دەکردم.

هەورام، برا هەراشترەکەی، هەنگاوێک هاتەپێشەوە و لێم ڕاما. منیش پەییم بە کوڕەکە برد. داکیشیان بەدیارکەوت و دەستێکی لەسەر شانی کوڕەکەی دانا.

من ئەمەم بە دایکەکە گوت و گوێشم لە دەنگە لەرزۆکەکەشم بووەوە: "تۆ نابێ منداڵەکان فێرە ئەو شتانە بکەی. تۆ نابێ وەها بکەی."

"ئاخر ئەدی بە منداڵێکی حەوت ساڵان بڵێی؟"

من لەویٚ ڕۆیشتم و دەستم لە تاکسییەک ڕاگرت. ئاخر هیچ وەڵامم پێنەبوو.

هەر تەنیا دوای تێپەڕبوونی چەند تاکسییەکی بەتاڵ کە بۆم ڕانەوەستان، لەوە بەئاگاهاتمەوە فرمێسک و ماسکارای چاوم بەتێکەڵی بە دەموچاومدا دێنەخوارەوە. دڵۆپە خوێنی گەورەش لەژێر چمکی لەچکەکەمەوە کە لە دەستم بەستبوو، دزەیانکرد. هەستمکرد هەندیگاویٚ دەبوورێمەوە. بە سەردەستەم دەموچاوم سڕی و دەستیشم لەناو کۆشم دانا. لە کۆتاییدا تاکسییەکی ڕەنگپرتەقاڵی ڕایگرت، خاوەنە چاویلکەکە زۆر پیربوو، بە ئاسانی نەیدەبینی لە چ حاڵ و ڕۆژێکدمدام. منیش خۆم هاویشتە نێو ترومبێلەکەی و ناونیشانەکەم پێدا و داوام لێکرد بە پەلە بمگەیەنیٚ. من دەبووایە بگەمەوە ماڵەوە، خۆم بگۆڕم و یەکسەر ڕێگەی زیندانی ئێڤین بگرمەوەبەر. وردەوردە دەنگی مەکینەی ترومبێلەکە بە سەر ترپەی دڵم زاڵبوو. ئیدی پشتم دایەوە تا سەرم بەر پاڵپشتە سەری گوشنی سەیارەکە بکەویٚ و هەندیٚ بحەسێمەوە.

من بە تەما نەبووم مستێک لەو پارچە شوشە دیکۆرەی سەر مێزی پارێزەرەکە بدەم، ئەگەرچی هێما خاپێنەرەکەی دادپەروەریی تەواو هەراسانی کردبووم. لیٚ کاتیٚ پارێزەرەکە هەواڵەکەی درکاند، کاتێک گوێم لیٚ بوو گوتی چیا بە تۆمەتی تاوانی هەڵبەستراوی موحارەبە[١٢٠] تاوانبارکراوە کە مەبەست لێی "دوژمنایەتی خودا" بوو - سزای ئەو تاوانەش مەرگە - ئیدی جڵەوی خۆم لەدەستدا، توند چەپۆکێکم لە تەرازووە شوشەییەکەی بەردەمم دا و شکاندم.

---

[١٢٠] Moharebeh

هەروەک ئەو پشیلەیە دەقوژبن ئاخنراوەی کە ئارەزووی دەخواست وابزانن شێرە، ئیدی هزرم کەوتە نوزەنوز و پەلهاوێشتن

به گەڕانەوەم بۆ ئەپارتمانەکە، جلەوم کەوتبووە دەستی غەریزەیەک: "گۆڕینی قەیتانە پەمەییەکەی پێڵاوەکەم بە قەیتانێکی ڕەش. هێنانەدەری سەرپۆش و لەچکێکی ڕەش بە شێوەیەک گشت تاڵەکانی قژم، کە هەمووی ماشوبرنجی بووبوو، بشارێتەوە و دیار نەبن. کۆکردنەوە و توندکردنی پرچم لە پشتەوە و بە نزمی بەستنی تا وەها دیارنەبێ کە بە تۆقە قایمم کردووە، ئینجا بە تەواوی خۆت لە عەبا ڕەشەکەت وەرپێچەوە." من ئەمەم بە دەنگ دەگوتەوە تا لەبیرم نەچن و تیشکۆی خۆمیان بخەمەسەر. پێویستم بەوە بوو لە بەردەم ئەم جڤاتە "پاکیزەیەدا" زەق دەرنەکەوم. "هەموو هێمایەکی مێینەیت لەبن عەبایەکەت بشارەوە. دەی بزربە." بە گەڕان لە نێو چەکمەجەی دۆلابەکەمدا، جووتە دەستەوانەیەکی ڕەشیشم دۆزینەوە، سەرباری لەدەستکردنیان ئازاری دەدام، لێ هەرچۆنێک بێ قامکە هەڵاوساوەکانم تێ ئاخنین.

ئینجا بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە سەر شەقامە جەنجاڵەکە، بەلای دارگێلاسە پڕ لە چرۆکاندا ڕۆیشتم، تیشکۆی هزرم هەر بە تەنیا لەسەر ئەو ڕاستییە ڕژدبوو، کە ڕۆژەکەی هات – لە کۆتاییدا، لە دوای ئەوەی نۆزدە جاران داواکاریم پێشکەش کردبوو- بەوەی چیا ڕووبەڕوو ببینم، نەوەک لەودیو شووشەبەندی پەنجەرەوە. دیداری ڕووبەڕووم وەرگرت بێ ئەوەی پێشوەختە دایکە و بابەش ئاگاداربکەمەوە تا سەفەرەکە بکەن. ئەوان زۆر بە توندی بۆ ئەوە تێدەکۆشان؛ دایکە تامەزرۆی دیتنی من و چیا بوو، هەرچی بابەشە

هێند شاناز بوو کە نەیهەوێ سەردانی ماڵی کچە حاشالێکراوەکەی بکا، ئەوەندەش موفلیس بوو کە نەتوانێ هۆتێلێک بگرێ. دۆخەکەش زۆر لەگەڵم دەهاتەوە؛ ئاخر مەیلم لەسەر ئەوە نەبوو ئەو چەند خولەکە کەمانەی ڕێگەدراوە بۆ بینینی براکەم لەگەڵ کەسی دیکەدا بەشیبکەم.

هۆڕنی ترومبێلان، جەنجاڵی ڕێگا، ڕووداوەکان و سەختی پەڕینەوە و گەیشتن لەبەر قەرەباڵغی ڕێگاوبان، هیچ لەمانە کاری نەکردە سەر ئامانجی ئەرکەکەم. خۆ نەدەکرا مێژوو بگۆڕم، نەشدەکرا ئاینده جڵەوبکەم، بەڵام خۆ دەکرا چیا ڕزگاربکەم. من هەر دەبێ چیا دەرباز بکەم. خوا دەستبەردارمان بووبوو. هەروەها هەموو کەسێکی دیکەش. هێشتاش تا دوا هەناسەی ژیانم نەمدەویست چۆک دابدەم.

دوای چەندین سەعاتی بێ کۆتا وەستان و چاوەڕوانکردن لە ڕیزی جۆراوجۆرەوە، ڕێنوێنیکرام بۆ قاوشێک، لەوێ زیاتر چاوەڕێ بم، خۆشم لە نیگای پاسەوانەکان بدزمەوە، چەند بارە خۆم بپشکنمەوە مەبادا داوەموویەک لە نێو حیجابەکەمدا هاتبێتە دەرێ. عەباکەم هەر لە تەوقی سەر تا قولەپێ داپۆشیبووم.

لەبەرچاوی پارێزوانانی هوەلحەق، کەسوکاری زیندانیانی سیاسی مێش و مەگەزی کۆمەڵگا بوون، دەبووایە لەناوببرێن. ئاخر جەللەجەلالەهوش بە دەسکێک سمێڵەوە پاڵپشتیان بوو.

منیش هەر لەبەرخۆمەوە بە بێدەنگی دەمگوت و دەمگوتەوە: "چیا دەبێ بمێنێ؛ چیا دەبێ ئازاد بکرێ." هەموو بیرۆکەکانی دیکەم لە مێشکی خۆم هاوێشتبووە دەرەوە تا ئەوکاتەی سەروسیمای

بەخۆداشكاوی براكەم لە كۆتایی دالانەكەدا لێ بەدیاركەوت و بە لەنگی[121] بەرەو ڕووم هات، پاسەوانێكی چوارشانەش یاوەریی دەكرد، كە چوار جاران هێندەی خۆی بوو. دیاربوو پیاوەكە خۆی بە كۆلۆنیا شوشتبوو. ئێمەیان بۆ كونجێكی بچكۆلانەی نێو چوار دیوار ڕێنوێنی كرد؛ تاكە شتیش كەلێی بوو، تەختەبەندێكی ڕەنگبزڕكاو بوو.

چیا بە دەنگێكی ئەوەندە نەرمونیانەوە گوتی: 'لەیلا گیان! گوڵە گیان[122]." ئیدی ئەمە دڵنیابوونەوە بوو لەوەی بە تەنیا دەنگەكەی دەرمانی دەردم بوو. منیش باوەشم پێداكرد، بۆنمكرد، ئومێدم خواست دەنگە نەرمەكەی نەبڕێتەوە.

ئەو پرسی: "ئەرێ چۆنی؟" بە ئاستەمیش باسكەكانی جەستەی منیان پێڕادەگیرا، وەک ئەوەی لە ئامێزگرتنەكە هەموو هێزوگوڕێكی لەبەربڕیبێ و دایدۆشیبێ. بەرمدا و تەنیا دەستە زبرەكانیم گرت، خۆم وەها لێكرد وەک ئەوەی سەرنجی ئەوەم نەدابێ كە شەویلاگەی شكاوە بۆیە قسەی بە نارۆشنی لە دەم دێتەدەرەوە.

ئیدی ڕوومەتی، چاوەكانی و هەنیەكەیم ڕاموسی. گوتم: "ئەی بە قوربانی چاوەكانت بم، چیا گیان."[123] ئەم قسەیەم دووبارەكردەوە. وشەی سۆز و خۆشەویستیم بە گوێدادان، ئەو وشانەی هەرگیز پێشتر پێمنەگوتبوون، بەڵام ئێستا بە مەبەستەوە پێمگوتن، هەر بۆ

---

[121] بە لەنگی: دەلەنگی: دەشەلی.

[122] Gola gian

[123] Ay ba ghorbani chawakanet bem, Chia gian.

ئەوەی بەڵکو تروسکایی بۆ چاوەکانی بگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو تەزووە پڕ لە ئازارەی بە قوڵیدا دەڕوا بوەستێ و نەمێنێ.

پاسەوانە خوێنتاڵەکە بە دەست لە دیوارە سپیهەڵگەراوەکەی داو گوتی: "بە فارسی!" بە دەم ئەم تووڕەییەوە ناوکەو و بنمیچەکەش لەرینەوە. ئیدی لە قسە وەستاین.

هەرچەندە وشەکان بە تاڵاوەوە لە دەمم دەردەچوون، بەڵام زمانی پاسەوانەکەم بەکارهێنا. "چیا، ئازیزم، من باشم. من کاردەکەم، دەخوێنمەوە و سەیری فیلمیش دەکەم. خاوەنکارەکەم دەرماڵەی داومەتێ. ئەویش لایەنگرێکی نامەکانی تۆیە. تۆ چۆنی؟ پێمبڵێ ئاخۆ تۆ باشی؟"

خۆی ئاسانتر بوو بۆ من کاتێ بە زمانی زگماکم نەدەدوام، ژان و ناسۆرم بشارمەوە، لی کاتێ چیا منی دەبینی، هەستمکرد ئاشکرا بووم و هەموویم پێوە دیارە. ئەو سەیرێکی دەستەوانەکەمی کرد بێ ئەوەی هیچیشم لەو بارەیەوە لێ بپرسێ.

"منیش زۆر باشم، کاتی زۆرم بۆ خوێندنەوە و بیرکردنەوە هەیە. ئەگەر هاتوو مێشکێکی ئافەریدەکاران و پرسنیت هەبێ، ئەوا زیندانیش ئەوەندە خراپ نییە، خۆت دەزانی، بۆ قووڵبوونەوە لە ژیان، لە هەبوون..." شانێکی هەڵتەکاند، ئینجا گوتی: "خۆم فێرە ئینگلیزی دەکەم."

ئاهێکی شکاو لە گەرووم دەرپەڕی؛ دەکرا هەناسەیەکی بە دەنگ بێ، کە من لە هەناوم گرتبێتەوە بە شێوەیەک گوێی لێ بگرمەوە و حیساب بۆ هەموو وشەیەک و هەموو ئاماژەیەکی دەربڕی جەستە بکەم. یاخود لەوانەیە هەر خەندەیەکی دەنگدار بێ گوێم لێبێ، بەڵکو

شتێکی باشم سەبارەت بە مانەوەی لە نێو چواردیواردا پێ بڵێ. قسەکردن بە زمانێک کە هی خۆمان نەبوو ئاسانتر بوو تا بە هێزی ساختەیی خۆتی پێ نمایش بکەی. "چیا گیان، چی دەخوێنیتەوە؟"

"زۆر کتێبی قانونی ڕێگەپێدراو لێرە هەن. من ئامادەی ئەوەم کاتێ دەرچووم کاری قانونی بکەم. هەروەها دەتوانم لە دادگاش بەرگریی پێ لە خۆم بکەم، ئەگەر هاتوو گەیشتمە ئەوێ. هەر دەبێ ئەمەش بەم زووانە ڕووبدا. مەبەستم ئەوەیە، من نازانم، بەڵام دەبێ. بیانەوێ یان نەیانەوێ، خۆ هیچ بەڵگەیەکیان لە دژی من نییە."

ئەو دەیزانی من ناوبەناو پارێزەرەکەی دەبینم و بڕیارەکەشی بیستووە. لەوانەیە ئەویش هەروەک من ئامادەی بەرگریکردنەکە بێ. خۆ لەخۆڕا پیاوێکی بێ خەتا هەڵناواسن، کێش؟ کەسێک کە لە ڕێی نامە و شیعرەکانییەوە، خۆشەویستییەکی زۆری خەڵکی لە سەرتاسەری دونیادا پەیداکردووە.

کاتێکیش پاسەوانە چەکدارەکە زەینی لە سەر ئێمە بڕا تا شتێک بئاخنێتە دەمی، یەکسەر چیا نامەیەکی خستە کۆشی من، شتێکی بە قەڵەمێکی ئاڵ لە سەر پارچە نایلۆنی سەرمێز نووسیبوو.

منیش فرمێسکە ڕژاوەکانم سڕینەوە و دووبارە دەستم گرتەوە. "کەواتە دار گێلاسەکە کەوتووەتە ژێر شکۆفەکوڵان. ئەو نەمامەی تۆ لە باخچەکەدا چاندت. ئەم ساڵ گێلاسی تەڕوتازەمان دەبێ."

چیاش کۆخی، خەریکبوو بخنکێ، لێ چاکبووەوە. "دەی هەندێکم بۆ هەڵبگرە، باشە؟

"قسە لەگەڵ مەل و کرمەکان دەکەم. بگرە." ئیدی هێدفۆنە کۆنەکەم دایە دەستی.

بە پێکەنینەوە گوتی: "ئەم شتە هێشتا هەر ئیشدەکا؟"

"سەیرە، وایە؟"

ئەوسا بە ئینگلیزی گوتی" بە بینینی ئەم شتە زۆر دڵشادم."

کە پێمگوت "چاو لە تۆ!" لێی نزبوومەوە، هەوڵمدا چاو نەترووکێنم بەڵکو بتوانم زۆرترین گرتەی دەروونیی لێبگرم. کاتێ بە خەندەیەکی بچکۆلانە هێڵەکانی ڕوخساری گەشانەوە، هەموویم لە مێشکمدا تۆمارکرد.

پاسەوانەکە لە شوێنی خۆی هاتە جواب: "شتی ئەلەکترۆنی ڕێگەپێدراو نییە. چۆن توانیت ئەمە ئاودیوی ئێرە بکەی؟" ئەوەبوو بە جووڵەیەکی تەڕدەستانە هێدفۆنەکەی لە دەستی ڕاپسکاند[١٢٤].

منیش چاوی خۆم نووقاندن، نەوەک لەکاتی لە دەست ڕاپسکاندندا بە شکاوی بیبینم.

"تۆ سەیری ئەمانە کە، ئەو شتە قۆڕە چیە هێناوتەتە ژوورەوە؟"

بۆنی کۆلۆنیایەکەی دەیدا لە مێشکم.

چاوم تروووکاند و ئاوڕێکم دایەوە، بە دوای پەنجەرەیەکدا گەڕام، بەڵام خۆ شوێنەکە بێ پەنجەرە بوو. هەناسەم تەنگ بوو، بەڵام بە بوونی ئەو زۆر دڵگەش بووم.

ئەو گوتی: "شاگەشکە، ئەمە وشەکەیە." چیا درێژەی بە گفتوگۆیەکەدا، هەوڵیدا دەمەتەقێکەمان نەپچڕێ، ئەمەش سەرباری ڕەفتاری زبری پاسەوان و ڕێوشوێنە توندە نالۆژیکەکە یان

---

[١٢٤] ڕاپسکاندن: بە زۆر یان لە هیکەوە شتێک لە دەستی یەکێک دەربهێنی.

تیاچوونی یادگاریەکەی منداڵیمان، یادگاری ئەو ڕۆژانەی منداڵیمان کە دەمتوانی براکەم بپارێزم.

بە دەم فرمێسک قووتدانەوە گوتم: "باوانم[١٢٥]، کامە وشە؟"

"وشەی ئەوەی ئاخۆ ئێستا هەست. هەنووکە، کە دەستی تۆم گرتووە." کەوای وت ئیدی لە باوەشی گرتمەوە.

منیش بە سرتەوە: "وڕێنەکردن، ڕاستیت بوێ ئێستا ئەمە هەستی منە."

ئەوسا منی بەردا. "ئەرێ بە ئینگلیزی هێدفۆن چییە؟"

"چی؟ نایزانم! مەگەر هێدفۆن وشەیەکی ئینگلیزی نییە؟ هەونییە؟"

ئەویش پێکەنی. "گوێ لەمە بگرە. ئینجا گۆرانی بۆ گوتم.

"توینکل، توینکل، لیتل ستار..."[١٢٦]

دیسان پاسەوانەکە هاڕاندییەوە: "بە فارسی!"

منیش بە توندی پێکەنیم، پێکەنینێکی ساختە. "تۆ هەر بە منداڵێکی پێنج ساڵان دەچی."

چیاش خەنییەوە. "من لە تەمەن بۆ دواوە دەگەڕێمەوە، ئەمەش لە سایەی زیندانەوەیە."

ئیدی هەردوو پەنجەی گەورەم لە گوێکانم ئاخنین و دەستیشم بۆ سەرم وەک قۆچ لێکرد و چاویشم سوڕاند. ئاهێکی شاگەشکەییانەی سەیروسەمەرەی لێوەهات و ددانیشی گرکردنەوە. ئیدی لەناو پێکەنیندا تواینەوە. پاسەوانەکەش دەستی بۆ تفەنگەکەی

---

١٢٥ Bawanem

١٢٦ Twinkle, twinkle, little star.

شانی برد. دەنگی پێکەنینمان لە نێو چوار دیواری شوێنە تەنگەبەرەکەمانەوە سەدای دایەوە.

کاتێکیش وادەی سەردانەکە کۆتاییهات، پاسەوانەکە من و چیای بە ڕاڕەوەکەدا برد، کە هەندێ لە زیندانییەکانی دیکە خواحافیزیان لە کەسوکاریان دەکرد. چیا گوتی: "سەیری ئەوێ بکە. کوڕەکانی فەرهاد لێرەن تا دوا ڕۆتینی وەرزشیانەیان بۆ باوکیان نمایشبکەن."

"ئەوان برادەری منن. ئەم دوو منداڵە بچکۆلانەیە، هەورام و هەورازن."

منداڵەکان کردەی ئەکرۆباتی خۆیان نیشاندەدا و بە دەوری کورسییەکاندا دەسووڕانەوە و لە خۆشیان هاواریاندەکرد، دەنگی ئەوان سەدای زایەڵەی جووڵە و باوەڕ بوو. پاسەوانەکەش هاواریکرد: "دەی بۆ دەرەوە." منیش باسکم لە براکەم ئاڵاندن و کولیچەم خستنە بەرکییەوە، ئەوانەی دایکی شیرین دروستی کردبوون.

"لەیلا، هەر بە ڕاستی پێویست ناکا لەبەر من نیگەران بی. من لە شوێنێکم پڕە لە کەسانی ڕۆشنبیر و هونەرمەند. لە ناخەوە ژیانێکی دەوڵەمەندمان هەیە و ناتوانن لێمانی بسەنن." چیا کە ئەمەی گوت توند دەستی گوشیم، ئینجا تێهەڵچووەوە: "من هەرگیز لە هەمان کاتدا ئەوەندە خەڵکی نایابم لە دەور نەبووە."

ئەوسا دەرگەکە داخرایەوە.

منیش دەستم توند لەیەکدان و هاوارم کرد تا هەموو زیندانە سیاسییەکان گوێیان لێبێ: "هەرگیز دەستەوەستان نەوەستی.

هەرگیز کۆڵ نەدەی، هەرگیز کۆڵ نەدەی. بە یەکەوە ئەم دۆخە تێدەپەڕێنین."

"هەی جادوگەر برۆ بە نەفرەت بە تا تۆشمان نەخستۆتە پشت دەرگایەکی پۆلایین." ئەوە بوو پاسەوانێکی ئافرەت دەستی منی گرت و پاڵێکی پێوەنام و لەوێ لایبردم. منیش زۆر لە هەناسەدانەوەکەم وریا بووم. ئەو منی بۆ خوارەوە بۆ ڕاڕەوەکە پاڵنا. کوڕەکانی فەرهاد و منداڵە وردەکانی دیکە لە کۆشی کەسوکاریان بە خۆشی دەیانقیژاند. پێکەنینی ئەوان ڕوخساری زیندانیان و کەسوکاریان گەشاندەوە، بەڵام هی پاسەوانەکانیشیان مڕومۆچ کرد. پاسەوانە ژنەکە منی ڕاونا تا لە دەرکە دەریکردمە دەرێ.

یەکێ لەسەر شەقامەکە هاواری کرد: پیرۆزە ڕۆژی ئایار!" لە هەموو ڕێگاکەمدا بۆ ماڵەوە، هەر ئەو سروودە کوردییە شۆڕشگێرییەم بە نەرمە ئاوازێک دەگوتەوە: "کارکەرین. جەنگاوەرین..."

دەوڵەمەندی لە ناخدا، چیا گوتی؛ دەوڵەمەندی لە ناخدا. ئەمە دڵنیاترین سەرمایەگوزاریی ژیان و دڵسۆزترین هاوڕێی مرۆڤە. منیش خەریکبووم بەکاوەخۆ لەناخمدا خۆم دەوڵەمەند دەکرد.

## بەندی بیست و شەش

لەدڵی خۆمدا دەڵێم قوتابییەکانم ئێستاش بە دزییەوە هەر خەریکی فێربوونی مێژووی کوردن. لەیلاش باشە، دەکرێ لە دووریی منیشدا کارەکانی خۆی راییبکا. کە سەدای بانگ لەقاوشەکانی زیندانی ئیڤین دەنگدەداتەوە ترس و لەرز دەکەوێتە گیانمەوە.

دەنگی تەپەی پێ.

بەڵێ دەنگی تەپەی ئەو پێیە قورسانە دەناسم. زۆر باش دەیانناسم. گوێم لە دەرگە ئاسنینەکە بوو کرایەوە و پێوەدرایەوە، گوێم لە سیرەی ڕستە کلیلی قورسی پاسەوانەکە بوو، دیسان دەرگەیەکی دیکە کرایەوە و داخرایەوە، هەروەها یەکێکی دیکەش. تا دێ دەنگی پێیەکان قەبە دەبن. خامەم لە دەست کەوت و وەک تۆپ پێچم خوارد، لە ترسان ڕێکهەلاتم. سێ دەرگەی دیکە، ئینجا گەیشتنە سەر من. ئازار لە سەر و ڕوخسارم، لە قاچ و پشتم، لە گەدە و پەراسووەکانم تا دەهات تیژتر دەبوو. خۆم بە سەرینەکەوە نووسان، بەڵام هەژانی قۆڵەکانمی ڕاناوەستتاند.

دەنگی تەپەی پێیەکان بەر لەوەی بگەنە ژوورەکەی من وەستان.

لەمێشکمدا دەڵێم: دەستت بەرزکەوە.

دەنگی پاسەوانە پیرەکە دێت: "دەستت بەرزکەوە."

من دەزانم لە چاوەژوورەکانی دیکە چییان کردووە. بە پارچە پەڕۆیەک چاوی دەبەستن، زڕەی کەلەپچە و پاسەوانیش (عەلی) دینێتەدەرەوە، پاڵی پێوەدەنێ و دەیداتە بەر شاپ و زللە.

من لە مێشکی خۆمدا هەروەک چۆن عەلی بە سەر پەیژەکاندا دەبەنە خوارەوە، منیش وەها دوایان کەوتم، نۆزدە هەنگاو بە لای دەستەڕاست، ئینجا پازدە پلیکانەی دیکە بۆ خوارەوە، لەوێ درانەدەستی لێکۆڵەرەوەکان. لەژێر پەڕۆی بن چاوبەستنەکەوە، عەلی ژمارەی جووت پێڵاوەکانی ژوورەکە دەژمێرێ: چوار، شەش، هەشت پێڵاوی فەرمیی خوێناوی، بە خوێن ڕەونەقدرابوون.

هەر زوو دوای جوێن و نەفرین، نۆرەی قامچی دێت. خۆ ئەگەر ئەو کابرایەی ناوی (مۆنگرێل[127])ە لەوێ بێ، ئەوا لێپێچینەوەکە درێژە دەکێشێ. هەموو زیندانییەک دەزانێ، دەنگی سەیری ئەم زەلامە دەناسێ، زەنگێکی نەرمی نائاسایی لە هەر ساتێکدا بتەقێتەوە. ئەو کورد بە "ناپاک و بکوژی دڕندە" بانگدەکا، ئینجا نیشانمان دەدا ئاخۆ کێ دڕندەی ڕاستەقینەیە. بەندوباوی ئەوە هەبوو گوایە براکەی مۆنگرێل بەر لە سێ ساڵ لە کوردستان کوژراوە، ئەو کاتەی چووەتە ئەوێ تا ڕاپەڕینی کوردان سەرکوت بکا.

پێنج، شەش قامچی، ئیدی عەلی بیر لە ئۆردوگای زۆرەملێ، لە هەڕەمەکان، لە دیواری مەزنی چین دەکاتەوە. هیوادارم چیدی هەست بە زەبری قامچییەکان نەکا.

---

Mongrel[127] بە سەگی دووڕەگە دەگوترێت کە سەر بەهیچکام لەتوخمە ناسراوەکانی سەگ نییە، بەڵکو تێکەڵەیەکە لە دوو توخمی جیاوازی سەگ.

ژمارەی درزکردنە دیوارەکە ئەمڕۆ گەیشتە ٣٠٥. قەڵەمێک لەبن بەتانییە سەربازییەکەم دەردەهێنم و ئەو کاغەزەش کە شەش جاران نوشتێنراوەتەوە، لە نێو جلەکانی ژێرەوەم دەردەهێنم. دەنووسم: *لەیلا*، بەڵام خۆ قەڵەمەکەم گۆد دەبێ. لەسەر ئەوەی لەیلام بەجێهێشت، تەزوویەکی خۆبەتاوانبارزانینم پێدادێ. *قوتابییە خۆشەویستەکانم*، ئەم جارە خامەکەم خۆشڕەوانە دەڕوا. *هەموو ئەوەی من دەتوانم بۆ ئێوەی بکەم، ئەوەیە فێری ئەلفبێتکەی خۆمان، ئەدەبیاتی خۆمان و مێژووەکەمانتان بکەم. منداڵینە، تکایە، لێی دەرچن. هەی خۆشەویستان، هەرگیز ڕێگە نەدەن ئەم زانیارییانە خۆشیی منداڵیتان لێ بتارێنێ. جەرگەکانم یادەوەرییەکانی نەوجەوانیتان لە مێشکتان بۆ هەمیشە هەڵبگرن، کە خۆی تاکە وەبەرهێنانی بەنرخی ژیانتانە؛ کوڕەکانم، دواتر کاتێ کوێرەوەرییەکانتان لەپای وەچنگخستنی پاروونانێک بەسەرتاندا زاڵدەبێ، بەکەڵکتان دێ. کچەکانم ئەودەمەی لەککەی گوناهی "ڕەگەزی دووەم" بەسەرتاندا باڵکێش دەبێ بەکەڵکتان دێ.*

پیاوان لەبن بەرگی شیندا لە ڕۆیشتنیاندا قاپقاپە شینەکانیان لە دوای خۆیان بە سەر زەویدا دەخشێنن. خشەخش لەسەر پلیکانەکانەوە دێ.

*لە بیرتان بێ پشت نەکەنە خەونەکانتان، پشت نەکە خۆشەویستی، موزیک، شیعر و سروشتە سیحراویەکەی کوردستان. دەستی یەک بگرن و گۆرانینە میللی بڵێنەوە. وەک چۆن جاران دەمانگوتەوە.*

چرایەک لە نێو تۆڕێکی ئاسنیندا تیشکی کزی خۆی بڵاودەکاتەوە. سەرشۆکە ستیلەکەی ژوورە تەنیایەکەم بۆگەنیکردووە. منیش بە دەنگ دەمگوتەوە: "لەنێو مندا زیندانییەکی زبر هەبوو بە زرەی زنجیر ڕانەهاتبوو،" دەستیشم بە دەرگەی چاوە زیندانەکەمەوە گرتبوو، مەوداکەشی لە دیوارەوە بۆ دیوار هەر پێنج هەنگاو دەبوو.

لەودیو شیشەبەندی دەرگەکەوە عەلی ئەوەندە وشک، ئەوەندە لاواز بووبوو، بەڵام دەنگی لێبڕاوانە بوو. "دیسان شیعرەکانی شاملۆ؟"

پێنج مانگ بوو خۆم نەبینیبووەوە -ئاخر ئاوێنە لە زیندانەکەدا نەبوو- بەڵام دڵنیابووم لەوەی منیش لە عەلی باشتر نیم.

پرسیم: "تۆ بڵێی، باشترین دەرمان چیە؟"

عەلی گوتی: "کەواتە خۆ شیعرەکانی خۆت نین؟"

"من شاعیر نیم، تەنێ مامۆستایەکم شیعری خۆشدەوێ." هەوڵمدا سەرم بۆ لای ئەو وەرسووڕێنم، سەرێک لە نێوان شیشە ئاسنەکاندا گیریخواردبوو. "ئەرێ پێم گوتبووی، قوتابییەکەم هەبوو بە ناوی عەلی؟"

عەلی ڕەنگی منی دەدایەوە و چاوی لێ دادەگرتم. دەمزانی لەبن جلی زیندانییەوە، جەستەی ڕایەڵەی هەموو زامەکان بوو. هی منیش هەروا.

"چیا، چییان لێدەکەی؟" ئەمە دەنگی عەلی بوو، دەهەژا. ڕوومەت و چاوەکانی ڕووشابوون، هەر ماسولکەکانی مابوون. "ئەرێ ئەگەر هاتوو بتەوێ شتێک لەو سادیستانە بکەی، چی دەکەی؟"

بۆ ماوەیەکی زۆر بیر لەو پرسە دەکەمەوە. "دەیاننێرمە کەمپی چاکسازی."

عەلی بۆ نیشاندانی بزەیەک زۆری لەخۆی کرد. "ئەرێ هێشتا پێت ئازاری هەیە؟"

"عەلی گیان، سەرتاپای بەدەنم دێشێ. لێ خۆ ئەوە ئازاری نەتەوەیەکە... هەروەها چاکبوونەوەشیەتی. کەواتە ئەوەندە خراپیش نییە."

"مامۆستا، کاتێ ئازاد دەکرێی، ئاگادار بە لە بیرمان نەکەی."

عەلی هەر پێیدەگوتم "مامۆستا." دەنگیشی تا دەهات کزدەبوو. هەرچەندە جەستەی ئەو لە هی من بەهێزتریش بوو، کەچی دەمزانی ئەو لەوە ناسکترە تا زیاتر لەوە بەربگرێ یان قسە بکا. دوای ئەوەی بە هۆی لێپێچینەوە تووشی هەوکردنی برینی سەرئاوەڵە بووم، ئیدی من نۆزدە ڕۆژم لە هۆدەیەکی چارەسەری باری ناکاو بردەسەر. بە ئاستەم ڕێگەی خەوتنیان پێدەدام، بۆم نەبوو لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا، زیاتر لە دوو جاران ئاودەست بەکاربێنم و لە ژوورێکی ساردوسڕ فڕێدرابووم. تاکە شت لەو ژوورەدا کە بتوانم خۆی تێوەرپێچم، حەسیرێکی سپیلکە بوو.

خۆ هەر دەبێ لەگەڵ عەلیش یاری "تۆپانێ"یان کردبێ. لێکۆڵەرەوەکان "یاریکەر"ن و لە گۆشەکانی هۆدەکە دەوەستن. فرمان دەکەن "دوژمنانی خوا" ڕووتکەنەوە، تا شاپ لە جەستەمان

هەڵدەن، جوێن و نەفرین بە سەر خۆمان و نەتەوەکەمان ببارێنن، شاپ لە سەرمان بدەن، لەو شوێنانەمان بدەنەوە کە هێشتا برینی تۆپانێی پێشووی پێوەیە، ئینجا گەف لە خێزانەکانمان دەکەن، گەفی ئەوەی لاقەمان بکەن. ئێمەش ناتوانین بەر بە ناڵە و هاوارمان بگرین، هەر ئەمەشە ئەوان ئاسوودە دەکا.

*عەلی گیان مەگری، گریانەکەت نیشانەی زەبوونی نییە.* ئەوە بوو لە پەراوێزی ڕووپەڕی ڕۆژنامەیەکی میریدا نووسیم، شتێکم نووسی، کە نەمتوانی ڕووبەڕوو پێی بڵێم. *من کۆرپەلەم لە کاتی لەدایکبووندا بینیوە. گریان و ململانێ، یەکەمین ئاماژەی ژیانن نەوەک نیشانەی زەبوونی. "کێو بە یەکەمین گاشەبەرد و مرۆڤیش بە یەکەمین ئازار دەستپێدەکا."*

*"ئەرێ وە فیدای دوو دیدەی ئازیزم، شەو بێ خەوت بام، لای – لای- لای- لای..."* گۆرانی لای لایەم دەگوت، ئەو گۆرانییەی عەلی ڕاهاتبوو بۆ کیژەکەی بڵێ کاتێ ساوا بوو. مەراقبووم بزانم ئاخۆ ئەم هەفتەیە دەیانبینێ یان دەبێ چاوەڕێبکا تا بەلای کەمەوە جێبرینی دەموچاوی هەندێک چاکببنەوە.

عەلی دەگریا و منیش بە دەنگێکی بەرزتر : *"لای- لای- لای- لای..."*

دەنگی لایلایەکەم بە نێو دیوارە کۆنکرێتییەکاندا تێدەپەڕی. زیندانییەکانی دیکە، سیاسی و ناسیاسییەکان کپوبێدەنگ بوون. لایلایەکەم ئەوانیشی لاواندەوە، هەرچەندە هەر هەمووشیان بە زمانی من نەدەدوان. هەندێکیان وەک منالی ساوا هەر هەنسکیان دەدا.

*لای-لای-لای-لای... کەژوڵەی چاوکەژاڵم... لای- لای- لای[١٢٨]...*

❖

ژمارەی هەڵکۆڵینەکانی دیوارەکەم ژماردن: هەژدە، نۆزدە، بیست.... پارێزەرەکەم بەڵگەنامەکانی پێشکەش دەکا. لێرە بە زەحمەت هەناسە دەدرێ. ژوورەکە بۆنێکی وەهای لێدێ وەک ئەوەی دیوارەکانی لە تەرم دروستکرابن. دادوەرەکە لەسەر کورسی خۆی هەڵدەستێ بەرەو ئەو دەرکەیە دەڕوا کە تاوانبار ناتوانێ پێیدا تێپەڕێ. ئەم دەرکەیە تەنها بۆ جەنابی دادوەرە. مێزە بۆرەکەی ئەوێ مەودا شەرەفمەندەکەی خۆی لە مەودای ئەو شوێنەی بۆ ناشەرەفمەندەکان تەرخانکراوە، لە یەک جیادەکاتەوە.

پارێزەرەکەم بۆ جاری سێیەم دەڵێت: "جەنابی دادوەر، بە دڵنیاییەکی زۆرەوە چیا بێ تاوانە. ئەو سەر بە هیچ گرووپێکی سیاسی نییە، نە گرووپی جیاخوازی و نە هیچی دیکە. هیچ شتێک لە فایلی قانونی ئەو و تۆمارە بەردەستەکان، ئەوە نیشان نادەن تاوانی تیرۆری بە سەردا بسەپێنرێ."

خۆی، هەر سێ کەسمان لە ژوورەکە بووین. پێنج خولەک تێپەڕین، بەڵام بە ڕوونی دیار بوو، دادوەر گوێی نەدەگرت. چاوەڕێ بووم قسە بکا.

ئەو هەندێ کاغەزی هەڵگرت و بەرەو ئەو دەرکەیە ڕۆیشت، کە تەنیا بۆ ئەو کراوە بوو. "من دەڕۆم نوێژی عەسر دەکەم."

هاوارم کرد: "نوێژی عەسر!" دۆشدامابووم.

---

١٢٨ "Ly-ly-ly-ly . . . Kazhollei chaw kazhallem . . . ly-ly-ly . . ."

ئەو وەستا.

ئیدی منیش قسەم بۆ هات: "من ئەوە بۆ پێنجسەد و چل و پێنج ڕۆژە لە زیندانم. لە ماوەی سەد و دوازدە ڕۆژی یەکەمدا تەنانەت ڕێگەیان نەدام پەیوەندی بە ماڵباتەکەشمەوە بکەم، هەروەها لێنەگەڕان داوای ڕاوێژی قانونی و پارێزەر بکەم هەتا نەشمدەزانی ئاخۆ بە چ تاوانێک گیراوم."

دادوەرەکە دەستێکی لە ڕیشە بۆزەکەی دا. خەیاڵم بۆ ئەو دەچوو مشکی مردووی تێدا بێ. ئاخر هەر هەنگاوێکی بەرەو دەرکەکە، وایدەکرد زیاتر دەنگ هەڵبێنم. باسک و قاچەکانیشم لەتاو ئازار دەهەژان، لەبەر زەبری لێدانی کارەبایی بۆ لای ئەو بەشەلەیی شەنقاوم دەنا و لاقیشم بە تەواوی بە دوامدا نەدەهات.

"خۆ سەلمێنراوە من لە تیرۆریزم بەرپرسیار نیم، ئەدی بۆ ڕێگە نادەی بڕۆم؟ ئەوان تەنانەت سەری خۆیان بەوە نەهێشاند تاکە بەڵگەیەکیش لە دژی من بخەنەڕوو."

دادوەرەکە گوێی لە من نەدەگرت. هەر دەبێ کرم لەناو گوێچکەیدا غژەغژیان بێ و لێنەگەڕێن وشەکانی من بگەنە بەر پەردەی گوێچکەی.

پارێزەرەکەش تێهەڵچووەوە: "جەنابی دادوەر، بە تەواوی وایە، هیچ بەڵگەیەک دژی سامان نەخراوەتە ڕوو."

دادوەرەکە دەسکی دەرکەی گرت. ئاوڕێکی لە دواوە دایەوە، نیگایەکی لە ژوورە بەتاڵەکە بڕی، لە کۆتاییدا چاوی بە دوای ئەو کامێرایەدا گێڕا، کە لەودیو کورسییە بەرزەکەی دانرابوو. "ئینجا بە

چرپەوە گوتی: "ئیتلاعات فەرمانی مەرگی تۆی داوە. من هیچم پێناکرێ."

ئیدی ئەو پشتی لە ئێمە کرد، لە هیکەوە لە دەرگا تایبەتییەکەوە ڕۆیشت و ژوورەکەی جێهێشت. پارێزەرەکەشم باوێشکێکی هاتێ. منیش هاوارمکرد. "ئاخخخخخ!" سەدای دەنگەکەشم بە هۆی دیوارەکانەوە هەر بۆ خۆم گەڕایەوە.

ئینجا پاسەوانی ئاسایش هات و دەستەکانمی لە پشتەوە شەتەک دا.

منیش بە نەرمی گوتم: "خۆ من بە دەستەکانم نەدوام." ئیدی هەستمکرد خەریکە گۆد دەبم[١٢٩].

پاسەوانە گەنجە تاوبردییەکە بە سرتەوە و بە گۆکردنێکی قورسی ئازەریانە گوتی: "بێدەنگ، برا بێدەنگ." ئەو کەسێکی کورتەبالا و چوارشانە بوو، ڕوخسارە زبروتوندەکەی نیشانەی ئەوە بوو کوڕێکی لادێیی بووە، ڕەنجی زۆر کێشاوە و ماندوو بووە، پێدەچوو ئێستا لە بن ڕاژەی سەربازگیریی بە تۆپزیدا بێ.

پارێزەرەکەش سەری دەهەژاند و دەستیشی لە هەوادا ڕادەوەشاند. "هەر تەنیا پێنج خولەک لە پشت دەرگا داخراوەکاندا بێ ئەوەی تەنانەت یەک وشەشی بۆ ڕوونکردنەوە هەبێ."

*بێدەنگ، چیا ، بێدەنگ.* من بیردەکەمەوە. *وەنەبێ بێدەنگییەکە بۆ ئەوە بێ، کە هیچت بۆ وتن پێ نەبێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، قسەکردن*

---

[١٢٩] گودبوون: سڕبوون.

*لێرە هەڕەشەیە لە سەر ئاسایشی نیشتمانی و دوژمنایەتی کردنی خواشە.*

دەرکەکە لەسەر ئێمە داخرا.

لە کۆتاییدا خوشکەکەم بە ئێسک و پێستییەوە و بەبێ پەردەی شووشەبەندی ناشیرین دەبینم. ئێستا لەیلا گەیشتۆتە تەمەنێکی سەخت، لێم نزیکدەبێتەوە. دیارە جەنگان بۆ من دەشێ و ڕاست و دروستە، بەڵام چاوە گلەییمەندەکانی لەیلا شتێکی دیکەم پێدەڵێن. دیسان کوڕەکانی فەرهاد لێرەن تا جووڵە جومناستیکەکانی خۆیان نمایشبکەن. وێڕای هەموو ئەوانەی لە قاوشەکەن و سەرباری هەموو کورسییەکانیش، وێڕای ئەو هەموو جێبرین و شینومۆربوونی سەر ڕوخساری باوکیان، ئەوان لە یاری خۆیان ناکەون. "لەیلا، دەبینی، من ئێستا لەوە تێگەیشتووم، ئەم منداڵانە نەوەک هەر بە پاکیزەیی خۆیان خۆشی بخەنە دڵی باوکیان، بەڵکو ئەو دەبینی، ئەوان بە ئاگاییەوە وا دەکەن؟"

لەیلاش زۆر ئارامە، هەر ئەمەشە دەمکوژێ. ئاخر من قومارم بە ژیانی هەردووکمانەوە کرد، نەوەک هەر بە تەنیا هی خۆم. من نوکتەی بێتامم کردن، گۆرانییەکی ئینگلیزیم بۆ ئەو گوت، بەڵام خۆ ئەو هەوڵانە هیچی لە ڕاستییەکە نەدەگۆڕی. ئەرێ کاتێ من نامێنم چی بەسەر ئەو دێ؟

کاتێکیش ئەو پانزە خولەکەی دیدارەکە بەسەرچوو -پازدە خولەکێک کە ڕۆژمان بۆ دەژماردن- منیش دەبوو لەیلا

ئاگاداربکەمەوە. "لەیلا گیان... ئەگەر هیچ شتێکت بەسەر بێنن من... تکایە چیدی لەبەردەم زیندان نارەزایی دەرمەبڕە، تکایە."

حەزم دەکرد ئەو هۆشدارییە هەزار جار دووپات بکەمەوە، بەڵام ئەو گرتەکەی[١٣٠] گەرووم ڕایگرتم.

لەیلاش لێوی خۆی دەگەزتەوە و فرمێسکی پەنگاوی خۆی دەخواردەوە. "باوانم، دانیشتن لای خەڵکی دیکە وام لێدەکا هەست بکەم بەهێزترم. دەکرێ سەبووری و دڵنەوایی بدەمە ئەو خێزانانەی کەسێکی خۆشەویستیان لە قەنارە دراوە."

منیش وشەی "لە قەنارەدرا"م بە توندی گوتەوە تا گوێم لە دەنگم بێتەوە.

ئەو پێمدەڵێتەوە: "دەی، خەم مەخۆ. نامەکانی تۆ بە بەرفرەوانی بڵاوبوونەتەوە، تەنانەت لەسەر ئاستی نیشتمانی و نێونەتەوەییش خەریکە هەڵمەت بۆ ڕزگارکردنی تۆ دەخرێتە سەر پێ."

پاسەوانەکەش دەرکە دەکاتەوە تا ڕێگەی لەیلا بکاتەوە و بڕوا.

"چیا، تۆ لە زیندانییەکانی دیکە جیاوازی؛ تۆ دەنگت هەیە، دەنگێکی کاریگەر. زۆر ناخایەنێ ئازاد دەکرێی. پارێزەرەکەت نامەی بۆ سەدان ئەندام پەرلەمان و کاربەدەستی دیکە نووسیوە، تێیدا هاتووە، ئەگەر هاتوو ئەوان هەر بەڵگەیەک لەسەر تاوانبارێتیی تۆ بدۆزنەوە، ئەوا ئەو واز لە کارەکەی دێنێ."

دەرکە چاوەڕوانە، تەنیا بۆ چوونەدەرەوەی لەیلا کراوەیە.

---

[١٣٠] گرتەک گرێی گەروو، وەرەم.

لەیلا بە دەنگی بەرزتر دەدوێ: "نامە و زەنگم بۆ هاتووە تەنانەت هەر ناشیانناسم. لە کوردی باکوور، لە ڕۆژاڤا و باشوورەوە پشتگیری تۆن."

ئیدی بە غار بۆ لام هاتەوە، ئامێزی پێداکردم و شتێکیشی خستە بەرکم. ئەوسا بردیانەدەرەوە، بەڵام هێشتا هەر گوێم لە دەنگی بوو: "هەرگیز دەست لە خۆت بەرمەدە، هەرگیز کۆڵ نەدەی. هەرگیز دەست لە خۆت بەرمەدە. بە یەکەوە دەتوانین ئەم دۆخە تێپەڕێنین."

منیش هاوارم کردەوە، بەو هیوایەی گوێی لێ بێ: "بەڵێ ئێمە دەتوانین، بەڵێ، ئێمە دەتوانین وا بکەین."

"بەڵێ ئێمە دەتوانین، بەڵێ، دەتوانین." ئەمە دەنگی زیندانییەکانی دیکە بوو هات. منیش هەر بە پاڵەپەستۆ گەڕێنرامەوە چاوە زیندانییەکەی خۆم، بەڵام خەندەکەم شتێک بوو نەمدەتوانی لایبەرم.

ئەمڕۆ لەبەرچاوم ژمارەی قڵیشەکانی سەر دیوار بێ ژمار بوون. ئەو کولیچە دەستکردە خۆماڵییانەی لەیلا بۆی هێنابووم، لە تەنیشت خۆم دامناون. ئەو قەڵەمدارێکی بچووک و کاغەزیشی بە دزییەوە بۆ ئاودیوکردبووم. "*ئەرێ وەک باخچەی بێ ئاو ئازیزم تەشنەی وارانم*[١٣١]..." منیش بە درەنگانێکی شەو بە بلمەبلم لایلایەکەم دەگوتەوە.

یەک دوو هەناسەی قووڵم دانەوە و کەوتمەوە سەر نووسین:

*نەخێر، لێناگەڕێم بمکوژن. نەخێر لە ناوەوە نا. هەرچۆنێک بێ، دیوارە بەرزەکانی ئێرە ناتوانن ڕێگەی بینینی مانگ و ئەستێرەکانم*

---

١٣١ "Are wak bakhchei bi aw aazizem teshnei waranm . . ."

لێ بگرن. ترنجاندن لەنێو چوار دیواری شوورەبەنددا ڕێگەی ئەوەم لێ ناگرێ شت لەبارەی ئەوێ، لەبارەی نەرمە سەمای شاخەکانی زاگرۆس لەبەر دەنگی تەمبوورم لێبگرێ. سیسرکەکە شاهیدمە. ئەویش دەیزانێ، سەرباری ئەو ناداپەروەییەی لە نێو دیوارەکانی زینداندا هەیە، شەو و ڕۆژ بە نۆرەی خۆیان، ئازادی لە یەکدی نادزن.

کاتێک ئازاد دەبم، سەما دەکەم. لەگەڵ شلێر، لەگەڵ لەیلا، لەگەڵ قوتابیەکانم، بێ ئەوەی بەسەرهاتی دیوارەکانیان بۆ بگێڕمەوە، بێ ژماردنی قەڵشەکانی هەر یەک لە ژوورەکان، کە بە خۆم دروستم کردبوو، شایی دەکەم و هەڵدەپەڕم. کولیچەکە لەدەممدا توایەوە. ئای چەند بە تام و شیرینە.

وێڕای هەڵاوسانی پەنجەکانم، لێ هەر درێژەم بە نووسینە شەڕە پشیلانەکەی خۆم دا.

بنوو، چیا ، بنوو.

وەنەبێ کاتی ڕازان بێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی لێرە بێداری تاوانە و سزاکەشی لە توانستی خۆراگریی ئێسقانی مرۆڤ بەدەرە. دەبێ ئەوەم لەبیربێ کە وشە لە نێو ئەم بەشە فەرامۆشکراوەی دونیادا تاوانە. بیرکردنەوەش "تاوانێکە" بۆ خۆی، نووسینیش "دژایەتیکردنی خودایە و قسەکردنیش "تیرۆرزمی"یە. ڕۆژنامەکان بەتاڵن، هەموو دیوارەکانیش گوێیی هەڵخراون، تەلەفزیۆنیش گەورەترین درۆزنە و قسەکردنیش بڤەیە. بە توندی هەستدەکەم لێرەدا تەلیسمێک هەیە، هێزێکی ژێرزەمینی هەیە، کە بەم دواییانە تینی داوەتە بەر شاعیر بۆ پێکەوەنانی پەیڤی جوان، بۆ نووسەران بابەت و پرسی نووسین، بۆ

*سالّمەندان بوێری و هیواش بۆ لاوان. پێویستە لە کاتی لێدانمدا ئەوەم لەبیر بێ، کە پێم گوتراوە: لە کۆماری ئیسلامیی ئێراندا، شتێک نییە ناوی هەژاری، خۆپیشاندان، چەوساندنەوە، جیاوازیدانان[١٣٢]، درۆ یان بێڕەوشتی بێ. ئەمانە زاراوەی دوژمنانن، بەشێکی "پیلانگێڕی"یانە.*

*لە کۆتاییدا دەبێ لەم شوێنە دەرباز دەبم. "ئەو پەپوولەیەی شەوان دوور دەفڕێ، بەختی خۆمی پێگوتم".*

دەرگا ئاسنینە کەتەکان دەکرانەوە و دادەخران. ڕستەی کلیلەکان زرینگەیان دەهات. تەپەی پێ. تەپەی پێی قوڕس.

من نالەرزم، بەو سەرکەوتنە، بەو ئازایەتییەی کە نووسین پێمدەبەخشی، خەندە دەخەمە سەر لیوانم. خۆ بۆ سەردانی ئاساییانەی ئەوان زۆر درەنگە. هەر دەبێ ئێستا دەرەوە تاریک بێ. خێرا قەڵەم و کاغەز لەبن پەتۆ سەربازییەکەدا جێیان کرایەوە. دەنگی تەپەی پێ گەیشتە ئەو لاباڵەی ژوورەکەی منی تێدا بوو. دەست بەرزکەوە، پێم وابوو وا گوترا، بە دەنگێکی بەرزیش گوترا.

پاسەوانە پیرەکە گوتی: "دەی دەستت بەرزکەوە."

"دوای چەندین سەعات لە لێپێچینەوە؟" ئیدی وەهام لە پیرە پاسەوانەکە پرسی، ئاخر لەوەتەی زیندانییم، کتومت ٤٥٤ ڕۆژە دەیناسم. بە شێوەیەکی ئاشنایانە قسەی لەگەڵدا دەکەم. ئەویش دەزانێ لێرە قەڵەمێکم پێیە، کەچی وا خۆدەنوێنێ کە پێم نییە. ئێمە یەک شتی هاوبەشمان هەبوو: ئەویش ڕۆژ ژماردن بوو،

---

[١٣٢] جیاوازیدانان: مەبەست واتای وشەی دیسکریمینێشن discrimination ـە.

پاسەوانەکە ڕۆژی نزیکبوونەوەی خانەنشینبوونی لە کارەکەی دەژمارد، کە قێزی لێدەبووەوە، بۆ منیش ژماردنی ڕۆژەکان بۆ پاشەڕۆژێکی یەکلانەکراوە بوو. هەردووکمان تێدەکۆشاین بەهۆی بیرکاریەوە مێشکمان لەدەستنەدەین.

من سەیری دوو بیچمی کەتە و زلم لەپشت ڕوخسارە ئاشناکەوە کرد.

پیاوە پیرەکە گوتی: "هۆ ژمارە ئا-١٣٣٢، هەڵسە سەرپێ. کەلوپەلەکانت کۆکەرەوە."

منیش سەرم بۆ لەقاند، پشتم تێکردن و نامەکانم خستنە گیرفانی ئەو کراسەی لەیلا بۆی هێنابووم. هەموو شتێکی خۆمم لە جانتایەکی پلاستیک ئاخنی، بۆرە ئومێدێکم هەبوو بەڵکو بیدەنەوە دەست خوشکەکەم.

ئیدی وەک جاران پاڵپێوەنانی بە دوادا هات، هەروەک پێشان دەست کەلەپچە کرانەوە و پەڕۆ لە چاو بەستران، بەڵام ئەمجارەیان نە هەمان ڕێڕەو و نە هەمان ژمارەی هەنگاوەکان. هەنووکە بە نابینا دادەنرام.

کاتێکیش پەڕۆکی سەرچاویان لادام، شیرین و عەلی و مەهدی و فەرهادم بینین. ئێمە لە حەوشەی زیندان بووین، زەردەش بەسەران کەوتبوو. بیست و پێنج پاسەوانی چەکداریش بە یەکەوە وەستابوون، دەوری پێنج زیندانکراوی کەلەپچە لە دەستیان گرتبوو. لە ئاسمانم ڕوانی.

"خۆر لەوە دەکۆڵێتەوە تا دڵنیا بێ ئەمڕۆ دژەشۆڕشی نییە کە هەڵبێ." من وەهام گوت و چوار کەلەپچە لە دەستەکەی دیکەش پێکەنین.

پاسەوانەکان ئێمەیان پاڵنا تا لە گۆشەی ڕۆژئاوای حەوشەکەیان پەستاین، بە زللە و پێلەقە پاڵیان پێوەناین. فەرهادیش دەلەنگی. ئێمە هەردووکمان لە دواوە بووین.

نیمچەبزەیەکم بۆ کرد. " ئەرێ تۆش تۆپی فوتبۆڵێن بووی؟"

ئەودەمەی فەرهادیان دەستگیرکرد و هێنایانە ئێرە سمێڵ و برۆکانی وەک ئێستا بۆز نەبوون. چاوی تێبڕیوم و قولماتێش ناکا.

"مۆنگرێل هاتە خزمەتت؟ تۆشیان کردە تۆپی فوتبۆڵێن؟"

"ئەوە تایبەت بوو بە خۆت. لەگەڵ من یاریی مشتەکۆڵەیان کرد."

منیش پێکەنیم، پاسەوانەکەش قۆنداغە تفەنگێکی سرەواندە نێوان هەردوو لا شانم.

بۆنی مەرگ دەکەم، لوولەی تفەنگی پاسەوان لە سینگم گرا. بووبوومە کەسێکی ئازا. دەمزانی بەم زووانە چیمان بەسەردێ. ئاخر خۆ هیچ شتێک بۆ ترس نەمابووەوە، جا گوتم: "شتێکتان پێ بڵێم؟ سەرباری ئەوەی ئێوە لێرە هەرچییەک بکەن، ڕۆژ هەر هەڵدێ."

پاسەوانەکان پشتگوێیان خستم، چاوەڕوانی فەرمان بوون، ئێمەش بە بێدەنگی وەستاین. کولیچە. بە زەحمەتێکەوە دەستم گەیشتەوە بەرکم، بە دەستی کەلەپچەکراوەوە دەرمهێنان. بە

پاسەوانە درێژەکەم گوت، ئەوەی لە لای ڕاستی منەوە بوو: "فەرموو دانەیەکیان هەڵگرە."

پاسەوانە ڕیشدارەکە هەوڵیدا لێمبداتەوە، ئەمجارەیان بە مست، بەڵام درێژەکەیان لێنەگەڕا و کێشایەوە دواوە. نەیدەتوانی بێتە پێشەوە، بەڵام جنێوی پێدام، جنێوی بە هەر چوار زیندانییەکانی دیکەش دا، بە هەموو کوردیش.

"دەی خۆر هەڵبێ. هەڵبێ و ببە شاهیدمان." شیرین وەها هاواریکرد، بەمەش مستەکۆڵە و تف و نەفرینی زۆری بۆچوو.

حەزم لێبوو پێی بڵێم، قوتابییەکەم هەبوو ناوی شیرین بوو.

خۆریش لە هەڵهاتن پەلەی نەبوو.

"ئەرێ چ دەبێ ئەگەر ئەم کولیچانە ببەشمەوە؟"

کەس وەڵامی نەدایەوە. پاسەوانەکان زۆر سەرقاڵی دەمەقاڵێی نێوخۆیان بوون.

بە شەلەشەل بەرەو لای شیرین ڕۆیشتم، پاسەوانەکانیش بە زیتەڵەیی سەیریان دەکردین.

شیرنیش پرسی: "دەکرێ دوو دانەیان بەرم؟"

" بەڵێ خوشکێ، فەرموو. چیدی ڕێجیم بۆ تۆ و من نابێ." بە دەم ئەم بەرسڤەوە چاوێکم لێداگرت، سەیرم بە خۆم دەهات ئەوەندە ئارام بووم.

شیرینیش کولیچەکەی خستە دەم و چاوەکانی نووقاندن تا باشتر تامی بکا. منیش خەنیمەوە.

شیرین گوتی: "خۆت دەزانی، ئەمە ڕێوڕەسمی دەرچوونمانە."

"به شەڕەفەوە."

هەر بە لینگەخشکێ بەرەو لای زیندانییەکانی دیکەش ڕۆیشتم و کولیچەم بە سەردا دابەشکردن، بێ ئەندازەش بەوە ئاسوودەم کە ئەمڕۆ کۆتایی سووکایەتییە ڕۆژانەییەکەمانە، لەوەی دەپەسترێینە شوێنێک، کە هەموو ڕۆژێک پێت دەڵێ دونیا بێ تۆ باشتر خۆی دەنوێنێ. زیندانییەکانی دیکەش کولیچەکەیان لێوەرگرتم، بەڵام پاسەوانەکان ڕەتیانکردەوە. هێشتا لە دابەشکردنی هەموو کولیچەکان نەبووبوومەوە، کاتێ ئێمەیان هەندێ کشاندە دواوە تا سەربازەکان بتوانن دەستبەندی چوار لە زیندانییە نێرەکان لە پشتەوە توند بە پەتێک بە یەکەوە ببەستنەوە. لە دەورەی سوچەکە لە مەیدانە سەرەکییەکەدا، پێنج لەسەر سەکۆیەکی بەرز چاوەڕێیان دەکردین.

فەرهاد هەندێ پرکێشی کرد. "ئێوە ناکرێ بەم جۆرە بمانکوژن. ئەدی کوا پارێزەرەکانمان؟ تەنانەت خواحافیزیشمان لە کەسوکارمان نەکرد. کێ فەرمانی بە مەرگی ئێمە ـــ"

یەکێ لە پاسەوانەکان زەبرێکی توندی سرەواندە ڕانی.

هەموو شتێک بە شێوەیەکی پرسنی بۆ من ئاشنا دیاربوو. تەنانەت دەموچاوی فەرهادیش، کە لە تووڕەیی و ئازاردا سوورهەڵگەڕابوو.

کاتێک ئێمەیان گەیاندە سەر کورسییەکانی سەکۆیەکە و پاسەوانەکان خەریکی بەستنەوەی قاچەکانمان بوون، بینیم عەلی بە بێدەنگی دەگریا و لێوی خوارەوەی خۆی دەگەزی. لێنەگەڕام ئەو

فەلاکەتەی تووشی هاتبووم بەسەر جەستەمدا باڵکیشبێ و بمخا، کەچی هەستەکانم کز بوون.

*"ئەی ڕەقیب..."* وەها دەستم بە سروودە دێرینەکە کرد. *کەس نەڵێ کورد مردووە؛ کورد زیندووە، زیندووە و قەت نانەوێ ئالاکەمان."*[133]

ئەوانی دیکەش لە خوێندنی سروودەکە هاتنە پاڵم. *"ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان،*

*نایشکێنێ دانەری تۆپی زەمان، کەس نەڵێ کورد مردووە."*

جەللادە تووڕەکان بە زمانی ئێمە قسەیان نەدەکرد. *کەس نەڵێ کورد مردووە؛ کورد زیندووە.*

کندری[134] زیاتر. کندرەکانیان لە ئەستۆمان وەرێنا. من دەمزانی میدیا شتەکە وەها جاڕدەدا: "پێنج تیرۆریست لە قەنارە دران."

هەروەها ئەوەشم دەزانی، ڕۆژ هەر هەڵدێ، ڕۆژێکیش دێ دزەکان دیواری زیندانەکە دەڕوخێنن و قوتابییەکانیش ڕێگەیان دەدرێ بە ئاشکرا مێژووی کورد بخوێنن. لەیلاش بەهێز دەبێ.

کورسییەکان لەبنمان دەرهێنران. بەسەر پەتی سێدارەوە، کولیچەکان لە دەممأندا دەتوانەوە.

---

[133] Kas nalle Kurd mirduwe; Kurd zinduwa/Zinduwa qet nanewe Ey reqib . . ." allakeman

[134] جۆرە پەتێکی ئەستوورە، لێرەدا بۆ مەبەستی قەنارە دەشێ.

## بەندی بیست و حەوت

با بە نێو ژووری چیادا هات و دەرکەی بە توندی پێوەدا. گسکە کارەباییەکەم لە بن سیسەمەکەی ئەودا ڕاکێشا، جووتێک دەرپێ کورتی شینڕەنگ لە کونی هەواکێشەکەی عاسی بوو، دەرمهێنا، ئینجا گسکەکەم کوژاندەوە. ڕادیۆم پێکرد تا بێدەنگی ژورەکە بڕەوێنێتەوە. میلی ڕادیۆکە لەسەر ئێزگەیەکی کوردی بوو لە لەندەن و گۆرانییەکی کرمانجی لێدەدا: *من بیریا تە کریە... من بیریا تە کریە، باوەرکە بیریا تە کریە/ بپرسە ژ ڕەنگێ بوهارێ، بپرسە ژ گولێن وێ دارێ/ من بیریا تە کریە، باوەرکە بیریان تە کریە/ ئەڤ چەند ساڵە ئەز گرتیمە، زوڵم و زۆری گەلێک دیمە، لێ ب ئەڤینا تە دژیم، من بیریا تە کریە، باوەرکە بیریان تە کریە ... ژینا بێ تە، نە تو ژینە، ژینا بێ تە ئەز دژیمە/ هەرکو تێد بیرا خو تنم/ هێز ددە من و دژیمە، من بیریا تە کریە، باوەڕکە بیریا تە کریە ... ئەڤین نەبێ ژین شینە، ژین بێ ئەڤین قیمەت نینە/ دکەم دۆزا ئەڤینێ، باوەڕ کە بیریان تە کریە/ من بیریا تە کریە ... بپرسە ژ کەڤۆکێن ئاشتیێ، بپرسە ژ هەڤاڵتی و دۆستیێ/ بپرسە ژ دیوارێن حەپسێ، ئەڤێ ژ تە را بێژن راستیێ ... من بیریا تە کریە، باوەرکە بیریا تە کریە.*

دوا پارچە تیپ لێبووەوە، ئیدی یادنامەکە کەوتە خوارەوە و لاپەڕەکانی بە گوڕێ وەربوون. سپرای بۆنخۆشم لە ژووری دانیشتنەوە هێنا.

ڕادیۆکە هەر دوای کۆتاییهاتنی گۆرانییەکە ڕاگەییاند: "ئەمڕۆ ئێران پێنج زیندانیی بە تاوانێکی هەڵبەستراوی موخابەرات لە سێدارەدا، چوار لەوان کورد بوون." ئینجا لیستی ناوەکانیشی خوێندەوە. کاتێ ناوی شیرین و فەرهادم بیست، گوێم قولاغ بوون. کە ناوی "چیا سامان"یشی خوێندەوە لە شوێنی خۆم وشکبووم. خۆ مەرج نییە هەر براکەم بەو ناوە بێ. بە گێژییەکەوە گەڕامەوە ژوورەکەی چیا - ئێستا پاکوخاوینە- و گوڵاو پرژێنە. لە ژووری دانیشتنەوە گوێم لە ڕادیۆکە بوو، ناوی چیای وەک زیندانییێک کە لەوانی دیکە بەناوبانگتر بوو، دووبارەیکردەوە.

لە پڕێکدا پەراسووەکانم گورچ بوون. پارسەنگەکەم بەوە دایەوە بە دەستەکانم پەستانیان بخەمە سەر و لە ڕۆخی پێخەفەکەی چیا دانیشم.

تەزوویەکی سامناک وەک درێشوولەیەک پێمەوە بدا، کزەی لە بن پێستمەوە هێنا، قووڵ ڕۆیشت تا سەر ئێسقانم. کەچی لە پێش چاوم چیا چەناگەی بەرزکردمەوە، بە بزەوە ماچێکی لە نێوچاوان کردم. کاتێکیش سەرم هەڵبڕی تا تەماشای نێو چاوی بکەم، لەبەرچاوم ونبوو.

هەڵسامەوە، بامدایەوە و سپرایە بۆندارەکەم ڕشاند، ڕشاندم و هەر ڕشاندم، ئەوەندەم ڕشاند تا بە توندی هێنامیە کۆکین، ئینجا وەستام. بە جووڵەیەکی سووکیشەوە دەستم بۆ ڕادیۆکە برد و کوژاندمەوە.

جوانە زەنگی لێدا. منیش پێمگوت هەر دەبێ میدیا کوردییەکە درۆی کردبێ. هەواڵەکەی لە حکومەتەوە وەرگرتبێ، ڕوون و

ئاشکرا درۆدەکەن. ئەوە بوو پرسیم: "ئاخر ئەوان کەنگی ڕاستییان بە خەڵکی گوتووە؟"

ئەویش گوتی کە بڕوام پێدەکا. بەڵام داوای لێکردم هەرچۆنێک بێ سەردانم بکا یاخود من سەردانی ئەو بکەم.

"بەڵێ، هەر کاتێ چیا لە زیندان هاتەدەرەوە، وا دەکەین."

"لە بیرت بێ ، هەمیشە باوەشی من بۆ تۆ کراوەیە. من تۆم هەروەک شلێری خۆشدەوێ."

بەڵێ، شلێر، بە بیرم هاتەوە بڵێم: "تکایە پێیبڵێ ئەم درۆیە فەرامۆش بکا."

پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵە ساختەکە، کە وەک چۆن ئاگر لە پووشوپەڵاش بەربێ، وەها خێرا بە نێو کەناڵە میدیاییە کوردی و دەوڵەتی وەک یەک بڵاوبووەوە، ئیدی دایکە و بابە بۆ یەکەم جار لە ژیانیاندا تیمێکیان پێکهینا و کێفەڕاتەکە یەکیخستن. ئەوەیان هەر لەبیر کرد کە من چەند مایەی شەرمەزاریی ئەوان بووم، پێش گزنگی خۆر لە ئەپارتمانەکەم وەژووورکەوتن. جانتاکانیان لە ژوورەوە بەجێهێشت و یەکسەر بەرەو مردووخانەی زیندانی ئێڤین ڕۆیشتن. منیش تەلەفۆنەکەم کوژاندەوە، ئاخر بە ئیمێلی دڵنەوایی و هاوسۆزی نامەبارانکرام و داوام لێکرا بەڵکو قسە بۆ میدیای خۆجێیی و بێگانە بکەم، ئەوانەی بڕوایان بە هەواڵە هەڵبەستراوەکەوە هەبوو. دایبابیشم بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە. منیش پەنام بۆ ژووری چیا برد و دەرکەم لەسەر خۆم گاڵەدا. دایکە لە دەرکەی دەدا و هاواریدەکرد، بەڵام خۆ من لێنەدەگەڕام نە ئەو و هیچ کەسی دیکە دەست لە شتەکانی چیا بدا.

دایکە هاڕاندی: "تۆ کچێکی خودانەناسی! تۆ هیچت پێنەگوتین. ئێمە لە غەواران گوێمان لێبووە." لەو کاتەدا من بەنێو کات و مەودایەکی نەناسراودا سەرئاوکەوتبووم، ئەویش هەر دەنگێکی دیکە بوو دەبوایە بەری پێ گیرابا.

خوازەڵۆکی و بەهرەی دایکە بۆ گرتنی دەماری خەڵک، وای لە کاربەدەستان کرد بە مەرج تەرمەکەیان ڕادەستبکەنەوە، دەبێ خێزانەکە بەڵێننامەیەک واژۆبکا، بەوەی سۆز بدەن کە نە بە ڕۆژ تەرمەکە بە خاک بسپێرن و نە پرسەشی بۆ دابنێن. تەنانەت دوای ئەو هەموو شتەش ئینجا چەند ڕۆژێکی خایاند تا تەرمێکیان دانەوە گوایە هی چیا بووە.

من و براکەشم بە دزیەوە چاومان لە یەک دادەگرت و بەوە گاڵتەمان بە بڕوا هەڵخەڵەتێنراوەکەیان دەهات. دیسان تەمەنی چوار ساڵانە بوو. دیسان بە باسک و قاچی ڕووشاوەوە بە هەڵبەز و دابەزەوە بۆ لای من غاریدا و گێلاسە نەشوراوەکەی خستە دەمی و پێکەنی.

ترۆمبێلە باربەرەکە ئێمە و تەرمە ساختەکەی بەرەو مەریوان هەڵگرت. کاتێکیش گەیشتینە شارەکە دایکە گوتی: "پێویستە نوێژ بکەم، بۆیە یەکەم جار لە لای ماڵێ دامبەزێنە." هەر ئەوە بوو خۆی لە ترۆمبێلەکە فڕێدا، سوپاسی خودای کرد، شانەکانی ڕێککردنەوە و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە ملی ڕێگای گرت و لە ئێمە دوورکەوتەوە.

هێشتا زوو بوو، کازیوەش دانەکەوتبوو، بابە و شوفێری ترۆمبێل و من گەیشتینە گۆڕستانەکە. دەرگاکان داخرا بوون، بەڵام بابە قسەی لەگەڵ پاسەوانی شەوانەی گۆڕستانەکە کرد و دەستێکی

لەسەر شان دانا و هەندێ پارەشی لە مشت نا و بە لایتی دەستی بەرەو تاریکییەکە بە بێدەنگی بە سەری نەوی و بە شانی چەماوەوە ڕۆیشت.

منیش بە ئەژنۆی لەرزۆکەوە بە دوای پیاوەکاندا ڕۆیشتم. شوفێرەکە کەسێکی چوارشانە و کەڵەگەت و بەهێز بوو، یارمەتی بابەی دا تا تەرمەکە لە سندوقی ترومبێلەکە دابگرێ. ئینجا دارەبازەکەیان لەسەر شانان دانا، منیان بەرەو بەشە کۆنەکەی گۆڕستان ڕێنوێنی کرد - باخچەیەکی بچکۆلانە بوو، دەرزیی بەکارهاتوو لێرەو لەوێ کەوتبوون[١٣٥]- تا گەیشتنە ئەو بەشەی قۆرت بۆ گۆڕ لێدرابوون، بەڵام هێشتا نەبیراسترابوون[١٣٦]. بابە لەوێ وەستا و منیش بە بێدەنگی سەیرمدەکرد.

بابە تەرمەکەی بۆ ناو قۆرتەکە شۆڕکردەوە، کفنەکەشی بە جوانی بەسەردا دایەوە، ئینجا لە گۆڕەکە هاتەدەرەوە. بە تیشکی کزی لایتی دەستی تەرمە کفنکراوەکەی پشکنی. قەبارەی تەرمەکە لە قەبارەی چیا دەچوو. ئای لەوە، خۆ حکومەت بایەخی بەو وردەکاریەش داوە. بابە لە شوێنی خۆی ڕەق ڕاوەستا. شوفێری باربەرەکەش بە خاکەناس خۆڵی فڕێدایە نێو قۆرتەکە. بابە بە چەشنی کۆتەڵێک ڕەق وەستابوو.

---

[١٣٥] مەبەست لێی ئەو شریقە و دەرزیانەیە کە ئالودەبووەکانی مادە هۆشبەرەکان بەکاریدەهێنن.

[١٣٦] بیراستن: ڕێککردنی گۆڕ بۆ ئەوەی بە قەد تەرم بێ و دوولایەکەشی بە بەرد یان بە شتایکەر هەڵدەپەندرێ تا تەرمەکە بە باشی ڕووە و قیبلە درێژبکرێ و جێگەی خۆی بگرێ.

لەوێدا هەر دەنگی هەناسەی ئێمە، هەر وشەی نەرمەبایەکە و دەنگە کوشندەکەی گۆڕستانەکە دەهات.

"مردووخۆرینە!" لە پڕێکەوە تەقینەوەی دەنگی بابە گۆڕستانەکەی هەژاند. "مردووخۆرینە!"

شانەکانی لەرزین، لەبەر گریانە توندەکەی داهێزران. دڵۆپە فرمێسکی گەورۆنە گەورۆنە بەسەر ڕوومەتیدا داباربن و بە ڕیشە بۆزە پیر و لاوازەکەیدا هاتنەخوار.

بە حەپەساوییەوە چاوم لێکرد و تروووکاند. ئەرێ کوانێ بابە شانازەکەم؟ تۆ بڵێی ئەمە خۆی بێ؟ تۆ بڵێی ئەمە هەمووی فیلم بێ، لایدەیەک بێ و گەرمەشین بگێڕێ؟

بە چرپە گوتم: "ئەمە درۆیە."

لە ناکاودا چاوەکانمان بەریەک کەوتن. ئەو ئازارەی لە چاوەکانی بابەدا بینیم، ئازاری ڕاستەقینە بوو. بە ناسکییەکەی بابە تاساندمی. ئاخر غەمگینترین کەسی تەمەنم، ئەوەی هەروەک هەوا و ئاو لەسەر ژان و ناسۆر دەژیا، هەنووکە دووچاری کێفەڕاتێک بووە مەزنترە لە هەموو ئەوەی لە ڕابردوو بە سەریدا هاتووە. بە تاکە نیگایەی ویڕا زانیم چی قەوماوە.

ئیدی چوومە سەر گۆڕەکەی و خۆڵم لەسەر فڕێدا. "دەی چیا توخوا پێمبڵێ ئەمە درۆیە!" دەستم خستە بن سەری مەیتەکە. کفنم لەسەر دەموچاوی لادا.

بەدەم ئەم قسەیەمەوە: "نا، چیا گیان نا. دەی براکەم هەڵسەوە!" شانەکانیم هەڵتەکاند. کەچی لێوە ڕەنگبزڕکاوەکانی نەبزووتن، سەریشی بە لادا هات. بە گریانەوە: "دەی بڵێ کە بەجێم ناهێڵی!"

بابەش شەوقی لایتەکەی دەستی کوژاندەوە. "لەیلا، بێدەنگ بە." خۆی ئەمە دەنگی دڵنەواییبەخشی بابە نەبوو. ئەمە دەنگێک بوو لە کەسکی دیکەی قەرزکردبوو.

دەموچاوە بێگیانەکەی براکەمم بە دەم و چاوی خۆمەوە نووساند.

ئەوەی لە گەرووشم هاتەدەرەوە نە هەنسک و نە دڵپڕی یان هەناسە نەبوو. بە پڕتاوە هەوایەکی دەنگدار لە سینگم دەرپەڕی. خەریکبوو دەخنکام، هەموو هەوڵێکم بۆ تۆزە هەوایەک بوو.

من لە ژووری منداڵیم بە ئاگا هاتمەوە. هاوشێوەیی و پەڕپوتیی جاران و چینە تۆز لەسەرنیشتووەکەی ژوورەکە ڕایچڵەکاندم. ئاخر لەم ژوورەدا دەمخوێند تا لە زانکۆ وەربگیرێم، هەر لەو ژوورە چیام کردەدەرەوە کاتێ شۆفاریی بەسەردا دەکردم، لەگەڵ ئەو خوازبێنییانەی کوێربام، نەمدیبان قسەم دەکرد. دەمژمێری دیوارەکە لە چرکەکردن کەوتبوو. منیش هەڵسامە سەرپێ، جەستە ژانگرتووەکەم ڕاستکردەوە، بە بێدەنگی کەوتمە نێو تاریکی. وێڕای دیارنەمانی چیاش لە نێوانماندا، مانگ بە تریفە و خەندەوە لە تاقی ئاسمان دیار بوو.

من بە ئەسپایی لە جەستەی کیژە جیابوومەوە کە دەست لەئەژنۆ لەسەر پێخەفەکە دانیشتبوو. شانەکانی بە هەنسکێکی بێدەنگ هەڵبەز

و دابەزی دەکرد. بە دارِسانە هێزی کێشکردنەوە، بەرەو سەروو فرِیم، هەستێکی سرِ و ئازاد.

کاتێکیش خۆر هەڵهات و پرشنگی لە رِێی هەوا تۆزاوییەکە بەر هۆدەکە کەوت، ئیدی من دیسان بوومەوە جەستە تۆقیوەکەی جاران. "خودایە! لێرەی؟ جەنابی خودا!" بە خۆراپسکاندنەوە هەڵسام و پەنجەرەکەم کردەوە. "لەخەو راپە!" روخساری خۆر بەو بەیانییە لەسەر کەل و بە ئاسمانەوە دەخەنییەوە.

"ئەریَ جەنابی خودا، ئەتۆ زیندووی؟" بە دەنگێکی هێند بەرزەوە بانگم کرد کە خۆشم باوەرِم نەدەکرد لەتوانامدابیَ. هاوارەکەم لە کۆلانە تەنگەبەرەکە دەنگی دایەوە، ئەوەی رِۆژێک لە رِۆژان لەتک و نانەقەیسیمان لێدەفرۆشت، "ئەریَ ئەوە تۆی؟ یان ئەوان کندریان لە ملی تۆش ئالاند و ژیانیان لە تۆش سەندەوە؟" گەرمە شینەکەم تێکەڵ بە دەنگێکی تیژ بووبوو. هەروەک ئاژەلێکی زامدار نووزەم دەهات، وەک دەڵە گورگێک بێچووەکانی لە بەردەمی خۆیدا سەربرِابن. فرۆشیارێکی گەرِۆک بەم بەیانییە زووە لە بەردەم ماڵماندا وەستا و بە شێوەیەکی سەیر تەماشای کردم.

لە دەرگەدانی بە تەقەتەقی زۆرەوە هێشتا شین و شەپۆرِی منی دانەمرکاندەوە. "تۆ دەبووایە ژێرگڵ خرابای نەوەک چیا."

بابە بە توندی دەرکەی پاڵدا و شکاندی و بە هەشتاو هاتەژوورەوە. دایکیشم گوتی: "ئەستەغفیروڵلا. ئەریَ ئالان بەو کچە ناڵێی چیدیکە کفران نەکا؟"

ئەویش بێدەنگیی لە دایکم کرد: "دەی بەسیەتی هانا." دایکەش چووە هۆدەکەی خۆی و دەرکەشی لەسەرخۆی پێوەدا.

بابە هات و توند بازندەکانی گرتم، هەروەک بووکەڵە شووشەیەک هەژاندمی. منیش نیگام تێبڕی. بەڵێ ئەمە خۆی بوو، ئەمە ڕوخسای ئەو بوو، کۆنەئازارێک، کە ئێستا لای من هەڕەتی بوو.

❖

سەدان کەس بە بێ بانگهێشتن لە دەرکەیماڵیان داین، هەمان ئەو ماڵە شڕوشەپڕیوەی کە من و چیا تێیدا گەورە بووین. منیش لە گۆشەیەکدا ئەژنۆکانم لە باوەش گرتبوو، سەیری ئەوانەم دەکرد کە دەهاتن و دەچوون، ئەو ژمارە زۆرەی تازیەکاران، خەڵکی غەوارە یان ڕەنگە شۆفاریشیان تێکەوتبێ. دراوسێ کۆن و نوێیەکان، نانەوا، قەساب، ژنی خاوەن دوکانەکان، هاوپۆلەکان، قوتابیانی چیا و کەسوکاریان، هەر کەسێک براکەمی بە شێوەیەک لە شێوەکان ناسیبێ، بۆ پرسەکەمان سەری بە ماڵماندا‌کرد.

چیا باشترین بەخاکسپاردنی نهێنییانەی بۆ کرا.

هەموو ڕۆژەکەش نەوارە کۆنەکە بە تەجویدەوە ئایەتەکانی کتێبە پیرۆزەکەی لێدەدایەوە، بەڵێنی ئەوەی دەدا؛ دۆستانی خوا ترس وناسۆریان نییە. خەمبار نابن. خەڵکەکەش بە دزییەوە نیگای بە ترس و سامیان لە یەک دەبڕی. زانیاری و سەری ڕێزیان بۆ ئەو قسانەی لەبارەی "خێزانی شەهیدەوە" لەگەڵ یەک دەگۆڕیەوە. دایکەش سوپاسگوزاری خودا بوو، کە وای لێکردوە هەستێکی تایبەتی بۆ بێتەوە و دیسان سەرنج و ئاگاهی جارانی بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام نەیدەزانی چۆن ڕەفتار بنوێنێ. ئەو میوانەکانی جێدەهێشت تا

له ڕۆژێکدا ده جاران نوێژ بکا، ئێنجا بەنێو ئاپۆرای میوانەکاندا دەهات و دەچوو، لێکلێکە دەیگوت دایکە شەهیدێکی سەربەرزە.

بابەش بۆمبێکی قورمیشکراو بوو، کۆتەڵێک لە سایەی تیشکی مۆمێک. ئەو هەروەک شلێر بوو، دەبووایە بۆ ماتەم بەسەر شاخدا هەڵکشابا.

وەهام هێنایە پێش چاوم کە بە سەر شاخی زاگرۆسدا هەڵدەگەڕێ، دەستی لە پشت خۆی گرێداوە، هەندێ خۆی کوورکردبووەوە، ژمارەی هەنگاوەکانی دەژمارد، بە دوای باشترین زناردا دەگەڕا تا بە متمانەوە پاڵی پێوەبدا و قورسایی خۆی بخاتەسەر، خۆی لەوە خاترجەم دەکردەوە هەرگیز هیچ کەسێک وەک ئەوەی بەسەرنەهاتووە و توشی کوێرەوەیی وەها نەبووە. ئەو بە دەگمەن دەچووە مزگەوتێ، ئەو شوێنەی لەسەر مرۆڤ بوو خەمباری خۆی لێنمایش بکا، بەڵام خۆگر و ڕیشهاتوو بێسەروبەر. جەڵتەی دڵ زۆر پەسەندتربوو لە فرمێسکڕشتن.

ئێنجا جوانە بەدیارکەوت.

بە دەم پرسیاری "ئەرێ چۆن ئەو شتە روویدا؟ چۆن؟" بە ڕووخاوی بەرەو ڕووی ئەو چووم. بینایم لەبەر فرمێسک تار ببوو، بەڵام بینیم کات شوێنەواری خۆی لەسەر ڕوخساری جوانە جێهێشتبوو. یان تۆ بڵێی ئەمە لەبەر نیگەرانی بووبێ؟

ئێمە هەردووکمان لە باوەشی یەکدیدا تێر گریان. ئەو بە دڵدانەوەوە: "لەیلا گیان، دەلالا من، کچەکەم، نازدارەکەم."[١٣٧]

---

[١٣٧] "Leila gian, dalala men, kechakam. Nazarakam,"

جوانه که هەر لە تەوقی سەرەوە تا قولەپێی سپیپۆش بوو، بە خۆی و قسە نەرم و بە سۆزەکانی هیچ وەڵامێکی بۆ پرسیارەکانم پێنەبوو، بەڵکو هەر گوێگرتن و دڵدانەوە و هێورکردنەوەی من بوو. ئەو بەوە ڕاگەیشت لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەی پرسەکەدا بە میوانان ڕابگا و خواردنیان بۆ ئامادە بکا و ئاگاشی لە من بێ پەرستارییم بۆ بکا. خۆی نەریتەکە وەها بوو، خزمە مێینەکەی مردوو دەبووایە خۆی بە دڵشکاو و ماتەمبار نیشاندابا، هەر حەسرەت و ئاخ و ئۆفی لە دەم دەرچووبا، شینێکی گەرمی گێڕا با، پرچی خۆی دەرهێنابا تا وا لە میوانانیش بکا بە کۆمەڵ بگرین. من لەوەدا شکستم هێنا. هەندێ لە میوانەکان لە پێشکەشکردنی خورما و پەقلاوە یارمەتیی جوانەیان دەدا، ئەوانی دیکە چایان دێم دەکرد و دەیانگێڕا، ژنەکەی دراوسێشم دەرکە بەردەرکەوە، کە لە شینوشەپۆردا بە ئەزموون بوو، چاوی لەوە بوو پرسەکە بکاتە شین و گریانی بەردەوامی ئامادەبووان و سەردولکەی دەگوتن، ئیدی جڵەوی کارەکەی گرتەدەست. کاتێکیش شینەکە گەیشتە لوتکە، ژنە دەستی بە قسە کرد: "ئەرێ ڕۆڵەکەم چیا، تۆ بڵێی ماڵە نوێیەکەت ئێستا چۆن بێ؟ ئەرێ ئەوێ زۆر تاریکە؟ ئەرێ گەنجۆ خۆ ئێمە بە تەمابووین شایی ژنهێنانت بۆ بگێڕین. هێشتا کاتی ئەوە نەبوو بارکەی و بڕۆی؛ ئەرێ خۆشەویستەکەمان بۆ پێش هەمووان کەوتی؟" هەر زوو پرسیارەکانی دەبوونە مایەی هەنسک و ئامادەبووان لە پرمەی گریانێیان دا.

منیش لە شوێنی خۆم هەڵسام شانۆی پرسەکە جێبێڵم. کەچی پەلوپۆم گۆد و قورس بوون، وەک ئەوەی ئەو هەموو هەراوزەنایەی تووشی بووبووم ڕێگەی لە ڕۆیشتنی خوێن بۆ

دەست و قاچم گرتبێ. لە نێو دەرکەدا دوو ژنی تەمەن بیست ساڵە باوەشیان پێداکردم و بە هەنسکەوە پێیان گوتم هەر لە زیندانەوە شوێنکەوتەی نامە و پەیامەکانی چیا بوون و بە هەواڵی لەسێدارەدانیشی هێدمەگرتی بوون. خۆی زۆر شت هەبوو ئەوان دەیانتوانی بەر لە نۆی ئایار بیکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خەڵکەی دەیانگوت گوایە چیا گۆڕیونی، هیچیان نەکرد. "سوپاس، بەڵام خۆ هێشتا زۆر زیندانی سیاسی دیکە ماون دەکرێ ئێوە ڕزگاریان بکەن." ئیدی من بە کۆڵانەکەدا شۆڕبوومەوە.

"ئەرێ زەحمەت نەبێ،" پیاوێکی کورتەباڵا و سەر ماشوبرنج وەهای لێپرسیم: "ئەرێ پرسەی کابرا گەنجەکە لە چ مزگەوتێکە؟"

یەک دوو چرکەی ویست تا پیاوەکە بناسمەوە، بەڵام خۆ پیاوە ڕیش بۆزە سمێڵ گەورەکە دیاربوو. منیش وەها وەڵاممدایەوە: "دووکۆڵان خوارتر لەسەر جادە سەرەکییەکە. هەر بەو بۆنەیەشەوە، پێم وایە تۆ لەسەر هەق بووی، باشتر وابوو ئێمە بنێردرابایینە هەتیوخانە." ئەو ساتێک لێمە ڕاما و پاشان ملی ڕێگای گرت و ڕۆیشت.

خۆی یەک شت هەبوو، پێویست بوو بیکەم: پاراستنی ئەو هەندە هۆشەی مابووم. دوای هەندێک قەدەملێدان بە شۆڕبوونەوە و هاتنەوە لە شەقامەکەدا خۆم بە ژورەکەمدا کردەوە، دەستم دایە جانتای منداڵیی چیا، کە گەمە و دەفتەرەکانی تێدا بوون، لە پەنجەرەی ژووری نوستنەوە فڕێمدانە حەوشەکەوە. کاتێکیش کۆڕی پرسەگێڕان بە خواردنەوەی چاوە سەرقاڵ بوون، بە هێمنی لە پلیکانەکان هاتمەخوارەوە و دوای ئەوەی باوەشم بە جوانەدا کرد و

خواحافیزیم لێکرد، بە نێو باخچە بە داروبارەکەدا پەڕیمەوە و کەلوپەلەکانم هەڵگرتنەوە.

ئەو دارە وشکانەی بە دیوارە چیمەنتۆڕێژەکە هەڵنرابوون، داری سێو و گێلاس بوون. پاسکیلە ژەنگاویەکە -کە تایەکانی پێوەی و دزرابوون- دەستبەرداری ژیان بووبوو.

چیدی هەستم نەدەکرد جەستەم هی خۆم بێ، بەڵکو شتێکی بەکرێگیراو، وەک ئەوەی ئەمانەتێک بێ و بدرێتەوە، لەوانەیە ئەو ڕۆژەش لەگەڵ چیا یەکبگرمەوە، ئەو کەسەی جەستەی ڕاقەنا و کەوت.

## بەندی بیست و هەشت

کاتێک من گەیشتمە تەرمینالی ڕۆژئاوای تاران و لەوێشەوە بۆ بەشی پاسەکانی ناوخۆی شارەکە، تۆپە پرتەقاڵییەکەی خۆر بە ئاسمانەوە دەبینرا. بۆن و بەرامەی شێلمی کولاو و پەتاتەی سوورەوەکراو لەسەر عەرەبانەکانی سەر شۆستەی شەقامەکە لیکی نەوسی پێڕژاندم، بەلام خۆ پەشێوحاڵیی وا بەسەر دڵمدا زاڵ بوو، خواخوام بوو دەستبەجێ بگەمەوە ماڵێ.

لە سپێدە تەنگژەییەکەمدا گیرمخواردبوو، هەر ئەوکات بە بیرمدا هاتەوە، پارەی مانگانەی ئەپارتمانەکەشم نەدابوو. بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی لە سێدارەدانی چیاش، بۆی هەیە خاوەنی ئەپارتمانەکە توورە بووبێ و لە سەلامەتیی خۆشی ترسابێ. خۆ دەکرێ ئێستا دەفتەر و یادنامەکانی چیا فڕێدرابنە سەر جادە و تەڕ و خوسا بن، قفڵی دەرگاکەش گۆڕدرابێ. بەو پێیەی گواستنەوەی شارەکە وەستابوو، دەبوایە باقی ڕێگاکە تا ماڵێ بە پێ ببڕم.

هەر بە ڕاستیش پەتۆ و کەلوپەلی ناندین فڕێدرابوونە سەر جادە، بەلام هی ئێمە نەبوون. کاتێکیش گەیشتمە سەر پلیکانەکە و بە هەنگاوێک دوو پێپلکەم دەبڕین، کەژاڵی خاوێنکەرەوەی باڵەخانەکە دیتمی و بانگی کردم: "خاتوو سامان، خاتوو سامان." ئەو لە نێو خەڵکدا هەر بە فارسی قسەی دەکرد، تەنانەت لەگەڵ کیژەکەشی، هەرچەندە پێی گوتبووم بۆ کوردی بە پەرۆشە.

منیش بە دلۆڤانییەوە وەڵامم دایەوە: " ببوورە جەژنی دوازدەمین ساڵیادی مریەمم لە دەست چوو. کتێبێکی نوێم بۆ داناوە، بەڵام لە کتێبفرۆشییەکەوە نایەم."

کەژاڵیش بە دان گڕکردنەوەوە، دەمی ئەوەندە لەگەڵ پێکەنین لێکدەکردەوە، لەم گوێ بۆ ئەو گوێ هەڵیدەبڕی، قورسایی خۆی هاوێشتە سەر گسکەکەی هەروەک ئەوەی گۆپاڵێک بێ، ئینجا گوتی: "مریەم دڵنیابوو لەوەی فەرامۆشت نەکردووە. من پێم گوتووە تۆ لە سەفەری."

منیش درۆم کرد: "تۆ ڕاستدەکەی. دەی بەو زووانە دەتبینمەوە."

"خاتوو سامان، پێویستە شتێکت نیشانبدەم."

"من دەبێ ئێستا بڕۆم، دوایی قسە دەکەینەوە."

"ئاخر شتێکی پێویستە." دەنگەکەشی لە نێوان فیکەی ترومبێلی فریادڕەس و تەپەی پێی مندا ونبوو. لێ خۆ ئەوکات من پلیکانەکانم دوو دوو دەبڕین.

بۆ خۆشبەختیم، کلیلی ئەپارتمانەکەم خواردی و پێدەچوو هەموو شتێکیش هەر وەک خۆی مابووبێ.

بە چاوپۆشیکردن لەو پارچە کاغەزە قەدکراوەی لە بن دەرکەدا فڕێدرابووە ژوورەوە، بە هەشتا و خۆم بە ژوورەکەی چیادا کرد و چوومە لای دۆلابی جلکەکانی. بۆنەکەی هێشتا بە شێوەیەکی کاڵ بە کراسە قەدکراو و هەڵواسراوەکانیەوە مابوو.

قورگم وێکهات و ئازارێکی تیژیش پەڕیە شانەکانم و تا سەر باسکەکانم هات. پەنجەکانم لە سەر کاراکتەری دەستنوسە

شیعریەکەی شاملۆ خشاند، کە بە سەر دەرکەی دۆڵابەکەوە هەڵواسرابوو: "لە نێو مندا، زیندانییەکی ستەمگەر هەبوو، کە لەگەڵ ئاوازی زنجیرەکەی ڕانەدەهات."

لە نێو چەکمەجەی مێزەکەیدا، پارچەیەک یاداشت و هەروەها ڕەشنووسی وتارێکی هەژدە لاپەڕەییم دۆزییەوە، ناونیشانی وتارەکەش ئەمەبوو: "لە خۆ-بەڕێوەبردن بۆ خۆ-لەناوبردن: دژبەری لە ژیانی ژنانی کورددا." ئەرێ لەسەر شانۆی گەمەی ژیاندا چی بەسەر کورددا هاتووە؟ زار و مار؟ یان شاعیر گوتەنی هەر مۆرە هەڵداوێ و بە تەمای دووشەشم؟ یاخود وەک پوولی دۆمینە یەک بە دوای یەکدا دەکەوین؟

خۆی خوێندنەوەی نووسینە بڵاوکراوەکانی ئاسان بوو، مایەی خۆشیش بوو، بەڵام ئەم وتارە نیوەناچڵەیان، کە بەڵێنمدابوو بۆی تەواوبکەم نا. ئەژنۆکانم لە باوەش گرت، لە ناو دۆڵابی جلکەکانیدا دانیشتم. دەبوو لێنەگەڕێم ئەوێ ڕۆژێ لە ماڵ بچێتەدەر.

دیمەنی ئەوێ ڕۆژێی چیام هاتە بەرچاو، ئەو کاتەی کراس و بێجامە خەتدارە شین و سپییەکەی لەبەردابوو و بە توندیش قەپاڵی لە نانەکە گرتبوو. دایکە و بابە هەریەکەیان بە ڕووی یەکدیدا لە هاواریاندا و زەویش کەوتە لەرزە. چیا بچکۆلە و لەڕولاواز، زۆر نیگەران بە خۆی و قژە ئاڵۆزکاو و سەرێکی پەشێوەوە، لە کۆڵم کرد، بۆ ئەوەی لە ترس و تۆقین بیپارێزم کەوتمە سەر قاچ و دەستم و هێنام و بردم. چیاش بە لایلایەکەی "لای-لای-لای..." لاواندمییەوە تا خەوم لێکەوت.

دواتر ملی چیا وا بەسەر پەتی سێدارەوە. ناتوانێ هەناسە بدا. چەندی هەوڵ و تەقەلای دا هەناسەیەک هەڵکێشێ، نەکرا. هەستیکرد وا گیان لە جەستە زەبوونەکەیدا دەردەچێ. دەیزانی وا دەمرێ، هیچیشی پێنەدەکرا.

چەند بەستەزمان و دەستەوەستان بووم بەدیار چیاوە کە هەڵوەدای مژێک هەناسە بوو، منیش لەگەڵیدا کەوتمە کۆشش و تەقەلا. یەکێک لە دەرکەی دا. منیش ناوی چیام هێنا.

لە دەرکەدانی زیاتر.

پێڵووی چاوم نەدەکرایەوە. خەریکبوو لەناو مۆتەکەیەکی بێ فرمێسکدا بخنکێم. هەڵسام تا دەرکە بکەمەوە، بەڵام سەرم سووڕا و هاوسەنگیی خۆم لەدەستدا.

"لەیلا، خاتوو لەیلا."

"ئەرێ چی هەیە؟"

کەژاڵ لە بەردەم دەرکەکەدا بوو. سەری لار کردبووەوە. بە دەوری خۆیدا دەیڕوانی. "ئەو شتەم دۆزیوەتەوە." ئەمەی گوت و لەچکێکی شینی لە دەست بوو. "گوتم ڕەنگە هی تۆ بێ."

ئەمە هەمان ئەو شاڵە بوو کە خۆی لەم دووساڵەی دواییدا بەسەری دادەدا. "من ئێستا کاتم بۆ ئەو شتانە نییە." لەسەر پێوەدانی دەرکە مکوڕ نەبووم و یەکسەر بەرەو ناندین ڕۆیشتم و هەندێ ئاوم بە دەموچاومدا کرد.

ئەویش خێرا و بە پێدزیلکە بە دوای مندا هات و دەرکەشی لە دوای خۆی پێوەدایەوە. ئینجا بە چرپەیەوە: "من دەبێ شتێکت پێبڵێم."

دەموچاوم خستە ناو هەردوو لەپی دەستم، بەڵکو ئەو سووکە سەرئێشەیەم بوەستێنم. ئەو پێشتر هاتبووە لام و چای لەلا خواربوومەوە باسی ئەوەی بۆ کردبووم، چۆن کاتی خۆی لە گوندەکەیان هەڵاتووە تا کیژەکەی خۆی لە چنگ بابە دەرمانخۆرەکەی دەرباز بکا. ئەو لە ڕۆژدا سێ شەفت کاریدەکرد تا هەم قووتی خۆی و کچەکەی و هەم پارەی مەکتەبی کچەکەی دابین بکا. بەڵکو تووشی هەمان چارەنووسی خۆی نەبێتەوە. ئەمڕۆش حەوسەڵەم نەبوو گوێی بۆ ڕادێرم.

کەژاڵ پەردەکەی دادایەوە، گڵۆپەکەشی کوژاندەوە. "خاتوون، جووتێک زەلام پرسیاری تۆیان دەکرد." ئەو ئەمەی بە کوردی چرپاند. "ئەوان وەها خۆیان دەنواند گوایە خزمی تۆ بن. منیش هیچ زانیاریم لەبارەی تووە نەدانێ." دەنگیشی لەگەڵ گۆکردنی هەر وشەیەکدا ئەوەندە هێواش دەبووەوە بە ئاستەم گوێم لێ بوو.

"زەلام! چ جۆرە زەلامێک؟"

ئەوان پرسیان ئاخۆ میوانی زۆرت دێن یان هەر هەمان ئەو خەڵکەی زووزوو هاتوچۆت دەکەن، ئاخۆ کەی تۆ لە ماڵ دەچیتەدەر، چ کاتێکیش دەگەڕێیتەوە ماڵ، کاتێ دەگەڕێیتەوە جانتای گەورەت هەڵگرتووە. خاتوون، منیش وا خۆم نیشاندا گوایە هاوکارییان دەکەم. پێموابێ بەقایان[١٢٨] پێکردم، ئەوان وایان دانا

---

[١٢٨] بەقاپێکردن: متمانەپێکردن.

چون بەردەستێکی خاوێنکەرەوەم و شێوەزارەکەشەم هی ئێرە نیە کەوایە دەبێ کەسێکی نەفام بم. پێیانگوتم هەر کاتێک هاتەوە، پەیوەندی بە نووسینگەی دادنووسی گەڕەکەوە بکەم. گوتیان ئەگەر وا نەکەم، ئەوا دەرم دەکەن. خاتوون، تکایە، دەمودەست لێرە بڕۆ."

منیش دەبووایە دانیشم.

"ئەوان لە هەر ڕۆژێکدا بێ دەکرێ بێنەوە." ئەو بەدەم ئەم قسەیەوە لە بەردەممدا کەوتە سەرچۆک، دەنگیشی بە ئاستەم دەبیسترا. درێژەی دایە پەرۆشییەکە: "ئەوان هەر ئەم بەیانییە، هەر ڕێک ئەو کاتەی تۆ بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتی هاتنەوە. خاتوون، من زۆر شادمانم تۆ گوێت لێم نەبوو کاتێ بانگکمرد نەچییە دەرەوە. :خۆت دەزانی.... دەکرا ..." فرمێسکیشی لە چاودا داباری‌ن، "ئەوان ئەو ژمارەیەیان دامێ، هەندێک پارەش، داوایان لێکردم هەر کاتێ تۆم بینی خەبەریان بدەمێ. منیش بۆیە قایلبووم تا گومانەکەیان برەوێنمەوە، بەڵام بە گیانی کیژەکەم سوێند دەخۆم، هەرگیزا و هەرگیز...." ئیدی خۆی هاوێشتە باوەشی من.

منیش لەوە داهێزتراوتر بووم لە باوەشی خۆمی بگرمەوە. "کەژاڵ گیان، زۆر سوپاسگوزارم."

"تۆ نابێ لێرە بیت. هەر ئێستا برۆ و ئێرە جێبێڵە. لە خڕکردنەوەی شتەکان یارمەتیت دەدەم."

منیش ئاوڕێکم بەملا و ئەولادا دایەوە. چیا بە پەرۆشەوە بە دانیشتن لەسەر ئەم کورسییەوە تاوتوێی بیرۆکەکانی دەکرد، بە تامەزرۆییەوە لەسەر ئەو قەنەفەیە دەیخوێندەوە، بە شەوقیشەوە لەسەر مێزی ناندینەکە ژەمەخواردنی خۆی دەخوارد.

"ناتوانم." هەر شتێک ڕوویدا. خۆ ئەگەر لە دەرکە لێم وەدەرکەوتن، ئەوا لە پەنجەرەوە خۆم فڕێدەدەم، لێناگەڕێم بێن و بمبەن.

"خۆ ئەگەر هیچ شوێنێکت نەبێ بۆی بچیت، ئەوا دەبێ لەوە دڵنیا بی بە هیچ شێوەیەک گڵۆپەکانت پێنەکەی، هەروەها لە پەنجەرەش نزیک نەبیتەوە، تەنانەت ئەگەر پەردەکەش دادرابنەوە." دوای ئەم قسانە، کەژاڵ هەستا و وایەری تەلەفۆنەکەی لە پلاکەکەی دەرهێنا. "نابێ ئینتەرنێتیشت هەبێ. دەرکەش لەسەر هیچ کەسێک نەکەیتەوە، تەنانەت لەسەر باوکی خۆشت. من نانت بۆ دەهێنم. ئێمە دەبێ لەسەر شێوازی لە دەرکەدانیش ڕێکبکەوین، یان کلیلێکم بدەیتێ. ئۆو، ڕاوەستە، بیرۆکەیەکی باشترم هەیە." ئەو بەنێو تۆپە کلیلێکدا گەڕا. "ئەرێ کارۆت لەبیرە؟ ئەو پیاوە کەشخەیەی لە نهۆمی بیستەمدا دەژی؟"

منیش سەرم بۆ لەقاند.

"ئەپارتمانەکەی ئەو بەتاڵە، کلیلەکەشی داومەتێ."

من سەرم بادا.

"بەڵێ، بەڵێ، پێویستە وەها بکەی."

دەبوو وا بکەم، دەنا تا دەهاتن و دەیانگرتم شوێنەکەم دەگۆڕا بۆ زیندانی تاکەکەسی.

"تۆ لە ئەپارتمانەکەی ئەودا خۆت بشارەوە تا شوێنێکی دیکە ڕێکدەخەی. بڕۆ گوندێکی دوورەدەست، یان بوەستە- بڕۆ بۆ کوردستانی عێراق. لەوێ سەلامەت دەبی. دەکری کەسێک لە

دێیەکەی خۆمدا بدۆزمەوە تا یارمەتی ئاودیوکردنت بدا و لە سنوور بتپەڕێنێتەوە، ئەگەر هاتوو ناوت لە نێو لیستەکەدا بوو."

"کامە لیست؟"

"لیستی ئەوانەی ناتوانن وڵات جێبهێڵن."

"ئەها، ڕاستە." ئێران لادەرەکانی خۆی نانێرێتە تاراوگە، بەڵکو لەبری ئەوە لێیان دەگەڕێ لەنێو دۆزەخدا دابرزێن.

"خاتوون، من ئەو شتانە دەزانم. کوڕەمامەکانم پێشمەرگەن."

دەکرێ خۆم بگەیەنمە شلێری. "هەر بە ڕاستی پێویستم بە ئینتەرنێت هەیە."

"ئەمەش هۆکارێکی دیکەیە، کە لە ئەپارتمانی کارۆدا بمێنیتەوە. هەر هیچ نەبێ بە شەو. من کارتی ئینتەرنێت و هەندێ نان و شیرت بۆ پەیدادەکەم."

"باشە چی ئەگەر هاتەوە؟ یان کرێچییەکی دیکەی هاتەناو؟"

"خاتوون، ئەو خۆی خاوەنی ئەپارتمانەکەیە و تا ساڵێکی دیکەش بەکرێی ناداتەوە. ئەو وای بە من گوت. پێم وایە دەچێتە هەندەران. ئەو کلیلەکەی بۆیە داومەتێ تا هەموو ڕۆژێ خۆم و کچەکەم خەمی گۆزەگۆزی بارکردنمان نەبێ. چەند جارێک لەوێ ماوینەتەوە. زۆربەی کەلوپەلەکانی ئەو بە جوانی هەڵگیراون، بەڵام پێخەفێک، هیرباری پێویست و قەنەفەیەک و تەلەفزیۆنێکی لێیە. لێمەگەڕێ هیچ کام لە دراوسێکان بتبینن. زۆر وریا بە." کەژاڵ بە شانازیکردن بە نەخشەکەی خۆیەوە هەڵسا و ڕۆیشت تا کلیلێک بۆ من کۆپی بکا و هەندێ شتیشم لای میوەفرۆشەکە بۆ بکڕێ.

ئەو پارچە کاغەزەی لە بن دەرکەش بۆ من فڕێدرابوو، نووسراوی ئاگادارکردنەوە نەبوو بۆ بەجێهێشتنی ئەپارتمانەکە، بەڵکو سەرەتای گەفوگوڕ بوو بەوەی بیریان هێنابوومەوە چارەنووسی منیش لە هی براکەم باشتر نابێ. ئاخر نووسینەکانی چیا بە نێو سۆشیال میدیادا بڵاوبووبوونەوە، تەنانەت دوای لە سێدارەدانیشی خێراتر پەخش بووبوون.

لە بێدەنگی و تاریکیی ئەپارتمانەکەی کارۆدا، ماتەم بەرقەرار و مۆمی شەڕ و بەرەنگاربوونەوەش کز بووەوە.

خۆی هەر ئەوە نەبوو کە چیام لەدەستدابوو، بەڵکو ئەو بەشەشم لە خۆم لەدەستدابوو کە واتای خوشکی ئەوی دەگەیاند. تۆ بڵێی ئێستا من کێ بم؟ بێ ئەو بەشەی خۆم کە هاوپێچی برا بچووکەکەم بوو، بێ ڕۆڵگێڕانی دادەی گەورە، کە لە تەمەنێکی زوودا دەمگێڕا، ئەدی هەنووکە من کێم؟

لە کۆتاییدا کاتێ دەستم بە خەتی ئەنتەرنێت ڕاگەیشت، سندوقی ئیمێلەکەم پڕاوپڕ بوو لە وتە و نامەی خەڵکی کارای ژێرەمینی. ئاخر خۆ شتە هەرە خراپەکە ڕوویدابوو، شتێکی وەها نەمابووەوە مایەی ترس بێ. من دەبووایە مەشخەڵەکەی چیا هەڵبگرم، کە بە ناچاریی ڕادەستی من کرابوو.

هەفتا کەسێکی لایدە[١٣٩] لە بنهۆمی شێدار و تاریکدا چاوەڕێیان دەکردم. ئیدی خۆم لە بەردەم ئەوەندە چاوەدا بینییەوە، قەت

---

[١٣٩] لایدە: نامۆ، غەریبە، بێگانە. غەوارە.

ئەوەندە خۆم بە پەشێوحاڵی نەبینیبوو، بەڵام خۆ هەستەکانم دەستبەردارم بووبوون.

شتێکی شاراوەش نەبوو، سووسەکارێکی ئیتلاعات بە جلی ئاساییەوە لەنێو ئەواندا بێ، یەکێک کە پەتی سێدارەی لە ملی چیا کردبێ و ئیستاش بە دوای نێچیرێکی دیکەدا بگەڕێ. کەچی من لێبڕاوانە بڕیارم دابوو بە پیر بانگەوازی ژیانمەوە بچم.

"چیای برام، خەم و ئازاری شتێکی گەورەتری لەوە هەڵگرتبوو کە شانەکانی بەرگەیبگرن. هەر لە تەمەنی نەوجەوانییەوە زیرەک، هەستیار و چاودێرێکی قووڵ بوو." ئەوەبوو لێوی خۆم گەزت تا کەفوکوڵی سینگم بە باشی بێتەدەرەوە. "تێکۆشانی خۆنەویستانەی وی بۆ دادپەروەریی بێ مەبەستانە کردیە پاڵەوانێکی بێپەروا. هەر ئەمەش ئەوانی تۆقاند. دیکتاتۆرەکان لەسەر چاندنی تۆوی ترس و دوژمنایەتی لە نێوان هاوولاتیاندا دەژین، لە سەروو هەمووانیش بێباکی لە هەمبەر ئازارەکانی یەکدی". دەنگم نووسا. دەبوو وچانێک بدەم.

لە ڕوانینم بۆ سەروسیمای ئامادەبووان، چاوم بە ڕوخسارێکی ئاشنا کەوت، خۆی لە پشت دینگەیەک پەنادابوو. ڕوانینە ژێربەژێرەکانی هێندەی دیکە هێنامیە جۆش و ئاگری تێبەردام.

ئامادەبووە بە ئاگاکانی ژێرزەمینەکە، بە پیر و گەنجیانەوە بەزیو دیاربوون. گردبوونەوەکە لە ناوچەیەکی دەوڵەمەندی شارەکە ڕێکخرابوو، هەر ڕێک لای کێوی توچال کە زۆریش لە زیندانی ئێڤینەوە دوورنەبوو. هەستمانکرد لە جەنگەکەماندا لە دژی دەوڵەت نامرادین، ماندوو و کەنەفتین بە دەست ئەو ئازارە نەبڕاوەیەی

لەدەستدانی خۆشەویستانمانەوە یان هەردەبێ شاهیدبین بە سەر ئازار و ئەشکەنجەی جەستەیی و ڕۆحیی ئەوانەوە.

من تفی خۆم قووتدایەوە لە بەرکم پارچە کاغەزێکم دەرهێنا، ئینجا تێهەڵچوومەوە. "چیا نەیتوانی ڕێگە بە ئەشکەنجەدەرانی بگرێ لەوەی شەویلاگی نەشکێنن... بەڵام توانی ژیان لەنێو خۆیدا بپارێزێ."

کاتێکیش لە پشتەوە جیڕەی دەرگاکە هات، هەمووان ئاوڕیان دایەوە. منیش درێژەم بە خوێندنەوەی خۆم دا.

"ئەو لە ناخیدا دەوڵەمەند دەژیا، بەهایەک کەس نەیتوانی لێی بستێنێ، دراوە چاپکراوەکەشی کتێب و خەڵک و پێواژۆ و کردەنیازەکانی هۆشمەندانە بوون کە پێیگەیشتبوو. ئەو هەمیشە هەر ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە لێناگەڕێ ئەوان ئەوەی لە ناخیدا هەیە بکوژن و بەسەریدا زاڵبن، ئەمەشی بە تەواوی بردە سەر."

پیاوێکی ڕیشداری تەمەن مامناوەنجی هاتەژوورێ، منیش دڵنیانەبووم —شایەد ئەوانیش نەیانزانیبێ- ئەوسا چ میلیشایەکی نافەرمی بێ یان پیاوێک بە ڕیشێکی قەڵەمنەکراوەوە.

"هاوشێوەی نیلسن ماندێلا، هەروەک لەیلا زانا، چیاش لە بن ئەشکەنجەدا نەڕووخا. سەرکەوتنەکەی ئەو لەوەدایە."

چاوی شڵەژاو بە نێو ژورەکەدا دەگەڕان. دەبووایە منیش درێژە بە قسەکانم بدەم تا ئەو بێدەنگییە ترسناکە پڕبکەمەوە، بۆ ئەوەی تا دوا هەناسەم لەسەر ڕێبازی چیا بڕۆم و ئینجا کەسێکی دیکە جێگەی من بگرێتەوە، لەوانەشە ئەو کەسە لێرەش دانیشتبێ. "چیا لە ئێمەی دەویست، هەموومان لە واتای ژان و ناسۆری هەژاری،

جینۆساید و لەناوبردنی ڕەگەزیی تێبگەین: پەی بە واتای لەدەستدانی زمان و کلتوور ببەین." من بەکاوەخۆ بەڵام شلێگیرانە دەدوام، هەروەک ئەوەی وشە نووسراوەکانی زمانێکی بێگانە بخوێنمەوە.

لە هیکەوە هەناسەدانەوەی ئاپۆرای ئامادەبوو گۆڕا بۆ دەنگەدەنگ و غەشبەغەشبێکی گەورە. گلۆپەکەی سەر سەرم دەدرەوشایەوە. کارۆش هاتەپێشەوە، چیدی هەوڵینەدا خۆی بشارێتەوە.

دەنگی پیاوێکی تەمەن مامناوەنجی لە تووڕەییان سەدای دایەوە و هاواریکرد: "چیا سامان کەسێکی جودائی تەڵەب[١٤٠] نەبوو."

جودائی تەڵەبیش -جوداخواز- لەسەر زمانی خەڵکی ڕەشۆکی ئێرانی بوختانێک بوو هاوواتای "ناپاک" بوو.

ژنێکی پرچ کەژەش، کە تاڵەقژەکانی لەبن لەچکەکەیەوە دەرچووبوون چاویلکەکەی ڕاستکردەوە و هاواری کرد: "ئەدی ئاگادارم نەکردنەوە کە کورد جوداخوازی قێزەونن؟ پێم خۆشترە ئەو ئاخوندە ئسولیانە فەرمانڕەوای وڵاتەکەم بن نەوەک ببینم کورد و تورکمان و باقی ئەوانی دیکە وڵاتەکەم پارچە پارچە بکەن."

منیش وەها هاتمە دەنگ: "ئادەی بوەستە." ویستم هەروەک مامۆستا ئاینییە توندڕەو جڵەوی ژوورەکە لەدەست نەدەم. "کەواتە هەر کاتێک کەمینەکان لەبارەی تراژیدیاکانیانەوە دوان، ئەوا ئۆتۆماتیکیانە دەبنە جوداخواز؟ بێڵەوەش، ئەرێ تۆ بۆچی وا ڕەفتار

---

[١٤٠] a jodai talab

دەنوێنی کە ئەم شتە تاوان بێ؟" بە هەناسەساردییەکی تەواوەوە سەیرێکی ئەو ناوەم کرد. شتێکی سەیر نەبوو هەتا لە نێو ئۆپۆزسیۆنیشدا کورد بخرێندرێتە گۆشەیەکەوە و بچەوسێنرێتەوە، بەڵام لای خۆم وام دانابوو ئەو حەشاماتەی خڕبوونەتەوە و منیان بانگهێشتی کۆبوونەوەکە کردووە، جیاواز بن. بردەبرد و بەدگومانیی بەنێو هۆڵەکەدا بڵاوبووەوە، لێ هەرزوو جڵەوەکەم گرتەوەدەست. ئاخر خۆ لەوێ حکومەت نەبوو بێدەنگی دەکردم. ئەمە ئۆپۆزسیۆن بوو وەهای دەکرد.

کارۆش بەرەو رووم هات. منیش پێویستم بە کۆمەکی ئەو نەبوو. دەمزانی چی بکەم تا بە سەر ئەو مەیلە لایەندارییەدا زاڵ بم: ئەویش دنەدانی هاوسۆزییان بوو. "رێگەم بدەن شتەکە بەم شێوەیە باس بکەم. وا بێننە بەرچاوی خۆتان، فارسەکان لەبن حوکمڕانییەکی دڕندانەی حکومەتێکی کوردیدا ژیابان، ئینجا منداڵەکانتان نەیانتوانیبا بە فارسی بنووسن یان بخوێننەوە، نەیانتوانیبا حافز و رۆمی بخوێننەوە، لە مایسترۆی شەجەریان نەگەیشتبان، بێننەبەرچاوی خۆتان. ئەوسا کاتێک ئەوەندە زۆر سووکایەتیتان پێکرابا، چی دەقەوما؟ بیربکەنەوە، کە ئێمە لە راستیدا چەند دەناڵێنین: تۆ دەبێ راوبنرێی، لاقەبکرێی، ئەشکەنجە بدرێی، لەناوببرێی...."

"*نەفرت پاراکانی نکن*[١٤١]. *رقوکینە بڵاومەکەوە. لەم وڵاتەدا هەموو کەسێک وەک یەک ئازار دەچێژێ*" نەدەکرا ژنە پرچ کەژەکە بە ئاسانی بە شێوەیەکی هۆشمەندانە هێور بکرێتەوە.

---

Nefrat parakani nakon [١٤١]

"نەخێر، خەڵک لەم وڵاتەدا وەک یەک ئازار ناچێژێ. قسەکردن لەبارەی ڕاستی ژیانمان بڵاوکردنەوەی ڕق و کینە نییە. بەڵکو داواکردنە بۆ لێتێگەیشتن." بەدەم ئەم قسەیەمەوە لە نامرادیان سەرم بادا.

پیاوە تەمەن مامناوەنجییە تووڕەکە بۆ بێدەنگکردن کۆخی و ئینجا گوتی: "بمبەخشن... مێژوو نیشانیداوین، برا و خوشکان تکایە گوێبگرن. مێژوو سەلماندوویەتی، هەموو هۆزەکان، هەر هەموو هۆزەکان..."

هەرچۆنێک بێ من ناسیمەوە. "هۆزەکان؟ ئایا تۆ نەتەوە بە هۆز ناودەبەی؟ لە ڕدێنە تەمشوولەییەکەی[١٤٢] ڕامام؛ چاویلکەکەی بە زریزەیەک لە مل کردبوو. بیرمکەوتەوە.

ئەویش سەری هەڵبڕی. وێرام دابرسێمە "ڕۆشنبیرەکە". ئەو یەکێک بوو لەوانەی بەردەوام لای کۆشکی کتێبفرۆشییەکەمەوە پەیدادەبوو، کابرایەکی سەرژنانی کە هەر جارێک سەروکەڵلەی لای من دەردەکەوت دەبووە هۆی ئەوەی خەڵکەکەی دیکە کاتێکی درێژتر لە ڕیزەکە بمێننەوە. ئەو هەمیشە دەرفەتی ئەوەی دەقۆستەوە لەگەڵ من لە کۆشکەکەدا باسی شتی قۆڕ لەبارەی شۆڕشەکانی فەرەنسی و ڕوسییەوە بکا و پاشان کە دەیبینی بە ناچاری و نابەدڵی گوێی لێ دەگرم، ئیدی بێ ئەوەی شتێک بکڕێ کوشکەکەی جێدەهێشت. هەر لە بابەتی نازونووزدا من لە

---

[١٤٢] ڕدێن تەمشوولە: مەبەست ئەو کەمە ڕیشەی ژێرچەنەیە، سەکسوکە و بە ئینگلیزیش goatee .

نیشتمانەکەی "ئەو"دا پلەم بۆ هەرزەگۆیەکی خێڵەکی دابەزیبوو. کەسێک بۆ وڵاتەکەی ئەو مایەی گەف و هەڕەشە بێ.

ئەو بەم شێوەیە قسەکانی خۆی ڕشاندنەوە: "سەرەتا هۆزەکان بەوە دەستپێدەکەن داوای فێربوونی زمانی زگماکییان بکەن، شتەکەی دواتریش وەک خۆتان دەزانن، دەیانەوێت سەربەخۆ بن. خانمان و ئاغایان ، سەربەخۆیی!"

خوێن تەوژمی بۆ دەموچاوم هێنا. "کرۆکی مەبەستی چیرۆکەکە ئەوەیە گرووپێکی پانوپۆڕ لە خەڵک لە سەرەتاترین ماف بێبەش بکرێن بۆ ئەوەی داوای مافەکانی دیکەیان نەکەن؟" بە دەم ئەم قسەیەم یەکسەر پەنجەم بە ڕووی ئەو بەرزکردەوە. نیگام لەسەر بیچمە خواروخێچەکەی گیربوو. ئای من چەند ساویلکە بووم، ژیانی خۆم بۆ کەسانێک بخەمە مەترسییەوە، دۆنمێک زەوی لە مرۆڤ بە بەهاتر بزانن. "ئەرێ گوێت لە دەنگی خۆت نابێتەوە کە چەند هاوشێوەی دەنگی ئەو حکومەتەی لێرە دژی وەستاویتەوە؟"

دەنگێک وەها هات: "ئێمە کوردمان خۆشدەوێ. پسمامەکەم کچە کوردێکی خواستووە." چاوم بە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا گێڕا، بەڵام لەنێو دەریایەک لە جووڵانەوەی لێو، نەمتوانی ماخۆی قسەکە بدۆزمەوە. ورتەورت پەرەیسەند، وشە و دەستەواژەی "دێموکراسی" و "مافی خۆچارەنووسی" لە گۆشە جیاجیاکانی ژوورەکە دەربڕان.

ئۆکسجین کورتی هێنا. ژێرزەمینەکە شێدار و بۆگەن و گرژ بوو. خەریکبوو دەبووورامەوە. "دەبینم. ئازادی باشە، بەڵام تەنیا بۆ ژمارەیەکی کەمی خاوەن زێدەماف" ئەمەم گوت و سەکۆی دوانەکەم جێهێشت.

پیاوێکی کەڵەگەت بە دەم مست بەرزکردنەوە گوتی: "ئێمەی مارکسی پشتگیریی مافی بڕیاردانی خۆچارەنووسی دەکەین." ئیدی خەڵک ئاوڕیان دایەوە لە بری ئەوەی هێرش بۆ من بێنن پەلاماری ئەویان دا. هەندێ لە ژن و پیاوانی گەنج بە هاوسۆزییەوە لە من ڕامان و سەری ڕەزامەندیان بۆ لەقاندم. یەکێکیش گوتی: "دەی ئەو جوداخوازە فڕێدەنە دەرێ!"

لە ناخمدا گرژ بووم، دڵم توند بوو. ترس لە ترس. ئەوە بوو گوتم: "بوەستە." جا نازانم ئەوەم لەناو مێشکی خۆمدا یان بە دەنگەوە گوتم- نازانم کامەیان بوو.

"بەداخەوە خاتوو سامان باری تەندروستیی تەواو نییە و ناتوانێ درێژە بە قسەکانی بدا." ئەم دەنگە ئاشنایە کەوای گوت تا دەهات لەگەڵ گۆکردنی هەر وشەیەکدا ڕوونتر دەبووەوە. "هەروەک خۆتان دەزانن، ئەم خاتوونە کوێرەوەری زۆری بەسەر هاتووە، تکایە ببوورن کە ناتوانێ قسەکانی تەواو بکا.

کارۆ بە نەرمییەوە پیلی منی گرت و لە نێو قەراپەستانێی خەڵکەکەی هێنامەدەرەوە. لێ ئەم کردەوەیەی ئەو تەنیا هۆشدارییەک بوو بۆ من، ئاماژەبوو بۆ گەفێکی گەورەتر. ئیدی پیلم ڕەق بوو.

هەستی بە خۆڕاپسکاندنی من کرد، بە ورتەیەکەوە: "دەزانم. بەڵێ دەزانم."

ئەو دەنگەدەنگ و هەراوزەنایەی لە ئامادەبووانی گردبوونەوەکە بەرزبووەوە وەک کوتکێک وابوو لە سەرم بدەن. کاتێکیش کارۆ خەڵکی بەردەمی بە پیاو و ژنەوە بەملاو بەولادا دەدا تا ڕێگام بۆ

بکاتەوە، هەستمکرد وەک ئەوەی لەنێو فیلمێکدابم. ئەو بۆ دەرەوە بۆ گەراجەکە ڕێنوێنیکردم و لە سەر کورسی پشتەوەی ترومبێلەکەی جۆری زانتیا[١٤٣] دانیام، ئینجا بەرەو ماڵ لێیخوڕی.

"لەیلا، تۆ دەبێ لەم وڵاتە بارکەی و بڕۆی."

کاتێک ترومبێلەکە لە جووڵە کەوت، منیش لەسەر کورسیی پشتەوە هەڵسامەوە. کارۆ دەرکەی پێشەوەی باڵەخانەکەی بۆ کردمەوە. ئەو پیلی گرتبووم لەو کاتەی خەریک بووم بەلادابێم، ئەو بەو شێوەیە لەگەڵم هات تا دەرکەی ئەپارتمانەکەی خۆمم کردەوە. لەسەر قەنەفە شینە پەڕپووتەکەی چیای دانام و خۆشی چووە ناندین کتری پڕ لە ئاو بخاتە سەرئاگر.

کاتێکیش چاوم کردنەوە، کارۆ ئیستکانێکی چای گەرمی پێبوو و بە نەرمی بانگی دەکردم و ناوی دەهێنام. هەڵم لە لێوی پەرداخەکە هەڵدەستا و شەکریش لە بندینەکەی دەخولایەوە.

"تۆ دەبێ بڕۆی. بچیە شوێنێکی سەلامەت."

منیش پرسیم: "ئەریێ ئەمەت پێشتریش نەگوت؟"

کارۆ دانیشت. "من دەچم شوێنێکی سەلامەتت بۆ پەیدابکەم."

"من ئەم شەو لە شوێنەکەی تۆدا دەمێنمەوە."

"ئەویش هەر سەلامەت نییە." هەستم بە هەناسەی گەرمی ئەو کرد لە سەر دەموچاوم.

---

[١٤٣] Xantia

هەندێک وزە بۆ دەستوپێم گەڕانەوە و ئینجا وزە بۆ مێشکیشم هەڵکشا. "ئەمە کۆمیدیایەکی ڕەشە، ستەمکارە بچووکەکان داوای دێموکراسی بکەن."

کارۆ دەستێکی لەسەر شانم دا. "هەندێک جار ئەو خەڵکەی لە پێناویاندا دەجەنگی دەبنە بەدترین بەرهەڵستکارت. هەرچۆنێک بێ، خوشکەکەم شتێکی سەرنجڕاکێشی لەبارەی کوردەکانەوە گوت. ئەو هێڵێکی هاوتەریبی لە نێوان کورد و خەڵکە ڕەسەنەکەی باکووری ئەمریکاوە کێشا."

"چۆن؟"

"بەڵێ، کورد زیاتر لە دەسەڵاتدار خەڵکی ڕەسەن و ماکی وڵاتەکەن. کەچی ڕووبەڕووی جینۆساید، چەوساندنەوە، داماڵینی فەرهەنگی و شتی دیکەش دەکرێنەوە."

هەستمکرد سینگم قورسە. ئەویش بە نەرمی دەستمی گوشی. کاتێکیش نیگاکانمان بەریەک کەوتن، شیعرەکەی فەروغی فروخزادم بیرکەوتەوە: "ڕەنگە ژیان ئەو ساتە داخراوە بێ." ئینجا ئەو سەری بەردایەوە و گەمەی بە ئەنگوستەکانی[١٤٤] کرد. منیش چاوم لە مۆمە بۆرەکە بڕی. "ڕێگایەک دەدۆزمەوە لێرە دەرتبهێنم."

"ئەری کەزیەکەی پشتسەرت چی لێهات؟"

پەنجەکانی لە سەرە تاشراوەکەی دا و گوتی: "من ئێستا سەربازم."

---

[١٤٤] ئەنگوست: پەنجە، قامک. گوست.

"دەکرا ئێستا چیاش دەرچووبا ئەگەر هاتبا و ...." ئیدی پەنجەم لە دەوری ئەڵقەی ئەو ئیستکانە چایە خشاند، کە بۆی هێنابووم.

بە چرپەوە گوتی: "تۆ سوور هەڵگەڕاوی."

"ئەری ئێرە زۆر گەرم نییە؟" چاوەڕێی وەڵامەکەیشم لێ نەکرد. ئەو هێشتا بلووزەکەی هەر لەبەردابوو. "هەردەبێ لەبەر چایەکە بێ."

"بە هەموو کەسێکم گوتووە وازم لە خوێندن هێناوە. ئەوەی ڕاستی بێ دەرکراوم. نەمدەتوانی چیدیکە لەوێ بمێنمەوە."

ئەو خەریکی ترازاندنی قۆپچەکانی پاڵتۆکەی من بوو.

کارۆ سەری خۆی نەوی کرد، چەناگەی لە ئێسکی چەڵەمەی دا، هەروەک ئەوەی دان بە شەرمەزارییەکی زۆردا بنێ. منیش بە چرپی لێڕامابووم. "بە جەماوەریی و کاریگەریی چیا... بە ئەنجامی پێچەوانە شکایەوە."

"مەبەستت چییە؟"

"ئەوە ئەمشەو هەوڵتدا چی بڵێی؟"

"هەوڵمدا چی بڵێم؟"

"ئەگەر هاتبا و نەبووبایە پاڵەوان، ئەوا لە ژیاندا دەمایەوە."

"چی؟ ئەمە ئەو شتە نەبوو کە گوتم، بەڵام ئەوە تۆ—" من لە شوێنی خۆم هەڵسامەوە، دەستەکانم لە یەک گیرکرد. "بەنیازی بڵێی خەتای من بوو؟ ئەوە من بووم بەهۆی بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی لە ئینتەرنێت ئەوم کوشت؟"

ئەو دەستەکانی وەک تەسلیمبوون بەرزکردەوە و گوتی: "من وام نەگوت!"

"کەواتە ئەوە خەتای خۆی بوو؟ بەوەی ئەوەندە خۆشەویست و ئەوەندە کاریگەر بووە؟"

بە دەم گوتنی "لەیلا" ڕێک هەڵسا و لە بەردەمم قیتبووەوە.

"کارۆ، چییە؟ چییە؟ دەتەوێ چی بڵێی؟ دەتەوێ بڵێی خۆنەویستیەکەی وی و کۆششی من بۆ ڕزگارکردنی وی کوشتی، نەوەک سیستەمە فاشییەکە؟ نەوەک... نەوەک دەستەکانی تۆ؟"

"من؟" ئەو بە حاڵەتی بەسەرخۆدا شکانەوە، دیسان دانیشتەوە.

"لێکۆڵەرەوەکان نەیاندەزانی تۆ کوردی. وایە، دەیانزانی؟" بەدەم ئەم قسەیە لێوەکانم توند لە سەر یەک گیرساندن، دیوی ناوەوەی ڕوومەتی خۆشم گەزت. "گرەو دەکەم تۆ ئەو ڕاستییەت شاردووەتەوە؟"

ئەو تەماشای سەرەوە و خوارەوەی دیوارەکەی کرد. "ئەگەر ئەوان زانیبایان، ئەوا منیش نەدەمام."

"خۆی ئەوە تەلەفۆنە نەفرەتییەکەی تۆ بوو. تۆش ئەو کەسە بووی، ئەوێ ڕۆژێ چیات لەگەڵ خۆت بردە دەرێ."

"خۆ ئەگەر بنەچەکەی منیان زانیبا، ئەوا نەدەبووە یارمەتییەک بۆ چیا. چیاش لە کاتی قسەکردندا، گۆکردنەکەی پێوەی دیار بوو کە کوردە. دواتر بە بلۆگ و وتارەکانی، لەبارەی بە قاچاغ وتنەوەی دەرسی زمانی کوردی و هەموو شتێکیان زانی." دەنگی کارۆ تا دەهات نزم و زبر دەبوو.

"تۆ خواپێداوییەکەت هەر بۆ دەربازبوونی خۆت بەکارهێنا، کەچی هیچت بۆ براکەم نەکرد." لەگەڵ ئەم قسەیەمدا هەستم بە تامی سوێریی فرمێسکەکانم کرد.

"لەیلا، چ خواپێداوییەک؟ منیش ئەشکەنجە درام و سووکایەتیشم پێکرا. هەر ئەوە بوو ئەوان بە شایستەی گوللە یان پەتی سێدارەیان نەزانیم، چونکە من هیچ نەبووم. چیا شت بوو، لەباریدا هەبوو و تا دەهاتیش دەبووە گەفێکی گەورە و گەورەتر بۆ سەریان. من ئەوە ناڵێم کە .... تۆ لە ژێر ئەو بارودۆخەدا ئەوەی پێت کرا کردت، بەڵام پشتگیرییەکە کەم بوو. ئایا لە مەبەستم تێدەگەی؟"

"نەخێر."

"خۆ ئەگەر هاتبا و گاردیان یان نیویۆرک تایمز لەبارەی ئەوەوە بیانووسیبا، ئەوا ئێرانیش بڕیارەکەی هەمواردەکردەوە، لێ خۆ هەر تەنیا میدیای کوردی و چەند کەمە میدیایەکی ئێرانی باسیان کردبوو، ناویان هێنابوو. تەنانەت ڕێکخراوی پێن و یونیسێفیش توانستێکی سنوورداریان هەیە. هەروەها خەڵکێکی زۆریش پێی سەرسام بوون. ئەوەش دەوڵەتی تۆقاند لەوەی ببێتە سیمبولێک." ئەوسا دەستی لەسەر شانی من دانا.

منیش دەستم لابرد و گوتم: "ئۆو، بڕۆ سندانتان لێدا، خۆت و باقی خەڵکە ساختەکە. خۆتان و هاوسۆزیتان بە نەفرەت بن، کاتێک هاوسۆزیەکەتان هیچ بەرهەمێکی نەبێ و هەر لە خەمی بەرژەوەندییەکانی خۆتاندا بن."

"تۆ پێت وایە ئەمە بۆ من شتێکی ئاسانە؟ ئایا دەزانی چیا بۆ من چی دەگەیاند؟"ئەو بە چاوە زەقەکانی ڕووی تێکردم و ئێوارەی

خلیسکانێی سەر بەفری بە بیر هێنامەوە. ماوەیەکی درێژیش بوو سەیری ئاسمانم نەکردبوو. کارۆ دەستی گوشیم، منیش دەستم کێشایەوە. ئەو شتێکی گوت، بەڵام نەمتوانی ورتەم لە دەم بێتەدەرەوە. چاوم پڕ لە فرمێسک بوون. دانیشتم و سەرم وە قۆڵی قەنەفەکە کرد، پەتۆیەکم لە خۆم وەرپێچا و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا تا دوا بۆنی بەجێماوی چیا هەڵمژم.

کارۆش بە خۆی و دەستە کلینکسێک لەبەردەمم وەستا. گریام. ئەویش بۆم هاتەسەر چۆک و قۆڵی لەیەک کردنەوە و منی لە باوەش گرت. سینگی بە سینگمەوە ناو، پەنجەکانیشی بەنێو پرچمدا نەرمونیان بوون.

## بەندی بیست و نۆ

کاتێک خەبەرم بووەوە، سەرم لەسەر کۆشی کارۆ بوو، سەری ئەویش بە پشتەوەی قەنەفەکەدا شۆڕبووبووەوە و پانیەدەستیشی قورس و گەرم بوو لەسەر کەمەرم. بە قوولّی و بە کاوەخۆ هەناسەی دەدا. بە خۆجوولاندن ویستم خۆم لە دەستی ڕاپسکێنم، بەلام ئەو توند کەفەلّی گرتبووم.

من جلوبەرگی خۆم بە تەواوی لەبەردا بوو هەروەها ئەویش. بە نەرمی بانگم کردێ: "کارۆ." ئەویش چاوەکانی کردنەوە، ئاوڕێکی لە حالّی خۆی دایەوە، ئینجا ڕاچڵەکی. "زۆر داوای لێبوردن دەکەم." دامەنی کراسەکەی لە بن قایشی دوولینگەکەی هێنایەدەر تا بەرزیی ناوپیستێرەکەی[145] بشارێتەوە و خێرا خۆی گەیاندە دەرکەی دەرەوە و تا لە دوای خۆی پێوەبداتەوە.

منیش لە دەرکە داخراوەکە ڕامام و ئەو هەوایەی لە سینگم پەنگی خواردبووەوە دەرمدا. ئەرێ بۆ خاتری خوا، چۆن کار بەوە گەیشت ئەوەندە لەیەک نزیک ببینەوە؟ هەر بەڕاست ئەوە کارۆ نەبوو بینیم بە کێری ڕەپی بن پانتۆڵەکەیەوە؟

تەنانەت بە هۆی ئەو کەلێنەی کارۆ بە ڕۆیشتنیە لەناکاوەکەی خۆی بەجێیهێشت، هێشتاش لە جەستەی خۆمدا هەستم بە هەبوونە

---

[145] ناوپیستێر: ئەو شوێنەی پانتلۆنە کە ناوگەل دادەپۆشێ.

نادیارە لینجاویەکەی کارۆ کرد. ڕوومکردە گەرماو و لەبن کەفاودا خۆم خوساندەوە.

بەسەرسوڕمانەوە پەنجەم لە کەفەڵم خشاند، هەر ڕێک لەو شوێنەی پێش کەمێک دەستی لەسەر دانابوو، قولانج بە قولانجی لەشی خۆم پشکنی، بە دوای هەستیارێتیدا گەڕام. کاتێکیش پەنجەم گەیشتە سەر گۆی مەمکی چەپم، خەیاڵم بۆ ئەوە چوو، ئەوە دەستی کارۆ بێ گرتبێتی. گرەو دەکەم دەیتوانی جمکەکەشی بە یەک دەستی کەتەوە بگرێ.

ئەم جەستە غەریب و فەرامۆشکراوەی من، کە جۆرێک بە من ناسێندرابوو گوایە دەبێ گاڵەبدرێ، چونکە سەرچاوەی خەتا و بەڵایە - بە تەنیاش خەتای پیاوان- هەرخۆی پارچەیەک بوو لە حەز و ئارەزوو؛ جەستەم سەرنجڕاکێش بوو، بەڵێ، بەڵام هەر خۆشی پڕ بوو لە حەزی بژاردن و بڕیاردان، لەتامەزرۆیی.

ئای ئەگەر کارۆ سەری براکەمی بە فەتارەت نەدەبرد.

لە گەرماوێ مامەوە تا ئاوەکە ساردبووەوە. دەنگی لە دەرکەدانێک، لە شوێنێکی باڵەخانەکەوە هات، منی وشیارکردەوە، چاویشم هەر لەسەر پەنجەرەکە بوو ئاخۆ هیچ ئاماژەی پیاوەکان هەیە. بە دوودڵی هەڵسام و پەشتەماڵێکم لە خۆم وەرپێچا و بە دوا کەفاویش داڵغەکانم شوشتنەوە و لابردن.

بە دەم پاروەنانێکی بە مرەبا و کەرەوە لاپتۆپەکەم کردەوە. گڵۆپە سوورەکەی پیلەکە هەڵدەبوو و دەکوژایەوە. لاپتۆپەکەم بە هێڵی ئەنتەرنێت بەستەوە و چوومە نێو ئیمێڵەکەم، بەو هیوایەی بەڵکو هێشتا کارتی ئینتەرنێتەکەم چەند خولەکێکی تێدا مابێ. لە نێو

بەشی هاتووی ئیمێلەکەمدا ژمارەیەکی زۆر پەیامم لە کەسانی نائاشنا و هەشت دانەشیان لە ماوەی ئەو هەفتەی ڕابردووە لە شلێرەوە بۆم هاتبوون. شلێر نووسیبووی بچمە تورکیا، لەوێشەوە بۆ بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان و داوای مافی پەنابەری بکەم، یان ئەگەر وەهاش نەکەم خۆم بگەیێنمە ئەو، یاخود بچمە هەرێمی ئۆتۆنۆم و ڕوو لەگەشەی کوردستانی باشوور بکەم.

منیش دەستم بە تایپکردنی بەرسڤەکەم بۆ شلێر کرد. "بۆ مایەی سەرسامی، من لە سەکۆی گوتاربێژیی گردبوونەوەیەک بووم، بەڵام کاتێ باسی کوێرەوەریی کوردانم کرد، هەر زوو هێنامیانە خواری. پێتوانەبێ ئامادەبم بێمە ڕێزی شۆڕشێکی فێمینیستی. هێشتاش ئەوەم لە پێشنۆرەدایە بۆ پرسێک بژیم تا لە پێناوی یەکێکیاندا بمرم... پێویستیم بە یارمەتییە. شوێنێکی ئارام. تکایە هەرچەندی زوو بێ باشە."

کاتێکیش بە نێو سندووقی نامەکاندا گوزەرم دەکرد، گۆرانییەکیشم لێدا. دەنگە غەمگینە هەڵقرچاوەکەی گۆرانیبێژە کوردەکە و دەفەکە، هەم دەیگەزتم و هەم هێوریشی دەکردمەوە.

"دەی دەستبەجێ وەڵامم بدەوە. پارەش نەما. نە شوێن و نە کەسێکی متمانەدار شک نابەم. دۆخەکە وایە هاکا بەسەریاندادام. هەندێ دەفتەر و تێبینی و سەرنجی چیا و یادنامەی ئەو هەندێکیش هی خۆمم پێچاونەتەوە. تەوقە شینەکەشت لە نێو پاکەتە پێچراوە بچکۆلەکەدایە. تکایە بە پەلە وەڵامم بدەرەوە."

بۆ کارۆشم شتێک نووسی، بەڵام ڕەشمکردەوە، جارێکی دیکە نووسیمەوە، لێ ئەمجارەش هەر ڕەشمکردەوە. کاتێکیش لەنێو ئیمیلەکەم هاتمەدەرەوە، یەکێک لە دەرکەی دا.

گوردییەکم کەوتێ. ڕۆبەکەم توند لە خۆمەوە پێچا. تۆ بڵێی پیاوەکان شەوێدی منیان لێرە بینیبێ؟ سەرنجی شەوقی مۆمیان دابێ؟ ئیمێلە تازەکانمیان بینیبێ؟ پشتاوپشت بۆ بەرپەنجەرەی ناندین کشامەوە. لێدانی زیاتری دەرکە. دەبوایە خۆم بگۆڕم، هەر هیچ نەبێ دەرپێ کورتەکەم. دیسان تەقەی دەرکە.

دەنگێکی نووساو لە پشت دەرکە تادەهات زیاتر دەبوو: "ئەوە منم."

چوومە لای دەرکە. بەڵام چی دەبێ ئەگەر کارۆ لەژێر گەفی دەمانچەوە ناچارکرابێ لە دەرکە بدا و بانگیشم بکا؟ ئەرێ بۆچی بیرمان لە وشەیەکی نهێنی نەکردبووەوە؟

"دەی بیکەرەوە، بیکەرەوە، خێرا بە!"

منیش تینم دایە بەرخۆ و دەستم دایە کێردێکی ناندین و لەپشت خۆم دانا و بە دەستی چەپەم و بە وریاییەوە دەرکەم کردەوە.

کارۆ بە دەم ئەم قسەیەوە: "زۆر باشە. هیچ کەسێک منی نەبینی." خۆی بە ژووردا کرد.

"خۆی ئەو تاوانەم بەسە کە دژەشۆڕشم."[١٤٦] بەدەم ئەم قسەیەوە کێردەکەم بۆ نێو چەکمەجەی کەوانتەرەکەی ناندین گەڕاندەوە، ئینجا قسەکەم تەواوکرد: " دەکرا کەمێک ئەتەکێت بپارێزی."

---

[١٤٦] مەبەست لێی دژە سوپای پاسدارانە.

ئەویش گوتی: "ببوورە کە شەو لێرە مامەوە. لە چاوەکانتەوە دیارە. پێدەچێ بە باشی نەنوستبی. حەزم دەکرد لە شوێنی خۆم بێ جوولە بمابامایەوە، بەڵکو تۆ هەندێک پشووت دەدا و دەڕازای، بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان منیش شەکەت بووبووم."

"من گوێم نەداوەتێ. لێ گەڕانەوەی تۆ تەنیا و تەنیا شتەکانی بۆ هەردوولامان شەپرێوتر کرد." کاتێ لەم قسەیەم بوومەوە، یەکسەر چومە ژووری نوستن و دەستم دایە پاڵتۆیەکی درێژ و سەرپۆشێک، هێنام و لای دەرگەکە بە عەلاگەیەکمەوە وەکرد، تا جاری دادێ خێرا بیانپۆشم.

ئەویش بە چاوداگرتنێکەوە: "خۆی ئاسانترە لەسەر هەر شتێک بگیرێی نەوەک لەسەر سیاسەت."

"ئەگەر ژن بیت نەخێر. دەدرێیتە بەر قامچیان، لەوانەیە سەنگساریش بکرێی. کێ دەیزانێ؟ زبڵدانێکم بە سەرپۆشەکەیەوە هێنا و کێردە زیوینە گەورەکەشم خستە ناوی و بە پەڕۆی وشکردنەوەی قاپوقاچاغیش سەرم داپۆشی. بە ورتەیەکەوە گوتم: "بێنە بەرچاوی خۆت، کچێکی پاکیزە بی و لەسەر زیناکردنیش قامچیکوت بکرێی!"

"ئەوە چی دەکەی، دەتەوێ بەو کێردە لە زەلامە چەکدارەکان بدەی؟" کە ئەمەی گوت لە گەڵیشیدا بڕۆی بۆ بەرزکردەوە، بەمە بە نیگایەکی کۆمیدیانە دەرکەوت.

"ئەگەر پێویست بکا، خۆم دەدەمە بەرچەقۆ. پێویستیشمان بە وشەیەکی نهێنی باش هەیە. بۆ ئەوە نموونە... ئمممم... نازانم. دەی تۆ بیر لە شتێک بکەوە."

"ئایسکریمی سەر دەموچاوم؟"

منیش بۆ ئەو یادەوەرەییەی ڕۆژانی شاخەوانیمان خەندەیەکم کرد و گوتم: "باشە."

"ئەری دەکریٚ بۆ ساتێک دابنیشی؟ شتێکم هەیە دەمەوێ پێتی بڵێم، دەمەوێ شتەکەم بە وریاییەوە لێوەربگری و هەڵیبسەنگێنی بەرلەوەی زەقوزۆپ بڵێی نەخێر." بەدەم ئەم قسەیەشیەوە گوێچکەی خۆی خوراند.

منیش لە بەرانبەری دانیشتیم. "دەبووایە لە هەفتەی ڕابردووەوە لێرە نەمابامە."

ئەو دەستەکانی خۆی لە یەک ئالاندن. "مشووری شوێنێکم بۆ خواردووی تا ئەو کاتەی دۆخەکە سەلامەتتر و هێورتر دەبێتەوە."

شتێک پەڕیە ناو دڵم. "تا ئەو کاتەی چیا لەبیردەکریٚ؟"

"ئێمە پێویستە شتە هەرە پێویستەکان کۆبکەینەوە و تێک بنێین. هەر ئێستاش."

کتێب لەسەر ڕەفە، خواردن لەنێو بەفرگرەکە، جلیش لەنێو دۆڵابدا. "ئەو شوێنە لە کوێیە و چۆنیش بزانم کە سەلامەتە؟"

ئەویش بۆ یەک دوو چرکە بە بێدەنگی لێم ڕاما. "تۆ هێشتا متمانەم پێناکەی، وایە؟"

"دەبێ متمانەت پێبکەم؟" دڵۆپە ئاویش لە پرچمەوە بە سەر بڕبڕەی پشتمدا دەهاتنەخوارەوە.

کارۆ وایەری تەلەفۆنەکەی لە پلاکەکە لێکردەوە و پەیامە دەنگییەکانی لێدانەوە. "خاتوو سامان، دەستبەجێ خۆت بە پۆلیسخانەی گەڕەک بناسێنە. ئێمە هەموو شتێک دەزانین." چرک.

"نازانم ئاخۆ بژاردەیەکی باشترت لەمە هەیە." بەدەم ئەم قسەیەوە شانەکانی کارۆ داکەوتن.

"چۆنت زانی ئەو پەیامە هەیە؟"

"پێشبینیکردنی ئەوەندە سەخت نەبوو. بوو؟"

هەڵسام و لە نێو ئەپارتمانەکەدا ڕاوێچکەم دان. "ئەوان هەر دەیانەوێ هەراسانم بکەن، دەنا خۆ دەیانتوانی ئێستا لێروکانە بان." باکیشم بەوە نەبوو ئاخۆ کارۆ هەستی بە لەرەی دەنگم کرد یان نا. درێژەم بە قسەکەم دا: " مەگەر دڵنیابن لەوەی میللەت بەر لەخۆیان بێدەنگم دەکەن."

کارۆ شانەکانی گرتم و گوتی: "ئێمە دەبێ هەر ئێستا لێرە بڕۆین."

ئەو سێرەی چاوی لە دەمی من گرتبوو. منیش تفەکەی خۆم قووتدایەوە، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد لە هەر ساتێکدا لێوی لەسەر لێوم دابنێ، لە کاردانەوەش دڵنیانەبووم. گرێی ڕۆبەکەشم بووبووەوە. ئەوە بوو پەنجەی ئاماژەی لەسەر لێوم دانا، بە سووریش لایبرد.

"پەککوو!" تامی خوێنی سەر لێویم کرد. دەبێ گەستبێتم.

"تا خۆت خۆت دەگۆڕی، هەوڵدەدەم هەندێ شت کۆبکەمەوە و تێکبنێم."

بەرلەوەی بگەمە ژووری نوستنم، ڕۆبەکەم لەسەر شانم خزی. نیگای تیژی ئەو لەسەر سمتم بوو. هەر بە یەک دوو خولەک لە تەوقی سەر تا قولەپێی خۆم ڕەشپۆش کرد. کارۆش دەستی دایە جانتاکان کە پێشتر تێکمنابوون. ئەو پرسی: "هیچ شتێکی دیکە ماوە، کە زۆرت لا گرنگ بێ؟"

"کەلوپەلە تایبەتییەکان."

"کەلوپەلی تایبەتی نوێت بۆ پەیدادەکەین. ترومبێلەکەم سێ کۆلان بە لای ڕۆژهەلاتەوە ڕاگرتووە. لە ماوەی دە خولەکدا بەڕێکەوە و هەر ڕێک بە ئاراستەی پۆلیسخانەکەوە بڕۆ. لە بەرانبەر پۆلیسخانەکەوە بڕۆ نێو بازاڕەکە و لەوێ بە یەکەم ئاسانسوار بۆ نێو گەراجەکە دابکشێ. نهۆمی پێنجەم. من لەوێ چاوەڕێت دەکەم."

"زۆر ئاگاداری شتەکانم بە. ئاخر هەموو وێنە و گۆڤارەکانی چیای تێدان."

منیش بەر لەوەی بکەومە بەر گەرمایی شەقامەکە، چەند شتێکی دیکەم ئاخنیە نێو جانتا دەستییەکەم و سەرپۆشەکەشەم بۆ هێنایە پێشەوە و چاویلکەی بەرخۆرم لەچاوکرد.

تێکۆشام بە متمانەوە توند هەنگاوهەلێنم، بەلام خۆ بە من نەبوو، دوای تاوێک ڕۆیشتن، ئاوڕێکم لە دوای خۆم دەدایەوە. هەرگیز سایەم ئەوەندە تۆقیو نەبووە.

بەرلەوەی بگەمە لای پۆلیسخانەکە پێم هەلێنا، خۆی ئەمەش جوولەیەکی سەرشێتانە بوو، کەچی خۆم پێ جلەونەدەکرا.

کاتێکیش گەیشتمە پێنجەمین نهۆمی ژێرزەمینی باڵەخانەکە، گەراجی ترۆمبێلان، زانتیا رەنگ زیوینەکەی کارۆ لە هیچ شوێنێک دیارنەبوو.

ئەمە داو بوو. کارۆ لەگەڵ ئەواندا بوو. هەر بۆیە لە زیندانیش بەریانداوە. جانتاکەم هێنایە پێشەوە، لەبەر سینگی خۆم رامگرت، دەستم بردە ناوی گەیشتە دەسکی کێردەکە.

گەراجی چۆل باشترین شوێنە بۆ کوشتن، دەوڵەتیش خۆی بە کردەی گرتن و لە سێدارەدان هەراسان ناکا. هیچ کەسیش سەرەداوەکەی بۆ دەرناکەوێ.

گەڕامەوە بۆ لای ئاسانسوارەکە[147]، بەردەوامیش چاوم دەگێڕا و ئەو ناوەم دەپشکنی، سرک بە هەر دەنگێ. لەوێ لە گۆشەیەک سێ ترۆمبێل لەبن تیشکی کزی گەراجەکە ڕایانگرتبوو.

قامکم لەسەر دوگمەی ئاسانسوارەکە داگرت، بەڵام خۆ ئامێرەکە زۆر بە کاوەخۆ بوو. هەوڵی پەیژەکانم دا. بۆنی تیژی میز لەسەر پەیژە تاریکەکە خەریکبوو بمرشێنێتەوە.

چاوێکم لەو وێنانەی لەسەر دیوارەکە کرابوون بڕی، لەسەر دیوارەکەدا، وێنەی چوکێکی ڕەپی گەورە لە کاتی ئاوهاتنەوە.

دەنگی مەکینەی ترۆمبێلێک هات. ترۆمبێلک بە تەناش هەڵسا.

"بڕۆین" کارۆ جامی دەرکەی داکێشایەخوار، منیش لێی ڕامام.

"ئەوە چاوەڕێی چی دەکەی؟" ئیدی ئەو گەیشتێ و دەرکەی نەفەری کردەوە.

---

[147] ئاسانسوار: ئەسانسێر. ئاسانسۆر.

منیش چوومە ناو ترومبێلەکە و هەناسەی خۆم ڕاگرت تا لە گەراجەکە دەرچووین، تەمومژیش بەری بە بینینی چیاکە گرتبوو. هۆڕنی ترومبێلانیش ئازادانە دەنگی بێزارییان لێوەدەهات. منیش هەوای پەنگاوەی نێو سینگم دەردا.

کارۆ گوتی: "شتێکی دیکەش هەیە، دەمەوێ لەگەڵت باسی بکەم."

منیش سەیری لاجانگە غەمگینەکەی ئەوم کرد. کارۆ چووە نێو گەراجێکی دیکە. هەر سەیری دەستە ڕاست و چەپم دەکرد و پرسیم: "ئەوە بۆ کوێ دەچین؟"

"ئەرێ گرفتێکت هەیە؟"

"من ڕقم لە گەراجی بنهۆم دەبێتەوە."

"لە کەیەوە؟"

"لە ئێستاوە!"

ئەویش بە شێوەی U پێچێکی کردەوە لەسەر جادە لە پێش مۆڵێکدا ڕایگرت.

من پرسیم: "بۆ ئێمە لێرەین؟"

"پێویستمان بەوەیە سەرەتا مێشکی خۆمان ساف بکەین."

"من ڕقم لە مۆڵە!"

"واز لە ڕق بێنە، دەی کەمێک بیربکەوە." بە دەم ئەم ڕستەیەوە دەنگی بەرزتر کردەوە: "لەیلا، شتەکە لەوەی خۆی هەیە قورستر مەکە. لێرە هیچ کەس بە دوای تۆدا ناگەڕێ."

جامخانەی دوکانەکانی جلفرۆشی بەم دوای نیوەڕۆیە لەبەر تیشکی خۆردا بریقەیان دەدایەوە. لە پشت جامخانەکانەوە گۆی مەمگکی مانکەنە مێینەکان قوتکرابوون. شاڵێک بە سەر سەرە شێوێنراوەکان دادرابوو - ڕێک لای ڕاستەش بڕابوو، ئەو شوێنەی دەبوو مێشکی تێدابا- بەم جۆرە ڕووی ژنە شیکپۆشەکان تەنیا لە لووتەوە بەرەو خوار دیاربوو. لاقە پلاستیکییەکانیش بە شێواوی بە ڕۆژنامە و تیپەوە شاردرابوونەوە.

"کارۆ، من ناتوانم لەم وڵاتە بمێنمەوە. وەنەبێ هەر لەبەر ئەوەبێ کە ڕەنگە لەهەر ساتێکدا شتێکم بەسەربێنن، نا. سوکوئاسان ناتوانم زیاتر بمێنمەوە، بەرگە ناگرم. هیچ شتێک بیرەوە نامبەستێتەوە." کە ئەم قسەیەم کرد ئاوڕێکم لە سەروسیمای دایەوە، ئینجا تێهەڵچوومەوە: "لەوەتەی هەم هەروا بووم، بەڵام جاران بیانوێکم هەبوو بۆ بەرگەگرتن، ئێستا بە دڵساردییەوە دەمەوێ لێی دەرچم. دەمەوێ بڕۆم، هەر کوێیەک بێ، تەنیا ئێرە نەبێ."

کارۆ لێوەکانی لەسەر یەک گیرساندن.

"تەنیا پێویستم بە شوێنێکی سەلامەت هەیە، تا شلێر پەیوەندی بە کەسانێکەوە دەکا بەڵکو لە سنوور ئاودیوم بکەن. بەلای زۆری ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ. پێویستم بە یەکلاکردنەوەی شتێک هەیە. لەوانەیە تا ئەوکات لای جوانە بمێنمەوە. هەرچەندە ئەگەر ئەوان لە ئەپارتمانەکە نەمدۆزنەوە. ئەوا دڵنیام لە مەریوان بۆم دەگەڕێن."

کارۆ سلفی لە ترومبێلەکە دایەوە. "بوەستە، پێویستە بچمە سەر کورسی دواوە، وا نییە؟" خۆ چاوەڕێی وەڵامی ئەویشم نەکرد، ئەوە بوو خۆم هەڵدایە سەر کورسی پشتەوە.. ئاخر دوا شت ئەوەبوو لە

لایەن پۆلیسی ئاکارەوە لە ترومبێلێک دەربکێشرێمە دەرەوە، چونکە لەگەڵ پیاوێکدا سووار بوومە. بەم جۆرە دەبووایە وا خۆ بنوێنین، کە شوفێرێکە و بەکرێم گرتووە. ئیدی پێم گوت: "ببوورە."

بۆ ماوەیەک کارۆ بە بێدەنگی ترومبێلەکەی لێخوڕی، منیش دوا نیگام بڕیە سەر شەقامی ئەو شارەی دالدەی دابووم، پاشان وێرانی کردم. پەیامە تەوسدارەکەش هەر دەبێ ئەوە بووبێ: "لێرە بژی، بەڵام هەرگیز تۆ یەکێک نیت لە ئێمە؛ هەوڵبدە پێی بگەی، بەڵام هەرگیز نایگەیتێ.

"نازانم چۆن ئەمەت پێبڵێم، بەڵام..." کارۆ ئەمەی بە شێوەیەک وت، لەسەر کورسی شوفێریی بە ئاستەم دەنگی دەهات. "من هەموو شەوەکە هەر بیرم لێکردووەتەوە. من دەمەوێ... مەبەستم ئەوەیە، دەتوانم ئەگەر هات و تۆش بتەوێ..."

"ببوورە، گوێم لێت نییە."

"من دەتوانم...." ئینجا ئیحمێکی کرد تا دەنگی ساف دەربچێ. "دەتوانم بتبەمە کەنەدا."

"تۆ دەتوانی؟"

گەیشتینە ترافیک لایتێک. "لەوانەیە وەها بیربکەیتەوە..." لەو کاتەدا دەستی بۆ تەسلیمبوون بەرزکردنەوە. "بەوەی منیش هەروەک کەسانی دیکە دەستبڕ بم."

"کارۆ، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟"

قامکەکانی تەقاندن و سەیرێکی لای دەستە ڕاست و چەپشی کرد. "من ئەو شتەت تەنیا بۆ ئەوە دەخەمە بەردەست، دڵنیام چیاش

دەیویست هەروا بکەم. ئەرخەیانم چیاش ئەمەی بۆ خوشکەکەم دەکرد."

"چی بکات؟"

چرای ترافیکەکە کەسک بوو، بە خێرایی لە چوارڕیانەکە ڕەتبوو، بەرلەوەی بە لای دەستەڕاستدا بابداتەوە بە پێش مارسدیسێک کەوتەوە. وەستا و چوارییەکانی داگیرساند. "زۆر چاکە، ئێستا گوێبگرە. دەتوانم بتبەمە کەنەدا، لەوێش تۆ ئازادی و ڕێگەی خۆت دەگری. من بە ناموسم سوێند دەخۆم، کارەکەم هیچ بەدقۆستنەوەیەکی تێدا نییە. خوشکی چیا هەروەک خوشکی خۆم وایە. سۆز دەدەم."

لە ئاوێنەی پشتەوە نیگامان بەریەک کەوت و لە پەشێویشدا سەرم هەژاند. بیرم کەوتەوە خۆ خێزانی ئەو لە تۆرنتۆ بوون و ئەویش کارتی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی ئەوێی هەیە، هەرچەندە ئەو بایی ئەوەندە لەوێ نەسەنگرابووەوە[148] تا ببێتە هاوولاتییەکی کەنەدی. لێ پرسەکە ئەوەیە ئەو چۆن دەتوانێ بمباتە ئەوێ؟

"من دەتوانم داوای ڤیزای کەنەدات بۆ بکەم و لە ماوەی ساڵێک یان شتێکی وەهادا کاغەزەکان ڕێکبخرێن." کاتێ لەم قسەیەی بووەوە چاوێکی لێکردم، ئینجا گەڕایەوە سەر ڕێگە و لێخوڕین. "کاتێکیش دەگەیتە ئەوێ، ئەوا کارتی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی وەردەگری، ئینجا ئازادی لە گرتنەبەری ڕێگەی تایبەتی خۆت. هیچ پابەندییەکیشت ناکەوێتەسەر. هەروەها هیچ مەترسیشی تێدا نییە. تۆ هەر دەبێ تا ئەو کاتە خۆت حەشاربدەی و دەرنەکەوی."

---

[148] سەنگرانەوە: مانەوە و گیرسانەوە لە شوێنێک.

"باشە تۆ بۆ شتێکی وەها دەکەی؟"

"چۆن؟"

"باشە، بۆچی و چۆن؟"

چاوێکی لە ئاوێنەی لای خۆی کرد و چووە سەر جادە جەنجاڵەکە، ئینجا بە ئاراستەی باکوور بەرەو لای زیندانەکە لێیخوڕی. "تۆ براکەت و منیش خۆشەویسترین برادەرم لە دەست دا. خۆ دەکرێ یارمەتی خوشکەکەی بدەم. کاتێک نەمتوانی چیا ڕزگاربکەم، بەڵام دەتوانم تۆ بپارێزم. خۆشت لە من باشتر دەزانی چیا بووەتە پرسێکی هەستیار، ئەوانیش ئێستا لە تۆ دەترسن... ناشمەوێ وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچم. ئەوانەی هەواڵن بۆ من، بۆ تۆش مێژوون."

"ئاخر چۆن کەنەدا مافی نیشتەجێبوونم دەداتێ؟ شلێر پێی گوتم، دەبێ من لە بارەگای نەتەوە یەککرتووەکان لە تورکیا داوای مافی پەنابەریی بکەم. منیش لە پێویست زیاتر بەڵگەم لەبەردەستن، کە ژیانم لە مەترسیدایە، بەڵام لەوە تێناگەم چۆن تۆ کەنەدات هێناوەتە گۆڕێ. ئەگەر هات و داوای مافی پەنابەریی بکەم، ئەوا دەبێ سەرەتا داوابکەم بمگەیەننە ئەوێ، بەڵام خۆ ئەوان ڕێگەی ئەو نادەن. لە سەرێکی دیکەشەوە پێواژۆیەکە سێ تا پێنج ساڵێکی دەوێ، نەوەک ساڵێک."

ئەو بوتڵە ئاوێکی لە شوێنی کوپەکانی لای دەرکە ڕاکێشا و قومێکی لێخواردەوە. "مێردم پێبکە." منیش چاوم لێ زەق بوو. ئەو قسەکەی خۆی وەها تەواوکرد. "تۆ دەبێ مێردم پێبکەی، بەڵام تەنیا لەسەر کاغەز."

به من نەبوو پێکەنیم. چاوە نیلییەکانی لە ئاوێنەکەوە هەر شکۆی لێدەباری. بەر لەوەی تیشکۆی هزری خۆی بخاتە سەر ڕێگە و لێخوڕین، بە خێرایی ئاوڕێکی لێدامەوە.

گەدەم تێکهەڵدەچوو کاتێ بەرەنگاری شەپۆلی دووەمی پێکەنینەکەم کردەوە. هەستمکرد ژیانم هەروەک شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕانەی سامۆئێل بێکێتە. ئیدی فرمسێک داباریینە سەر ڕوومەتم.

"بیوەستێنە."

هەرچەند بە توندی هەوڵمدا قاقاکەم بوەستێنم، ئەوەندەیتر تەوژمە ماخۆلانییەکەم پتر دەبوو. ئەوە بوو ئەو هەندێ ئاوی پرژاندە سەر دەموچاوم.

کاتێکیش ترومبێلێک بە لایدا هات و لەو تێپەڕی دەستی خستە سەر هۆڕن، لە پێویست زیاتر دەستی لەسەر دانا. "چی پێکەنیناوی هەیە؟ من باشترین بژاردەم خستییە بەردەست. کێ دەزانێ ئاخۆ دەبێ چەند ساڵ لە تورکیا چاوەڕێ بکەی تا ئەنجامت دەستدەکەوێ؟ بیستوومە کەسانی وا هەن زیاتر لە یازدە ساڵە چاوەڕێی مافی پەنابەریی دەکەن. بیستووشمە کەسانی وەها هەبوون، هەر بە ڕاستییش نیشانی ئەشکەنجەیان لەسەر جەستە هەبووە، کەچی داوانامەکەیان ڕەتکراوەتەوە. باشترین سیناریۆش ئەوەیە، چوار ساڵ لە ژیانت بە دەستەوئەژنۆیی دەمێنێتەوە."

لەگەڵ چوونەدەرەوە لە تاران، دیمەنەکەش گۆڕا. گرد و زورگە بەرزونزمەکان لەبەر سایەی خۆردا وەک هێڵێکی بۆر خۆیان دەنواند و دارکاژەکانیش لەگەڵ تیژڕۆیشتنی ترومبێلەکان بەخێرایی

لەبەرچاوان ڕەتبوون. کارۆ لەسەر هەق بوو. من زۆر بەسەرهاتی هاوشێوەم بیستبوون، لە نێویشیاندا بەسەرهاتی ژنێک کە لە بەردەم زینداندا یەکمان ناسی و بۆی گێڕامەوە. ئەو دەبووایە لەو ماوەیەی داوانامەی پەنابەریی پێشکەشکردبوو تا بڕیاری لێبدەن، لە تورکیا بە قاچاغی کاربکا. ئاخر کیژەکەی پێویستی بە جووتێ کەوشی گەرم و نەرم هەبوو، ئیدی دەستی بە خاوێنکردنەوەی موتێلەکان کرد، لە کاتێکدا بیری لە ناوەڕۆکی نووسینەکەی داهاتوو سەبارەت بە شۆڕشگێڕێتی دەکردەوە. ئەو ڕۆژەی قەول وا بوو کرێیەکەی بدرێتێ، خاوەن کارەکەی هاتە ئەو ژوورەی پاکی دەکردەوە و قایشی دوولینگەکەی کردەوە. ئیدی بە ئاستەم توانی لە موتێلەکە بێتەدەر و پیلی کیژەکەی گرت و گەڕایەوە ئێران. ئەو یازدە ساڵی تەمەنی لەودیو شیشەکانی زینداندا بەسەربرد و کاتێکیش ئازادکرا، کە کیژە هەرزەکارەکەی لەسەر خۆپیشاندانێ خرابووە زیندانەوە.

لە هیکەوە نیگەران بووم و پرسیم: "ئەرێ خۆ خاڵی بازگە لەسەر ڕێگا نین، هەن؟"

"چی؟"

"بۆ کوێ دەڕۆین؟"

"بۆ شوێنێکی پڕ لە ئارامی."

"شوێنێکی سەلامەت؟"

"بەڵێ. بەڵێن دەدەم."

ئێمە بەسەر جادە خێرایەکەدا ڕۆیشتین، ئەوەی شەش سایدی هەبوو، بە لای شوێنێکدا تێپەڕین یەک دەرزەن ئاڵا بە نەرمە با

دەشەکانەوە. ئالآ! ئای چەند ڕقم لێیان بوو، ئاخر ئەوان هێمای دابەشکردن و خوێنڕشتن بوون. بۆ ئەوەی لەو وڵاتە دەرچم کە هی من نەبوو، ئەوەی براکەمی بە خوێنساردی کوشت، دەبووایە متمانە بەوە بکەم جارێکی دیکە کارۆ لێنەگەڕێ بشکێم. باشە چۆن من ئاوا بکەم؟

"پێمبڵێ لەیلا، ڕات لەسەر پلانەکەم چییە؟

کارۆ ئەوەندە توند دەستی بە سوکانەکەوە گرتبوو، سپی هەڵگەڕابوو، ئەمە لە کاتێکدا چاوەڕوانی بەرسڤی منی دەکرد.

منیش ئاهێکم هەڵکێشا و لەسەر کورسی پشتەوە قیت دانیشتم. ئاسمان بۆر و تەمومژاوی هەڵگەڕابوو. "باوکم هەرگیزا و هەرگیز ڕێگە نادا."

ئەویش بە هێواشی وەڵامی دایەوە. "ئەگەر تۆ لەگەڵ پلانەکە کۆک بی، ئەوا ئەم شتە نابێتە کەندوکۆسپ." ئەویش لە سەر هەق بوو. لە وڵاتێکی وەها گەندەڵدا، ساختەکردنی واژۆی باوک هیچ کێشە نەبوو.

"باشە ئەدی چی دەقەومێ ئەگەر هاتوو کەنەدا ڕاستییەکەی بۆ دەرکەوت؟

"سەبارەت بە مارەکردنەکە؟ خۆ ئێمە درۆ ناکەین. هەر بە ڕاستی دەبینە ژن و مێردی یەکدی. ئەوانیش نایگەیەننە مریشکەڕەشە تا تێستی پاکیزەیت بۆ بکەن."

منیش گوتم: "من دەچمە هەرێمی کوردستان. ئەوێ لە گەشەسەندن دایە و منیش دەمەوێ لە شوێنێک بژیم کە کورد تێیدا

فەرمانڕەوایە. یاخود لەوانەیە خۆم بگەیەنمە شلێری." لە ئاوێنەکەی پشتەوەڕا دیاربوو، ڕوخسارە دەربڕەکەی کارۆ غەمبار بوو. "باشە ئەو شوێنە سەلامەتە کوێیە، کە منی بۆ دەبەی؟"

"هەواری خوشکەکەم لە لەڤاسان[١٤٩]. ماوەیەکە چۆڵە."

"ئەوە چۆنە چۆڵە؟ ئەوین هەر لە کەنەدایە؟"

"ئەوین چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بە ڤیزای خوێندن چووەتە تۆرۆنتۆ، بەڵام ئێستا لە نیویۆرک کاردەکا."

"کەی ئەو ڕۆیشت؟"

"پێش هەژدە ساڵ. بەڵکو زیاتر، بیست ساڵ؟ لەو کاتەوە نەگەڕاوەتەوە. ئەوکات خوێندن لە دەرەوە باو نەبوو. مرۆ دەبووایە سەیری خشتەی کاتەلۆگی زانکۆکانی بکردبایە، نامەی بۆ نووسیبان و داوای فۆرمی وەرگرتنی بکردبا، پڕیکردبایەوە ئەوسا بۆی بناردنایەتەوە، هەینێ دەبوایە شەش مانگێک یان شتێکی وەها چاوەڕێی بکردبایە ئاخۆ وەرگیرابا یان نا، بەڵام ئەو وەرگیرا."

"باوکیشم هەمان شتی کرد. ئەویش لە بەرنامەی دکتۆرا لە UCLA وەرگیرابوو، زەماڵەی خوێندنیشی پێدرابوو، بەڵام شۆڕشەکە قەوما ئینجا پرسی بە بارمتەگرتنی باڵیۆزخانەی ئەمریکاشی بە دوادا هات. دەکرا چیرۆکەکەی لە لایەن چیخۆفەوە بە هەستێکی ڤیناوییەوە نووسرابا." ئینجا بێدەنگ بوو. کارۆ نەیدەویست لەبارەی باوکییەوە بدوێ.

---

[١٤٩] Lavasan

منیش درێژەم بە قسەکەی خۆم دا: "ئەرێ چی وای لە خوشکت کرد لە دەرەوە بخوێنێ؟ پێم وابێ کاتێ ئەو وڵاتی جێهێشت، مێردی نەکردبوو، وایە؟"

"وڵاتێکی جیهانی سێیەم هەر بە تەنیا لەگەڵ مێشکی جیهانی سێیەم دێتەوە."

"ئەوە قسەی خوشکەکەت بوو؟"

"بە دڵنیاییەوە خوشکەکەم وایکرد. هەرچەندە ئێستا دەڵێت ئەمە لە ڕووی سیاسییەوە قسەیەکی قەبوڵکراو نییە."

منیش پرسیم: "کەواتە پێتوایە مێشکی ئەو سەر بە وڵاتانی پەرەسەندووە؟"

"پێموایە وەهایە. تۆ هەمیشە ئەوم بیردەخەیتەوە."

"باشە. هێشتاش هەر هەمان بیرکردنەوەی هەیە؟"

پێکەنینە سوکەکەی دەموددانی بە دیار خست، کە ڕیزە ددانێکی وردیلەی و جوانی هەن، ئەمەش گەواهییەکی دیکەی گەورەبوونێکە لە باوەشی خێزانێکی خۆشگوزەران. "پێم وابێ وەهایە. پێدەچێ ئەو شادمان بێ. ئەو بەڕێوبەرێکی هەرە باڵایە. هەرگیز مێردی نەکرد و لە دووری دایبابیشم دەژی."

"دایبابت دە ساڵ پترە لە دەرەوە دەژین، وایە؟"

"بەڵێ، ئەوان بە دڵنیاییەوە مشووری ئەوە دەخۆن بە شێوەیەکی مۆدرێن دەربکەون هەرچەندە بڕواشیان هەر بە ژیانێکی نەریتیانەیە." کارۆ دوای ئەم قسەیە چاوێکی لێداگرتم و گوتی: "من برسیمە."

لەسەر ڕێگای خێرا لە شوێنێک وەستاین و چێشتخانەیەکی بچووکمان دۆزیەوە و لاماندا، کەبابێکمان خوارد کە هەر لە دەمدا دەتوایەوە، لە ڕۆژی شوێنبزبوونی چیاوەوە، ئەو ڕۆژەی هەرسێکمان، من و کارۆ و چیا لە ماڵەوە لەسەر یەک مێز دانیشتین و هەموو مەنجەڵە شێوەکەمان خوارد، کە لێمنابوو، تامی ئەو کەبابە لە دەمما لە هەموو شتێک خۆشتر بوو کە خواردبێتم. ئێستا تێگەیشتم لە دوای ئەو ڕووداوە بەدواوە ئەوەندە زۆر شێوم لێنەناوە.

"من ئەوەندەی چیا و تۆ لەبارەی مێژووی کوردەوە نازانم، بەڵام لە بیرمە ئەو دەیگوت کاتێ خەونی کورد دێتەدی، هەمیشە کورتخایەنە. دڵنیام لەوەی هەرێمی کوردستان زۆر لە ئێرە سەلامەتتر و ئازادترە، بەڵام ئایا تۆ دەتوانی لەوێ فیلمسازی بخوێنی؟ ئەرێ باشە تۆ لە کەنەدا پاشەڕۆژت باشتر نابێ؟"

"پێویستم بەوەیە لەگەڵ گەلەکەی خۆمدا بم."

"لەیلا، با لێکینەشارینەوە. من و تۆ شۆڕشگێڕ نین. چیاش جیاواز بوو. چوونە کوردستان یان چوونەڕیزی پێشمەرگەوە شتەکە باشتر ناکا."

بەڵێ، ئەو ڕاست بوو. ئەگەر من وەک چیا و بابە زیندانی بکرێم، ئەوا بە یەک ڕۆژ دەڕوخێم. "بەڵام خۆ خوێندن لە کەنەدا گرانە. دەکرێ لە کوردستان بەکالۆریۆس بهێنمەوە ئینجا بۆ تەواوکردنی خوێندن بچمە ئەوێ. تا ئەوکاتیش هەندێ پارە پاشەکەوت دەکەم."

"ئەم کارە بە لای کەمییەوە چوار ساڵ ژیانت دوا دەخا، بابی ئەوندەش لەوێ دینار خڕناکەیتەوە تا پارەی خوێندنی کەنەدا بە

دۆلار بدەیتەوە. لێ ئەگەر بە یەکجار لە کەنەدا مافی نیشتەجێبوونی هەمیشەییت وەرگرت، ئەوا دەتوانی لە سەر قاچەکانی خۆت بوەستی، قەرزی خوێندن وەربگری و داوای فەند یان پشتیوانییەکەی دارایی بۆ پرۆژەکەشت بدۆزیەوە. ئەو کات چیا لەنێو کارەکانی تۆدا دەژی و منیش هەستدەکەم قەرزەکەی ئەوم دابێتەوە."

"قەرزی چی؟"

کارۆ کەوچکەکەی دانا، قامکەکانی لەیەک گیرکردن، سەری خستە نێو لەپی و پەنجەی دایە بەر لاجانگی. ئینجا گوتی: "چیا دنەدەرێکی ڕاستەقینەی ژیانی من بوو. من ئەو کوڕەم خۆشدەویست. دڵنیابووم ئەویش هەر بۆ من وابوو. ئەگەر هاتبا و پێگەکەمان پێچەوانە بووبانەوە ئەو زیاتر لە منیشی دەکرد."

خەریکبوو چەناگەم بلەرزێ. "لەو ڕۆژەوەی ئەو نەماوە، من هەموو ڕۆژێک لە جاران زیاتر غەریبی دەکەم."

"هەروەها منیش، بەڵام ئێمە ڕێگەکەی بە شەڕەفەوە هەڵدەگرین، ئەمەش زیاتر لە کەنەداوە بەدی دێ نەوەک لە شوێنێکی دیکە."

من پێویستم بەوە هەبوو، بە لای کەمییەوە بۆ یەک چرکەش با، چیام لێ وەدەرکەوتبایە تا پێی بگوتبامایە چی بکەم. من بایی ئەوەندە هۆکارم هەبوون متمانە بە کارۆ بکەم هەروەک زۆر هۆکاریشم بۆ بێمتمانەیی بەو هەبوون.

کاتێ شیرینی دوای خواردن هات کارۆ بەم جۆرە سەرەداوی قسەی داهێنا: "ئەمە نەخشەکەیە. ئەمشەو لە هەواری خوشکەکەم

برازیٚ و منیش لای برادەریٚکم دەمێنمەوە. بۆ بەیانیش یەکەم شت بیکەین، مارەبڕینەکە لای تۆمارگەی ژنومێردایەتی قەید دەکەین."

منیش کەوچکەکەم لە دەورەی تۆپە ئایسکرێمەکەی زەعفەرانیەکەی سەر قاپەکەم وەردەدا. "خەڵکی شادمان لەبەر خۆشەویستی خۆیان لەیەک مارەدەکەن. تۆش لەپای هەستی بەرپرسیاریێتی مارەم دەکەی. پێم وابێ منیش لەبەر نامرادی بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنمەوە خۆم لە تۆ مارە دەکەم."

ئەویش تەماشایەکی کردم. دەمی هەڵبڕی، لێوەکانی لەیەک کردنەوە، بەڵام وشەکانی خۆی قووتدانەوە.

دوای ئەوەی پارەکەی دا، چێشتخانەکەمان بەجێهێشت.

ئەو بە خەندەوە: "کەواتە ئیشەکە دەکەی؟ مێردم پێدەکەی؟ مەبەستم ئەوەیە لە نامرادیان وەها دەکەی."

"نەخێر، بەڵام هەرچۆنێک بێ ئەڵقەیەکم دەوێ و پێویستیش ناکا خوازبێنیم بکەی."

ئەو لە ناخەوە دایە قاقا، پێکەنینەکە گەیشتە چاوی، دیاربوو ئاسوودە بوو.

"لە ماوەی بیست خولەکی دیکەدا دەگەینە ئەوێ. بەیانیش زوو بۆ واژۆکردنی کاغەزەکان دێمە دوات. بڕوانامەی لەداکیبوونیشت لەبیرنەکەی. ئەگەر ڕات لەسەر بێ، داواش لە کەژاڵی خاوێنکەرەوەی باڵەخانەکە دەکەم، باقی کەلوپەلەکانی ئەوێت بۆ بفرۆشێ. دوای ئەوەی لای نووسینگەی قەیدنامە جێدەهێڵین، یەکسەر بلیتێکی فڕین بۆ تۆرنتۆ بۆ خۆم دەکڕم.

کاتێکیش گەیشتینە هەواری خوشکەکەی کارۆ، بێ ئەوەی قولماتم لە دەم بێتەدەرەوە لە ترومبێلەکە دابەزیم. جومگەکانم لەبەر دانیشتنی زۆری ناو ترومبێل ڕەق بووبوون، کاتێکیش پاڵمدایەوە و خۆم لێککێشایەوە، ئیدی ئەوێ بووە پەناگام. لێرە لە لەڤاساندا، چیای جوان و ناوازە، هەوای سازگار و ڕێگەوبانی پێچاوپێچ هەبوون. دەوروبەری ئەوێ پڕ لە کۆشکی نایاب بوو، تەلارسازییەکەیان وای لێکردم بیرم بۆ ئەوە بچێ، کە خاوەنەکانیان کەسانی ناودار بن یاخود دەسەلاتدارانی دەوڵەت بن. شەقامەکانی هێور و ئارام، جیهانێک بوو دوور لە جەنجاڵی و هەراسانی شارەکە. بەڵی، کارۆ ڕاست بوو، مەگەر بە دواماندا هاتبن و سووسەیان کردبین، دەنا لێرە کەس تەماشای من ناکا. من سەلامەت بووم، بەلام تۆ بڵێی ئەمە لە دۆخی ڕاستەقینەی ژان و لەدەستدان هیچ بگۆڕێ؟

"بوەستە، شتێک هەیە بەرلەوەی بڕۆم پێویستە بە یەکەوە بیکەین." ئەو جامی ترومبێلەکەی داهێنایە خوارەوە و درێژەی بە قسەکەی دا: "ئێمە دەبێ بچینە ستۆدیۆیەک و هەندێ وێنەی مارەبڕین بگرین. ئاخر ئەم وێنانە بۆ دۆسیەکە چارەنووسساز دەبن."

منیش گوتم: "خۆی یەک ڕاستی هەیە، پێویستە بیزانم." ئەوەی ڕاستی بێ، لەوێدا زۆر شت هەبوو دەمویست بیانزانم، نەشمدەتوانی تاکە شتێکیشیان لێهەڵبژێرم. دیسان لە کورسی پشتەوەی ترومبێلەکە دانیشتمەوە. "ئەرێ دەتوانی شتەکە وەها ڕێکبخەی، کە ناوی تۆ لەسەر بەڵگەنامەی لەدایکبوونم دەرنەکەوێ؟"

"دەکرێ هۆکارەکەی ڕوونبکەیتەوە؟"

"ئەگەر هاتوو کەنەدا داواکەمی ڕەتکردەوە و تۆش نەگەڕایتەوە و بە هەر هۆیەکیش بێ تەڵاقم نەدەیت، ئەوا تا باقی ژیانم هەر بە مارەبڕاوی تۆ دەمێنمەوە."

ئەو بە چاوداگرتنەوە: "ئینجا چ هەڵەیەک لەمەدا هەیە؟ بڕوام وایە پێویستمان بە هەموو بەڵگەنامەیەکی قانونی دەبێ تا پرسەکەمان سەربگرێ، بەڵام خۆ دەکرێ ناسنامەی تۆ بزر ببێ و یەکێکی دیکە داوا بکەیتەوە. کەواتە بەڵێ، دەتوانم شتی وەها ڕێکبخەم."

"بەبێ حەوجەبوون بە بەڵگەنامەکانی باوکم و شاهیدیی درواسێ، ئەمە مەیسەر دەبێ؟

ئەویش گوتی: "بەبێ سەرئێشەی تۆ، دەتوانین سمێڵەکانیان چەور بکەین. هەردوو ناسنامەکان هەڵبگرە. بۆ ئەوەی بە بێ کێشە ڕاتبکێشم."

ئەدی ئەگەر هات و لەو ماوەیەی ئەو لێرە نەبوو، من گیرام، ئەوا هەر لەو کاتەدا دەتوانێ بە هانامەوە بێ ئەگەر هاتوو خزم بین.

ئینجا ئەو پرسی: "ئەمە هەموو شتێکە؟"

"نەخێر."

ئەویش ترومبێلەکەی کوژاندەوە.

"ئینجا پرسی: "ویستت چی بڵێی؟ لە دوا ڕۆژی چیادا، کاتێک تۆ لەسەر پەیژەکان بووی و منیش دەپاڕامەوە بمێنیتەوە."

"من....." تەماشای هەر دوو لای کردم، وەک ئەوەی کەروێشکێک بێ و چاو لە ڕاوکەرەکەی بگێڕێ.

منیش داوامکرد: "ڕاستییەکە."

"سوێند دەخۆم داوام لێدەکرد بمێنێتەوە، ئاخر دیمەنی ڤیدیۆکان منیشی ترساندبوو."

وچانێکی درێژ. "باشە، ئەدی بۆ وات نەکرد."

کارۆ دەستەکانی لە پشت سەری خۆی دانان، ئینجا سەری بۆ پێشەوە هێنا و لەسەر سوکانی دانا. "نەمدەویست تۆ وەها بیربکەیتەوە، کە من ترسنۆک بووم."

منیش نووزەیەکم لێوە هات: "خۆ ئەگەر لێگەڕابای بە ترسنۆکم زانیبای، ئەوا چیا لە ژیاندا دەما."

ئەو لە ترومبێلەکە هاتەدەر و دەستی گرتم. "بەڵێنت دەدەمێ، قەرەبووی بکەمەوە." ئیدی بەربەستەکەی نێوانمان شکا و بە هەنسکەوە یەکدیمان لە باوەش گرت

## بەندی سی

کارۆ باوەشی پێداکردم، لە ئامێزگرتنەکەش زیاتر لە پێویستی خایاند. منیش ئاوڕێکم لە دەورووبەرم دایەوە مەبادا پۆلیسی ئەلئەمر بیلمەعروف و نەهی عەنلمونکەر لەو ناوە بن، چاوم لە ڕوخساری ئەو خەڵکەش گێڕا، ئەوانەی سەرنجیان بۆ سەر ئێمە ڕاکێشرابوو.

بڵندگۆی فڕۆکەخانەش گوتی: "ئەمە بانگەوازی سواربوونی فڕینی ژمارە ٧٥٩یە بۆ ئوسترالیا..."

کارۆ دەستی لەسەر شانم دانا، داوە قژە ڕەشەکەی بەسەر نێوچاواندا هاتبوونە خوارەوە. "هۆ خاتوونی کۆڵنەدەر، بەم زووانە دەتبینمەوە."

منیش خۆم لە نیگای دزییەوە، تا لەو گەردەلوولەی لە هەناومدا پێچی دەخوارد خۆم ببوێرم. "ئەوە گاڵتەم پێدەکەی؟"

"چاو دەبڕیە نێو هەرجومەرج و ئەودیوی دەبینی. هیچ شتێک عەرشی دانبەخۆداگریی تۆ ناهەژێنی."

خۆی ئەمە لە هەمبانەی ئاسایی وشەکانی ئەودا نەبوو. "ئەوە تۆ دێڕە شیعرێک دەڵێیتەوە؟"

بە خەندەیەکی مەکرۆیانە گوتی: "خانمە هاوسەرەکەم، تکایە پتر وشیار بە و دانبەخۆدابگرە تا ئەو کاتەی ڤیزاکەت دەگا." ئینجا ماچێکی لە گۆشەی چەناگەم کرد، بەڵام لێوی تەنیا بەر لەچکەکەم کەوت.

منیش چاوم بڕیە چاوە نیلییەکانی، ئینجا دوا نیگام کەوتە سەر لێوە ئەستوورەکانی. ماچێک لە هەنیەی من. نەڕەی نیشتنەوەی فڕۆکەیەک. مانەوەی بۆنی کۆلۆنیا چرەکەی دوای ڕۆیشتنی بە چەند خولەکێک.چاوم بۆ هێمای چوونەدەرەوە لە فڕۆکەخانەکەدا گێڕا.

"لەیلا!" ئەو بە شێوەیەکی ئەوەندە شیرین بانگیکردم. وەک ئەوەی ناوەکەم بە (لی- لا) بچێ. منیش ئاوڕم دایەوە. "تکایە، ئاگات لە خۆت بێ." ئینجا ملی لێنا و ڕۆیشت.

منیش دەستم لە دەوری دەمم بە خڕی ڕاگرت و بە دوایدا گازمکردێ[150]: "لە ڤیەنناوە زەنگم بۆ لێبدەوە." بەهۆی ئابڵووقەی ئەمریکاوە هێڵی ئاسمانی ئێران بووەتە تابووتی مردووان[151]. دوای وەستانێکی شەش سەعاتی، ئینجا سواری هێڵی کەنەدەی دەبێ، مەترسییەکە کەم دەبێتەوە.

تاکە ڕێگەش تا بزانم ئاخۆ لە لیستی ڕەشدام بۆ دەرچوون لە وڵات هەوڵ و تەقەلایەکی گەرەک بوو، ئەمەش پێویستی بە ڤیزا هەبوو. بەختێکی زۆریشی پێویست بوو تا ئەو هەموو وردەکارییانە جێگەی خۆیان بگرن و هەموو شتێک پێکەوە بە جۆرێک ڕێککبەوێ تا ڕێگە بدەن بفڕم. خۆ ئەگەر بەخت شتێکی بۆ ماوەیی بێ، ئەوا هەرگیز فڕین بە چاوی خۆم نابینم.

بینیم کارۆ بە نێو ڕێڕەوێکی جامبەندا دەڕوا، تەنیا بۆ پیادەڕۆیانی سەرنشینی فڕۆکە ڕێگەپێدراو بوو. سەرم سووڕا، هەستمکرد نەخۆشی گێژاوی دەریام هەیە. لەوێ پیاوێک دەڕوا، کە

---

[150] گازکردن: بانگکردن.

[151] مەبەست ئەوەیە زووزوو دەکەونە خوارەوە چونکە کۆن و لەکارکەوتوون.

دوێنێ لای ستۆدیۆی وێنەگرتن زۆر لێمەوە نزیک بوو -بۆ ماوەیەکی کورتخایەن هەناسە و جەستەمان یەکانگیر بوو- ئیدی لەسەر قسەی وێنەگرەکە لێوی لەسەر لێوی من دانا، بەلام بە ئاستەم.

پەنجەرە گەورەکانی خانووە قەپەنگدارەکەی شاری لەڤاسان، لە باکووری تاران جیهانێکی سەیروسەمەرەی بێسەروبەری گیاوگۆل و چلەدار و گەلای وەریوی حەوشەی بەردەمیشی نیشاندەدا. خانووەکە لە ناوەوەڕا بە کۆتەلّی لەدارداتاشراوی مەلان و تابلۆ دیمەنی سەرنجڕاکێشی لەچوارچێوەکێشراو، لێ لەگەڵ ئەوەشدا بۆنی گەنیوی کرم و مەگەزە مردووەکان لە هەموو دیوێکیدا[١٥٢] دەهات، لەوە دەچوو پێش من جێنشینگەی مشک و جورجان بووە.

لەنێو جانتاکەمدا، کارۆ وێنەیەکی چوارچێوەداری خۆی و منی دانابوو، لە کاتی مارەبڕینەکەدا گرتبوومان، بە بزەوە دەستی لەسەر ڕوومەتم دانابوو، ڕاستەوڕاست سەیری چاوی کامێرای کردبوو، وەک ئەوەیپەنجە بنێتە نێو چاوی هەر کەسێکەوە کە گومان بخاتە سەر هاوسەرگیرییەکە. لێ خۆ ئەوە هەر وێنەیەک بوو. بە پەرۆشەوە لەنێو جلە پێچراوەکاندا بە دوای وێنەی براکەمدا گەڕام. حەزم دەکرد وەسەر دوندی چیا بکەوم و پڕ بە دەمم هاوار بکەم.

کارۆ تەلەفۆنی کرد: "ڤیەننا فرۆکەخانەیەکی جوانی هەیە. لێرە سەعات دووی شەوە."

---

[١٥٢] دیو: ژوور، هۆدە.

"ئەرێ بۆچی هەموو وێنەکانی چیات لێ دزیوم؟ چۆن وێرای وەها بکەی؟"

ئەو تەلەفۆنەکەی داخستەوە. منیش دەستم دایە وێنەی مارەبڕینەکە و بە دیوارم دادا، وردوخاش بوو، جامەکە بووە سەد پارچە. نازانم کوێم بوو، بەڵام ئازارم پێگەیشت. لە ناخەوە ڕووشابووم، هەمووم شین و مۆر بووبووەوە.

هەفتەی یەکەم ئەو هەوارەی کارۆ گوتبووی چەند ساڵێکە بەکرێمان نەداوە، گەسکمدا و تەپوتۆزەکەیم ڕامالی. کاتێکیش ماڵەکە وای لێهات بۆ ژیان بشێ، ڕۆحی وێرانم ئاهێکی تێگەڕایەوە. دەستم دەنێو باخچەکە وەردا، چڵە وشکەکانم لێکردنەوە، گوڵەکانم بڕینەوە، ئاوم دان. لەو ماوەیەدا چیدی سایەی چیا ڕاوینەدەنام، زیاتر وەک یاوەرێک بوو، کۆیدەکردینەوە.

دوو هەفتە بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی بوو، کە دواجار زەنگی بۆ لێدابووم، ئینجا بە کورتە پەیامێک ئاگاداری کردمەوە، گەیشتووەتە تۆرنتۆ. لە سەر هەڵچوونەکەم لۆمەی کردم.

بەتاڵیی بەفرگرەکە مرۆڤی نائومێد دەکرد، بەڵام خۆ مەترسیی ئاشکرا بوون و گرتن لە ڕێگەی چوونم بۆ لای دوکان و مێوەفرۆش بەسەرمدا زاڵ بوو، وای کرد جارێ زیاتر بەرگەبگرم و خۆم ڕابێنم. لەتکە پەتاتە[١٥٣] و فاسۆلیای ناو قوتوم دۆزیەوە، ئیدی پەتۆیەکم لە خۆم وەرپێچاو لە قەپەنگەکە دانیشتم و ئیستکانە چایەکی گەرمم دانا.

---

[١٥٣] مەبەست جیبسی پەتاتەیە، بە کوردی وشەیەکم بۆ نەدۆزرایەوە، لەسەر کێشی لەتکەسێو و هەرمێ و هەنجیر کردمە لەتکەپەتاتە.

لەگەڵ زەردەی رۆژهەڵات، پشیلەیەکی بەڵەکی سپی و رەشی بەرەڵڵا، بەسەر پاردەکەی دەورەی دەرگایەکەدا هەڵگەڕا، بانگم کردێ: "بۆ شوێنێکی هەڵە هاتووی. پشۆکە، ئێرە چ خواردنی تۆی لێنیە، بەڵام ئەگەر بتوانی هەرسی کەی، پارەیەکی چاکی لێیە، یادگاریی مێردە درۆینەکەمە کە وادەزانێ سوکوئاسان وەک دێوەکەی عەلائەدین دەتوانێ خەم و پەژارەمان راماڵێ."

قسەکەم پشە جوانەکەی نەوەستاند. "تۆ زۆر خەپەی. لەو شوێنەی لێیهاتووم، پشییلەکان هەر بە قەبارەی مشکەکانی تارانن. مشکیشمان هێندەی لێرە سیسرکانی ئێرەن." پشیلەکە میاواندی. منیش بۆ هاوئاوازی، دەنگێکم لێوەهات -خۆ ئەگەر لاواندنەوەی ئەویش نەبێ- ئاخر لەو دوو هەفتە تەنیا و دابڕانەمدا، ئەوە یەکەمین گیانلەبەر بوو ببینم. پشیلەکە منی خەجاڵەت کرد بەوەی لەتکەپەتاتەکەمی لەگەڵ بەش بکەم و چۆڕێ ئاویشی لەبەردەم دانێم. کاتێ زمانی بە ئاوەکەدا دێنا، پرسیم: "ئادەی بڵێ بزانم لە ژیانتدا لە چی دەترسی؟" ئەویش پشتی تێکردم و بە سووکی بازێکی هەڵدایە سەر پاردەکە و ئاودیو بوو.

ئاخێکم هەڵکێشا. خۆ نەشمدەتوانی تا هەتایە نزیکی دەروازەکە نەبمەوە، بەتایبەتیش تا ئەو کاتەی ڤیزەکەم دەگەیشت، ساڵێکی دەخایاند. ئەوە بوو چاویلکەی بەرخۆرم کردەچاو، لە تەپڵی سەرمەوە تا قولە پێم رەش پۆشی، بە وریاییەوە لە دەروازەی حەوشەی هەوارەکە چوومەدەر. کەسیش بەو نیوەڕۆیە لە دەرەوە نەبوو، ئاخر کێ بە تینوتاوی تۆقێنەری ئەو گەرمایە سەرهەڵدێنێ. ئەمەش زاتی دایە بەرم تا لە ڕێرەوەکە هەناسەیەکی پڕ لە بۆنی

یاسەمین هەڵبکێشم کە بە سەر دیواری حەوشەی ماڵە دراوسێکەدا کەوتبوو، ئەویش خانوویەکی قەپەنگداری خاکیانە بوو. چیاکانیش زەریایەک بوون لە کەسکایی. باقی خانووەکانی دیکەی سەر ئەم جادەیە هەموویان کەشخە و لوکسە بوون. دیارە باشترین تاکتیکیش ئەوەیە وەک گەشتیارێکی دەوڵەمەند ڕەفتاربنوێنم، ئەو جلوبەرگانە لەبەر بکەم کە لە دۆلابی جلکەکانی ماخۆی خانووەکەدا هەبوون. لێ خۆ نەمدەویست ببمە مایەی سەرنجڕاکێشانی زیاد لە پێویست. بە حاڵی خۆم ئاسوودە بووم، کە هەر لە کڵفەتێکیش دەچووم.

بەرلەوەی بگەمە دووڕیانەکە، تاکسییەک لەبەردەممدا ڕایگرت. بە سواری ترومبێل سوپەرمارکێتە خۆجێییەکە هەر پێنج خولەکێک دووربوو. هەر زوو بایی ئەوەندە بازاڕی خۆم کرد، بەشی چەند هەفتەیەکم بکا، لە نێو باڵەخانەکەشدا چاویلکە بەرخۆرییەکەم لە چاو نەکردەوە. کاتێکیش لە شتکڕینەکە بوومەوە، هەمان شوفێری تاکسی لە دەرەوە چاوەڕێی دەکردم، ئیدی منیش خۆم تێهاوێشت تا پێمکرا هەوڵمدا کەمترین کەس بمبینێ. لە ڕێگای گەڕانەوەدا شوفێرەکە لێیپرسیم ئاخۆ لە هەندەران گەورە بووبم. هەردەبێ سیمای دەرەوەی جلوبەرگم لەگەڵ هەوارنشینە کەشخەکان نەهاتبێتەوە، ئەو شوێنەی چینی باڵای ئێرانی بۆ سەردان و خلیسکان لە سەر بەفر ڕوویان تێدەکرد.

منیش گوتم بەڵێ لە تۆرۆنتۆوە. ئەویش پرسی: "پایتەختی کەنەدا؟" بە دوایدا منیش بۆم سەلماند، هەرچەندە لە وەڵامەکەشمدا دڵنیا نەبووم کە وایە. لە زەینی خۆم تێبینییەکم تۆمارکرد تا دواتر پشتڕاستی بکەمەوە. شوفێرەکە یارمەتیدام، هەموو کەلوپەلەکانی بۆ

هێنامە نێو حەوشەی ماڵەکە. لە بەرانبەردا بەخشندانە پارەم بە دۆلار نەوەک بە تمەن دایێ، تا بەگوێرەی خۆنواندنەکەم دەربکەوم. کاتێکیش ئەو ڕۆیشت، ئاهێکم هاتەوەبەر و لەوە تێگەیشتم هیچ لەبارەی کەنەدا نازانم، هەروەها ئینگلیزییەکەشم پێویستی بەوە بوو زۆر سەعی بۆ بکەم. بەرلەوەی دەرکەی حەوشەکەش پێوەبدەمەوە، گوڵە یاسەمینێکی دراوسێکەم لێکردەوە کە بە دیواری ماڵەکەی ئێمەدا هەڵچووبوو.

لەو ماوەیەدا لە دۆخێکی ئاسان نەدەژیام، هەوڵمدا خۆم بۆ ئامادەکردنی ژیان لە کەنەدا سەرقاڵ بکەم، کاتێ هەر بە ڕاستی ڤیزایەکە بگا، هەموو ئەوکاتەش هەر لەسەر شانم ئاوڕمدەدایەوە. لە شارەکەدا کتێبخانەیەکی بچکۆلانەم دۆزیەوە، سێ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا بۆ ژنان کراوە بوو. لە ڕەفەکانی کتێبخانەکەدا بە دوای ئینسکلۆپیدیاکان، ڕێبەرنامەی گەشتیاری، فەرهەنگی زمانی و هەر شتێکدا گەڕام بەڵکو خۆمی پێ لەگەڵ ژیانی نوێم لە دەرەوە بگونجێنم. تێکۆشام خۆم ناچاربکەم ڕۆژانە چوار سەعات ئینگلیزی بخوێنم، بەڵام زۆر جارانیش بە تەشیەکەی جارانم دەڕێستەوە و دەچوومە سەر خووخدەی تەماشاکردنی فیلم لەسەر فیلم، ئەو فیلمانەی لە کتێبخانەکە وەرمدەگرتن و لە مێشکی خۆشمدا نەخشەی چیرۆکی وێنەدارم بۆ دەکێشان.

گوڵ و نەمامەکانم لەنێو حەوشە لەبەر بە پیتیت خاکەکە بوونە گوڵی زەمەقی و ئەتڵەسی. سەعاتی دووورودرێژم لە نێو باخچەکەدا بەسەر دەبرد، بە مشوورخۆرییەوە گەڵاکانم دەڕشاند، بەو هیوایەی

شتێکیش لە ناخمدا چەکەرە بکا. من و کارۆ هەفتانە ڤیدیۆچاتمان دەکرد، ئەو زۆر لەبارەی ژیانی خۆی لە تۆرنتۆ دەدوا و لە وشەدانی ئینگلیزییەکەی منی دەپرسییەوە تا واملێهات لە هەموو هۆدەیەکی خانووەکەدا کۆمپیوتەرەکە لەگەڵ خۆم بگێڕم. جاربەجاریش شلێر قسەی لەگەڵ دەکردم، لەبارەی دوا ئەرکەکانی لەنێو حیزبە سیاسییەکەیدا دەدوا. هەرگیز زەنگیشم بۆ دایبابم لێنەدا، بەدەر لە یەک زەنگی تەلەفۆن نەبێ، کە پێمگوتن لە وڵات دەڕۆم. بەدەر لەو ڤیدیۆچاتانە و ئەو چەند کەسەی لە کتێبخانە و سووپەرمارکێت تووشم دەهاتن، خۆم لە پەیوەندیکردن بە هەر کەسێکەوە دەبوارد، دەترسام نەوەک دراوسێکان ناسنامەی منیان بۆ دەربکەوێ و ئاگاداری دەزگای هەواڵگریی بکەنەوە.

دەمەوبەیانی یەکێک لەو ڕۆژە پاییزیانەی جێگەیان بە ڕۆژە درێژ و گەرم و تاقەتپڕوکێنەکانی هاوین لەق کردبوو، لە زەنگی تەلەفۆن بێداربوومەوە، پەیوەندیکردنێک لە کەسێکی نەناسراوەوە. هەر سەیری ژمارەکەم کرد تا زەنگەکە لە لێدان کەوت. ئازارێکی زۆر بە نێو پەلوپۆمدا چەکەرەی کرد وەک ئەوەی ئێسکەکانم بە مستی زەبەلاحێک تێکبشکێنرێن وەها بوو. خۆی دەکرێ کارۆ بێ بە ژمارەیەکی دیکە زەنگی لێدابێ، یان شلێر بێ، ئاخر شلێر چەند هەفتەیەکە خەبەروباسی بڕاوە، ئەمەش لەو کاتەی هەندێ مەشقی شەڕی مەیدانی دەکا. سوریا بەهۆی شەڕی ناوخۆ لەباریەک ترازا، ئەویش چووەتە بەشە ڕۆژاڤای کوردستان تا ناوچە فەرامۆشکراوەکە بنیاتبنێتەوە.

من تەلەفۆنەکەم پشتگوێخست و چوومە بەرهەیوانەکە. زەنگلێدەرەکە پەیامی دەنگی بەجێنەهێشت. خۆریش لە پشت گەواڵە هەورە پەمەییەکانەوە تیشکی دەدایەوە. لە نزیک سندوقی ئامراز و کەلوپەلەکانی باخ، لە عەمبارەکەدا هەندێ تۆوم دۆزیەوە، لەسەر کیس و گونیەکانی هیچ نووسین و نیشانەیەکی ئاماژەدەر نەبوو، منیش چاندم، لەگەڵ چاندنیشیدا هەوڵمدا شیعرەکەی مەولانام بیربێتەوە: "نەمگوت مەچۆرە وێ، خۆ ئاشناکەی تۆ منم، لەم سەرابی بەباچوونە، ئاوی حەیاتی تۆ منم."

لەو نێوەدا یەکێک زەنگی دەرکەی لێدا و پاشان بە خوردەیەکی ئاسن یان بە کلیل لە دەرکەی دا. منیش لە شوێنی خۆم وشک بووم.

لێدانی دەرکە بەردەوام بوو. هەناسەی خۆم ڕاگرت و پشتاوپشت کشامەوە، چاوەڕوانی ئەوەم کرد سەرباز بن و دیوارە چیمەنتۆڕێژەکە بشکێنن.

خۆم خزاندە ژوورەوە و بە خێراییش هەوڵمدا بەڵکو یەکێک لە سکایپ، گووگلتۆلک یان یاهوومێسنجەر بەکاربێنم و قسە لەگەڵ کارۆ بکەم، بەڵام لەبەر فیلتەری بەهێزی حکومەت، هیچیان نەکرانەوە.

شێتانە بەنێو خانووەکەدا دەهاتم و دەچووم، پرچی خۆمم گرتبوو، کە بە شێوەیەکی نائاساییی لەسەر پێستی کەللەسەرم قورس خۆی دەنواند. نەشمدەتوانی زەنگ بۆ پۆلیس لێبدەم بڵێم یەکێک خەریکە دەرگای ماڵەکە دەشکێنێ. لەو دەمەدا ئەوەی پێویستم پێی بوو، تفەنگ و ڕاهێنەرێک بوو، فێریکردبام چۆن چۆنی بەکارمهێنابا و تەقەم پێکردبا.

هەڵسام و بە ژوورەکاندا گەڕام، هەرچی چەقۆ و کێردی کۆنە هەیە کۆمکردنەوە و سوویم و تیژمکردنەوە، ئینجا لە بن سەرین، لەسەر بەفرگرە، لە سەر دۆلابی پێڵاوانی نزیک دەرکەی دەرێ، لە زۆر شوێنم دانان. ئاخر دەمەویست بە شکۆوە بمرم نەوەک دەستی هەیتەیەکی پیسی کۆماری ئیسلامی یان دزێک.

کاتێکیش بۆ ئەنگۆرەی هەمان ڕۆژ چوومە بن دوشی ئاو، لە بەرانبەر ئاوێنەیەکی گەورەی گەرماوێ وەستام، کێردێکی گەورەم بە دەستەوە گرتبوو، لاسایی ئەوەم دەکردەوە چۆن خۆم بدەمە بەر کێردان.

هەر دەبێ هەستی خۆزایی[١٥٤] مانەوەم بە قووڵی ڕێگر بێ لەوەی خۆم بدەمە بەر چەقۆ و لە دەستی هەیتەی دەوڵەت و لاقەچیی لابەلا قوتارم بکا. [١٥٥] ئیدی پێویستی پلانی دووەم ملی هەڵکێشا.

موسی ڕیشتاشینم لە هەمو شوێنێکی ماڵەکە و لە نێو گیرفانی کۆتەکەشم دانا. بەم جۆرە ئەگەر کار لەکارترازا، بڕینی دەماری بازندی دەست کاریگەرە. ئەوسا خۆم شوشت و پێستە مردووەکەم هەڵکڕاند و فڕێمدا.

پەشتەماڵێکم لە سەروپرچی خۆم وەرپێنا، لەشە ڕەقەکەم بەسەر قەنەفەکە دادا و لە بنمیچەکە نزبوومەوە. ڕژێنەی کرکڕاگەی قورتم[١٥٦] ئەستوور بووبوو، ئیدی خەیاڵم هەڵفڕی بەوەی بەرەبەرە سەرتاپای جەستەم پفدراوە، بووەتە میزڵدانێکی قەبە و زل، ئینجا

---

[١٥٤] خۆزا، خۆزایی: غەریزە.

[١٥٥] قوتارکردن: ڕزگارکردن، دەربازکردن.

[١٥٦] ڕژێنەی کرکڕاگەی قورتم: غودەی دەرەقی، thyroid.

لێککێشرایەوە بە ڕادەیەک پێستم بزرکا و لە کەشکەڵانی فەلەکدا ونبوو. باڵم گرت و بەرەو سەروو فڕیم، ئەوەندە بەرز فڕیم و ئەم وڵاتەم بەجێهێشت، گۆی زەویشم بەجیهێشت، چوومە شوێنێک دەستی کەسی نەدەگەیشتێ تەنانەت دەستی چیاش.

جارێکی دیکە بە ڕووتی لە بەردەم ئاوێنەدا وەستام و چراشم هەڵکرد، بە دەست مەمکە وردیلەکانم و ئێسکی دەرپۆقیوی سمتم پشکنی، گۆڕانکارییەکی جەستەم تا ئەو کات سەرنجم نەدابوو. هەر بە ڕاستی لاواز بووم؛ بە بەرزبوونەوەی ئێسکی چەڵەمەوە، تەنانەت کاتێ باسکی چەپەم بەرزکردەوە، ئێسقانی پەراسووشم بەدیارکەوتن. خۆ ئەگەر بەم شێوەیە کێشم هەر لە دابەزین بێ، ئەوا بەر لەوەی باڵوێزخانەی کەنەدا بڕیار لەبارەی منەوە بدا، دەپوکێمەوە و نامێنم. لە شوێنێک لە نێوانی ئێسقانەکان و پێستمدا، زیپک و پۆرگ هێرشیان بۆ سەر گۆشتم هێنابوو. هەر بە تەنیا بە خۆشم دەمبینی.

دەستم دایە مقەسێک و بەرزم کردەوە. خۆ من برام لە دەستدابوو،بەندی پێکبەستنی نێوانمانم لەدەستدابوو، من، ئەو خۆمەم لە دەستدا، کە دەیزانی چی دەوێ؛ من ئاسایشی خۆشم لە دەستدابوو. بۆ من ماتەمگێڕان وغەمگینی سوتان بوو لەنێو ئاگردانێک قرچەقرچی بێ. هێشتاش دەژیام، بەڵکو ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانم لە نێو خۆڵەمێشەکەمدا ڕابیمەوە.

ئیدی هەر تیلماسکە پرچێک لە سەرم دەکەوتە خوار قورساییەکی لەسەر ملان لادەبردم، ئەوە بوو بە مەکینە سەرم پاک تاشی.

کاتێکیش پرچە بڕاوەکەم لە کونی ڕۆچوونی ئاودەستەوە بە ئاو ڕامالّی، چیدی هەڵنەدەقرچام.

## بەندی سی و یەک

بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر، دەرکەی دەرەوەم لەسەر خۆم پێوەدا و ملی ڕێگەم گرتەبەر و بە جادەکەدا شۆڕبوومەوە، بەڵکو تووشی ئەو ژنە بێم، کە بۆ شەقامەکەی ئێمە هاتبوو. لە ڕێڕۆیشتنیشمدا تیشکۆی چاوبازییم خستە سەر ماڵەکان، وا خۆمنواند لە ناونیشانێک دەگەڕێم.

"لەیلا!" ئیدی ئەو بەم بانگکردنە سەرسامی کردم. "ئەوە خۆتی؟"

منیش گوردییەکم کەوتێ. دەنگە چرپەدارەکەم ناسییەوە.

"سەرەنجام!" خەریکبوو بچمە بەردەم دەرکەی ماڵ! باشە بۆچی دەرکەکەت نەکردەوە؟"

ڕۆندک لە چاومدا بارین، لێ بزەشم کەوتە سەر لێوان.

ئەو درێژەی بە قسەکەی دا: "دوێنێ چەند جارێک لە دەرکەی ماڵتانم دا. چییە زەنگی دەرکەتان تێکچووە؟ وامزانی شلێر ناونیشانێکی هەڵەی داومەتێ یان ... ئەرێ تۆ باشی؟"

منیش بەسەر شانەکانمدا ئاوڕم دایەوە، دەستی جوانەم گرت بە ڕێگەدا هاتینەوە تا گەیشتینەوە ماڵێ.

"ئەرێ قومە ئاوێک ناخۆیتەوە؟ ئەمە تاکە شتە پێشکەشت بکەم."
ئیدی بەر لەوەی ئەو وەڵام بداتەوە، سوراحییەکەم لە بەفرگرەکە هێنایەدەر و دوو پەرداخیشم هێنان. ئیجا دووبارە چاوم بە دەرگاکاندا گێڕان، ئاخۆ باشم پێوەداون.

ئەویش دەستێکی لە قەنەفەکەدا و گوتی: "دەی کیژەکەم، وەرە ئێرە دانیشە!"

لە بەردەمیدا ڕووخام، بە دەستی خۆم نەبوو لە پڕمەی گریانم دا. ئەویش بێ ئەوەی قسەیەک بکا، سەرە تاشراوەکەی منی دە ئامێز گرت.

ماوەیەکی باشی خایاند تا هاتمەوە سەرخۆم و توانیم قسە بکەم. "شتێکی سامناک بوو. خەریکە دین دەبم، وابزانم تەواو، ئیدی دین بووم."

جوانەش گوتی: "ئەڤینا من، تێدەگەم." شلێر بۆم بە خەم بوو، دڵیشی نەدەهات بە کەس بڵێ، ئاخر متمانەی نەبوو، بۆیە جوانەی ناردبوو تا چاوی لێم بێ. ئەویش سواری ترومبێلە شڕەکەی بووبوو، ماوەی دە سەعات لێیخوڕیبوو، ویستبووی تا حەزبکەم لام بمێنێتەوە، چونکە منیش دوێنێ بە پیر لە دەرکەدانەکە نەچووبووم، ناچار شەو لە نێو ترومبێلەکەی نوستبوو.

من باسی ڕووداوەکەی دوێنێم بۆ کرد. "پێم وا بێ تووشی دەردی بەدگومانی بووم. هەموو دەنگێک دەمترسێنێ، هەر لە دەنگی با تا خشپەی مار و مێروو. ئەم بەیانییە تووشی خەوزڕان بووم. زۆر بە ئازارە، خەریکە مێشکم لەدەست دەدەم."

"نەخێر، شیرینەکەم، مێشکت لە دەستی نادەی. لە بیرت بێ تۆ زۆر بەهێزی، ئەمەش تەنیا قۆناغێکە و تێدەپەڕێ. ئێستا تۆ دەتوانی بە ئاسانی پشوو بدەی. خەمت نەبێ، من لێرەم." ئینجا بەرەو دیوی نوستنی بردم، دوای ئەوەی ڕاکشام، پەتۆکەی بەسەردا دام و تا ژێرچەنم هات.

"ئەرێ دەكرێ لایلایەم بۆ بڵێی؟" ئەویش بە لەچكەكەی خۆی ماسكێكی بۆ چاوم دروستكرد، ئینجا بە دەنگێكی نەرمونیان گۆرانی بۆ چڕیم.

من ئێستا تێدەگەم بۆچی خۆی و لەوانەیە دایكانی دیكەش گۆرانی لایلایەیان بۆ ڕۆڵەكانیان دەگوتەوە، دەیانەوێ بەدەم خەواندنەوە منداڵەكانیان بۆ هەر نەهامەتی و كوێرەوەرییەك ئامادەبكەن كە دێتە ڕێگەیان.

من بە بۆنی پلاوی ڕەش، كە لە ناندینەوە دەهات، بە ئاگا هاتم. برنج بە سركەی هەنار و كاكڵەگوێز. جوانە لای ئاگردانەكە گۆرانی دەگوت. "جوانە، زۆر سوپاس! بەڵام خۆ پێویست بوو سەرەتا تۆ پشووت دابایە." وامدەگوت و لەبەر خواردنەكە دەمیشم لیكی كرد.

"سەرخەوێكم شكاندووە." ئیدی جوانە قاپ و شتەكانی لەسەر مێزی ناندین دانا و خواردنەكەی لە دەفرەكان كرد. لای خۆشمەوە ئەو دوای نیوەڕۆیەم بیركەوەتەوە، دوای گەڕانەوە لە قوتابخانە و بەر لە چوونی دایكە بۆ سەر كار، سەردانی شلێر و جوانەم كردبوو. زۆر جاران جوانە لە پشت مەكینەی دروومانە ڕەنگ سپی و بۆرەكەی دادەنیشت، جلی بۆ گەڕەك دەدووری. ئەو چاویلكەكەی دانابوو، باوەشی پێداكردم و خواردنی بەردەستی خۆی دامێ، ئەوەش هیچی لە مەسەلەكەی نەدەگۆڕی، كە چەندین جار درۆم دەكرد و دەمگوت برسیم نییە. سادەترین شێوی تامێكی ناوازە و نایابی هەبوو، نەخاسمە دۆغاوەكەی، هاڵاوی سوپی ماست و برنج و هەندێ مەعدەنۆس و دۆراغەشی لەسەر بوو.

لەسەر خواردنێ باسی ئەو کاسێتە دەنگی و وێنەیی و کتێبانەم بۆ کرد کە بێگانە فێرە زمانی ئینگلیزی دەکەن. بە هۆی ڕۆڵبینینی سیناریۆکانی ئەو دەرسانەی گوێم لێدەگرت، ڕوونکردنەوەی نیشانەکانی هەلامەت بۆ پزیشک، بازاڕکردنی جلوبەرگ، سکالابردنە بەر دراوسێ لە دەست وەڕینی شەوانەی سەگەکەیان فێربووم، هەموویشی بە ئینگلیزی.

جوانە هەڵسا و قاپەکانی سەر خوانەکەی کۆکردنەوە، پاشان فستقی پاککردنەوە تا پاقلاوەیەکی خۆش دروستبکا.

"ناتوانم بایی پێویست بۆ چێشتی ژەمەکە سوپاسگوزارت بم. بەیانی خۆم چێشتت بۆ لێ دەنێم. سالانێکە شێوێکی شایستەی وەهام لێنەناوە! لەوکاتەی بەر لە چیا...."

ئەویش قسەکەی پێبڕیم و گوتی: "مەشق لەسەر ئەوە بکە بەڵکو ژەمە خواردن بۆ دراوسێ کەنەدییەکانت ئامادەبکەی."

منیش بە بیرۆکەی بەشکردنی خواردن لەگەڵ دراوسێکان پێکەنینم هات، دروسێی تەبا. خۆ ئەگەر بێت و لە فڕۆکەخانە نەگیرێم. ئەگەر مام و توانیم بەرەنگاری یەک دوو ساڵی یەکەمی ئەوێم ببمەوە و دۆخەکە تێدەپەڕێنم.

لە ماوەی چەند خولەکێکی کەمدا بۆنوبەرامەی هەنگوینی گەرم و فستقی سوورەوەکراو بەنێو ناندینەکەدا گەڕا و دیسان لیکی نەوسنیی پێڕژاندم. لەو کاتەی جوانە سینییەکەی لە نێو فڕنەکەدا دەردەهێنا، منیش لە نێو چەکمەجەکانی کەوانتەری ناندینێدا بە دوای چەقۆیەکی ددان مشاردا دەگەڕام و ئەوەشم بە خەیاڵدا هات، چۆن پارچەکانی پاقلاوەکە لەسەر زمانم دەتوایەوە. چەکمەجەی

بوفییەکەی نزیک مێزی خواردنەکەم کردەوە، لە بری چەقۆ بەسەر دەستەیەک کاغەزدا کەوتم، پێشتر نەمدۆزیبوونەوە. لەسەر زەرفی یەکێکیان ناونیشانی پۆستەی خانووەکەی لەسەر نووسرابوو، بەڵام ناوی ڕەزا عەزیمی لە بری ئەوین شوکری لەسەر بوو. دەستبەجێ شیرینییەکەم لە بیرچوو. بە پاڵنەری لێتێگەیشتن و پەستی، تەوژمێکی پرسنیم بۆ هات و داواخواز بووم کارۆ وەڵامم بداتەوە.

کۆمەڵێک پنتی پیکسل لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەی من وێنەیەکی تەڵخ و تارماوی کارۆیان نیشاندا، لە کاتێکدا ئەستێرە لە ئاسمانی مندا هێشتا شین و درەوشاوە بوون.

کاتێک ڤیدیۆکەی لە داونلۆدکردن بووەوە، بە بزەیەکی تەواوی سەر لێوانەوە وەڵامی دامەوە: "لەیلا! چۆنی ـــ"

"ئەرێ خۆ تۆ گوتت ئەم هەوارە هی خوشکەکەتە؟ هی ئەوینە؟"

وەهام چاوەڕوان دەکرد کارۆ گرژ بێ، بەڵکو سەرکۆنەشم بکا و بەهانەیەکی لاوازیش بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو دانی بەوەدا نا، چیرۆکی ماخۆیەتی خانووەکەی هۆنیوەتەوە تا من هەستنەکەم کەوتوومەتە بن قەرزوقۆڵی ئەو.

"کارۆ، دەی بڵێ چی دیکەشت لە بن سەردایە؟ تۆ بڵێی ئەوین ناوێک هەر هەبێ؟"

"لەیلا، تۆ سەرچیخ چووی."

"ئاخر چۆن ئەوەم لێ چاوەڕێ دەکەی باوەڕ بە هیچ شتێکت بکەم؟"

"پێویست نییە بڕوا بکەی. دەی با قەبوڵنامەکانت بۆ بێن، ئینجا هەرچی پێتخۆشە بیکە و بڕوا بە هەر کێ دەکەی بیکە، ئەگەر ئیدی متمانەت بە کەس مابێت. لەیلا، بۆ خاتری خودا، تۆ لەگەڵ من هەر لەشەڕ دەگەڕێی."

منیش پەیوەندییەکەم بڕی.

بە پێخواسی[157] بەرەو ناندیکە ڕۆیشتمەوە، بینیم جوانە خەریکە قاپ و کەوچکەکان لەناو کەفاوی سەرشۆکەکە هەڵدێنێ.

کە هەستی بە من کرد سەری بەرزکردەوە: "دیسان هزر و داڵغەی غەمگینانە؟"

منیش بە هەراسانییەوە سەرم بەردایەوە: "تۆ مێشکی مرۆڤ دەخوێنیتەوە؟"

"ئاخر هەمووی بە ڕوخسارتەوە دیارە."

حەزم نەدەکرد ئەویش بە قورسایی ترسی دیکە سەرقاڵ بکەم، بەڵام خۆ نەشمدەتوانی چیدی بەرگەی ئەو فشارە سەنگینەی سەر سینگم بگرم. ئەوەبوو باسی بێ متمانەیی خۆمم لە هەمبەر کارۆ بۆ کرد، ئەو ڕاستییەشم بوارد کە دوای بەسەربردنی ماوەیەک لەگەڵ ئەو، بە شێوەیەکی فیزیکی ئەوە ئازاری دام کە خواحافیزی لێبکەم. جوانەش بێ ئەوەی قسەم پێببڕێ بە شەوقەوە گوێی لێ گرتم، ئەگەرچی پێدەچوو شلێر بەشی زۆری بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابێتەوە.

---

[157] پێخواسی: پێپەتی. پێخاوسی.

ئەوسا پێشم لەوە نا کەوا من درۆم لەگەڵ دایبابم کردووە، چونکە دوای بەخاکسپاردنی تەرمی چیا، پێمگوتبوون بۆ خوێندن چوومەتە کەنەدا "منیش داوام لە دایکە کرد، بەڵکو لێبگەڕێ قسە لەگەڵ بابەدا بکەم، ئەوە بوو لەوێ لە کابینەی تەلەفۆنەکە پارەم تێدەکرد. خەڵکیش لە پشت منەوە بە ڕیز نۆرەیان بۆ تەلەفۆنکردن گرتبوو. ئێستا بیردەکەمەوە، خۆ من و بابە شتی هاوبەشمان لە دەست دابوو، خۆت دەزانی، لەوانەیە بتوانین سەبارەت بە خەم و ناسۆر لەگەڵ یەک بدوێین. کەچی نەیویست لەگەڵم بدوێ. بڕوادەکەی؟ چۆن دەتوانی هێندە چەند کەڕەپ بی؟"

جوانە نیگایەکی خەمخۆرانەی تێبڕیم، لێ وەڵامی هیچی نەدایەوە، وای دانا تەنیا هەناسەیەک دەدا و تێهەڵدەچێتەوە.

"جوانە، هەر بە ڕاستی، پێویستم بەوەیە تێبگەم. تکایە قسەم لەگەڵ بکە." بە دەم ئەم قسەیەوە دەستم دایە پەڕۆیەکی وشککردنەوە و کەوتمە وشککردنەوەی ئەو قاپانەی جوانە شوشتبوونی.

"باوکت بیست و پێنج ساڵە لە پەژارەدایە. تۆش خۆت ماوەیەک ئەو ئەزموونەت چەشت. هی ئەو بەردەوامە." جوانە بۆی باسکردم کە چۆن ئازار و ئەشکەنجەدان خەڵک بە شێوەیەکی چانەبووەوە تێکدەشکێنی. ئەویش هەرگیز دەرفەت یان ئامراز و هۆکاری چاکبوونەوەی بۆ هەڵنەکەوتووە.

کاتێکیش ناندینەکەمان پاککردەوە و پڕ بۆن و بەرامەی پەقلاوە و چایی تازە دێمکراوی بە دارچینەوە تێکەڕا، لەسەر مێزە خاوێنکراوەکە دانیشتین، قوممان لە ئیستکانە چایەکانمان دەدا. جوانە

پێیگوتم دوای بەسەرچوونی بەخاکسپاردنەکە و دوای ئەوەی خەڵکەکە خەریکبوو شتەکەیان لە بیر دەچووەوە، وەک هەمیشە وایە، ئیدی هەموو ڕۆژێک دەزگای هەواڵگریی زەنگی بۆ باوکت لێدەدا، ئەمەش بۆ ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق بوو، هەموو ڕۆژێکیشی هەر لێیان دەپرسییەوە، پێیان گوتبوو چۆن چۆنی ژیانە شکستخواردووەکەی سەری کوڕەکەشی خوارد و بە کوشتی دا. "باشە تۆ بۆ کێ گرەوت لەسەر ژیانی خۆت و کوڕەکەت کرد؟ بۆ خەڵکەکەت؟ ئەرێ ئەوە نازانی هەر ئەوان ڕۆژانە خەبەریان لێدەدای؟"

جوانە گوتی شتێکی باشم کردووە زەنگم بۆ داییابم لێداوە و پێمگوتوون چوومەتە کەنەدا. ئاخر باوکیشت بە نۆرەی خۆی ئەمەی بە هەیتەکانی هەواڵگریی ڕاگەیاندووە، ئەو پێی گوتبوون ئیدی لە مەودوا ناتوانن دەست لە منداڵەکانی بدەن.

جوانە کاغەزێکی بە دەستخەتی بابە دایەدەستم. "ئەوان باریانکردووە." ئەمەش ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنەکەیانە لە هەڵەبجە.

"ئەو ئەمەی بۆ تۆ نووسیوە یان بۆ من؟"

"ئەو داوای لێکردم ئەمە بگەیەنمە شلێر، بەڵکو ئەویش بتوانێ ئەو زانیارییانە بگەیەنێتە دەستی تۆ."

"باشە ڕات وایە پەیوەندییان پێوە بکەمەوە؟"

"باوانم، نازانم، بەڵام کە کاتی خۆی هات خۆت دەیزانی. دەی ئەمشەوە بەسە."

"جوانە، ئەمە زۆر سەختە دایبابێکت خۆش بوێن کە نازانن خۆشەویستی بکەن. لەوەش سەختتر ئەوەیە خۆت خۆش بوێ لە کاتێکدا دایبابت تۆیان خۆش نەوێ." ئەویش سەری لەقاند، بەڵام دڵنیا نەبووم ئاخۆ لێم تێگەیشت یان نا، بە تایبەتیش کە دوای بێ دایکی و تەنیاییم وا بە ئاسانی دڵی خۆم بۆ کردۆتەوە، دڵێک کە هێزی پیس و شەڕانگێزیش ویستوویانە ئەم بۆشاییە پڕبکەنەوە.

دوای ئەم قسەیە شانێکم بۆ هەڵتەکاند. بەڵێ ئەو لەسەر هەق بوو. وەنەبێ دوژمنی دایکم دەوڵەتێکی توندوتیژ بێ، بەڵکو نەیدەتوانی خۆی ڕێنوێنی خۆی یان خۆی جڵەو بکا.

"ئەرێ دەکرێ ئێمە قاپی شیرنەمەنی بۆ بەیانی هەڵبگرین، ئەوسا بیانشۆین؟ ئێستا شەکەتم، بە ئاستەم خۆم بۆ دەجووڵێ."

ئەوە بوو لە بەرانبەر ئەو لەسەر قەنەفەکە لێی ڕاکشام، سەیری چلچراکەی بنمیچەکەم دەکرد، چلچرایەکی جوان، بەڵام ژەنگگرتوو. "جوانە، ئەدی چی لەبارەی تۆ؟ خۆ تۆ شتی زۆرت بەسەر هاتووە، لەوەش هەر گەڕێ، کە لە زیندان منداڵت بووە، لە هەمووشی پۆلکتر بە شێوەیەکی وەهمیش لەسێدارەدراوی. ئەرێ بۆچی ڕەفتارێکی وەک هی دایبابی منت نەنواند؟"

"منیش کێشەوبێشەی زۆرم هەن." بەدەم ئەم قسەیەوە لە شوێنی خۆی هەڵسا و سەیرێکی وێنەکانی سەر دیوارەکەی کرد. ئینجا تێهەڵچووەوە: "لە پێناو یەک شت کیژەکەم منی بەجێهێشت."

ئینجا نۆرەی من هات تا بۆ جوانەی ڕوون بکەمەوە، کە شلێر چەند دایکی خۆش ویستووە و چەند متمانەی پێی هەبووە بەڵام خۆ لە وڵاتێک، کە هەموو کردەیەکی مەدەنییانەی سەرکوت دەکرا، هیچ

دەرەتانێکی بۆ نەمابووەوە. "تەنانەت ئەوان کاری خێرخوازیشیان خستبوە ژێر چاودێری خۆیانەوە. لە هەموو کردەیەکی بە کۆمەڵدا زەندەقیان دەچووا" من ئەوەشم بۆ قسەکەم زیادکرد، ئەگەر شلێر لێرە مابووایە ئەوا لە شوێنێ خۆی دەپوکایەوە. ئاخر گوڵی دەگمەن و ناوازە تەنیا لە ئازادییدا چەکەرە دەکا و دەگەشیتەوە.

"من ئەوم بەخێو کرد. هەردەبێ ئەوە بزانم." کە ئەمەی گوت فرمێسکەکەی چاوی سڕی و قاچی لەسەر قەنەفەکە لێڕاکێشا.

"بەڵکو ئەم شتە خۆی دادپەروەرییەکی گاڵتەجارانە بێ. دایک و باوکم هەم منیان خۆشدەویشت هەم دەستیشیان لێ شوشتم؛ ئەوان لێمگەڕان بچمە مەکتەبێ و ئەوەی لە مێشکمدایە بیڵێم و لە کۆتایشدا ئەوانم بەجێهێشت." ئیدی جوانە چیرۆکەکەی خۆی بۆ گێرامەوە، کە چۆن سەرەتا کەسێکی بە ناوی ئاگرین خۆشویستووە، ئەوکاتەی تەمەنی پازدە ساڵان بووە و ویستوویەتی هەموو کاتێکی هەر لەگەڵ ئەو کوڕەدا بەسەربەرێ، ئەو کەسەی شمشاڵی دەژەنی، گۆرانی بۆ جوانە دەچڕی. جوانە دەیەویست مێردی پێبکا، کەچی کەسوکاری لێی نەگەڕان، ئاخر ئاگرین نابینا بوو، گوایە نەیدەتوانی هیچ بۆ جوانە بکا، سەرباری ئەوەش ئایا جوانە چیدەکرد کاتێ منداڵیان پەیدادەبوو؟ لەگەڵ ئەوەشدا جوانە هەموو دەرفەتێکی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە ئاگرین و دەربارەی هەموو شتێ، ئەوەی لەسەر زەوی و لەژێر ئاسماندایە قسە بکەن. دایک و باوکیشی لێی گەڕان، ئەوان لە خۆشەویستی گەیشتن، یار و دڵداری یەکدی بوون. هەموو شتێک باش دەڕۆیشت تا ئەوکاتەی ئاگرین نەخۆش کەوت، ئینجا جوانە دەیەویست کاتی زیاتر لای دەزگیرانەکەی بمێنێتەوە،

بەڵام خۆ زیاتر لە هۆیەک بە دەستی دایبابی جوانەوە هەبوو، تا پێی بڵێن نەخێر، نابێ وەها بکەی.

بۆ ساڵی پاشتر ئاگرین مرد. ئیدی جوانە نەیتوانی زیاتر لە کۆبانی بمێنێتەوە. ماتەمینییەکەی زۆر کاریگەر بوو، هەر بۆیە دایبابی زۆ لێی دەهری بوون. ئەوە بوو ناردیانە کوردستانی ئێران، چونکە مامی جوانە لەوێ کارخانەیەکی هەبوو، ئومێدیان وابوو بەڵکو لەوێ کچەکەیان بێتەوە هۆش خۆی. مامەکەش زۆر لەگەڵ برازاکەی دلۆڤان بوو، بەڵام جوانە ئەوەی بۆ قووت نەدەدرا کە مامی چەند لەگەڵ کرێکارەکانی بەدڕەفتار بوو. "بوونە سەردار شتێک بوو لە کەللەی ئەوی دابوو. ئەوە هەموو شتێکی ژیانی ئەو بوو نەوەک سەرکەوتنی کارخانەکەی. هەروەها باکی بە دەوڵەمەندیش نەبوو، هەر مەزنایەتی و بەس، تا وای لێهات چیدی نەتوانێ مەزنایەتی بەسەر خەڵکەوە بکا. ئاخر هەمیشە هەموو چرکەساتێک ئەوەی بەچاودادەدانەوە گوایە ئەو هێز و دەسەڵاتی بەسەریانەوە هەیە." جوانەش لە کارخانەی جلدروونەکەی ئەودا مایەوە تا ئەو کاتەی هەوڵدرا دەستدرێژی بکرێتەسەر و لاقەبکرێ.

منیش لێمپرسی بەڵکو زیاتر باسی کاتی زیندانییەکەم بۆ بکا. ئەو گوتی دواتر باسی بۆ دەکا، بەڵام ئێستا شتێکی گرنگتری هەیە، کە پێویستە پێم بڵێ.

منیش هەندێ خۆم هاوێشتە سەر تەنیشتم و چەناگەم لەسەر هەردوو لەپی دەستم دانان. من ئەوەم زانی ماوەیەک لە بەخاکسپاردنی چیا خەڵک بەشێنەیی و وردە وردە شتەکەیان لەبیر دەچووەوە، سروشتی خەڵک وایە. پاشان هەیتەکانی دەزگای

هەواڵگریی هەموو ڕۆژێک، بۆ ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق، لەسەر یەک دەهاتنە لای باوکم و بە پرسیاران هەراسانیان دەکرد، پێیان دەگوت چۆن ژیانە شکستخواردووەکەی خۆی وای لە کوڕەکەشی کرد بە کوشتنی بدا.

بۆ شەوەکەی خەونم بەوە دیت، من لەنێو زۆنگاوێکی پڕ لە مێش و مەگەز و پڕ لە هەراوهوریای گیزە و وشەوشدا سەری خۆم بە هێواشی بەرز دەکەمەوە.

دەمژمێرەکەش لە چکەچکە بێ کۆتاییەکەی خۆی نەدەکەوت.

## بەندی سی و دوو

من و جوانە هەموو ڕۆژەکە و هەموو ڕۆژێ بە باخچەوە خەریک بووین، شێومان لێدەنا و قسەمان دەکرد. هەر جارێکیش غەم و کەسەر وەک قرش هێرشی بۆ دەهێنام، ئەو شانی دەدایە بەر. ماڵەکە خاوێن وبژوون بووەوە و تا دەهاتیش شیعری زیاتر لە یادگە تۆزلەسەرنیشتووەکەمدا سەری هەڵدەدا. "دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی بە هیچ قەفەسێک بەند ناکرێ." لێ گەلۆ هەر کاتێک وشەی با دێ یان دەرکە بە توندییەوە پێوەدەدرێ و دەنگ پەیدادەکا، هەر جارێک یەکێ لە دەرەوەی ماڵێ بە دەنگی بەرزەوە قسە بکا، بە خۆم نییە لە شوێنی خۆم ڕادەچڵەکێم و دەستەکانیشم دەلەرزن.

ئیدی ڕۆژەکە هات. کابرای پۆستەچی پاکەتێک کاغەزی بۆ هێنام. نەرمەبایەکیش لە پرەوە هەڵیکرد و گەڵای دارەکانی لەراندنەوە، وای لێکردن لە شوێنی خۆیانەوە بکەونە سەما. کاتێکیش زەرفەکەم هەڵپچڕی تەزووم پێداهات.

کاغەزەکان لە دەستمدا قورس دیاربوون. تێیدا هاتبوو بۆ چاوپێکەوتنی ڤیزا لە باڵوێزخانەی کەنەداوە بانگهێشت کراوم. هەستمکرد چەندین قولانج باڵام کردووە. فرمێسکیش لە چاوم داباریبن، بەڵام ئەم جارەیان ڕۆندکەکان لە ساڵەکانی پێشوو جیاوازتر بوون. ئەم فرمێسکانە هەڵگری هیوا و ترس بوون. هەستمکرد کاتێ بۆ پشتەوە بۆ ژوورەکەی دانیشتین دەگەڕێمەوە بەژنم درێژ بووە، لەوێ جوانە یەکێک لە کتێبە سوفیگەریەکانی

خۆی دەخوێندەوە، ئەویش زانی. ئەو ئەمەی گوت و باوەشێکی پێداکردم: " ئیدی شازدە مانگی چاوەڕوانی بەسەرچوون."

هەستم بە ترس و تۆقینێک کرد پەڕییە سینگم. "هێشتا ماوە."

"مەگەر چاوپێکەوتنەکەت هێندە بێ سەروبەر و خراپ ئەنجام بدەی تا مۆر لە پاسپۆرتەکەت نەدەن، دەنا تەواو."

"پەیوەندییەکانی ئەم ڕۆژانەی تاران- ئۆتاوا گرژن." چارەنووسی تاکەکانیش شتێک نییە مایەی بایەخ بێ.

"دیسان! دەی بەسیەتی ئەم هەموو نیگەرانییە!" جوانە موزیکی لێدا و دەسرۆکەیشی ڕادەوەشاند و شانەکانی هەڵدەتەکاند. منیش دەستم گرت و کردمانە هەڵپەڕکێ[158]: پێی ڕاستە بۆ پێشەوە، پێی چەپەش بۆ دواوە، شان بە شانیش جارێک بۆ پێشەوە و جارێکیش بۆ دواوە، ئەمە یەکەمین شاییکردنم بوو، هەنگاوی یەکەمم بەرەو ئازادی. داماو و بێ سەروبەرانە بۆ ماوەیەک هەڵپەڕیم، لێ هەر زوو ترس دایگرتمەوە. مایەی تەوسە گەلێک لە کێفەراتبارترین قۆناغی مێژووی خۆیدا، ئەم جۆرە ئاوازە دابهێنێ و هەمیشە شایی و ئاهەنگ بۆ بەختێکی باش بگێڕێ.

ئەوە بوو یەکەمین دەرفەتی لەبارم بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ باڵوێزخانەی کەنەدا قۆستەوە. لە بەرەبەیانێکی تەمومژاوی بەر لە خۆرهەڵاتندا، سواری ترومبێلی جوانە بووین و تاران خۆت بگرە هاتین. ئەودەمەی ڕێگا پێچاوپێچە شاخاوییەکەمان دەبڕی، کڕ و بێدەنگ هیچم بۆ گوتن پێنەبوو، بەڵام لە بێدەنگیشدا دڵم دەتۆقی و

---

[158] Halparke

بەرگەم نەدەگرت. کورسییەکەم توند گرتبوو. ئاخر ئەگەر بە پەرجوویەکیش ڤیزاکەم وەرگرت، ئەوا هەر ناتوانم لەبەر ناوم و لیستی ڕەش بڕۆم. بۆ ئەوەی خۆم لەو هزر و دالْغانە لابدەم و بخافلێم، میلی ڕادیۆکەم بادا.

کاتێ جوانە ترومبێلەکەی ڕاگرت، شەویلاگەم لەسەر یەک گیرساندن، سیرەیان لێوەهات، ئینجا بەرەو نووسینگەیەکی بچکۆلانەی دەرگە داخراودا ملمان لێنا. لەبەردەم نووسینگەکەدا ئاپۆرایەک لە ئێرانییان بە خۆیان و شەپقە و شاڵەکانیانەوە بە تووڕەیی هەراوهوریایان بوو، باسی ڕەتکردنەوەی داوانامەی ڤیزایان بۆ یەکدی دەکرد و وتوویژی ئەوەشیان بوو ئاخۆ کەنەدا باڵوێزخانەکەی خۆی دادەخا یان نا. جوانەش لەوێ ڕۆیشت، بەڵکو لە شوێنێک بە دوای نانێکدا بگەڕێ، منیش هەستمکرد ئەو، بەرگەی ئەو هەموو هەراسانیی و گرژییە ناگرێ. من لە شوێنی خۆم توند پاڵتۆکەی خۆمم گرت و نەجولام، بەو هیوایەی بە گوتنەوەی هەندێ شیعر خۆم لەو هەراوزەنا و گرژییە پەیدابووەکە بە دوور بگرم.

هەر ئەو کاتەش جوانە بە خۆی و دوو سەندەویچەوە بەدەرکەوت و دری بە ئاپۆراکە دا تا بگاتە لام، ڕێک لەو کاتەشدا ناوم خوێندرایەوە و ڕێگەیان دام بچمە نێو باڵوێزخانەکە.

ئەو ژنە تەمەن مامناوەندییەی کە لە سەر مێزی پێشوازی لە ژوورەوە دانیشتبوو، پێویست نەبوو سەرووپرچی خۆی دابپۆشێ. خۆی بە چاکوچۆنی و ئەو شتانە سەرقاڵ نەکرد و یەکسەر پرسیار لە دوای پرسیار لە بارەی ئەوەی ئاخۆ چۆن کارۆم ناسیوە و لە کوێ مارەبڕیمان قەید کردووە. وەڵامەکانی منیشی لەگەڵ ئەو

بەڵگەنامەیەی پار پێشکەشمان کردبوو، ڕادەگرت و بەراورد دەکرد، پاشان پێی گوتم جارێکی دیکە لە دەرەوە چاوەڕێی بکەمەوە.

خۆم توند گرت و پاڵم بە دیوارەکەی بەرانبەر پەنجەرە بچکۆلەکەی باڵوێزخانەکە دا، چاوەڕێی ئەوە بووم ناوێکی دیکە بانگ بکا. پشووی نانخواردنی نیوەڕۆی کارمەندانی باڵوێزخانەکە هات. منیش بە شەقامە بچکۆلانەکەی بەردەمی ئەوێدا قەدەمم لێدا.

جوانە لێی پرسیم: "ئەرێ غەریبی دەکەی؟" بەم پرسیارە دەیویست بزانێ ئاخۆ هەر لەبەر ئەوە بوو هیچم بۆ نەدەخورا.

منیش ئەو شتەم هەر بە خەیاڵیشدا نەهات، کە جوانە مەبەستی کارۆ بێ. "هەستدەکەم سنوورێک بۆ ئەوە هەیە ئاخۆ چەند زۆر و بۆ ماوەی چەندیش مرۆ بۆ کەسێک بناڵێ." دڵیشم ئەوەندە بۆ یەک هاتبووەوە، چیدی توانای غەریبی چیاشی تێدا نەمابووەوە.

"ئەرێ هەست بە سڕبوونێک ناکەی؟" جوانە بە دەم ئەم قسەیەوە، شاڵەکەی بە سەر کەپووی دادا، ئاخر لە سەرما کەپوی سوور هەڵگەڕابوو.

"هەست بە سوپاسگوزاریی دەکەم." خۆی ئەمەش ڕاست بوو. ئاخر دوای هەموو شتێک، بۆرە هەستێکی پێزانینم بۆ پەیدابوو، کە چیا تەنیا بۆ ماوەیەکی کەمیش لە ژیانمدا بوو.

"دڵنیا نیم ئاخۆ هەستت سەبارەت بە ڕۆیشتن چۆنە."

"لەوەدا بە تەنیا نیت!" زۆر بە تاسەبووم تا لە ئێران ڕزگارم ببێ، کەچی هێشتاش لەوە دەترسام ئاخۆ لە کەنەدا و لەنێو هەستی دژەکۆچی کەنەدا چیم بەسەردا دێ. ئاڵای ئێرانی و کەنەدی بە سەر

دەرگاکەدا بەو هەوا سارده دەشەکانەوە. هیچ کامێکیشیان هی وڵاتی من نەبوون. یەکێکیان براکەمی لە خاچ دا و هەڕەشەی کوشتنی منیشی دەکرد. ئەوی دیکەشیان ڕۆژێک لە ڕۆژان خەڵکی خۆجێی خۆی دەکوشت و خاترجەمیش نەبووم ئاخۆ لەوێ شوێنی کەسانی وەک من دەبێتەوە یان نا.

شیشەبەندە ساردەکەی پەنجەرەی باڵوێزخانەکە لە سەعات دوودا کرایەوە. ناوەکان بانگ دەکران. دڵنیاش نەبووم کاتێ لە کۆتاییدا ناوی لەیلایان گازکرد، من بووم یان نا. هەر ئەوەندەم زانی جوانە منی بۆ پێشەوە پاڵنا. پیاوێک پاسپۆرتەکەی منی لەسەر مێزی پێشوازیەکە خشاندە لام. منیش دەستم پێوەگرت و ساتمەیەکم کرد. جوانە دەستێکی لەسەر شانم دانا و بەنێو جەنجاڵییەکەدا دەرچووین.

دەستم بە جۆرێک دەلەرزین نەمدەتوانی پەڕەکانی پاسپۆرتەکە هەڵدەمەوە. جوانە لاپەڕەی ڤیزای دۆزیەوە. منیش قامکم لە سەر لاپەڕە بریقەدارەکە دانا. بەڵێ، هەوبوو.

دەستبەجێ گەڕاینەوە تا تاریکمان بەسەردا نەیەت.

جوانە گوتی: "ئاسان نییە کاتێ دەگەیتە کەنەدا، بەوەی بە گوێرەی پێویستی و نەخشەی یەکێکی دیکەدا بڕۆی."

بەڵێ ئەمە ڕاست بوو، خۆ دەمتوانی هەر شتێک و لە هەر شوێنێکدا بێ بخوێنمەوە، بە تەواوی ئەوە فەرامۆش بکەم، کە دەمژمێر بە سەرمدا دەسەپێنێ و دەمتوانی لە هەر کاتێکدا بخەوم، لە هەر شوێنێکیماڵەکە بخەوم و هەر پارچە جلێکیش حەزم لێبێ بیپۆشم.

"جوانە، ئەمەش لایەنی کەمی ترسەکانمە."

بۆ شەوەکەی فێریکردم چۆن کێکی بە سێو دروستبکەم و مۆمەکانی پێ کوژاندمەوە. ئاهەنگی لەدایکبوونەمان گێڕا، کە هێشتاش ڕووینەدابوو.

لە سەر پێخەفی نوسنتنیش، پاسپۆرتە مۆرلێدراوەکەم بە سینگی خۆمەوە نا و خەویشم لێنەکەوت.

بۆ بەیانییەکەی هەڵسام، بە بن ئارەقەدا کەوتبووم. سەرم دەهەژاند تا ئەو خەونە ئاڵۆزوبڵۆزانە لە سەرم لادەم، لە تۆرنتۆ بزربووبووم، هەرچی ئینگلیزی بوو، هەرچی مەشقم لەسەرکردبوو، لە بیرم چووبووەوە، لە لایەن قاچاغچیانی مرۆڤەوە ڕفێندرابووم. ئەوەبوو ڕۆبێکم لە خۆم وەرپێچاو چوومە نێو حەوشە.

مەلە بە جریوەکانیش دیار نەبوون، ئەو هێلانانەی لە بەرزایی، لەسەر دارە شۆڕەبییەکانیشیان چێکردبوو، دیاربوو بەتاڵ و حەتاڵ بوون. ئەو نەرمە بایە ساردەش کە لە بن ڕۆبەکەمەوە لێی دەدام، تەزووی بە جەستە شێدارەکەمدا هێنا.

خۆم دایە دەست کەشە ساردە گەزلێدەرەکە، قۆڵەکانم لە یەک کردنەوە، بە قاپقاپەیەکەوە بەنێو گیای چیمەنەکەدا ڕۆیشتم، لەبەردەم باخە بچکۆلانەکەدا دانەویمەوە، کە بە شێوەیەکی تەلیسماوی لە تۆوی فەرامۆشکراو و نەزانراوی نێو کیسە پلاستیەک ڕوا بوو. لە هەموو کاتێک زیاتر لە ئازادی نزیک بووم. تەنها بەس بوو سواری فڕۆکە بم و هەستیش بکەم دەفڕێت.

ئینجا دەستم بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە و لە گزنگی خۆرم ڕوانی.

## بەندی سی و سێ

من ژیانی خۆم بە دوای خۆمدا ڕاکێشا، هەموویشم لە دوو جانتادا ئاخنیبوو. نەشمدەویست باوەشی جوانە بەربدەم. ئاخر بۆ من ئارامترین پەناگە بوو. سەرشانەکانی ئەوم بە فرمێسکەکانم تەڕ کردن، خۆزگەی ئەوەم دەخواست بەڵکو دایکی من بووبا و خۆم بخزاندبایە نێو منداڵدانەکەی تا هەم مشوورم بخواردبا هەم سەلامەتیش بووبام. کاتێکیش ڕۆندکەکانی سڕیمەوە گوتی: "هەرگیز لە یەک کاتدا لە ڕۆژێکی وەها شاد و وەها غەمبار نەژیاوم."

ئەمڕۆ چارەنووسەکەم دوای ساڵ و نیوێک لە ڕۆژی لە سێدارەدانی چیادا، دیاری کرا. ئەوە بوو هۆڵی دەرچوونی فڕۆکەخانەم لە نێوان لە ئامێزگرتن و هیواخواستنی ڕێبواران و یاوەرانیان تێپەڕاند.

ئەفسەری گومرگەکە هەر چاویشی لە چاو نەکردم و پرسی: "بە تەنیا سەفەر دەکەی؟"

"بەڵێ، خۆم دەگەیەنمەوە مێردەکەم." هەناسەشم دەنگی دەهات.

ئەویش دەستێکی درێژکرد و گوتی: "ڕەزامەندینامەی ئەو؟"

"قایلنامەی کێ؟ ئۆو، بەڵێ. مێردەکەم چاوەڕێم دەکا. ئەو بانگهێشتنامەی بۆ ناردووم." بە دەم ئەم وەلامەم هەموو ئەو بەڵگەنامانەی لە دەستم بوون، نیشانم دان، بەلام هیچیان نامەیەکی فەرمی کارۆیان تێدا نەبوو تا ڕێگە بدا ژنەکەی بە تەنیا بۆ هەندەران

گەشت بکا. لەنێو ئەگەری هەموو سیناریۆکان، من ئەمەیانم فەرامۆشکردبوو، لە هەمووشیان ڕێتێچووتر بوو. ئیدی ئارەقەیەکی شپرزەییم بەسەر نێوچاواندا هات.

ئەفسەرەکە منی دایە دەست ئەفسەرێکی دیکە تا لە شوێنی چاوەڕوانکردن بوەستم، لەو شوێنەی ڕێبوارە گوماناوییەکانیان لێ ڕادەگرتن. هێشتا سێ سەعاتم بۆ فرین مابوو، بەڵام تەوژمێک لە ترسوبیم هەناوی داگرتم. خۆ ئەگەر تا ئێستا سەیری تۆمارنامەی منیان نەکردبێ، ئێستا کاتیەتی تەماشای دەکەن و دەیزانن. کاتیش بێ بەزەییانە سست و خاو لێک دەکشرایەوە. وێنەیەکی گەورەی ژنێکی جوان و کەشخە لە بن حیجابدا لەوێ دانرابوو، ژنەکە سەیری خوارەوەی خۆی دەکرد، بە فارسی و ئینگلیزی نووسرابوو: "خانمانی بەڕێز، پابەندبوون بە جلوبەرگی ئیسلامییانە شتێکی تۆپزییە."

لەو نێوەشدا بۆ پرسیار و وەڵامی زیاتر بانگیان کردم، پێستی بن نینۆکەکانیشم خوێنیان تێزا.

ژوورە تاریکە کۆنەکە بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات، هەر دەتگوت غازە و لە لوولەکەی خۆی دزەی کردووە. پەردە کانزاییەکانیش دادرابوونەوە. کابرایەکی درێژی فەرمیپۆش بە خۆی و ڕیشێکی درێژی قەڵەمنەکراوە لە نێو ئەو فایلانەی بەردەستییدا بە دوای یەکێکیاندا دەگەڕا. لە پشت کورسییەکەشی وێنەیەکی گەورەی خومەینی و خامنەئی بەقەد قەبارەی بەفرگرەیەک هەڵواسرابوو، ئەو دوو ڕابەرە باڵایانەی بە هەزاران کەسیان لە "دوژمنانی خودا" سەربڕیبوو.

بنهەنگڵی کراسی کاربەدەستەکە ئارەقەی کردبوو. لە سەر سینگیشی شوێنی پەڵەی لابەلا خوێی جێماوی ئارەقە هەبوون. ئەو بە پەستییەکەوە هەر پەڕەی فایلی نێو سەبەتەی سەر مێزەکەی هەڵدەدانەوە. بە تووڕەییەکەوە بانگی کرد "لەیلا سامان؟" لە لێوی ئەو ڕا، ناوی من تاوانێکی دیکە بوو. دەکرێ هەر یەکسەر ڕابکێشرێمە زیندان. بۆنی هێلکەی گەنیو وای لێکردم بڕشێمەوە.

"چییە، کەڕی؟ تۆ لەیلا سامانی یان نا؟"

کاتێ بە سووکی سەرم لەقاند چاوە زەنگیانەییەکانی تێبڕیم.

"دیارە وا ئاسانترە ئەو سەرە گەورەیە لە جیاتی زمانێکی بچکۆلە بجووڵێنی؟" پیاوە دڵڕەقەکە بە نوکتەکەی خۆی خەنییەوە، بەناو هەندێک ڕووپەڕدا گەڕا، کە لە نێو فایلەکەدا جێگەی کردبوونەوە و لە هەندێ شوێنیش واژۆی خۆی لەسەر دانا. تۆ بڵێی چی دانابێ؟ *ئێمە دەتنێرینە ئەو شوێنەی پێشتر براکەتمان بۆ نارد؟* لەبەر خۆشمەوە دەمپرسی بەڵکو ئەم دوا ئاسوودەکردنە چاکەیەک بێ دەرهەقم دەکرێ. خۆ باشترە مرۆڤ یەک جار بمرێ، لەوەی ڕۆژانە سەدان جار بمرێ. دامنا گەیشتمە کەنەداش، کێ دەزانێ لەوێ چیم بەسەردێ؟

ئەفسەرەکە لەوێ ڕایگرتم. ژوورەکە هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نەبوو، نە هەواساردکەرەوەیەک، نە ڕوەکێک، ئەو پانکەیەش لە بنمیچەکە و لەسەر سەری ئەو دەسووڕایەوە، تەپوتۆزی لەسەر فایل و کاغەزە پەڕزەردەکان هەڵدەدایەوە. بۆنی ئارەقە و گەنیوی

ژوورەکە مرۆڤی کاس دەکرد. هەناسەی ئەو لە هۆدە بێ هەواکەدا مۆنجەی[159] دابووەوە.

منیش سەیری سەر سەری ئەوم کرد، ئەو شوێنەی دیوار بە بنمیچەکە دەبەستێتەوە و گوتم: "مێردەکەم نیشتەجێی کەنەدایە. منیش پاڵپشت بە ڤیزا دەچمە لای ئەو. بەڵگەکانیش سەلمێنەری ئەوەن، ئەو دەیەوێ بچمە لای. دەکرێ پەیوەندی پێوە بکەیت."

"ئەرێ باشە بۆچی دایبابت ناوێکی نێو قورئانیان بۆ هەڵنەبژاردووی؟"

ئەم قسەیە وەک ئەوە وابوو سەتڵێک پارچە سەهۆڵ بەسەر گازەرای پشتمدا بکەن.

کابرا لەسەر نێوچاوانی جێشوێنی توربەی بەردەنوێژی شیعەکانی پێوە دیاربوو. ئاخر ناسنامەکەم ئەوە ئاشکرا دەکا لە کوردستان لەدایکبووم، لە نێو گەلێک هاتوومەتە دونیا، خومەینی بە گەندەڵەکانی سەر زەوی ناوزەدی کردبوون.

ناوی گیلێتینە[160] بیستبوو، ئەو زۆر لە یەکینەکانی مەرگی ئەوانە بێ ئازارتر بوو. هەنووکە مەرگ هاوڕێمە، ئەوە دوو ساڵی ڕەبەقە دڵسۆزانە شانبەشانم ڕێدەکا.

کابرا درێژەی بە قسەی خۆی دا: "باشە بۆچی تۆ و مێردەکەت خزمەتی وڵاتەکەتان ناکەن؟"

---

[159] مۆنجەی دابووەوە: پەنگی خواردبووەوە.

[160] گیلەتین: ئامێری سەربڕینە، ئەوەی کاتی خۆی فەرەنسییەکان لە سەرەتای ڕۆژگاری شۆڕشە مەزنەکەیاندا دایانهێنا.

نیگام لەسەر بنمیچ و دیوارەکە پەڕیە سەر فایلەکەی بەردەستی ئەو، گەیشتە سەر ڕوخسارە بێ باکەکەی ئەو پیاوەی دەستی بە ڕدێنیدا دەهێنا. ئینجا گوتم: "بەڵێ وەها دەکەین، هەر کاتێ خوێندنەکەمان تەواوکرد. مەبەستیش هەر ئەوەیە، تەکنەلۆجیای ڕۆژئاوایی لەگەڵ ئاکاری ئیسلامی لە یەک بدەین."

ئەویش سەری لەقاند، کەوتە پشکنینی جانتاکانم، بە شێوەیەکی شێتانە هەموو شتێکی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد، تەنانەت دەرپێ و جلی ژێرەوەش کە پێچابوومنەوە، کاتێکیش جانتایەکی پلاستیکی زنجیرداخراوی لە نێو جانتای دووەممدا دۆزیەوە، گاڵتەی پێکردم.

کاتێ دەستی لێدا و زانی شتە تایبەتییەکانی بێنوێژی و شتی وەهایە، سڵەمییەوە، ئینجا بێ ئەوەی قسەیەک بکا، دەرکەی نیشاندام.

دوای ئەوەی دەرکەم لە دوای خۆم پێوەدا، لە پێکەنینم دا، سەڵەوات بۆ ئەو شتە کوفرانەی ڕزگاریان کردم.

پاسپۆرتەکەم مۆرکرا. هەروەک خەونم بینی بوو بلیتی سەفەرەکەم نە بووە هەڵم و نە پارچەپارچە کرا. بە نێو دەرگای نادیاری وادا تێپەڕیم کە ڕێگەیان نەدا تارمایی بەدوامدا بێ. ڕابردوو فڕێدرابووە سەرزەمینێکی دیکە.

من دوا کەس بووم سواری گەشتەفڕینی ئێرۆفلۆت بووم.

بە نێو ڕاڕەوێکی باریکدا ڕەت بووم، نابینا لە ڕێبوارە سەرنشینەکانی دیکە. خۆ ئەمە ڕاستی بوو، ئەمە دابڕان بوو لەو ژیانەی پێی ئاشنابووم، بەڵێ ئەمە گەشتێکی یەک سەرە بوو. کاتێکیش لەسەر کورسییە تەرخانکراوەکە دانیشتم، شانەکانم خاو و

ئارام بوونەوە هەرچەندە گوریسی خەم و ناسۆر لە سینگم هەر کشت دەبوو[١٦١].

لەو کاتەی فڕۆکەکە بۆ هەڵفڕین چووە سەر ڕێڕەوی چاوەڕوانی، مەکینەکەی لە بنەوەی مندا کەوتە لەرینەوە. هەناسەیەکی درێژم هەڵکێشا بەڵکو دەمارەکانم خاو بکەمەوە. لەکاتی هەڵفڕینیشدا ئاو بەسەر پەنجەرە بچووکەکەدا ڕیزی بەست. ئیدی گەواڵە هەور کەوتنە ژێرەوەی فڕۆکەکە.

وێستگەی وەستان لە مۆسکۆدا یازدە سەعاتی خایاند، لێ لەبەر ئەوەی پەساپۆرتەکەم ئێرانی بوو، ڕێگەیان نەدام لە ترانزێت بچمە دەر و شارەکە ببینم، ئای چەند تامەزرۆی بینینی بووم. بە نێو تەرمینالەکەدا گەڕام، ئینجا لە وردەکاری ژیانی دەرەوەی ئەو زیندانە ٦٣٦،٤٠٠ مایل چوارگۆشەیە تێگەیشتم، کە ناوی ئێران بوو.

ژنانی باڵابەرز و زراڤ، کە شانازییان بە قاچوقولە نازدارەکانیانەوە دەکرد و تەنوورەی کورتیان لەبەردابوو، جگەرە و بۆنیان بۆ ئەو ڕێبوارە بێژمارانەی لە چاوەڕوانیدا بوون، دەفرۆشت. خەڵک بە بەردەمیاندا دەهاتن و دەچوون، قسەیان دەکرد، بنێشتیان دەجووی، پێدەکەنین، مووڕدەبوونەوە و نیگایان دوور لە نیگای من بوو. دوای یەک سەعات، لەسەر پەیژەکان دانیشتم، لەپەکانم گەیشتنە سەر کاشییە ساردەکە. کچێکی کەژەی جوان لە بەرانبەرمدا لەسەر پەیژەکان دانیشت. پێنج کوڕ کە داڵغەیان لێدابوو، دەورەیان لێدا، هەر یەکەیان قسەی بە برادەرەکەی خۆی دەبڕی تا

---

[١٦١] کشتبوون: گرژبوون، توندبوون.

نوکتەیەک لە سەر کچەکە بکا. ئەویش لە جێی خۆی بە شتێک پێدەکەنی، کە من بوومایە دەیتاساندم.

من درێژەم بە هاتن و چوونم دا تا گەیشتمە بەردەم دەرگایەکی تەلیسماوی، پێشتر تێبینیم نەکردبوو. ئەم دەرگایە هەستپێنەکراوە لە جامی ڕەش دروستکرابوو، بە هەندێ وشەی ڕوسیش ڕازابووەوە. بە لایدا ڕۆیشتم، لێ دیسان خۆم لە بەرانبەریدا دۆزیەوە، بەر لەوەی پاڵی پێوەبنێم و بیکەمەوە بە ناویدا بچمە ژوورەوە، ماوەیەک وەستام. پەیژە تاریکەکان بە هەڕەشەیەک دەچوون. هەنگاوم بۆ دواوە هەڵهێنایەوە. پیاوێکی بە تەمەن، قاتێکی ڕەشی لەبەردابوو، بۆینباخیشی بەستبوو بۆ دوو پیاوی بزنسمانی کەشخە چەمایەوە و ڕێگەی بە پەیژەکان بۆ خوارەوە نیشان دان. منیش دوایان کەوتم.

لە خوار پەیژەکان سارد و خۆش بوو، بە پێچەوانەی گەرمی سەروی پەیژەکان. پیرەپیاوەکە قسەیەکی بە کارمەندەکەی وەستا و لە پشت مێزی پێشوازییەوە گوت، پیاوەکانی بردنە ژوورێکی نوێ و کەشخە کە چەندین کورسی و شیرینی و خواردنەوەشی تێدابوو. ئینتەرنێتیشی هەبوو، سێ شوێنی بەستنەوە بە کۆمپیوتەری لێ هەبوو. دوا دانەیان خەڵکیان لەسەر بوو، یەکێکیان بەتاڵ بوو. بەڵێ خۆ دەتوانم لێرەوە ئیمێلێک بۆ کارۆ بنێرم، پێی ڕابگەیەنم لە زیندانەکە دەرچووم.

کاتێک بە تاسەوە لە شاشەی کۆمپیوتەرەکەوە ڕامابووم، کارمەندی مێزی پێشوازییەکە بە ئینگلیزی پێی گوتم: "ببوورە."

"ئۆو، ئەم کاتەت باش! ئەرێ دەتوانم ئەم کۆمپیوتەرە بۆ ماوەی پێنج خولەک بەکاربهێنم؟"

"ئەویش بەدەم ئەم پرسیارەی: "ئەری تۆ بە بزنسکلاس دەفڕی؟" لە تەوقی سەر تا قولەپێ تەماشای کردم.

گەرووم وشک هەڵات. *پێموایە خۆت دەتوانی تەلیسمی وەڵامەکە هەڵبێنی.*

"ببوورە، ئەگەر هاتبا و بە بلیتی بزنسکلاس فڕیبای، یارمەتیمان دەدای."

"فڕیبیت یان فڕیبایت[١٦٢]؟" لە هزری خۆمدا دێڕە ئینگلیزییەکەییم هەڵدەسەنگاند، دەستی چەپیشم هێشتا هەر ئاماژەی بۆ کۆمپیوتەرە بە خۆڕاییەکە دەکرد.

"ئایا بانگهێشتنامەت پێیە؟"

منیش سەرم لەقاند و بە پەیژەکاندا هەڵگەڕامەوە. لە شوێنی ئاسایی ئیکۆنۆمیدا، لە دیوارەکە خۆم خزاند و لەسەر ناوکەوەکە دانیشتم، خۆم بۆ شتی هەڵاوێردراوی و حاڵەتی هەراسانی پتر ئامادەکرد، ئاخر لە تێگەیشتنی ڕێسا نەنووسراوەکان شکستم هێنابوو.

دوای چاوەڕوانییەکی بە ئازاری دە سەعاتی، بەرەو خاڵی پشکنینی ئاسایش ڕۆیشتم و جانتاکەم بۆ پشکنینی ئەفسەرە دڵبەردەکە خاڵی کرد، پێڵاوم داکەند و قایشی پانتۆڵنەکەشم لە خۆم

---

[١٦٢] لێرەدا گەمەی زمانییە، یان ڕاستتر، لەیلا کە تازە خۆی فێرە ئینگلیزی دەکرد وشەیەکی ئینگلیزی بۆ کارمەندە ڕوسیەکە ڕاستکردووەتەوە، چونکە ڕوسییەکە وەهای گوتووە: 'if you had flied business class'، کەچی ڕاستییەکەی دەمی کاری فڕینەکەیە، flied نا بەڵکو دەبوو flown بەکاربێت.

کردەوە، بە نێو ئامێری دوودەری پشکنینەکەدا ڕۆیشتم، لێگەڕام بە کەیفی خۆیان بیپشکنن.

کاتێکیش سواری فڕۆکە بووم، پیاوێکی فەرمیپۆش بە خەندەیەکی پەسەندئامێزەوە هەروەک ئەوەی ڕابێم، وەستاندمی. سەیرێکی پاسپۆرتەکەی کردم، پاشان لەپڕ خەندەکەی لەسەر شڕ بوو. ئەو جارێکی دیکە لەو سەرەوە تا خوارەوە سەیری کردم، بەڵام دەربڕینەکەی گۆڕابوو. منیش بە خۆم نەبوو بە سووکی پێکەنیم. "فڕۆکەوانەکە داوای لێکردووم جارێ پاسپۆرتەکەی لای خۆمان گلبدەینەوە."

"دیسان هەر لە گۆترە؟ بەڵام ئەو ناتوانێ ئەم کارە بکا. ئێوە ئەو مافەتان نییە."

ڕوانینەکەم لە گوورەی نەبرد[163]."لە دابەزین لە فڕۆکەخانەی پیرسندا[164]، دەتدەینەوە."

منیش سەیرێکی خۆم کرد و مەراق مام ئاخۆ چی لە مندا وەها دەنوێنێ لە تیرۆرست بچم.

بە هەناسەبڕکێوە کاتێ ڕێگەی خۆم بڕی تا لەسەر پشتی فڕۆکە گەورۆنەکەی هێڵی ئاسمانی کەنەدی جێگەبگرم، پێم گوت: "خۆت و باقی ئەوانی دیکەش بە جەهەننەم."

هەستمکرد سڕ بووم.

---

[163] لە گوورەی نەبرد: کاری تێنەکرد، نەیجووڵاند.

[164] pearson

گەزەی بەدگومانی دەیسوتاندم، بەڵام خۆ ئەمەش سزایەکی دیکەم بوو دەبوایە باجەکەی بدەم، ئاخر من لە ئێران لەدایکببووم، لە وڵاتێکی شەڕانگێز، لەو شوێنەی هەروەک نیشتمانەکەی جێیمس جۆیس[١٦٥] "پیرەمالۆس بەچکەکانی خۆی دەخواتەوە." بۆ هەر کوێ بچم، زێدەکەم بە دوامەوەیە، وام لێدەکا لەبەر چاوی جیهانێکی دەبەنگ و بێبەزەیی و لایەنگیر بە تاوانبارێکم بزانێ.

کورسی خۆمم دۆزیەوە و لە یادنامەکەشم نووسی:

*تەمەنێکم هەبووە کە زۆریش ڕەنگدانەوەی ژیانی من نەبووە. بابە و دایکە لە مەریوان منیان هێنایە سەر ئەم دونیایە؛ چیاش لەگەڵ خۆیدا بردمیە تاران و ئێستاش کارۆ دەمباتە تۆرنتۆ. خۆ ئەگەر هات و لەوێ مام، ئەوا بەڵێن دەدەم خۆم جڵەوی ژیانم بگرمەدەست؛ ئیشێک بدۆزمەوە، "هۆدەیەکی تایبەت بە خۆم" هەبێ، بچمە بەر خوێندن، پارەکەی کارۆش بدەمەوە، ڕێبازی چیاش بەرنەدەم. دەی کەواتە هەی خەمی خنکێنەر، خواحافیز.*

ژنێکی جوان بە خۆی و خەندەیەکی شەرمنانەوە لە تەنیشت من دانیشت و گوتی ئەم کاتەت باش. ژنە سارییەکی شینی لەبەردابوو، خاوەنی دوو چاوی ڕەش و پرچێکی کەزیکرا و بیندی[١٦٦] بوو. بەرلەوەی فڕۆکەکە هەڵبستێ، چەند حەبێکی لەنێو لەپی دەست قوت دان و بوتڵە ئاوێکیشی بەسەرداکرد. بە چاو داگرتنێکەوە گوتی: "من بووکێکی پۆستکراوم."

---

[١٦٥] James Joyce جیمس جۆیس: نووسەری گەورەی ئیرلەندی (١٨٨٢ - ١٩٤١) نوسەری شاکارەڕۆمانی (یولیسیس)ە.

[١٦٦] بیندی: شتێکە بۆ ڕازاندنەوەی بوک، لە خەزێم دەچێ، بەڵام لە نێوچاوان قایم دەکرێ، پتر دابێکی هیندییانەیە.

چاوم لێداگرتەوە و گوتم؛ "منیش بووکێکی ساختەم."

## بەندی سی و چوار

دوای دە سەعات لە فڕۆکە دابەزیم. هێشتا ڕۆژ لە تاقی ئاسمان بوو، هەروەک ئەوەی کاتێ من ڕوسیام بەجێهێشت. ئەو پیاوەش کە لە مۆسکۆ پاسپۆرتەکەی لێستاندم، بە دوامدا هات و پێی دامەوە. هەر پیاوێک چاوی دەکەوتە سەر من، وەک ئەوە وابوو قاچاغچییەکی مرۆڤ بێ. خۆم بۆ پێواژۆی گەیشتنم ئامادەکرد و ڕێگەی گومرگم گرتەبەر.

ئەفسەرێکی چاوشینی ڕیشتاشراو پرسیاری لێکردم و سەیری بەڵگەنامەکانی کردم، ئینجا بردمیە دیوێکی دیکە، کە چەند گۆشەیەکی هەبوو، لەوێ لە پشت مێزێک پرسیاری پتری لێکردم. منیش هەموو توانستی مێشکم کۆکردەوە، بەڵام ئەو ئەوەندە خێرا دەدوا، هەڕدەر هەڕدەر قسەی لە دەم دەردەچوو، لە هەر ڕستەیەکیشی بە تەنیا لە یەک دوو وشەی تێگەیشتم. بە مەزەندەکردنی پرسەکانی هەوڵمدەدا وەڵامی بدەمەوە، ئەمەش لە بەدحاڵیبوون سەریکێشا بۆ دووبارەکردنەوە و ڕاستکردنەوەی وەڵامەکان. تا ڕادەی مردن ترسم لەوە بوو ئەو بەربەستی زمانەکەم بە تەفرەدان بزانێ، کە خۆشی هەر بەشێک بوو لەو، لەوانەشە هەر ئەمە هۆکاری سەرەکی دڵەکوتەم بووبێ. ئەفسەرەکە پێیگوتم لە شوێنی خۆم بوەستم و چاوەڕێ بم و خۆیشی ڕۆیشت.

سەرجەم ئەم شتانەم بۆ هات: هەر بە ڕاستی کارۆ نایەوێم. پارەشم نییە. ئینگلیزییەکەشم دووکەڵ دەکا. هەر بۆ ئەوە لە دەست

هەڕەشەی زیندانکردن قوتارم بوو تا لێرە لە وڵاتی غەریبی بە تەنیایی سەر بنێمەوە.

سەیرێکی دەوروبەری خۆم کرد، بینیم کەسانی دیکە لەگەڵ ئەفسەرە فەرمیپۆشەکان قسەدەکەن. ژنێکی ڕوخسار شێواوم بینی تەقییەوە و کەوتە هاتوهاوارکردن. هەموو ئەوەی لێی تێگەیشتم، بەکارهێنانی-نەفرەت بوو کە وشەیەکی بازاڕیە. ئیدی دوو فەرمیپۆشی کەتە و زل هاتن و پیلی ژنەیان گرت و لەوێ بردیانە دەرەوە. منیش لە ترسی ڕشانەوە شاڵەکەم بە دەممەوە نا.

ئەفسەرەکەی منیش بە خۆی و دەربڕینێکی بێلایەنانە هاتەوە و پاسپۆرتەکە و بارستە بەڵگەنامەکانی و داوانامەکەمیشی دایەوە دەستم. بە دەنگێکی نەرم دوا، لێ بۆ تێگەیشتنی من زۆر خێرا بوو. منیش بە دەمێکی داچەقیوەوە سەیرم کرد، هەڵسام و بە دوای ئاماژەکانی دەرچوون کەوتم.

کاتێ گەیشتمە دیوی وەرگرتنەوەی جانتاکان، ئاوڕێکم لە دوای خۆم دایەوە. دیاربوو کەس بە دوامەوە نەبوو.

جانتاکانم خستنە نێو عەرەبانەیەکەوە و ڕێگەی خۆم بەرەو دیوی گەیشتن بڕی و چاویشم بۆ کارۆ گێڕا. ئاڵای کەنەدی بە گەڵای سووری دارکەوەتە بە بنمیچە بالاکەوە هەڵواسرابوو. زەریایەک لە ڕوخسار لە هەراسانی بۆ ورووژاوی و مەراق چاویان دەگێڕا. ژنێک لە تەمەنی شەشت ساڵیدا بە خۆی و پێستێکی ئەسمەر و پرچێکی کەژەوە، جلێکی تەسکوتار و کورت لەبەریا، هەر تا سەر ئەژنۆی دەهات، فیستانێک لە ڕەنگی پەمەی و پێلاوێکی پانیبەرزیشی لەپێدابوو. لەنێو ئەو ئاپۆرایەدا هەڵسا. ماکیاجێکی

زۆریشی کردبوو. ورگە هەڵاوساوەکەشی جلەکەی لێ تەنگتر کردبوو. ژنە لە من نزبووەوە. توانیم ئەوەی لەسەر لێوەکانەوە بخوێنمەوە، کە بە فارسی گوتی: "ئەرێ ئەمە بووکەکەمە؟"

ئەو پیاوەی لە تەنیشتیشی بوو، لە بن کۆڵەپشت کووڕ بووبووە و شەڕی لەگەڵ زنجیرەکەی دەکرد، خۆ ئەوە کارۆ بوو. کارۆ دەستی بۆ ڕاوەشاندم. منیش وەهام کردەوە، بەڵام دەست لە هەوادا بەستی، لە پڕێکەوە هەستم بە ڕوخساری شەپرێوی خۆم کرد: پێڵاوێکی ناشیرینی وەرزشی، دەلینگی هەڵکراوی جینزەکەم، کراسە ئاماڵ پەمەیی و سپی و شینە نەگونجاوەکەم، پرچە کوڕانییەکەم، کە زۆرنەبوو کورتم کردبووەوە. هەموو ئەمانە وا هەستم بە خۆ کرد ناقۆلاییم پیشاندەدا.

دایکی کارۆ تەوقەی لەگەڵ کردم و بە خشکەییش بە هۆی ئەوەی خۆ دوورخستەوە لەوەی ڕوومەتەکانی ماچ بکەم، منی لە دۆخێکی سەرسوڕماندا بەجێهێشت. بە شکۆمەندییە خۆبەزلزانییەکەشی سەرم سوڕما.

کارۆ باوەشێکی گەرمی پێداکردم و تەوقی سەریشی ماچ کردم، لەچکومەچکیش نەمابوو. دایکیشی دەستی لەسەر دەمی دانا، خۆی پێنەگیرا و لە پڕێکدا دایەی قاقای پێکەنین. "شیرینەکەم دڵگیر مەبە. ئەو شوێنە دەزانم کە باڕۆکەی نایابی لێ دەفرۆشن."

منیش وەڵامم نەدایەوە، پێنەدەچوو ئەویش باکی پێبێ. ئیدی بەرەو گەراجی ترومبێلان هەنگاومان هەڵێنا، لەوێ دایکی کارۆ سواری بی ئێم BMWە سپییەکەی بوو. کارۆش کە لەسەر ئیشەوە هاتبوو، ئاماژەی بە تۆیۆتایەکی کۆن کرد و بارستە فایلی کاری

خۆی فڕێدایە سەر جانتاکانی منەوە. بە هێواشی بەرەو دەرچەی گەراجەکە لێیخوڕی.

پەشۆکاوی و بەیەکەوەگەیشتنەوەمان شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو. دوای چاکوچۆنی و یەک دوو کورتە ڕستە، لە دواییدا لێم پرسی: "ئەرێ چیت بە دایکت گوت؟"

کارۆش ئاوێنەی پشتەوەی دەستکاری کرد تا ڕوخساری خۆی تێدا ببینێتەوە و دەستێکی بۆ پرچی برد و گوتی: "هیچ."

"ئەو نازانێ ژن و مێردایەتیمان شانۆگەرییە؟" بە دەم ئەم قسەیەوە جەستەم بەرەو لای ئەودا لار کردەوە.

ئەو بەرەو دەرچەی گەراجەکە ڕۆیشت و بلیتەکەی و کریدت کارتەکەی لە کونە کلیلی دەزگایەکە ڕاکرد و دەرووەکە کرایەوە. "مەگەر بینەرێکی زیاترت بۆ نمایشەکە ناوێ؟"

"گاڵتە ناکەم!" ئیدی لەبەر خۆ بەستنەوەم بە قایشی دڵنیایی ترومبێلەکە بە ئاسانی خۆم پێ نەدەجووڵا.

کارۆ گوتی: "ئەرێ هەر بە ڕاستی، چیت بە دایبابت گوتووە؟" لەو قسانەدا بوو ئێمە گەیشتینە سەر جادەیەکی خێرا پێی دەگوترا ٤٠١ جادەی ڕۆژهەلات و تێکەڵی ڕێگا قەرەباڵغەکانی کەنەدا دەبوو.

"نەمتوانی."

"منیش نەمتوانی."

"بەڵام ئەوانەی من دوورن، پێویستیش ناکا بیزانن."

"ڕاستە، پێویست ناکا بیزانن."

"بەڵام خۆ دایکت لێرەیە. ئەو هەر بۆی دەردەکەوێ. باشە بۆ چی درۆی لەگەڵ دەکەی؟"

"چونکە ئەو بەم جۆرە دڵخۆشترە."

"ئەدی باشە کاتێک منیش دەڕۆم، چی پێ دەڵێی؟"

کارۆ چاوێکی لێکردم. "ئەم قژکورتییەت لە نزیکەوە زۆر جیاوازە."

"ئەری بۆچی دایکت وای دانا کەوا باروکەیەکم دەوێ؟" کەچی ئەو بەرسڤی نەدامەوە. منیش جامی تڕومبێلەکەم داکێشا، سەری خۆم بردە پێش تا با بەنێو تیسکە کورتەکانی قژمدا بێت و بڕوا. کاتێکیش وام کرد، هەستمکرد بەو خۆدەرخستنەم هەندێک وروژاوم. بەرزبوونەوەی پلەی گەرما گۆمۆکەی بریقەداری لە بن تایەی تڕومبێلەکان دروستدەکردن و ڕێگەکەش ئێمەی گەیاندە شارێک، پێشتر هەرگیز خەیاڵیشم بۆی نەچووبوو. بە ڕێگا خێراکەدا بە چوار هێڵی بە نێو ڕیزێک قوللە و تاوەری بەرز و بڵندا ڕۆیشتین، خۆی تاوەری میلادی تاران ڕێک لێرە لای هەوربڕەکانی تۆرۆنتۆوە جێگەی دەبووەوە و هەر بۆ ئێرە دەستی دەدا. تڕومبێلەکان بە تیژڕەوییەکی سەیر بە بەردەمماندا ڕەت دەبوون، بە سەر ئەو هێڵانە ئەوەندە خێرا دەڕۆیشتن، وەک ئەوەی فڕۆکە بن و بە سەر ڕێڕەوێکی چۆڵدا بڕۆن. ئێمەش لە نێو تڕومبێلە بچکۆلەکەماندا بووین. کاتێکیش ڕێگای خێرامان بڕی و گەیشتینە شارە سەرنجڕاکێشەکە، پێستی ئەوانەی لە دەرەوە بە پیادە دەڕۆیشتین سەرسامیان کردم. هەندێ لە ژنان مینیژۆپیان لەبەر بوو، هەندێکیشیان لەچکیان کردبوو، بەدڵی خۆیان- ئەمەم لەگەڵ خۆمدا

گوتەوە. هەندێک لە پیاوان بۆیناباخیان بەستبوو، هەندێکیش تەنیا کراس. دیمەنەکە هەروەک ئەو فیلمانەی هۆلیود وابوو، ئەوانەی لە مەریوانەوە دیبوونم. لێ ئەم جارەیان خۆم لە ناو فیلمەکەدا بوم، نادڵنیاش لە سیناریۆ و ڕۆڵەکەی خۆم.

ئێمە گەیشتینە خانوویەکی کەشخەی پەنجەرە گەورە لە نۆرس یۆرک. هەوڵمدا سەرسامیم بشارمەوە، دیکۆری خانووەکە و ڕاخستنەکەی بە شێواز و مۆبیلیاتێکی ناوازەی بە چەشنێک بوو، جارێکیان لە کۆشکی دوایین شای ئێرانم بینیبوو، کە ئێستا بووەتە مۆزەخانە. کورسی و قەنەفەی جوان و دڵڕفێنی نەرم، قاچەکانی لە داری مەهاگۆنی دروستکرابوون، کۆتەڵی گەورەی شێر و پڵنگ و جەنگاوەران، فەخفووری ڕازاوە و نەخشین، مافوورێکی دەستکردی ئێرانی بە تانوپۆی زۆر جوان چنرابوو، لە گۆشەیەکی هۆڵەکەشدا ئاگردانێکی نایاب دانرابوو. شتی وەها تەنانەت لەسەر ڕەفەی کتێبانیشدا نەدەبینرا.

دوای سەرسامبوونم بەو هەموو شتە ناوازە زۆرانە، هەستم بە بێ بایەخیی خۆم کرد. ئەو دوورییەی لە ئێرانەوە بڕیبووم خەریکبوو بکەوێتە هەناوم و لە ناخمدا واتایەک ببەخشێ. من بەوێوە نەبەسترابوومەوە. ئێمە جانتاکانمان لە ژووورە بنهۆمەکەی دایکی دانان، دیاربوو زۆر جار وەک ئەمبارێک بۆ باقی مۆبیلیاتی ماڵەوە دادەنرا، چەندین سندوقیشی لێ دانرابوو، لە گۆشەکەی ئەوسەری ژێرزەمینەکەش هۆدەیەکی نوستن و حەمام و ئاودەستێکیشی لێ هەبوو.

کارۆ بە نیازپاکی و بە تاسەوە ڕوونیکردەوە، دایکی بۆ ئەوەی مەودایەک بۆ هەستی تایبەتمەندیمان بهێڵێتەوە ئەو شوێنەی لە جیاتی هۆدەکەی میوانانی سەرەوەی پلیکانەکان بۆ داناوین، هەروەها ئەوەشی پێگوتم بە تەمایە بۆ نانی شێوان بمانباتە دەرەوە. منیش بە شەکەتی دوای گەشتێکی بیست سەعاتی داوام کرد بەڵکو لە بری چوونەدەر لە ماڵ بمێنینەوە.

ئەویش پرسی: "دەتوانین خواردن لە دەرەوە داوا بکەین. حەزت لە چییە؟"

بە زۆر لەخۆکردنێکەوە خەندەیەکم بۆ کرد و گوتم: هەر شتێکی کەنەدایی بێ."

"دەتوانم هەر جۆرە خواردنێک خەیاڵت بۆ بچێ، داوابکەم؛ هەر لە خواردنی ئەسیوپی، کۆریایی، چینی، هیندی، دەی خۆت ناوێک بڵێ."

"خواردنێکی کەنەدایی."

"ئاخر شتێکی وەها لە گۆڕێدا نییە."

"چۆن شتی وا دەبێ؟"

"بڵێ چۆن. کەنەدی یەک جۆرە دەفری خۆراکییان هەیە، بەڵام پێشوەختە ئاگادارت دەکەمەوە، پێت خۆش نابێ. خواردنەکەیان پێی دەگوترێ پۆتین[١٦٧]، بەشی هەرە زۆری خواردنەکەش لە پەتاتە و هەندێک پەنیر پێکدێ. بوەستە، خۆ تەنانەت ئەم خواردنەش فەرەنسییە! کەواتە خواردنێکی کەنەدی لە ئارادا نییە. چۆنە داوای خواردنی ئیتاڵی یان یۆنانی بکەین؟"

---

[١٦٧] Poutine

"پۆتین." ئیدی ئەوەم هەڵبژارد، چونکە پێم شتێکی سەیر و سەمەرە بوو خواردنێک هەبێ بە کوردی واتای "پۆتین[١٦٨]" بدات. دەی با شانۆگەرییە هەزەلیەکە بگاتە لووتکەی خۆی.

خۆم گۆڕی و بێجامەیەک و تیشێرتێکم کردەبەر، هەر دەبێ لە ماندووبوونییدا سەرخەوێکیشم شکاندبێ، چونکە هەر ئەوەندەم زانی خواردنەکە هات. لەسەر لێواری پێخەفەکەی دانیشتین و دەستمان بە خواردنەکە کرد.

"خۆی دەبووایە مێزێکی نانخواردن لێرە دروست بکەین. من سێ جۆریانم دەسنیشانکردووە، بەڵام چاوەڕێی تۆم دەکرد تا یەکێکیان لێ هەڵبگری. ئەم هەفتەیە دەچینە ئیکیا[١٦٩]."

منیش وەک گوێزم بۆ بژمێرن، نەمدەزانی ئیکیا چییە. "ئەم خواردنە سادەیە، بەڵام بە تامیشە. ئەرێ بە ڕاست ناوەکەی چی بوو، پوو-تین؟"

کارۆش پێکەنی. "نەخێر، ئێمە خۆ پو-تینی دیکتاتۆری ڕووسیا ناخۆین."

"هەر چۆنێک بێ!" وام لێکرد دیسان لێم بڕوانێ.

"پرچێکی نوێ." ئەو سەیری ڕوخسارمی کرد و لێی نزبووەوە.

منیش سەیری بەرپێی خۆمم کرد و گوتم: "قژم دێتەوە."

---

[١٦٨] پۆتین: لاپچین، کەوشێکی لاچک درێژ لە شێوەی جزمە وایە.

[١٦٩] IKEA ئیکیا یان ئایکیا لە بەریتانیا و ئەمریکا کۆمپانیایەکی مۆبیلیاتی سویدیە، ناوبانگی لە زۆر وڵاتدا پەیداکردووە.

"ویستم بڵێم لێت دێ. پرچی درێژ ڕوخسارت دەشارێتەوە. من ئەمەیانم بە دڵە."

کەمێک شلەژام. "یەکێک لە نێو فرۆکەکەدا لێی پرسیم ئاخۆ لە چارەسەری کیمیاوی بوومەتەوە. منیش گوتم، شتێکی لەو جۆرەیە."

کارۆ کەوتە سەر دۆشەکە دوونەفەرییەکەی سەر ناوکەوەکە. ئینجا گوتی: "هەندێک جار خەڵک هەوڵی ئەوە دەدا سەرەداوی پەیوەندییت لەگەڵ ڕابچینێ، کەچی لە دواییدا شتێکی پووچ دەڵێ. هەندێکی دیکەش، یەک لەوان من، ئەوەندە لە وتنی شتێکی شاش دەترسن، تا وای لێدێ نەتوانین سەری قسەش دابێنن. گوێبگرە. دایکم.." بە دەم ئەم قسەیە سەرین و پەتۆیەکی دیکەی زیادی لە دۆڵابەکە ڕاکێشا. ئینجا قسەکەی خۆی تەواو کرد؛ "..کاتێک ئەو دەربارەی شتگەلێک دەدوێ وەک، نازانم چی، بەوەی تۆ بباتە لای دەستڕەنگینێکی ئارایش یان پزیشکێکی جوانکاری، هەر بۆ ئەوەیەتی تانوپۆی پەیوەندیت بۆ ڕابکێشێ."

"چی؟ نەشتەرگەریی جوانکاری؟ تۆ بڵێی ئەو هەموو شتانەی لە مێشکی خۆیدا بۆ من ئامادەکردبێ؟ مەگەر چرۆچاوی من ئاوا چییەتی؟ مەبەستمە بڵێم، من دەزانم وەک ئەو جوان نیم، ناشمەوێ ببم. من کاری پێشنۆرەیی دیکەم هەن، هەر هیچ نەبێ جارێ شتی گرنگترم لە پێشە." پێم وا بوو من زۆر بە دەربازبوون و زیندوومانم سەرقاڵبووم. تۆ بڵێی چەند دەستکاریی سەر و سیما و جەستەی ئەو کرابێ؟

کارۆ لەسەر دۆشەکەکە پاڵی دایەوە. "من ناڵێم تۆ گوێی لێبگرە. من خۆم جوانیی سروشتیی ژنانم بەلاوە پەسەندترە. من هەر ئەوە

دەڵێم، ئەو کاتێ شتێکی وەها دەڵێ مانای ئەوە نییە دڵڕەق بێ. ئەوە جیهانی ویە. ئەو تۆ بانگهێشتی جیهانی خۆی دەکا. خۆت دەزانی چی دەڵێم."

"من دەبێ ددانەکانم بشۆم." ئیدی بە دەم ئەم قسەیەوە ڕووم لە حەمامێ کرد. ئای خوایە، خۆ ئەگەر ئەمە شێوازی ئەو بێ بۆ ئەوەی جوان دەربکەوێ، ئەوا ڕقم دەبێتەوە ئەو بە بەدفەڕێکی ڕاستەقینە ببینم.

لە ئاوێنەی سەرشۆکی حەمامەوە، لە ڕوخسارە هیلاک و ناپێشچاوەکەی کیژێکم ڕوانی کە ئارەزووی بوو بمرێ و سەرنەکەوت، هەوڵ و تەقەلای دا برایەکەی ڕزگار بکا و شکستی هێنا، ئێستاش هاتۆتە بەردەم ئەم ژنە دەوڵەمەندە جوانە، کە بە بینینی ئەم بووکە ناحەزە و بەو هاوسەرگیریە سەقەتەی کوڕەکەی، کە بەزمەکەی خۆی بیردەخاتەوە، هەراسان بووە، ئەگەر هەترەشی نەچووبێ. ئیدی ددانەکانم شوشتن، بە ئازاریشەوە هەستم بە کەڵبە دەرپەڕیوەکەم کرد، پێدەچێ تا ئێستا دایکی کارۆ نەیبینیبێ. پێویستە لەوە ڕایبهێنم (ئەگەر؟) هاتوو پێکەنیم، دەمم نەکەمەوە. هەروەها پێویستم بەوەش هەیە تا دەکرێ زووتر کارۆ و دایکی جێبهێڵم.

کاتێکیش گەڕامەوە هۆدەی نوستنێ، کارۆ دەستەکانی خۆی خستبوونە پشت سەری و لە بنمیچەکە نزبووبووەوە. منیش لای پێخەفەکەی وەستام. "دەبێ هەڵبسیت و بچیتە سەر سیسەمەکەی خۆت."

"لەیلا، من قسەیەکی قۆڕم کرد." بە دەم ئەم قسەیەوە هەڵسا، ئینجا درێژەی دایێ: "ئای چ گەوجێکم. ویستم بە لێکدانەوەکانی وی

سەغڵەت نەبی، کەچی وا خۆم ئازارت دەدەم. سەیرکە، ئەو هەمیشە ئەو شتانە دەکا، هەستیش دەکا پێیەوە دەنازێ، نەوەک پێی سووکایەتی بێ. کەواتە کاتێ شتێک دەڵێ

"کارۆ، تکایە. دەی تەنیا لەوێ هەڵسە و بڕۆ سەر سیسەمەکەی خۆت. لێگەڕێ با لەسەر زەوی بڕازێم."

"من لێرە زۆر ئاسوودەم." کارۆ خۆی خستە ژێر چەرچەفەکە و بە سەر دەموچاوی خۆیدادا.

"باشە، بەڵام، من ئاسوودە نابم. تۆ لەسەر ئەم سیسەمە ڕاهاتووی. بڕوام پێبکە، من لە سەر زەویەکە زۆر ئاسوودەترم."

ئەو وای خۆ نواند پرخە بکا. منیش لەوێ لە ژوور سەری وەستام و سەیرم کرد، بیرم لەو دۆخە گاڵتەجاڕیە کردەوە کە بووەتە هەموو ژیانی ڕاستەقینەی من. ئەو وێنە پیکسلەی سەر شاشەی لاپتۆکەم بوو، ئێستا ببووە ئەو پیاوە کەشخەیەی لە هەمان ئەو ژوورە نووستووە کە منیشی لێم، بەڵام پێکەوەش نین، بە شێوەیەکی کاتی بووەتە خانەخوێم، کەچی "مێردیشمە"، هەرچەندە ئەگەر بە مەبەستیش نەبێ، براکەمی کوشت، لێ منیشی لە هەڕەشەی مەرگ ڕزگارکرد.

ئینجا منیش خزامە نێو سیسەمەکەی، ئەوە بوو بە درێژایی شەوەکە هەر لە بنمیچە تەختەکە و دیوارە تازە بۆیەکراوەکان بە ڕەنگێکی سپیپاتەوە ڕامام. گەڕامەوە بەردەم زیندانی ئێڤین، سەیری پیاو و ژنە لەسێدارەدراوەکانم کرد.

## بەندی سی و پێنج

کارۆ دەموچاو و ملی کەوتبووە بن ئارەقە، هەروەک ئەوەی لە ئاو هەڵکێشرابێ وابوو. "سەد و پەنجا جار شناو، دەی بۆ ئەمرۆ بەسیەتی. ئەرێ حەزت لێیە سەرێکی ناو شارەکە بدەین؟"

منیش چاوەکانم هەڵگلۆفتن. "لە خەونمدا هاتنە کەنەدام خەون بوو."

ئەویش پێکەنی. "دەی نوقرچێک لە خۆت بگرە."

"بۆچی وا بکەم؟ نامەوێ لەو خەونەم خەبەرم بێتەوە." ئینجا قۆڵەکانم لە یەک کێشانەوە و باوێشکم هاتێ، هێشتاش سەرتاپای جەستەم بە هێواشی دەهێشا، مێشکیشم هەر تەمومژاوی بوو. بربڕەی پشتی بە ڕووتی لە بن ئارەقەدا دەبریسکایەوە. منیش چاوم لەسەری لادا، زگم پێچێکی کرد، وەک ئەوەی دەرزیئاژنینم بکەن وا بوو.

"دەی کەواتە با بیکەینە باشترین خەون. من ئەو هەفتەیە پشوو وەردەگرم تا بتگێڕم و بە ئێرەت ئاشنا بکەم." ئەو بە خاولییەکی تەنک ئارەقەی دەموچاوی سڕیەوە. ئینجا درێژەی بە قسەکەی خۆی دا: "جلی مەلەش لەگەڵ خۆت بێنە. فانیلەیەکیش بێنە، ئاخر ئاوهەوای کەنەدا شێتە."

"من جلی مەلەوانیم نییە. وێڕای ئەمەش، ناخوازم پێستم بدەمە بەر تاوێ. ئەرێ ئەو کۆمپانیایەی تۆ کار دەدەنە کەسانێکی بەدەر لە ئەندازیاری کۆمپیوتەر؟"

"کۆمپانیاکە پێکهاتووە لە بەڕێوبەرێکی جێبەجێکار، کە هیچ ناکا و شەش ئەندازیارەکانی بەردەستی هەموو کارێک ڕادەپەڕێنن. لێ لە هەفتەی داهاتوودا بۆت دەپرسم. ئەمڕۆ ڕۆژێکی خۆش بەسەردەبەین."

"زۆر چاکە." چاوم گێڕا و پاشان ملم دا. دانیشتمەوە و بە قامکم ئاماژەم بۆ سینگە دەرپەڕیوەکەی ئەو کرد. "کەواتە پێویستم بە جلی مەلەوانییە. تۆش پێوستت بە مەمکدانێک هەیە."

ئەویش پێکەنی و ژوورەکەی جێهێلا. "ئیمە لەسەر ڕێی خۆمان جلی سەر کەنار دەکڕین.

گوێم لێبوو دوشەکەی کردەوە. ژوورەکە هەم گەورە بوو هەم ڕێکوپێکیش، بەلام پەنجەرەی تێدا نەبوو. منیش دەستم لە چۆکان وەرێنان. باشە چۆن دەبێ ژوورێکی وەها بێ پەنجەرە بێ؟ ئاخر چۆن یەکێک لەم ژوورە بەبێ ڕووناکی و هەوا دەژی؟ چلچرایەکی برۆنزی بە خۆیی و هەشت گلۆپی شۆڕبووەوەی بە بنمیچی ژوورەکەدا هەلواسرابوو، ئاخر خۆ ئەمە جێگەی تیشکی ڕۆژی نەدەگرتەوە. هیچ دەمژمێرێکیش لە ژوورەکە نەبوو، ئیدی نەمدەزانی کاتیش چەندە. شاشەی تەلەفزیۆنە ڕەشەکە، کە لە بەرانبەر سیسەمەکە دانرابوو، جەستەی منی بە شێوەیەک ڕەنگدایەوە وەک ئەوەی ئاوێنەی مالۆچکە پێکەنیناوییەکان بێ، ئیدی خۆم وێکهێنایەوە تا مەودایەکی کەمتر بگرم. زمانم لە وێنەکە دەرهێنا، شاشەکەش

هەمان کردەی منی ڕەنگدایەوە. پلەی ستێیشنێک و بارستەیەک کتێبی کارتۆنی[170] لە بن تەلەفزیۆنەکە دانرابوون.

پێخەفەکەم ڕێکوپێک کردەوە و ئینجا سەیری دۆلابەکەی لای ڕاستم کرد. ئەویش زۆر بە دروستی ڕێکخرابوو، جلوبەرگەکان بە گوێرەی وەرزەکان بە عەلاگەکانەوە کرابوون، لە سەرەوە بۆ خوارەوە دانرابوون، جینز و چەرچەفەکان قەدکرابوون، وایەر و کەلوپەلە ئەلکترۆنییەکانی دیکە بە جوانی لە نێو سندوقی خۆیدا دانرابوون، چەندین بوتڵە وێسکیش ڕیزکرابوون. کە بینیم بوتڵەکان وەها ڕاشکاوانە ڕیزکراون هیکەکم لەخۆ گرت[171]. ئۆ، خۆ مرۆڤ لێرە لەسەر ئەوانە قامچیکوت ناکرێ، ئیدی وەبیر خۆم هێنایەوە. جانتاکانیشم بە وریاییەوە لە پەنا دیوارەکە دانرابوون، ڕەفەکانی سەرووش بە تاڵ و حەتاڵ بوون. مەراق بووم بزانم ئاخۆ ناو سەری کارۆش بەم شێوە ڕیکوپێکە خانەخانە کرابێ، تا بە شێوەیەکی کاتی گۆشەیەکی بۆ خوشکی برادەرە مردووەکەی تەرخان کردبێ. منیش بە ئیرەیی بووم، لەو شتەی لەنێو دەرەوەی خۆم پڕ و ماندوو بووم.

"هەموو ئەم ڕەفانە بۆ تۆن، دەتوانم مەودای زیاتریشت بدەمێ ئەگەر پێویستت پێی هەبوو. هەندێ خاولیم لەوێ داناون، سابونیش لە چەکمەجەی حەمامەکە دایە. لەوێ لای دەستە ڕاست." بە دەم ئەم قسانەوە کارۆ لە پشت منەوە وەستا کە بیرم دەکردەوە بزانم چی

---

[170] comic books : کتێبی کارتۆنی: ئەو کتێبانەن کە ناوەرۆکی کتێبەکان بە وێنە و ڕستەی کورت کورت نووسراون.

[171] ئیدیۆمێکە واتە، شۆک بووم، سڵەمیمەوە.

له جانتاکەم دەربێنم و چی دەرنەهێنم. سابوونەکەی بۆنی داری سەندەلی دەدا.

"منیش ئاماژەم بۆ بنمیچەکە کرد و گوتم: "دەنگی ئەو تەپەیە چییە؟"

"ئەوە دایکمە لەسەر ئامێری غاردانە. هەرقلی ڕاهێنەری بەسەریدا دەنەڕێنێ. ئەو لە من زیاتر پێویستی بە مەمکدانە."

منیش کەلوپەلەکانی حەمامم بە سینگمەوە گرت و ڕووم لە ڕێرەوە تەنگەبەرەکەی ژێرزەمینەکە کرد. لەوێ و لە قوژنەی کۆتایی پەنجەرەیەکی لاکێشەیی بچکۆلە هەبوو، ژووری جلشوشتن و حەمامیشی لای دەستە چەپەوە بوو. دەنگی وڕەوڕی گەسکی کارەباییش دەهات، مێشکم سەرقاڵی ئەوە بوو ئاخۆ چۆن دایکی کاری خۆی دەکا و گسکیش لێدەدا.

کاتێکیش بە تەڕوتازەیی لە حەمامێ هاتمەدەر، ژنێکی دەم بە خەندەم بە خۆی و گوپی پڕەوە بینی لە خوارووی پلیکانەکان ئەو ناوەی گسک دەدا.

ئیدی ئێمە خۆمان گۆڕی و بەرەو وێستگەکە بەڕێکەوتین. لە ماوەی گەشتەکەم بە میترۆی ژێرزەمینەوە ئاهێکم پێداهاتەوە، ئاخر بینیم هەر من بێگانە و تەنیا نیم، هەر منیش نیم فێری زمانی ئینگلیزی دەبێ. هەندێ لە ڕێبواران بە زمانی جیاواز جیاواز قسەیان دەکرد، ئەمە هەستێکی وەهای لا دروستکردم کە من هەر لە وڵاتێکی نوێ نیم بەڵکو لە یەک کاتدا لە چەندین وڵاتم. مێردمنداڵێک لەوێ بە پێوە وەستابوو، بە ڕەوانی ئینگلیزی دەزانی، کەچی سەروسیمای

تێکەڵەیەکی ئاسیایی و ئەورووپی و ئەفریقایی بوو. لە کارۆم پرسی: "ئەرێ دەکرێ لە دۆزینەوەی کارێکدا یارمەتیم بدەی؟"

"لەیلا، تۆ هەر بیست و چوار سەعات دەبێ هاتوویتە ئێرە. ئێمە دەبێ یەکەم جار کاروباری نیشتەجێبوونی تۆ لێرە جێبەجێ بکەین. تۆ ناتوانی لەم وڵاتە بە بێ کارتی بیمەی کۆمەڵایەتی[١٧٢] کاربکەی. هەروەها کاری ڕاستەقینەشت ئەوەیە خۆت بۆ تاقیکردنەوەی ئینگلیزی ئامادەبکەی، لیستێکیش بۆ ئەو زانکۆ نزیکانەی ئەم دەروروبەرە ساز بکەی، کە خوێندنی فیلم و سینەمایان تێدا هەبێ."
پێنەدەچوو کارۆ زۆر ئاسوودە بێ، بەڵام ئەوەشی خستەسەر، کە بە خۆشییەوە ئامادەی یارمەتیدانە.

لەو نزیکانە؟ ئاخر من ئامادەی خوێندنی هەر زانکۆیەکی کەنەدی دەبم کە کۆمەکێکی دارایی پێشکەش بکا، جا نزیک بێ یان دوور.
"کەواتە وەڵامەکە نەخێرە؟ بۆ دۆزینەوەی کارێک یارمەتیم نادەی؟"

"ئەرێ بۆ وا بێ حەوسەڵەی؟"

"ئاخر دەمەوێ قەرەبووت بکەمەوە"

"باشە، بیکە، بەڵام بۆ بەم پەلە پەلە؟ تۆ ژیانێکی دووروودرێژت لە بەردەمدایە تا وەها بکەی. خۆ دەتوانی یەکەمین فیلمی خۆتم

---

[١٧٢] ئەم دەستەواژەیەم لە بەرانبەر social insurance number داناوە. ئەم سۆشیال ئینشورانس نەمبەر یان - لە ئەمریکا - سۆشیال سیکوریتی نەمبەرە بریتیە لە کارتێک کە ژمارەیەکی تایبەتە ئەو کەسەیە و دووبارە نابێتەوەو ناگۆڕێت، بیمەی کۆمەڵایەتی مۆڵەتی کارکردنە و تۆماری هەموو داهات و کرێدت و سەرپێچیی یاسایی و دارایی و مافەداراییەکانی وەک خانەنشینی، هەر کەسێک ئەو ژمارەیەی نەبێت ناتوانێت بە شێوەیەکی یاسایی کاربکات.

پێشکەش بکەی. باشە ئەوەت پێ چۆنە؟ ئەمەش قەرەبووکردنەوەیەکی دەستکراوەییانەیە."

کاتێکیش قیتارەکە لە تونێلەکە هاتەر دەر، ڕاستەوخۆ دەنگێکی ژنانە جاڕیدا: "گەیشتینە ڕۆسدێیل، وێستگەی ڕۆسدێیل." ئەوەبوو لە یەک کاتدا فارگۆنی قیتارەکە پڕ بوو لە دەنگی فیکە فیک و ئاماژە و پیپەپیپی تەلەفۆنەکان، چونکە ئاماژەی یانتنی مۆبایل هاتەوە. دەرگایەکە کەوتە سەر گازی پشت، پیاوێکیش بە شەپقەوە سواربوو، سەریشی لەبەر ڕیتمی ئاوازێکەوە دەهەژاند، هەستێکی وەهام لا پەیدا بوو گوێم لە موزیکەکەی بووبێ. گەیشتینە وێستگەی دانداس و دابەزین، لەوێ ئاپۆرای خەڵک دادەبەزین و سەردەکەوتن و مێردمنداڵانیش ڕایان دەکرد.

لەوێ کارۆ گوتی: " دەنا هێشتا کاتی گوڕدەم[173] نەهاتووە."

"کەواتە ئەدی سەعاتی گوڕدەم کەنگێیە؟"

"لەم ڕۆژانە لە تۆرنتۆ هەموو ڕۆژەکە هەر وایە."

"پەکوو! لە تارانەوە هاتووی و گلەییش لە گوڕدەمی هاتۆچۆی ئێرە دەکەی؟"

دەموچاویشی بە خەندەیەکی جوامێرانە گەشایەوە. لە بەر تیشکی ڕۆژدا نیلییەکەی چاوی ڕەشتری دەنواند. "پێموایە چاوەڕوانییەکی زۆرم لە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو هەیە."

---

[173] گوڕدەم: تەوژمی ئاپۆرای خەڵک، ئەوکاتەی خەڵک بۆ سەر کار دەڕوا یان لە کار دێتەوە، ئیدی وێستگەکانی زۆر سیخناخ و جەنجاڵ دەبن.

بەسەر پەیژەکاندا بە لارێدا سەرکەوتین، لەوێ پیاوێکی پەڕپووتی پرچ پەرشوبڵاوی درێژمان بینی، هەگبەیەکی درێژی بە شانی چەپییەوە کردبوو، لە نێو تەنەکەی زبڵدا بە دوای شتدا دەگەڕا. "ئای خوایە، هەژاری لە هەموو شوێنێکدا هەیە، تەنانەت لە کەنەداش؟"

"مەبەستم ئا ئەمە بوو، چاوەڕوانییەکان." بەدەم ئەم قسەیەوە قۆڵە ڕووتەکەی گرتم، بەمە یەکسەر پلەی گەرمییەکەشم هەڵکشا. "ئەمە گۆڕەپانی دەنداسە."

سووڕامەوە، چەندین باڵەخانەی گەورە و بێشومار تابلۆی ڕاگەیاندنیشم بینین. جووڵەی وێنەیەکی گەورە لە سەرووی باڵەخانەی H&M دا نمایشی کچانێکی کەمخۆری دەکرد لەبن بیکینیدا و لەسەر کەناراوەکەدا غاریان دەدا و وەستان تا وێنەیەک بگرن. هەر ڕاستەوخۆش دوای ئەوە لەسەر کەنارەکە دەستیان بە ڕاکردن کردەوە. دیسان و هەر دیسان دووبارەیان دەکردەوە.

ئێمە لەسەر ڕۆیشتنمان بەرەو لای خوار لە سەر شەقامی یەنگ ستریت بەردەوام بووین و چووینە نێو موغازەیەکی گەورە، پێی دەگوترا زە بێی[١٧٤] بە مانای گەرووەکە تا جلی مەلەوانی بکڕین. من دانە جلێکی زەردباوی مەلەوانیی سەر کەنارم لێگرت لە ڕەنگی ڕۆژ بێ؛ ئەم دانەیەیان لە هەموو ئەوانی دیکە لە جامخانەکەدا نمایش کرابوو، باشتر جەستەی دادەپۆشیم. لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆش بوو ناچار نیم سەرپۆش بپۆشم، بەڵام بەوەی کە بە جلی مەلەوانی لە شوێنێکی کراوەدا بسووڕێمەوە ئاسوودە نەبووم، بە تایبەتیش لە

---

[١٧٤] The Bay

بەردەم کارۆدا، چونکە ئێستا دەزانێ جەستەم چەند لەڕولاوازە. هەرچەندە ژەمە خۆراکەکانی جوانە یارمەتیدام هەندێ گۆشت بگرم، بەڵام هێشتا هەر بەسەر خۆمدا دەشکامەوە. ئۆو بەڵێ، خۆ ئەمە هیچ لەشتەکەی نەدەگۆڕی. خۆ هاویشتنە نێو دەریاچەیەکی ڕاستەقینە و بناولێدان ئارەزوویەکی لەمێژینەی من بوو. دەبووایە ئازا بم. من ئازا بووم. تا ئەوکاتەی لولەی دەمانچەیان نەخستە سەر هەنیەم، نەدەپەشۆکام.

لە ژووری خۆگۆڕین هاتمەدەر و سەیرێکی ئەو ناوەم کرد، سەیری ئەوانەم کرد کە سەرقاڵی شت کڕین و فرۆشتن بوون. مەراقمام، تۆ بڵێی کەس لەمانە دەمانچەی لەسەر نێوچاوان ڕاگیرابێ. لە وڵاتێکی تەژی لە پەنابەر و کۆچبەر، ناکرێ بەسەرهاتەکەی من لە هەموویان سامناکتر بێ.

کارۆ دەرکەوت، ئەو دوو خاولی سەر کەنار و دەرپێیەکی مەلەوانی لەسەر باسک دانابوو. بەدەم گوتنی "دەی با کەنێدیان تایەر بدۆزینەوە" بەمانای تایەی کەنەدی[١٧٥]، ئینجا جلە زەردە مەلەوانییەکەی بردم و بەرەو شوێنی ناونووسینەکە ڕۆیشت.

منیش تێنەدەگەیشتم بۆچی لەسەر کەنار پێویستمان بە تایە دەبێ. دەرچوو پێویستمان پێی نەبوو، خۆ ئەوە تایە نەبوو، بەڵکو فرۆشگایەکی کەنەدی گەورە بوو. بە داڵانەکەدا ڕۆیشتین بینیم ژنێک کراسێکی ڕەشی نەگونجاوی لەبەردایە، لینگێکی پانتلۆکەی هەڵکشاوە و ئەوی دیکەشیان داکشاوە، لە ئاوێنەکەدا دیارە بە شانەیەک قژە خوڵەمێشییەکەی دادێنێ و پێدەکەنێ. تاگێکی سەوز

---

[١٧٥] Canadian Tire

لەسەری نووسرابوو ٥.٢٥$ هێشتا هەر بە شانەکەوە هەڵواسرابوو. کارۆ دەستێکی لەسەر شان دام. منیش ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە، لە ئاوێنەکەدا گۆشە بێ ددانەکەی ژنەم بینی بە بەرینی دەموزاری بریقەی دەدایەوە. بە کارۆم گوت: پێموابێ ژوانی هەیە." ئەویش ئاوڕێکی دایەوە ئاخۆ باسی کێ دەکەم. "پێدەچێ لەگەڵ ئەو پیاوە پەڕپووتەی لە دەرەوەی وێستگەی میترۆدا بینیمان."

ئەویش پرسی: "ئەرێ ئەو جۆرە بیرۆکانەت لە کوێ هێناون؟" ئیدی تیروتوانجی بەردەوامی چیام سەبارەت بە بیرۆکەکانم بیرکەوتەوە، بۆیە دڵم کەوتە کوتەکوت.

کاتێ بە ڕاڕەوەکە بۆ لای تۆمارکەرەکە ڕۆیشتین، چاوم لێ زەق بووەوە. "لەو هەموو قەڵەمڕەنگە ڕەنگینانە! ئەو هەمووە. سەیری ئەولا بکە، پێنج پلەی سوور! بە سەدان قەڵەمڕەنگ." ئەویش لێم ڕاما، خەریک بوو لە شوێنی خۆم بکەومە هەلەکەسەما، قۆڵم بجووڵێنم و سمتیشم بە لای ڕاست و چەپدا بابدەم. پێمگوت: "گرەو دەکەم تۆ بە منداڵی عەوداڵی کڕینی دانەیەکی وەها نەبووی." ئیدی دەستەیەکی سەد پارچە قەڵەمڕەنگم بە تەنیا بە سێ دۆلاری کەنەدی کڕی.

لەسەر لێواری ئاوەکە، بۆ سواربوونی کەڵەک[١٧٦] بۆ ماوەیەک لە ڕیزدا وەستاین. سەیری خەڵکم دەکرد بە لاماندا تێدەپەڕین ئاسوودە و بێباک بەو جلانەی بە کەیفی خۆیان لەبەریان کردبوو. حەزم لێ

---

[١٧٦] نووسەر وشەی ferry بەکارهێناوە، مەبەست بەلەمێکی سەرکراوەیە، زیاتر لە کەڵەک دەچێ، بەڵام کەڵەکێکی هاوچەرخ.

بوو ڕایانبگرم تا لێیان بپرسم ئاخۆ ئاسودەن کەوا لە کەنەدا دەژین، بەڵام پێدەچوو ئەوەندە دڵخۆش نەبن وەک ڕەچاوم دەکرد. بە گوێرەی ئەوەی لەو ساعاتەی دوایی تێبینیم کرد، خەریکبوو لە هۆکارەکە تێبگەم.

بە کەڵەک بەرەو ناوجەرگەی دوورگەکە پەڕینەوە، بەسەر دەریاچە جوانەکەی تۆرۆنتۆدا، کە لە زرێبار دەچوو، ئەو دەریاچەیەی ناوی ئۆنتاریۆ بوو، بەڵام بە پێچەوانەی زرێبار بناوانەکەی تەلیسماوی نەبوو. ئاو لە ژێرەوە لەبەر تیشکی ڕۆژدا زیوئاسا وەک ئەوەی لە هەزار ئاوێنەدا ڕەنگبداتەوە بریسکەی دەدایەوە، ئەمەش زۆری دڵخۆش کردم. کاتێکیش کەڵەکەکە لە شار دوور دەکەوتەوە، سەیری دواوە، سەیری هێڵەکانی ئاسمانم کرد، ئیدی تاوەری CN تا دەهات لە ئاسۆدا بچووک و بچووکتر دەبووەوە.

دوورگەی مەڵبەندەکە ماوەی دوای نیوەڕۆ تا ئەنگۆرە خانەخوێ و جێی حەوانەوامان بوو. منداڵان لەو ناوە دەهاتن و دەچوون، بە قاقای پێکەنینەوە گەمەی خۆیان دەکرد، ئەمەش ڕۆژانی منداڵیی سەر گۆلی زرێباری هێنامەوە یاد، ئەو کاتەی سەرەتا لەگەڵ شلێر پاشانیش لەگەڵ چیا غارمان دەدا.

بە دەم ئاوڕدانەوە ئاماژەیەکم کرد و گوتم: "سەیرکە ئەو پەڵە هەورە لە مەیمونێکی بچکۆلەی قۆشمە دەچێ."

ئێمە دوو پاسکیلمان بەکرێ گرتن و بە لێواری گۆلەکەدا خولێکمان لێدا. باش لە پرچ و دەموچاوی دەدام. "سەیری ئەو ئاشە بکە." کارۆ ئەمەی گوت و لەپاڵ مندا پاسلیکیشی لێدەخوڕی.

خۆ ئەگەر هاتبا و ئاخوندەکان پاسکیلسواریان بۆ پیاوان بە شتێکی نەشیاو دانابا ئەوا ئەویش وەک من ئێستا دەیگوت: "بیست ساڵ دەبێ پاسکیلم لێنەخوڕیوە."

منیش پاسیکلم دوور لێخوڕی. *ئەرێ چیا ئێستا لە کوێی؟ ئا لەم چرکە ساتەدا لە کوێی؟* حەزم دەکرد بتدیبام، *کە لەگەڵ هەر پەیدان لێدانێکدا وا منداڵتر دەبمەوە، ئەو ساڵانەشیان لێدەستێنمەوە کە لێیان دزیوم.*

ئەوەندە خێرا پەیدانم لێدا، هەستم کرد وەک ئەوەی با منی دابێتە بەر زللان، بەڵام گوێم نەدایێ، خێراتر لێمخوڕی و فرمێسکیش بە سەر گۆنامدا داباریێ. *چیا دەبووایە بە دوای مندا پاسیکلت لێخوڕیبا. بەڵام تۆ ئێستا لە شوێنێکی هیچ دەستێک ناتگاتێ، هەرچەندیش بە دوای تۆدا خێرا لێیبخورم....*

من نەوەستام تا بە تەواوی هەناسەم لێبڕا. کاتێکیش ئاوڕم لە پشتی خۆم دایەوە، کارۆ لە هیچ شوێنێک دیار نەبوو. ئینجا بە هێواشی پەیدانم لێدایەوە بەو ئاراستەیە گەڕامەوە کە لێیەوە هاتبووم، بەڵکو بیبینمەوە، زۆریش لەوە دەترسام بە ئینگلیزی پرسیاری ئاراستەی شوێنێک لە کەسێک بکەم، زۆریش خۆم بە خەتاباردەزانی بەم جۆرە کارۆم بەجێهێشتبوو.

ئەوم لای کۆشکی بەکرێدانی پاسیکلەکان دۆزیەوە، لەسەر بەردێک دانیشتبوو، بە دارێک لەسەر قیرەکە یادەوەریی خۆی دەنووسییەوە، کە تەنێ خۆی دەیبینی چ دەنووسی..

"زۆر داوای لێبوردن دەکەم." بە خۆم بەسەر خۆم هێنابوو.

ئەویش سەرێکی پێش خۆی و ئاسۆشی کرد. ئێمە پاسیکلەکانمان گەڕاندەوە، لە ڕێگەی خۆمان لە شوێنی تایبەت بە خۆگۆڕین، جلی سەر کەنارمان پۆشی و چووینە بەر گەرمای کەنارەکە. بە پێی پەتی ڕۆیشتم تا هەست بە لمەکە بکەم، کە بەنێو پەنجەکانی پێم پاندەبنەوە، بەڵام هەستی بەوشێوە ڕۆیشتنەش هەنگاوەکانی خاوکردمەوە. سەرنجی پیادەڕۆیانی سەر کەنارەکە ختووکەی پێستی دەدام.

خاولییەکانمان لەسەر لمەکە ڕاخست و لەسەری دانیشتین. بێدەنگی. ڕاشکاوانە لە ژیانی دەوروبەرم ڕامام: مەلی سەر کەنار، منداڵ بە کەیفوسەفای خۆیان، هەراشەکان بێ جووڵە لە ژێر تیشکی خۆر، هەندێکیان لەبەر ڕادیۆکەیان سەریان دەهەژاند، هەندێکیان دەیانخوێندەوە هەندێکیشیان بۆ چاوگەرم کردن لەسەر زگ کەوتبوون.

جووتەیەکی تەمەن مامناوەند لە نزیکمانەوە لەسەر گردێکی لمین دانیشتبوون. ژنەکە پارووە سەندەویچێکی بچکۆلانەی لە دەمی هاوتایەکەی نا. پیاوەکەش قەپاڵی لە پەنجەی ژنەکە دا. ژنەش پێکەنی. پێکەنینی ژنێک بە دەنگێکی بەرزتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا. تۆبڵێی لێرە ڕێگە بە ئاستێکی وەهای دەنگهەڵبڕینی مێینە بدرێ؟ من سەیری دەروبەرەکەم کرد و بە خەیاڵ پۆلیسی ئەمر بیلمەعروف و نەهی عەن مونکەرم هێنایە بەرچاو، کە لەسەر کەنارەکەدا بگەڕێن، بە پەلەپرووزێ بۆ لای ئەو ژنانە بچن، ئەوانەی بە توێی شۆرتێک و مەمکدانێکەوەن. هەڵبەتە ئەوان لێرە لەسەر ئەم کەنارە نابینرێن.

لەسەر پشت لەبن ئەو خۆرەتاوەدا، بە سەیری ئەو دیمەنەوە، خەڵک بە شادی و پاڵدانەوە و دەمارخاوی دەبینرێن، هەستم کرد مردووم، دوای ئەوەش بە شێوەیەکی ڕەچاونەکراو گەردنم ئازادکرا و لێخۆشبوونم بۆ دەرچوو، ئێستاش خراومەتە بەهەشتێ. دیاربوو بۆ باقی ئاپۆرای خەڵکەکە، بەهەشتەکەی من هەر ڕۆژێکی دیکەی خۆشی ئەوان بێ.

چەندین جار چاوم کەوتە سەر کارۆ، ئەویش نیگای لە سینگ و بەرۆکم بڕیبوو. "لە دواییدا لێی هاتمەدەنگ: "ئەرێ ئەوە تۆ سەیری چی دەکەی؟"

"ئاها، پێم وابێ دەبێ کرێمی دژە خۆر لە خۆت بدەی."

"من وا دەچم...." هەڵسام و ئاماژەم بۆ گۆلەکە کرد.

"دەتەوێ مەلە بکەی؟" ئەویش جووڵا تا هەڵسێ، لە دۆخێکی سەیری چەقبەستوودا بوو، لەپی دەستی لە سەر زەوی و سمتیشی بەرز لە هەوا.

"ئممم..." پێویستم بەوە بوو تەنیا بم.

"ئاها، باشە، دەی بڕۆ." ئەو دانیشتەوە و بە لەپی دەستی لمەکەی لە خۆی داماڵی.

شەپۆلەکان منیان بۆ خۆ کێشکرد، منیش خواخوام بوو هاوسەنگییەکەی خۆم ڕابگرم. وردەلم بەری پێیە ڕووتەکەمیان ختووکە دەدا. خۆم بە ئاودا دا و هەستمکرد بەشێکم لە مەودایەکی بێ کۆتایی، پەیوەست بە ڕۆژ و ئاسمانەوە. خۆم دایە دەست تەنکاو، لێگەڕام ئاو لە هەر چوار دەورم بێ وەک دایکێکی دلۆڤان

چۆن کیژە بیمار و ماندووەکەی لە باوەش دەگرێ. خۆ هەر هیچ نەبێ کچی دایکە سروشت بووم.

کاتێکیش گەڕامەوە لای کارۆ، خاولییەکی تێوەرپێچام.

ئینجا ئەو خۆی خستە سەر زگ و گوتی: "دەکرێ هەندێ کرێم لە پشتم بدەی؟"

منیش لە تەنیشتی دانەویمەوە، هەوڵمدا پشتی بە کرێمەکە بهەنووم[177] و خۆشم لە موچڕکەکانی بنزگم نەبانکرد. پێستەکەی ئەو نەرم و گەرم و شێدار بوو، ماسولکەکانی ڕەق و توند، مل و شانیشی لەبەر تیشکی خۆر سوور هەڵگەرابوون. "دەبووایە کرێمێکی سپرامان هێنابووایە." ئینجا قتووی کرێمەکەم دایەوە خۆی تا باقی جەستەی خۆی بە خۆی بهەنوێ.

ئەویش پرسی: "وشک بوویتەوە؟"

"من پێویستم بە کرێمی دژەخۆر نییە."

"بەڵێ پێویستت پێی هەیە، مەگەر هەموو شەوێ پشتی خۆت ئەوەندە هەڵبکرێنی تا بریندار دەبێ."

پێستم لە بن پەنجەکانی ختووکەی دەهاتێ. کاتێکیش هەردووکمان بە کرێم خۆمان هەنوو، بە دوایدا بەبێ ترس لە شەپۆل گەڕامەوە نێو ئاوەکە. بە یاریی هەڵدانی دەفری هەواییەوە خەریک بووین تەنگوچەڵەمەکانی ناوخۆم لەبیرچوو. بە هەژاندنی پرچی سەری دڵۆپە ئاو بە دەموچاوی دەکەوتن، بەو چاوانەشی کە تەماشای خۆری دەکرد، کارۆ بووبووە زەبەلاحێکی نایاب.

---

[177] هەنووین: چەورکردن.

کاتێک بۆ شەوە گەڕاینەوە ماڵەوە پێمگوت: "کارۆ تکایە، من هەست دەکەم داگیرکەرێک بم. من زۆر بەوە ئاسوودە دەبم لێم بگەڕێی لەسەر زەویەکە بخەوم نەوەک سەر سیسەمەکە."

بەدەم وتنی "شەو شاد"ەوە بەتانییەکەی بەسەر سەر دادا و زۆری پێنەچوو دەنگی هەناسەدانەوەی نیشانەی ئەوە بوو خەوی لێکەوتووە. منیش دیسان لە بنمیچەکە ڕامامەوە تا چاوم شەکەت بوون.

بۆ ڕۆژی پاشتر بەسەر تاوەری CN کەوتین، زاتی ئەوەمان کرد لە شوشەبەندی سەرووی پاڵبکەوین. لەوێ وێنەمان گرت و پارەمان خستە نێو تێلسکۆپەکە تا وێنەی گەورەکراوی شارەکە ببینین.

لە نێو ئاسانسوارەکەدا کارۆ دەستێکی خستە سەرشانم و گوتی: ڕۆژێکی خۆش بوو؟" هەستم بە هەناسەی کرد لە دەموچاومی دەدا.

"ئۆو، من لەو ڕۆژەوە دیمەنی شادمانییم یاد ناکەوێتەوە... خۆت دەزانی." لەو ڕۆژەی تۆ داوات لە براکەم کرد تا لەگەڵت بێتەدەرەوە. منیش دەستم لەسەر دەستی دانا، بەڵام تەنیا بۆ ئەوەی دەستەکەی لەسەر شانم لاببەم. ئینجا کامێراکەم لێوەرگرت تا وێنەی خۆمی پێبگرم و یادەوەرییە پڕ ئازارەکانیش وەک قونکە جگەرە بخەمە ژێر پێڵاوکانمەوە.

بۆ ڕۆژی سێیەم مەزنێتی تاڤگەکانی نایاگارام بینی، کە برینە بچووکەکانمی شەرمەزار کرد. هەستم کرد سەرپۆشی سەر هەستەکانم هەڵگیراوە. ئەو هێزە شەڕانگێزەی ژیانمی تارکردبوو خەریکبوو پاشەکشەی دەکرد. ئەو شەوە خەونم بینی، سینگم

ئاوسا. سینگم شەق بوو، قەقنەسی لێهاتەدەر و لە شەقەی باڵیدا و هەڵفڕی.

بە کۆتاییهاتنی هەفتە، کاتێک بەنێو گوڵزار، بەنێو گوڵە زەمەق و ئەتڵەسدا لە باخچەی موزیک لە پارکی وێست ئێند پیاسەم دەکرد، ناسۆرە قەبەکەی سەر سینگیشم خەریک بوو وێک دەهاتەوە. لەو هەفتەیەدا سەیری ئەو دیمەنە گەشتیارانەیە ئارامیم بۆ گەڕایەوە. تۆ بڵێی من بەسەر مێژووەکەمدا بکەوم؟ لە قاوەخانەی ئالن گاردندا، ئەو کاتەی کارۆ چووە ئاودەستێ، من لەسەر دەستەسڕەکەم نووسی: *وێڕای دڕندایەتی مرۆڤ، کەچی دار و گوڵ لە چڕۆکردنی خۆیان ناکەون، تۆ بڵێی منیش وەها بم؟*

کارۆ زۆری پێچوو، منیش هەراسان بووم. لە قاوەخانەکە هاتمەدەر، بۆنی گوڵانم هەڵمژی. دەستم لە خونچەی گوڵەڕەز دا، لەمێژە و بۆ یەکەمین جار بوو هەستمکرد بە لێدانی دڵم لە ڕێی بازند و سەرپەنجەکانمەوە کرد. ئاخر پێشتر سەرنجم نەدابوو چەند شڕ بووبوم. کارۆ بە خۆی و خەندە پڕبەدەم و جوانەکەیەوە لەپێشمەوە قیتبووەوە و سەرسامی کردم.

شێوەی ڕەشی مەلان، لە هێڵەکانی ئاسمان لەبەر تیشکی خۆردا هەڵکەنران. لە بەردەم چاوە مشوورخۆرەکانی کارۆدا، لەوێ لەسەر چیمەنە شێدارەکە ڕاکشام. شێنە ئاوێکم پێکەوت. دەستم لە سەر برژانگم داناو بە ڕژانی ئەو دڵۆپە ئاوانەی سەر دەموچاو و پرچم دڵخۆش بووم. کاتێکیش چاوم کردەوە، دارەکان کەسکتر بووبوون، ڕەنگی زەرد و سووریی گوڵەڕەزەکانیش ڕەونەقدارتر.

هاوارێک له گه‌روومه‌وه ده‌رهات، هاوارێک له‌مێژ بوو خه‌فه‌کرابوو.

## بەندی سی و شەش

من و کارۆ سەبارەت بە خۆپارێزیمان لە یەکدی سەرڕەقانە هەموو دانپێدانانێکمان ڕەتکردەوە. هەموو ڕۆژێک کاتێ ئەو کراسەکەی لەبەردەکرد یان بە خاولییەکی لە خۆوەرپێچراو دەهاتەوە ژوورەوە، کەمێک زیاتر لێم دەڕوانی و چاوم لەسەری بوو. هەموو شەوێکیش کاتێک لە سەر دۆشەکەی بەرپێی من پرخەی دەهات، گوێم لە جەستەی خۆم دەبوو تاسەی ئەوی دەکرد.

من زۆر بە هێزی ئیرادەی ئەو سەرسام بووم، لێ هێشتاش مەراقبووم بزانم ئاخۆ کێشەی هەیە یان لەوانەیە قوفڵەکەی گرتبێتەوە. تۆ بڵێی ئەوەندە نەریتپەروەربێ تا وەها دابنێ، کە دەستلێدانی پێش ژن و مێردایەتی بەمانای بەکارهێنانی "ژن" دێت؟ شلێر و چیا وا ڕاهاتبوون بڵێن گوایە من لەو بارەیەوە زۆر کۆنەپارێزم. تۆ بڵێی کارۆ نیگەرانی ئەوەبێ کە من کێشەم لەگەڵ ئەوەدا هەبێ جووڵەیەک بکەم و دەستپێشخەر بم؟ هەرچی سەبارەت بە منە، هەر دەتوانم لە داڵغەکانمدا دەستپێشخەر بم، ترسام مەبادا داوا و لێکەوتەی لێبکەوێتەوە، ترسام لەوەی مەیلدارییەکەم تاکلایەنە بێ.

لێ گەلۆ، لەو وڵاتە جوانە خۆ هەر کارۆ بە تەنیا نەبوو گێژی کردبووم. وشەدانە ئینگلیزییەکەشم، کە لە خەیاڵی خۆمدا بە ئاسانی بە کارم دەهێنا، کاتێ ڕووبەڕووی ئاخێوەرێکی خودی زمانەکە دەبوومەوە، دەشێوام. ئاخر گوێم بەم هەموو زاراوانە ڕانەهاتبوو،

گۆکردنە بەدحاڵیبونەکەشم دیوارێکی لە نێوان من و هەموو ئەو کەسانەدا دروستدەکرد کە قسەم لەگەڵ دەکردن. زۆریش شەرمن بووم لەوەی داوا لە بەرانبەر بکەم بەڵکو بە هێواشی بدوێ یان قسەکەی خۆیم بۆ دووبارە بکاتەوە، زۆر جار کۆتاییەکەم هەر پەشێوی و شڵەژان و بەدحاڵی و بەدلێتێگەیشتن بوو. شارەکەش لە خەڵکی تازەهاتوو جمەی دەهات، زۆر لە تۆرنتۆییەکانیش حەوسەڵەی ئەو ژمارە زۆرەیان نەبوو کە لەبارەی گونجان و پەیوەندیگرتنەوە کورتهێن بوون. هەر دەستکەوتێکی باوەڕبەخۆبوونیش لەنێو بۆتەی وشەدا، کە بە شێواوی گۆدەکرا دەتوایەوە. تەنانەت هەڵەیەکی بچووکیش وەک لە ڕێلادانی هێڵی قیتار مایەی بێهودەیی و تێکشکان بوو. تەنانەت کردنەوەی دەرگاکانیش مەتەڵێک بوون بۆ خۆی؛ ئاخر لە ئێران وا ڕاهاتبووین هەر لە لایەکەوە بچینە ژوور، بۆیە لێرەش کاتێ دەگەمە بەردەم دەرگایەک، خۆڕسکانە ڕایدەکێشم لە جیاتی ئەوەی پاڵی پێوە بنێم.

بۆ شەوەکەی کاتێ کارۆ خەوی لێکەوت، من بە بێدەنگی شیعرم دەگوتەوە تا پێڵووی چاوم قورس بوون. کاتێکیش چاوم داخست، هەموو ئەوەی لەپێش چاوم بوو، ڕوخساری چیا بوو. شەوێکیشیان ڕامگەیاند: "دەکرێ خۆگونجاندن فریادڕەسی ژیان بێ."

چیا کە بە مێرگێک لە گوڵە مێلاقە دەورەدرابوو پرسی: "ئەرێ ئازیزم چیتە؟"

"گونجاندن و ئەهلیبوون. پێتوابوو ئەمانە بزمارن لەتابوتی داهێنان دەدرێن و بکوژی پرسنین. خۆ ئەگەر هێزی لەگەڵڕاهاتن نەبووایە، دەمێک بوو لەپەلوپۆکەوتبووم."

"له شت ڕاهاتن مێشکخۆرەیە." ئێستا چیا له گۆلی زرێبار مەلەدەکا.

به قورسی پێم هێنایه خوارەوه. "مێشکیش دەپارێزرێ! ناهێڵێ بتەقێتەوه."

چیا پرسی: "ئەرێ ئەوە چییه تۆ ئەوەنده به ڕژدی دەتەوێ بیگەیتێ؟" هەنوکه ئەو له پشت شیشەبەندەکانه، چاوەکانی پڕ تاسەی ژیانه، چەناگه شکاوەکەی دەلەرێتەوه.

"دەی به تەنیا جێم بێڵه. لێمگەڕێ هەو بم. خۆشم دەوێی. من تۆم خۆش دەوێ، بەڵام لێمگەڕێ. ئاخر کاتێ لێتپاڕامەوه له ماڵ دەرنەچی و بمێنییەوه و به قسەت نەکردم. هەر گوێشت نەدامێ. لێمگەڕێ بژیم." که له خەو هەڵسام، گیانم کەوتبووه بن ئاو و ئارەقه، سەرم بەسەر سەرینەکەمدا گرت تا هەنسکەکانم خەفه بکەم. فرمێسکەکانم ڕژانه سەرینه لۆکەکه و تەڕیکرد. مەیلم لێ بوو بخزێمه نێو پێخەفی کارۆ و داوای لێبکەم توند بمگرێ تا لەزرم کۆتایی دێ، بەڵام ترسی لێکەوتەی ئەو جووڵەیه ڕایگرتم. ئاخر ئەوەی لەسەر ئەم دونیایه بۆم مابووەوه هەر دۆستایەتییەکەی ئەو بوو. پرخه بەردەوامەکەی ئەو ئارامبەخشترین دەنگ بوو.

له کۆتایی یەکەمین مانگمدا له تۆرنتۆ، من و کارۆ چووینه ئێرل بالس، پارکێکی پانوپۆڕ بوو زۆریش له ماڵەوه دوور نەبوو. خەسووم و برادەرەکانی بێ زەنگلێدان و بانگهێشتن بەدەرکەوتن، ئەمەش شتێکی له ناکاو بوو، ئاخر لەوەتەی هاتبووم له چاک و چۆنی و چەند کورته ڕستەیەکی دیکه قسەمان لەگەڵ یەک

نەکردبوو. منیش دەمزانی هەندێک گرفتی لەگەڵ کورد هەیە، کۆنەقینەکەی لە بەرانبەر مێردە هەڵخەڵەتێنەرەکەی و ڕێگربوون لە منداڵەکانی بۆ زانینی ڕاستیی ئەسڵونەسەبیان. پێموابوو نەفرەت لەو قەدەرەش بکا، کە من بوومەتە بووکی.

خۆی و دەستەخوشکەکانی سەرتاپایان جلی پیاسە و ئاڵووالآیان پۆشیبوو، خۆیان خەملاندبوو و خەریکی نمایشی لێوە سوورەکانیان بوون کە ڕەنگەکەیان لەگەڵ ڕەنگی نینۆکی دەست و پێیان هێنابووەوە، لەوانەیە پێش چوونیان بۆ ئاهەنگێک لای ئێمە لایان دابێ. ژنەکان گاڵتەیان بە کچێکی تازەی کلاسی یۆگایان دەکرد، کە مێردێکی دەوڵەمەندی هەبوو بەلام کەسیش لەبارەی ماڵبات و پاشخانەکەیانەوە نازانێ. گوتیان گوایە کچێکی بە فیز و پۆز بوو، بەم زووانە گەیشتووە، هەمیشە کتێبێکی لەبن هەنگڵ دایە و ئەوانی دیکە پشتگوێ دەخا.

بە ئاگاییەوە خۆم لە نیگاکانیان دەدزییەوە، خۆم لێ دادەبڕاندن تا ئەوان وەهای لێکبدەنەوە گوایە من کەسێکی گۆشەگیرم.

یەکێکیان بە تەوسەوە پلارێکی هاوێشت: "هەر خوا دەزانێ ئەو کچە خەریکی چییە، ئاخر هەمیشە ئەوانەی تەنیان، شتێک دەشارنەوە."

منیش یەکەمین قەپاڵم لە سەندەویچی سەلاتەی هێلکە دا، بەلام بینیم ڕەقە هی قوتدان نییە.

"ئەو ژنە بێ کەسوکارە[١٧٨]!" ئەوە خەسووەکەم بوو ئەو قسەی لە دەم دەرچوو. برادەرەکانیشی بەمە پێکەنین، بەڵام ئەو بۆتۆکسەکەیان ڕێگەی نەدان چاوەکانیان لێکبکشێنەوە، بۆیە ئاکاری گاڵتەجاڕانەیان کەمێک سامناک دەرکەوت.

پارووەکە لە دەمم غەزری[١٧٩]، نەیویست بە گەروومدا بڕواتەخوارەوە. ناونیشانی بێ کەسوکار، لە مێشکمدا واتای حیساب لەسەر نەکردن و بێ متمانەیی دەگەیاند. گەرووم تەنگ بوو، لە ڕێی کەپووشمەوە بە سەختی هەناسەم دەدایەوە، لە پڕێکەوە هەستم بە فشارێکی تۆقان کرد. بە نیگابڕین لە چاوی خەسووەکەم، هەوڵمدا بزانم ئاخۆ ئەو و دەستە خوشکەکانی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دادەبەزنە سەرم، وەک ئەوەی مرۆ لە ڕوانینی یەکەمەوە بۆی دەربکەوێ.

لێی نزبوومەوە، ڕقم لێی بووەوە. ئەو ژنانە ڕەگوڕیشەی خۆیان هەڵکەندووە و لەتاو دیکتاتۆر ڕایانکردۆتە کەنەدا، بێئاگا لەوەی خۆشیان بوونەتە ستەمگەر. خۆ ئەگەر چیا لە ژیاندا مابووایە، هیچ کەسێک نەیدەوێرا وەها بانگم بکا.

کارۆ پێکەنی، بە تەلەفۆنە دەستییەکەی قسەی دەکرد، بێ ئاگا لەو سوپایەی ئابلۆوقەیدابووم. منیش عوزرێکم هێنایەوە و خێرا لەوێ ڕۆیشتم. ڕابردوو بە هەموو دێوەزمەییەکەی خۆیەوە وەک ڕەوە مێشوولەیەک لەنێو سەرمدا دەخولانەوە. من زەڵاتەکەم ڕشاندەوە، لەسەر تەختەبەندێک دانیشتم، پشتم لە خەڵک و ڕووشم

---

[١٧٨] bi-kas-o-kar

[١٧٩] غەزرین: لەجێی خۆی وەستا، مانیگرت، ڕەتیکردەوە وا بکا.

له ئاوه پەنگخواردووەکە بوو. زۆر بە تاسەوە غەریبی چیام کردبوو؛ هەستمکرد بە خەنجەر لە گەرووم دراوە.

بۆ بەیانیی پاشتر، بەرلەوەی کارۆ لە خەو هەڵبستێ، ژێرزەمینەکەم بەجێهێشت بێ مرادانە بەنێو گوزەری بێی-ڤیو ئاڤینیودا دەسووڕامەوە، مەراق بووم ئاخۆ ئەو خەڵکەکە دەبینێ کە من لەحاڵێکدا خەنجەرێکم لەقوڕگ چەقێنراوە هەناسە دەدەم.

لەوێ لە قاوەخانەیەکی ناودار بە ناوی تایم هۆرتنس لای پەنجەرەوە دانیشتم و داوای قاوەیەکی تۆخی کەنەدیم کرد، بینیم چەند گەڵا لە دارەکان دەوەرین و دەکەوتنە سەر ئەو ترۆمبێلانەی لە بەردەم دەروازەکەدا وەستابوون. "ئەدی نەمگوت چەشنی مەلان بەپێی خۆت مەچوە نێو داوێ، وەرە کە هێز و تاوی فڕین و پەڕ و پێیەکانی تۆ منم، نەمگوت دەترفێنن، سۆز و میهرت لێدەستێنن، نەمگوت کە ئاور و ترپە و تینی حاڵی تۆ منم؟" لەبەر خۆمەوە ئەو هۆنراوەیەی مەولانام دەگوتەوە، لێ هیچ دڵنەواییەکی نەدامێ.

لەسەر کیبۆردی تەلەفۆنە نوێیەکەم ئەوەم تایپ کرد: "شلێر، ئەرێ تۆ لە کوێی؟ پێویستم پێتە. کارۆ منی مارەکرد و هێنا، بەڵام دەستم لێنادا، نەوەک لای وی ڕێزم نەمابێ. دایکیشی پێیوایە کوڕەکەی لە کچێکی بێ کەسوکاری وەک من خەسارە. من بە سەر ئۆقیانووسدا گوزەرمکرد تا تووشی ژان و ناسۆری جیاوازگەری ببمەوە، هەمان ئەو شتەی لەبەری هەڵاتبووم. داننان بەوەی مەیلێکم بۆ کارۆ هەیە هەستێکم دەداتێ دەڵێی ناپاکی لە چیا دەکەم. حاشالێکردنی ئەم شتەش درۆیەکی زەقوزۆپە. من پێویستیم بە جوانەیە، پێویستیم بە وڵاتێکە، پێویستیم بە تۆیە. ئەرێ تۆ لەگەڵ

دوندی کێوان چۆنی؟ ئەرێ هەموو ڕۆژێ هەر بۆمباباران دەکرێ؟ ئەرێ تۆش وازت لە گریانێ هێناوە؟ فرمێسکەکانی من مانیان گرتووە، ئاخر هەر جارێک دەڕژێن لایان دەبەم. ئەرێ ماڵەکەت لەسەر گردەکە چۆنە؟ ئەرێ هەر بە ڕاستی چیاکان دۆستی کوردن؟ ئای کە ئەم شکۆ ڕووکەشەی ڕۆژئاوا چەند نامۆیە."

"من تۆم لەو ناوە بینی، ئەرێ وا نەبوو؟" ئەو گۆرەوییە سوورانەی ئەو پیرەمێردە بە ڕوومەتە لەبەری کردبوون لە نێوان پێڵاوە ڕەش و دوولینگە شینەکەی بریقەیان دەهات. مەراق بووم بزانم ئاخۆ چاوەڕێی ئەوەم لێدەکا تا بۆی بسەلمێنم کە منی بینیوە. منیش سەری خۆم بادا، بە هیوای ئەوەی بڕوا و وازم لێبێنێ تا سەرم بەسەر ئیمێلەکەی خۆمدا بگرمەوە.

ئەوە بوو پرسی: "من لەم دەورووبەرە دەژیم، تۆش لەم نزیکانە دەژی؟"

"ببوورە، ئینگلیزی نازانم." سەیرێکی دەمژمێرەکەی پشتی کابرای سەر مێزی پارەوەرگرتنم کرد. هێشتا دوو سەعاتی دیکەم مابوو تا کلاسی وانەی ئینگلیزیم دەستپێبکا، هەر دەستبەجێش هەستم بە خراپیی خۆم کرد، کە قسەی ئەو کابرا ڕووخۆشەم ڕەتکردەوە. لەوانەیە ئەویش تەنیا بووبێ، بەڵام خۆ من لە میزاجێکی وەهادا نەبووم گوێ لە "بمبوورە" و "ئەمە چییە" بۆ ملیۆن جار بگرم. "ئینگلیزی نازانم" ئاسانترین ڕێگەی کۆچبەران بوو تا داوای ئەو خەڵکە ڕەتبکەنەوە، کە لەوانەیە لەدڵی خۆیان بپرسن "ئەرێ بۆ خاتری جەهەننەم تۆ بۆ لێرەی؟" پیرەمێردەکە گوێی لە قسەکەم بوو، سەیری چاو و پرچە ڕەشەکەی کردم، کەچی هێشتاش کورسییەکی

پاڵ ناو هات و له بەرانبەرم دانیشت. منیش بە قەلاقوپ بۆی خەنیمەوە، بووکەڵەیەک بەبێ ئەوەی شتێک لە ناویدا وەدەنگ بێ.

ئیدی ئەو گوتی: "پێم وایە بەیانی دەبارێ."

منیش سەرم بۆ لەقاند و ویستم بڵێم حەزم لە بینینی کۆلکەزێڕینەیە. لێ ترسام قسە بکەم، یان لە هیکەوە وەک شێتێک لە پڕمەی گریانێ بدەم.

ژنێکی بە تەمەن لە دەرکە وەستابوو بانگیکرد: "جۆن." ئەو ئاخێوەرەی بەردەمم هەڵسا و بە پیریەوە چوو گوتی: "کارۆلین ڕۆژباش."

منیش کەوتمەوە سەر تایپکردنەکەی خۆم: "شلێر، غەریبی خەندە شێتانەکەت دەکەم." ئینجا پەنجەم بە ئینتەرەوە ناو و لێگەڕام ئیمێلەکەم هەسارەکە ببڕێ، لەم دیوەی چەکی لێدروست دەکەن بۆ ئەو دیوەی بەکاریان دەهێنن.

قاوەکەم چیدی هالاوی لێ هەڵنەدەستا. بە لاڕێیەکی شیپارد ئەڤینیودا ڕۆیشتم تا گەیشتتمە ئاماژەنمای "هەلی کار"ی قاوەخانەیەک بە ناوی سۆل. ئەو شوێنە تەختەبەندەکان لە لایەک و مێز و کورسیش لە کۆتاییەکەی دیکە دانرابوون.

ماخۆ ئاسیاییەکە بێ باکانە بە شێوەزارێکی قورستر لە هی من پرسی: "پێشتر ئیشت کردووە؟"

"بەڵێ ئیشم کردووە." بە دەم ئەم قسەیە باسکەکانم لەسەر یەک دادەنان و لەسەریەک لامدەبردن، ئینجا درێژەم دایێ: "من.... من

شاگردێکم خێرا شت فێردەبم. ئەزموونم لە مەعمیل پەیداکردندا هەیە."

"تۆ فارسی دەزانی؟ ئێرە هاموشۆکەری ئیرانی زۆرە."

"بەڵێ، دەزانم."

"دە چاکە. بەیانی دەست بە کار دەکەی؟ بەیانی سەعات دووی پاشنیوەڕۆ."

تەماشای کراسە کەسکە تەسکەکە و تەنوورە ڕەشەکەمم کرد، هەستمکرد شایستەیپێدانی هەلی کار نیم. "بە ڕاستی؟ بەڵی، دەتوانم. بێگومان دەتوانم". لە خۆشییان بازم نەدا، بەڵام دەنگم وا پێدەچوو.

"وەک ئەزموونی. بۆ دوو ڕۆژ، باشە؟"

منیش نەمدەزانی مەبەستی لە ئەزموونی چییە. "باشە. بەیانی دەتبینمەوە. سوپاس!" ئەویم بەجێهێشت، بەڵام دەمودەست گەڕامەوە لای. "تۆ فێرم دەکەی، وایە؟"

"بەڵی، دەبێ بە زوویی فێر ببی."

بە تەلەفۆنەکەم وێنەی مێنوەکەم گرت، تا شەوداهات هەموویم لەبەر کرد. دوای دەرسی ئینگلیزیم گەڕامەوە ماڵێ و بە گۆکردنی ناوەکانی نێو لیستی مینووەکەدا چوومەوە، لە یوتیوبیش بە دوای ئەوەدا گەڕام ئاخۆ ئەو شتانە چین وا لە کەسێک دەکەن ببێتە شاگردێکی باشی قاوەخانە. من لە نێو ژوورەکەدا بە سینییەکی بەتاڵەوە دەهاتم و دەچووم، بە ڕووی مەعمیلە خەیاڵییەکانمدا پێدەکەنیم، کاتێکیش ڕۆژانی سەعیکردنی تاقیکردنەوەی نیشتمانییم

بیرکەوتەوە، ترسی شکست دایگرتم. ئەوە بوو لە سەر ڕۆخی پێخەفەکەم دانیشتم. دایکی کارۆش بانگی کردمە سەرێ.

"چایەکی تازەم لە دێم ناوە."

منیش گوتم: "سوپاس، حەزم لە چا نییە."

فەرمانی کرد: "دەی بۆ چەند خولەکێک وەرە سەرەوە."

"باشە." دەستبەجێ لە تۆنەدەنگی خۆم پەژیوان بوومەوە، ئاخر زۆر بە خێرایی قایلبووم. ئەدی ئەوە نییە، هەودایەکی باریک لە نێوان ڕێزداری و ترسنۆکییدا هەیە.

"ئەو چایەکی تێکرد و کێکێکی بە توی فەرەنگیشی دانا، چاوی دە من بڕی. "ئەرێ ماڵباتەکەت چۆنە؟"

من وامدەزانی ئەو ماڵباتی من بێ. "زۆر باشن." ئیدی پشتم دایەوە قەنەفەکە و قامکم لە دەوری دەسکی کوپەکە وەرێنا.

گوتی: "ئێمە کوردمان خۆش دەوێن."

لەدڵی خۆمدا گوتم هەڵبەت وایە.

"ئەمینی برام دەبووایە لە ئێران خۆی بشارێتەوە، هەندێ کورد بە سەلامەتی لە سنوور ئاودیویان کرد. ئەوان هەم گیانی ئەو هەم زۆر کەسی دیکەشیان ڕزگارکرد. زۆر لە ئێرانییە تاراوگەنشینەکان بە ژیان قەرزارباری کوردانن."

منیش کە بە ئاستەم دەنگم دەبیسترا پرسیم: "ئینجاش کە ناومان دێ، ئێمە تەنها هەر قاچاخچین؟ تەنانەت جیهان بۆ شکستپێهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی داعشیش پشتی بە لەشکری کورد بەست."

ئەو وانیشاندا قسەکەمی نەبیستبێ. "دەکرێ ئەو وێنانەی لە کەوەنتەری ناندیکەدا هەن بیانهێنی؟" بە دەم ئەم قسەیەوە لاقە ڕووتەکەی خستە سەر ئەوی دیکە.

چوارچێوە زیوینەکە پێنج گوڵی لەخۆگرتبوو، لەنێو هەر گوڵێکدا وێنەیەکی بچووک بە شێوەیەکی نایاب دانرابوو. وێنەی هەرە سەرەوە، هی زەماوەندیان بوو، وێنەیەکی ڕەش و سپی دایبابی لە ناوەڕاستەوە، وێنەیەکی کارۆش لە دەستەڕاستەوە بوو، یەکێکی ئەوینی کچیشی لە دەستەچەپ. کارۆ لە بەرزیی ئێسکی چەناگەی و چاوی گەشی چووبووەوە سەر باوکی. هەر دەبێ وێنەی پیاوەکەی لای خوارووش برای ژنە بێ. لەسەر کەوانتەرە مەڕمەرەکەش چەکێکی ١٥٠٠ دۆلاری بۆ بەکرێگرتنی ژێرزەمینەکە بۆ مانگی حوزەیران و سەوزەو میوە لە لایەن کارۆوە واژۆکرابوو. نەشمان بیستبوو ماڵباتێکی ئێرانی ژێرزەمینێکی قوڕ بە کرێ بداتە منداڵەکەی خۆی. پارەی کەلوپەلی خواردنیشی لێبستێنێ، ئاخر ئێمە زۆر بە کەمی نانمان لە ماڵەوە دەخوارد.

"من و ئەمین زۆر لەیەک نزیکبووین."

منیش لەسەر قەنەفەیەکی دوو نەفەری دانیشتم. ئەوە بوو زەنگی تەلەفۆنی ماڵەوە لێدرا.

دەستی وەها بادا وەک ئەوەی زەنگەکە دووربخاتەوە. "کارۆ پێیگوتووم تۆش زۆر لە چیای برات نزیک بووی."

منیش سڵەمیمەوە. ئاخر ئەوە هەڵەبوو ناوی چیا لەسەر لێوە سوورەکانی ئەو بێ.

درێژەی دایێ. "براکەم لێرە لە میسیساگادا دەژی. من نایبینم چونکە ژنەکەی لێناگەڕێ. هەرگیز ژنەکەی خۆشی نەویستووم، دەبینی." ئینجا سەری بەردایەوە. "ئەو براژنەم بە شێوەیەک دەجوولێتەوە وەک ئەوەی من هەر نەبووبم." ژنە سەیرێکی پشتەدەستی خۆی کرد، نینۆکەکانی بە ڕێکی بۆیەکرابوون، سێ ئەنگوستیلەی ئەڵماسیش لە قامکەکانی دەبریسکانەوە.

ئەو بۆ هاوسۆزی لە سەروسیمام ڕاما. بۆ مایەی سەرسامی، منیش تەنیاییم لە چاوی ئەودا خوێندەوە.

من لە وێنەکان ڕامام بۆ ئەوەی خۆم لە بەزەییهاتنەوە بدزمەوە بۆ کەسێک کە هەر دوێنێ ئازاری دابووم. خۆ ئەگەر بێتە سەر ئۆلمپیادی بەلەنگازی، هەڵبەتە پاڵەوانی بێ ڕکابەرم. "هەرنا برایەکەی تۆ لە ژیانە و ساغ و سەلامەتە." من چوارچێوەکەم لەسەر مێزی شوشەکەی قاوەکە دانایەوە، کە پێچکەکانی پەیکەرێکی شێر بوو.

ئەویش بێ تێفکرینەوە گوتی: "خۆزگە دەمزانی ئاخۆ ساغ و شادمانە. من دە ساڵان بووم کاتێ ئەمین لەدایکبوو. من بەخێوم کرد. ئەو وەک کوڕی خۆم وایە. ئێستاش لە منیان سەندووە." هەندێک بە لای مندا نوشتایەوە، ئەو بۆنە سەیرەی لە خۆی دابوو، خەریک بوو بمخاتە کۆخەکۆخ. "خۆ دەمرم ئەگەر بێت و یەکێک کوڕەکەشم لێ بستێنێ."

من هەڵسام. ئەویش پشتیدایەوە و تەماشای کردم، دەیویست بزانێ ئاخۆ وتارە ئامادەکراوەکەی چ کاریگەرییەکی جێهێشتووە، باڵەکانی لەسەر قەنەفەکە لێک کردنەوە. ئەو گەفی لە من نەدەکرد؛

بەڵێ خەریکی تەفرەدانم بوو، هەوڵیدەدا لە وەتەری بەزەییهاتنەوەم بدا.

منیش گوتم: "خۆ ناکرێ یەکێک سووکایەتی بکا و لە بەرانبەریشیدا میهرەبانی وەربگرێتەوە." ئینجا گەڕامەوە ژێرزەمینەکە گەڕامەوە.

بە نائاگاییەوە -لەوانەیە ئەم شتە لە بابە و چیا فێر بووبم- لاپتۆپەکەم کردەوە و دەستم بە خوێندنەوەی هەواڵەکان کرد: "چەند سەد زیندانییەکی کورد لە دەیان زیندانی سەرتاسەری تورکیادا مانیان گرتووە. یەکێک لە داواکارییەکانیشیان بەکارهێنانی زمانەکەیانە لە نێو دادگادا. سەرۆک ئەردۆگانیش بە سووکی سەیری ئەو مانگرتنە دەکا و بە "نمایشی" لە قەڵەم دەدا."

تۆ بڵێی خۆسەرقاڵکردن بە پرسگەلی جیهانیی میکانیزمێکی بەرگریبێ بۆ کەمکردنەوەی ئازارە کەسییەکان، یان من بە ئاگاییەوە بۆ بەرپرسیارێتی وەها دەکەم؟

دەنگی ئەو کلیلەی لە کیلۆنی دەرکە وەردرا، کۆتایی بە بیرکردنەوە دووڕییانیەکەم هێنا. ئیدی چوومە سەر کەچە دۆشەکەکەی کارۆ لە ناوکەوەکە، پێموابوو بەم جۆرە ناچاری دەکەم ئەو بچیتە سەر سیسەمەکە و لەو ئازاری ویژدانەش ڕزگارم بێ.

کارۆش کە چاکەتەکەی بە پەنجەی دۆشاومژەی وەکردبوو، چاوێکی لێداگرتم و هات و لام لێی پاڵیدایەوە. "بەخێربێی بۆ سەر جێی من."

بە هەراسانییەوە هەڵسام و خۆم خزاندە نێو چەرچەفەکانی سیسەمی شاژن.

کارۆش پەنجەی بە دوگمەی کۆنترۆلی تەلەفزیۆنەوە نا. نمایشێکی ناسراو لەسەر شاشەکە بەدیار کەوت: چیرۆکی کۆمیدیانێکی نیویۆرکی، برادەرەکەی مایەی بەزەیی بوو، لەگەڵ دراوسێیەکی پرسن. هیچ شتێکی ئەو نمایشە بۆ من مایەی پێکەنین نەبوو، لەو باوەڕەدا نەبووم خەڵک لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیاندا وەها بێخەم و خەیاڵ لێی بڕازێن، هەروەک ئەوەی سێکسیش شتێک لە تەوقەکردنێکی ئاسایی زیاتر نەبێ. کارۆش ئەو نمایشەی پێ سەیر و مایەی پێکەنین بوو، تا وای لێهات منیش خەندە دایگرتم تەنانەت لەگەڵ قرتەی پێکەنینی ئەویشدا هاوئاوازبم. کاتێکیش ئەڵقەکە بەرەو کۆتایی چوو، بینیم کارۆ زگی خۆی گرتووە بە دوای هەوادا دەگەڕێ. پێکەنینە نەپساوەکەی وایکرد ئیرەیی پێببەم.

"دەی هەڵسە." من دەستم لە پەتۆیەکەدا . "دەی هەڵسە وەرە سەر ئەو سیسەمە. لەوێ تۆ ئاسوودە نی."

ئەویش بە کۆنترۆڵەکە بە دوای کەناڵەکاندا گەڕا، خێرا لە کەناڵە هەواڵییەکانەوە لە CNNەوە بۆ CBC و بۆ وێستگەکانی دیکەی گۆڕی، ئەمەش ڕێک پێچەوانەی باوکم و براکەم بوو. حەزم دەکردە پێی بڵێم، من بۆ دوو ڕۆژی دادێ ئیشێکی ڕۆژانەم دۆزیوەتەوە، دەمویست بۆی ڕوونبکەمەوە ئاخۆ بۆچی لە ناوەڕاستی پیاسەی دوێنێدا بەجێمهێشتبوو. لێ کارۆ پێکێک ویسکی جۆنی والکەری[180]

---

[180] Johnnie Walkerb ئەم جۆرە ویسکیە لە کوردستان بە ڕێد لیبڵ و بلاک لیبڵ ناسراوە، کەس ناوی براندەکە ناهێنێ، بەڵکو بەهەڵە ناوی مۆدێلەکانی دێنن.

بۆ خۆی تێکرد، ئینجا هات و لەگەڵ من لەسەر سیسەمەکە دانیشت، ئەوسا لەگەڵ هەر دێڕێکی ئەڵقە کۆمیدییەکە پێدەکەنی و هەموو جارێکیش بە لەپی دەستی لە ئەژنۆی خۆی دەدا. بۆنی ئەلکهولەکە لەگەڵ بۆنە خۆشەکەی پرچی یان بۆنی کرێمی دوای ڕیشتاشینی تێکەڵ بوو. بۆنەکەی نەرمونیان بوو وەک بۆنی گوڵ و گوڵووکی کێوی بوو کاتێ بە ترومبێل بە لایاندا تێدەپەڕی و جامیشت هێنابێتەخوارەوە وابوو. بۆنێک بوو ڕایدەکێشای.

دوای گۆڕینی چەند کەناڵێک، کارۆ چاوەکانی داخستن و سەری وە شانی من کرد. بەیەکگەیشتنی سەرپەنجەکانمان تەکانێکی دایە پەیبردن و دۆزینەوە. کەوایە بەم جۆرە لەگەڵ خەمەکانی جووڵایەوە: حاشاییلێکردن. کۆمیدی. ویسکی.

بەدەم وتنی "شەوشاد"ەوە تەوقی سەری ماچکردم و خزایە نێو پێخەفە کاتییەکەی و پەتۆ شینەکەی بەسەر خۆدا هەڵکێشا تا نزیکەی هەموو سەریشی داپۆشی.

منیش لەسەر ڕۆخی سیسەمەکە ڕاکشام سەیری کارۆم کرد، بە ئارامی خەوی لێکەوت. ڕواڵەتێکی هێدی ژیانێکی پڕناسۆری لەنێو خۆدا حەشاردا بوو. منیش بە هێواشی پەنجەم بۆ دەموچاوی برد، دەستم لە چەناگە و لووت و لێوی دا. هەناسە گەرمەکەی ختووکەی ناو لەپمی دا.

## بەندی سی و حەوت

لە قاوەخانەکە فێربووم هەموو شتێکی ناو لیستەکە ئامادە بکەم، ئیشی سەر سندوقی پارەوەرگرتن و پەیوەندیکردن بە هاموشۆکەران و قسەدابەستن بەو ئینگلیزیەی لە فیلمەکانی هۆلیودەوە فێرببووم. بە هەراسانیشەوە سەرم بۆ مەعمیلە زۆربلێکان دەلەقاند و لە تێگەیشتنی ئەوانەی بە زمانی بازاڕ و ڕەشۆکی دەدوان بەجێدەمام، ئاخر لە هەندێ وشە و دەستەواژەیان نەدەگەیشتم. زۆر دەهاتەپێش کە هەڵە لە دەربڕینی دەستەواژە باوەکاندا بکەم، بۆ وێنە لەجیاتی بڵێم "ئاساییە" دەمگوت "یاساییە." سەرکارەکەم فێری کردم دوای بەڕێکردنی هەر مەعمیلێک بڵێم: "سوپاس بۆ تۆ، بە هیوای ڕۆژێکی خۆش"، تا وای لێهات دوای ماوەیەک بێ وروژان و هەستیاری ئۆتۆماتیکیانە لە دەمم بێتەدەرەوە.

لە بەر نۆرەکاری ئێواران و ڕۆژانی پشووی کۆتایی هەفتە، زۆر بە کەمی کارۆم دەبینی. خەسووم و من خۆمان لە یەکدی دەپاراست و بە دوور دەگرت و بەدەر لە سڵاو و چاکوچۆنی و یەک دوو ڕستەی کورت کورت هیچ قسەیەکمان لەگەڵ یەک نەدەکرد. تۆرۆنتۆکانیش باسوخواسیان هەر کەشوهەوا و گوڕدەمی

چەقبەستنی ڕێگەی هاتوچۆ و بچوکبوونەوەی قەبارەی پەرداخەکانی تایم هۆرنتز[181] بوو.

لە بەیانییەکی تەممووزدا لە فێیسبوک خوێندمەوە تورکیا تەقەی لەو کوردانە کردووە کە لە دژی داعش جەنگاون. ژمارەیەکیشی لێ کوشتوون. لە نێو پاس بەرەو شوێنی کارم، بە دوای میدیای کەنەدیدا گەڕام بەڵکو زانیاری زیاترم لەو بارەیەوە دەست بکەوێ، کەچی تاکە ئاماژەیەکیشیان بەو دەستدرێژیکردنانە نەدابوو. تێبینی ئەوەم کرد کاتێک تاوانبار هاوپەیمان بێ، ئەوا هەواڵی تاوانەکانی بەهایان نییە، تەنانەت ئەگەر ئەندامێکی ناتۆ دڕندانەش بکەوێتە وێزەی گیانی هاوپەیمانێکی چارەنووسساز لە دژی تیرۆر و لێشیان بکوژێ. سەرئێشەکەم بە شێوەیەک لە کەللەی سەری دام وەک ئەوەی بە دڕێل کون بکرێ. هەرچەندە دڵیشم خەبەری دابوو، بەڵام ئەو بوێرییەم نەبوو چاو لە ئیمێلەکەم بکەم و شتەکەم بۆ پشتڕاست ببێتەوە، ترسام نەوەک هەواڵی ناخۆشی تێدابێ، مەراق و ترسەکەشم لەوە زیاتر بوو مەبادا هەر هەواڵی تێدا نەبێ.

سەرکارەکەم لەو ڕۆژەدا بەوە سەرسامی کردم، سەرباری کرێ و مزی خۆم پاداشتێکی بیست دۆلار زیادەی پێدام. "تۆ کارمەندێکی باشی. ئەمە هەڵگرە تا دواتر پێڵاوێکی گەرم بۆ خۆت پێبکڕی. زستانی کەنەدا زۆر سەختە." بۆ یەکەمین جاریش بوو بە تەنیا جێمبێڵێ. ئیدی منیش پەڕژام تا ئیمێلەکەم بکەمەوە.

---

[181] Tim Hortons خواردنگەیەکی زنجیرەیی کەنەدیە کە خواردنی خێرا ئامادەدەکات و دەفرۆشێت، لەئەمریکای باکوور و هەندێ وڵاتی ئەورووپی و چین و وڵاتانی کەنداو لقی هەیە.

بەڵێ، نامەی شلێر هاتبوو: "زیان و لەدەستدان بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی پێشمەرگەیە. زۆر جاران ڕووبەڕووی مەرگ دەبیەوە، ئیدی مەرگ دێت و بە ڕووتەوە پێدەکەنێ و هاوڕێ یان خزمێکت، یان پێشمەرگەیەکی نوێت لێ دەستێنێ. کە هێشتا دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵنەکەوتووە بە کردەوە مەشقی شەرڤانی ببینێ. ئەو ژن و پیاوانەی ڕۆژانە چایان لەگەڵ دەخۆیتەوە.. ڕۆژێک دێ چیدی نایانبینیەوە."

کاتێک ئەوەم خوێندەوە شتێک لە هەناوم بەربوویەوە. لە ئێمێلەکانی پێشتردا، زۆر جاران شلێر لەبارەی کاتی خۆش و سەیری نێو کێوەکانی دەنووسی، باسی یاریی تۆپی پێ، باسی ئاگر و هاوڕێیەتی.

"لەیلا، شەیمای هاوڕێم تیاچوو. بۆمبە هێشووییەکان کوشتیان. دەمێک خۆی و پێکەنینەکەی لێرەبوون، بە ئامێرە کۆنەکە موزیکی دەژەنی، ئەو ئامێرەی پێشتر بۆم باسکردبووی، ئەوەی بە دنیایەک جەوی و کەتیرە لێکماندابووەوە، گۆرانیی دەچڕی. من دەمژەنی و بە یەکەوە گۆرانیمان دەگوت، کەچی پاشان بۆ ڕۆژی دواتر، هەر ئەوەندەم زانی سەرتاپای جەستە هەلابەهەلابووەکەیان دە عەلاگەیەک هاوێشتووە تا لەبن دارێکدا بنێژرێ."

قۆڵە لێککێشراوەکانی شلێر -باڵە خەیاڵکردەکان-، خۆگرییە بێوێنەکەی و چاوە قەترانییەکانیم هاتنە پێشچاو. دڵی خۆم بەوەدایەوە کە ئەمجارە ئەو نەکەتبووە بەرێ، بەڵام زۆر لەوە دەترسام ڕۆژێک بێ چیدی هەواڵیم پێنەگات و ناچاربم هەر لە بەرزەخی هەواڵزانینیدا چاوەڕێبم.

"پاش دوو ساڵ لە شەڕ، بینینی تەرمی شیتەڵ بوو، لێدانی گۆڕ... وادەزانی قوربانیی زۆر واتلێدەکا مردنت لەکن ببێتە شتێکی ئاسایی، بەڵام خۆ من جەبەڕوتی مەرگ لە هەموو لایەک دەبینم، چاوێکی هەر لەسەر منە، هەر جارە لەگەڵ بردنی گیانی هاوڕێیەکمدا پارچەیەکم لێدەبێتەوە، هەموو جاریش پیرترم دەکا."

تواناى تێگەیشتن و وەڵامدانەوەدا نەما، ئیدی هەڵسام بە گسک ناوکەوەکەم ڕاماڵی، مێزەکەم سڕیەوە و دەستشۆرەکەشم خاوێنکردەوە. ئەوەبوو دەستەیەک خوێندکار هاتن، منیش پەلەم کرد تا قاوەیان بۆ ئامادە بکەم، خەندەی زیاتریش تا ژان و ناسۆری ناو دڵ بسڕمەوە. مەعمیلە گەنجەکان هەموو ڕۆژەکە لە قاوەخانەکە بەدەم خواردنەوەی چەند قاوەیەکی سارد و سەرداگرتنی لاپتۆپەکان و تایپکردن کاتیان بەسەر دەبرد.

پاشان ئەوەی لە شیعرەکەی عەبدوڵلا پەشێوم لە بیر مابوو بە ئیمێل بۆم ڕەوانکرد:

"دەڵێم گەورەم،

لەسەر سەکۆی هەر مزگەوتێ

لەبەر دەرگای هەر ماڵێ، هەر کڵێسەیێ هەر ئەشکەوتێ

لەسەر گابەردی هەر شاخێ

لەسەر درەختی هەرباخێ لەم وڵاتە

لەسەر هەر بستە زەمینێ

لەژێر هەر گەزە ئاسمانێ

مەترسە کەمێک سەر داخە و تاجە گوڵینەکەت دانێ"

ئەوانە هەموی گۆڕی سەربازی ونن.

پیاوێکی چاوخۆڵەمێشی هات و داوای لاتێی[١٨٢] کرد. کاتێکیش وردەم بۆ گەڕاندەوە پرسی: "هەر لە ڕووی پرسنییەوە، ئەرێ تۆ پورتوگالی؟"

"لاتییەکەت بۆ ئێرەیە یان لەگەڵ خۆتی دەبەی؟" منیش خۆم بە لێگرتنی کوپێک خەریککرد تا بۆی تێبکەم.

ئەو بە وردی لە سەروسیمای منی ڕوانی و گوتی: "ئیسپانی؟"

ویستم بەسەریدا هاواربکەم و بڵێم: "من سەر بەو گەلەم کە هاوپەیمانی ناتۆی حکومەتەکەی تۆ بە ڕۆژی ڕووناک لێیان دەکوژێ و میدیاکەشتان فزەی لێوە نایەت." کەچی لە بری ئەوە گوتم: "قاوەکەت لە ماوەی یەک خولەکدا ئامادە دەبێ."

قورسایی سەرم گوازرایەوە بۆ پەلوپۆم. کێشم بووە هەزار کیلۆ. ئەو فرمێسکانەی لێنەگەڕام بڕژێن وایان لێکردم بێزم ببێتەوە و بڕشێمەوە، هەر وەک ئەوەی لە هەر چرکەیەکدا گەف و هەڕەشەکە سەبارەت بە ڕشانەوەکەم لە گەرووەمەوە بێتەدەرێ.

پیاوێکی تێرتەمەن بە خۆی و خەندە دلۆڤانییەکەی هات و داوای چایەکی کەسکی کرد، بێ ئەوەی ئەوەم بە بیر بێنێتەوە من گۆڕاوم یان بە شێوەیەکی جیاواز دەرکەوتووم. کاتێکیش چایەکەم بۆ بردە سەر مێزەکەی، پێم گوت ڕیشە سپییە درێژەکەییم پێ جوانە. ئەوە

---

[١٨٢] Latte

بوو گوتی نووسەرێکم لە مانیتوباوە[١٨٣] هاتووم. منیش پێم گوت ئەزیش خەونبینێکم لە کوردستانەوە. ئەو داوای لێنەکردم ناوی خۆم دووبارە بکەمەوە، پرسیاری ئەوەشی لێنەکردم ئاخۆ کوردستان لە کوێیە. لە بری ئەوە، دەستبەجێ لەسەر کورسییەکەی هەڵستا، سەیری دوورِ چاوی کردم و باوەشی پێداکردم. "تۆ یەکەمین کوردی لە ژیانمدا بینیبێتم."

ویستم پێیبڵێم، هاورِێکەم شەرِڤانێکی ئازادیخوازە، بەڵام ئەو هەر قسەی دەکرد، دەربارەی هەموو ئەو شتانە دوا، کە لەبارەی کورد و لەبارەی جینۆسایدەوە دەیزانی.

من گوتم: "بەڵێ، سەددام حوسێن کانیاوەکانی چیمەنتۆرِێژ کرد تا خەڵکەکە لە بێ ئاوی بمرن.

ئەویش بە چاوێکی مۆلەقەوە پرسی: "تۆو؟"

منیش هەوڵمدا وشەکە راستبکەمەوە ؛ "چیمەنتۆ؟"

"ئاها، چیمەنتۆ!" وا پێدەچوو ئاهێکی هاتبێتەوە بەر، بەڵام لەسەری نەرِۆیی. منیش لە فەرهەنگ بۆ وشەکە گەرام، ئینجا تێگەیشتم و سووربوومەوە. ئینجا هەردووکمان پێکەنین.[١٨٤]

---

[١٨٣] Manitoba : مانیتوبا: پارێزگایەکی کەنەدییە.

[١٨٤] ئەوەی راستی بێ، لێرەدا نووسەر لە نێوان وشەکانی cement وSemen لەگەڵ وشە دروستەکەدا cement رەوانبێژیانە گەمەیەکی زمانەوانی تێدا کردووە، وای نیشانداوە هێشتا لەیلا بە تەواوی وشەکان گۆناکا و وشەی Semen واتە سپێرم یان هەمان تووی پیاو لەگەڵ cementسیمێنت واتە چیمەنتۆ تێکەڵبکا.

بەو مز و کرێیە بچووکە، بەڵام جێگیر و بەردەوامە و بە هێنانی نمرەی باش لە تاقیکردنەوەی تۆفل[185] وام لێهات داوای خوێندن لە زانکۆی ماکماستەر و زانکۆی ویستەرن ئۆنتاریۆ لە ڕشتەی فیلمسازیدا بکەم، کە بۆ تێچوونە زۆرەکەی خوێندنیش پشت بە قەرزی حکومەت ببەستم. لە ڕۆژنامەکانیشدا ئەو لاپەڕانەی تاکژووری بەکرێدەدەن دەستنیشانمکرد و لە ئینتەرنێتیشدا بۆی گەڕام.

وای لێهات خەسووم وەڵامی ڕۆژباشیشی نەدەدامەوە. منیش لێی تێنەدەگەیشتم. خۆ ئەگەر لەوە ترسابێ کارۆی لێ دەستێنم و دوور دەکەومەوە، هەروەک چۆن براژنەکەی ئەمەی دەرهەق کردبوو، بە دڵنیاییەوە ئەو ڕەفتارە نەیارییەی ڕێگەی لەوە پێنەدەگیرا، تۆ بڵێی ڕێگەی پێگیرابا؟ یاخود یەکێک چووبێتە بن کەوڵی تا خۆی وەک قوربانی نیشان بدا، ئەو ژنەی لە لایەن مێرد و منداڵەکانیەوە لەخشتەبرا و خۆیان لێ نەبان کرد؟ خۆ هەر هۆیەک لە گۆڕێ بووایە، پێویستم بەوە بوو بێ لەیەکخشان و بەیەکدادان بژیم، سەرگێژەی ژیانە نوێکەم بە تەنیا بەس بوو، نەمدەویست شتی دیشی بێتەسەر. هەرچەندە وای لێکردم هەستبکەم لە بەرانبەر ویدا پیس و قێزەونم، بەقەد پیس و قێزەونیەکەم لەچاوی حکومەتەکەیەوە، کە ئەویش ڕقی لێدەبووەوە. بە ئاستەمیش کارۆم دەبینی، کاتێکیش بە یەک دەگەیشتین، هەمیشە ماندوو شەکەت بووم، هەمیشە بە ئیشەکەم و ئەرکی خوێندنەکەمەوە سەرقاڵ بووم.

---

[185] TOEFL

ژنێکی ڕوخسار جوانی پرچ ڕێک، کە لە کۆتاییەکەیدا تاڵەکانی لوولکردبوو، وای لێهاتبوو هەموو ڕۆژێک لە سەروبەندی سەعات سێی دوای نیوەڕۆدا دەهاتە قاوەخانەکە و داوایەکی تایبەتی بۆ ئامادەکردنی ماکیاتۆ[١٨٦] لێدەکردین. دەنگە گن و لوتبەرزییەکەی وای لێدەکردین داواکەی وەک دارڕسانیک تێبگەین. بۆ ئەوەی دڵنیابم چیدەوێ هەر ئەوەی بۆ ئامادەبکەم، چارەم نەبوو، دەبوو هەمووجارێک لێی دووبارە بکەمەوە، پاشان دیسان دڵنیاببمەوە ئینجا خواردنەوەکەی بۆ چێکەم. لەو میانەشدا، بە پۆزەوە سەیری دەمژمێرە ئاڵتونییە گەورەکەی بازندی دەستی دەکرد، باکیشی بەوە نەبوو ئاخۆ داواکارییەکەی بە روونی گۆدەکا یان نا.

ئینجا لە ناوەڕاستی تەختەبەندەکە دادەنیشت و هەمووی بۆ خۆی دەویست، کۆسمۆکەشی لە نێو جانتا مارکە تایبەتییەکەی دەردەهێنا و پێی لە سەر مێز دادەنا و بنێشتیشی دەجووی. هەموو ڕۆژێک لە سەروبەندی سەعات دوودا دڵەکوتێ دایدەگرتم. وای لێکردم هەموو جارێک خواردنەوەکەی بۆ ئامادە بکەم.

ڕۆژێکیان بەرلەوەی هەڵبستێ و بڕوا، لەسەر دەستەسڕێک بۆی نووسیبووم: هەی گێلاژن! لەسەر مێزەکەی دانا. منیش لێنەگەڕام هیچ مەعمیلێک ڕۆندکەکانم ببینێ.

بۆ شەوەکەی وەهام بۆ شلێر نووسی: "کاتێک تۆ چیدی شایستە نیت، کاتێک ناوی تۆ چیدیکە لە گۆکردن نایەت، کاتێکیش ناسنامەکەت دەبێتە تەگەرەی پەیوەندی لەگەڵ ئادەمیزادی دیکە، ئەوکات تێدەگەی تۆ کۆچبەری. ئاخر هیچ شوێنێکی ئەم هەسارەیە

---

[١٨٦] Macchiato : ماکیاتۆ، قاوەیەکی ئێسپریسۆیە لەگەڵ هالاوی شیر.

ئامادە نییە من و تۆ لە باوەش بگرێ، بەڵام تۆ بڵێی قوژبنێکی ئارام بدۆزینەوە؟ ئەرێ کەنگی وەک بەڵێنت داوە چەک دادەنێی و گوندی ژنواری[187] ئارام دروست دەکەی و جوانەش بانگ دەکەی؟ شلێر من ماندوو بووم. من خەمی تۆمە و دەترسم. لە تەنیایی جوانە و ئەو دوورییەی تۆ دەترسم."

بۆ ڕۆژی پاشتر و بەر لە سەعات دوو، من گێلاژن-ەکەی مەعمیلەکەم ڕاستکردەوە[188] و کردم بە گێلەژن و بەرلەوەی دەستەسڕەکەی بۆ لەسەر مێزەکە دابنێمەوە، ئەم ڕستەیەم لە بنی نووسی: *تۆ ژنێکی زیرەکی ناکرێ هەڵە لە ڕێنووسی ئەو تاکە زمانەدا بکەی کە قسەی پێدەکەی*. کاتێکیش بە دیار کەوت لێمپرسی: "چۆن یارمەتیت بدەم؟" کاتێک دەستەسڕەکەی بینی بە دەنگێکی بەرز ئاهێکی هەڵکێشا و ڕۆیشت، ئەو ڕۆیشتنەی و ڕۆیشتن، هەرگیز نەگەڕایەوە.

لە ڕۆژێکی وشکی ئەیلوولی تۆرنتۆدا، سەری چەند ئەپارتمانێکی بەردەستم بۆ کرێ دا و بە چەندین سەعات لەم بەری شەقام بۆ ئەوبەر دەچووم، بە دوای ژمارەی خانووەکەدا دەگەڕام. لە کۆتاییدا ژوورێکی ژێرزەمینییم دۆزییەوە، دەمتوانی بە ڕێژەی ٦٥ لە سەدی ئەو پارەیەی لە قاوەخانەکەم وەردەگرت، بە کرێی بگرم. ناندین و حەمامەکەی لەگەڵ دوو کوڕ و کچێک هاوبەش بوو، بەڵام هەر باش بوو. ئاخر مەودایەکم بۆ خۆم دەویست.

---

[187] Jinwar : ژنوار: گوندێکە بۆ ژن و منداڵ لەژێر دەسەڵاتی خۆسەری ڕۆژاڤا لە ٢٠١٦دا دروستکراوە.

[188] ژنەکە نووسیبووی moran، بەڵام ڕاستییەکەی moronە.، کە لەیلا بۆی ڕاستکردووەتەوە.

کاتێ کارۆ گەڕایەوە ماڵێ من پرچم وشک دەکردەوە. ئەو بە دەستێکی زەرفێک و بە دەستەکەی دیکە قەیتانی پێڵاوەکەی کردەوە.
"ڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆز!"

"ئۆو ، بە ڕاست. من ئەوەندە پیربووم ڕۆژی لەدایکبوونەکەی خۆشم بیرچووەتەوە!"

ئەو دیارییەکی بچکۆلانەی بۆ ڕاگرتم و ڕوومەتیشی هێنایەپێش، چاوەڕێی ماچێکیشی دەکرد. منیش خەریکبوو بابدەمەوە. کارۆ هەستی بە دوودڵییەکەم کرد و چاوە نامرادەکانیشی وای لێکردم شەرم بکەم شڵپەی ماچێک لە سەر ڕوومەتی بهێنم. ئەوە بوو دیارییەکەم لێوەرگرت و زەرفی پاکەتەکەییم هەڵپچڕی. لەبن چاوە مەراقاوییەکەیدا، هەوڵمدا واتای ئەو وشانە بدۆزمەوە، کە لە دوو پارچە کاغەز نووسرابوون: TIFF, Visa Screening Room (Elgin). ئەو کاتەش ناوێکی ئاشنام هاتە بەرچاو خەریک بوو بشێوێم: مەمەد ئاکسۆی، فیلمسازی کورد. ئینجا بە پێزانینێکی زۆرەوە بە بیرم هاتەوە واتای TIFF چی بوو: فیستیڤاڵی فیلمی نێودەوڵەتیی تۆرنتۆ[١٨٩].

بە جۆشەوە لە هاوارم دا و ئامێزم لە کارۆ وەرێنا. "ئای چەند لەجێی خۆیەتی!"

"زۆریش پێدەچێ دەرهێنەرەکەش لەوێ ئامادە بێ."

منیش بلیتەکەم بە سینگمەوە نا. "سوپاس، سوپاس بۆ تۆ! ئای لەو دیارییە جوانە."

---

[١٨٩] Toronto International Film Festiva

"لەیلا گیان، شایانی نییە." ئەویش دەستی خستە سەرشانم و چاوی بەردایە خوارەوە و لە دەممی ڕوانی.

منیش شل بووم. خەریک بوو لووتمان بگاتە یەک، هەناسەکەی لە ڕوومەتم دەدا، لە هیکەوەش لێوم لەسەر لێوی دانا: گەرم و نەرم و دلۆڤان. هەستێکی وابوو، وەک ئەوەی پەپوولە لە سەر ڕووم هەڵبنیشێ. بەستەڵەکی ناوەوەم توایەوە.

کاتێکیش ماچوموچەکە تەواو بوو، هیچ کامێکمان نەیدەزانی چی لەگەڵدا بکا. من خۆم بە کۆمپیوتەرەکەوە سەرقاڵ کرد. ئەویش سەری بەسەر کتێبێکی کارتۆنیدا گرت.

بۆ بەیانییەکەی من خۆم وەها نواند هێشتا نوستووم، ئیدی ئەو خۆی گۆڕی و دەرچوو. بە خشکەیی و بە وردی ژوورە ژێرزەمینەکەم پشکنی و دیسان ژیانی خۆم خستەوە نێو دوو جانتا، یەکێکیان بەرگەکەی دڕابوو، ئاخر کرێکارانی فرۆکەخانە بێ تێیانهەڵدابوو.

لەسەر کار، مەعمیلەکان تێبینییان لەسەر ڕوخسارە ماندووەکەم هەبوو. منیش دەستم بۆ ڕاوەشاندن. "نا، هەرگیز لەمە باشتر نابێ." پێویستم بەوە هەبوو بێمە سەر ئەو بڕوایە، کە من زۆر تاسەمەندی ئەم بەندە نوێیەی ژیانم بووم و ئەو ناسۆرە بێپایان و خەتابارییەی ناو دڵیشم بڕەوێتەوە.

ڕێگەدرام شەفتی کارەکەم لە سەعات چواردا کۆتایی پێبێ، ئەوە بوو لە نێو ترامدا ئەو نامەیەم نووسی، پێشتر لە مێشکی خۆمدا ڕەشنووسم کردبوو:

کارۆ هەنوانێکی بچکۆلەی تایبەت بە خۆم دۆزیوەتەوە. ئەوەش نەخشەکەمان بوو، وا نییە؟

دەبینی، هەمیشە لە ئاسۆدا بە دوای فریادڕەسێکدا گەڕاوم. هەر بە ڕاستیش نازانم من کێم و ئاخۆ لەم جیهانە دڕندەیەدا چیم بەسەر دێ، بەڵام ئێستا وەهای دەبینم، دەکرێ ببمە ڕزگارکەری خۆم، پێویست ناکا پشت بە چیاش ببەستم.

لەسەر ئەو بڕوایە ڕاهاتبووم، کە شاشییەکی جەوهەری لە مندا هەیە و بۆیە بەم شێوە ژیاوم، بەڵام ئێستا وەهای دەبینم، کە ژانوناسۆر بۆ من و گەلەکەم شتێکی نامۆ نییە. هەروەها لەمەوپاش ڕێگە نادەم هیچ کەسێک بە تۆشەوە، بمخاتە سەر ئەو ڕەوتەی، کە هەڵەی منی تێدا نییە.

کارۆ، من خاڵە لاوازەکانم دەبینم. خوێنی خۆم دەخۆمەوە، یەخسیری حەسرەت و نائومێدیەکانی خۆمم. بۆیە هەمیشە دادەڕمێم و قیت نابمەوە. دەبێ ڕێگەی خۆم بدۆزمەوە. تۆ بێ منیش شادمان دەبی. شتێک دەبینم کە تۆ بەزیادەوە هەتە و من نیمە، ئەویش ئارامی و ئاسودەییە.

سوپاس بۆ هەموو شتێک کە بۆ منت کرد. من لای خۆم تۆمارم کردووە کە چەند قەرزباری تۆم، بە پێزانینەوە بەرە بەرە هەمووی دەدەمەوە.

خواحافیز،

لەیلا

لەوەدا خۆم گرت جارێکی دیکە بەسەر تێبینینامەکەدا بچمەوە، ئیدی لە بن بالیفەکەم دانا. بەر لە پێوەدانی دەرکە، ئاورێکم لە ژوورەکە دایەوە، ئاوڕم لە پێخەفەکە، کە بۆ چەند مانگێک لەسەری بووم، هەروەها لە بارستەی کتێبەکانی کارۆش دایەوە.

لەو کاتەی تاکسی لە تۆرنتۆ گران بوون، بۆیە ئاسانترین ڕێگەم هەڵبژارد کە هاتوچۆی گشتی بوو. کاتێ دەرگەکەم داخست، تەلەفۆنەکەم لەرییەوە.

"ئەرێ لەسەر کار تەواو بووی؟" ئەوە کارۆ بوو، لە دەنگیڕا دەتگوت لە بنی بیرەوە تەلەفۆن دەکا. "ئەمڕۆ بۆ نانی ئێوارە بچینەدەرێ؟"

دەسکی جانتاکانم لەنێو دەستمدا قورس بوون. دەستم لێبەردان.

ئەو پرسی: "دەکرێ لە وێستگەی یونیەن یەکدی بگرینەوە؟ من ئێستا لە نووسینگەکە دەردەچم. بەلای کەمی بۆ پێنج و نیو دەگەمە ئەوێ."

## بەندی سی و هەشت

کاتێ بە کراسێکی کەسکی هاوینەوە گەیشتمە ویستگەکە، کارۆ لەسەر تەختەبەندێک دانیشتبوو، دەستەکانی لە یەک ئالاندبوون، شەپقە بێیسبۆلەکەی بۆ پێشەوە هێنابووەوە.

بەر لەوەی بگەمە ئەو، بە قەڵەمی لێوان، ڕەنگی قاوەیی ئاماڵ بۆر چینێکی دیکەم لە لێوم دا. "دەی بۆ کوێ بچین؟"

ئەویش برۆکانی بڵندکردن و هەروەک قوتابییەک ددانی گرکردنەوە. سێنتەر ئایلەند[190]، لەوێ چێشتخانەیەکی نایابی لێیە."

منیش ڕەتم نەکردەوە. ئاخر خۆ یەکەمین ڕۆژی خۆش و سەیرمان لەوێ بەڕێکردبوو، بەڵکو دوا ڕۆژیشمان هەر لەوێ بەسەر بەرین. لەسەر کەڵەکەکە لە تەنیشت ئەو دانیشتم، بە ڕوونیش بینیم پەشۆکاو بوو. خەڵکیش لە دەوروبەری ئێمە لە گەرمەی دەمەتەقێ و پێکەنینی خۆیاندا بوون.

"هێزە هەرە کاریگەرەکەی دایباب ئەوەیە کە بۆ تێکدانی تۆ بەکاریدێنن. خراپتر لەوەی دوژمنێکی سەرسەخت بتوانێ بیکا." ئەم تێبینییە لەناکاوەی کارۆ دەریبڕی، ڕایچڵەکاندم، ڕایەڵەی هزر و سەرەداوی ئەو شتانەی بە یەکەوەش گرێمدابوون، ترازاندی.

"ڕاستە، ئەوان ژیانیان بە تۆ بەخشیوە، کەچی لە ساتێکیشدا وێرانی دەکەن."

---

[190] Centre Island, Toronto

لەسەر تەختەی کەڵەکەکە، دەستی گرتم. منیش بە سەرسوڕمانەوە ڕووم تێکرد. ئەو دەستەکەی دیکەشی گرتم. ئیدی ئێستا ڕوومان لە یەک کرد. نیگاکەی ئەو پڕ و چڕ بوو. "ئەرێ ئەوە دوایین ژەمە بە یەکەوە دەیخۆین؟"

"ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟" منیش نەمدەزانی بۆچی درۆم کرد.

"خۆ هەر هیچ نەبێ دەکرێ بە برادەر بمێنینەوە؟"

من لێوەکانم لەسەر یەک گیرساندنەوە. ئەرێ ئەو چۆنی زانی؟ "خۆت گێل مەکە. من دەچمە سەر بانی کەڵەکەکە." کاتێکیش مەکینەی کەڵەکەکە بە نێو تونێلەکەدا بەرەو دەریاچەکە دەڕۆیشت، بە هۆیەوە بە شێوەیەکی نارەحەتانە ئاوەکە هاتە سەر ڕووی کەڵەکەکە و هەندێکیشی بە لمووزی پڕژاند، بەڵام خۆ نەمدەتوانی لەدەست چاوە خەمبارەکانی ڕابکەم. وێنەکە لە خەیاڵمدا گڕی گرتبوو، ئازاری ویژدانیش بە سوژنان هەناوی کردبوومە هێڵەک، بەڵام خۆ من بەو ڕێگەیەدا ڕۆیشتم کە ئەو نیشانی دابووم.

کەڵەک بە هەڵبەز و دابەزەوە گەیشتە لەنگەرەکەی سەر کەنار، ئێمەش لەگەڵ حەشاماتەکە ڕێگەی خۆمان بۆ دابەزین بڕی. باڵندەش لە گۆمی بچکۆلەدا مەلەیان دەکرد، کە دەهاتنە دەر سەر و پەڕ و باڵی خۆیان دەهەژاندەوە و دیسان خۆیان لە قوڕاوەکە وەردەدایەوە.

لە چێشتخانە دەریاییەکەی ئەوبەر، خانەخوێیەکە مێزەکەی ئێمەی نیشانداین، کە وەک مێزەکانی دیکەی دارگوێزی تۆخڕەنگ کە چەند مۆمێکی لەسەر بوو، کەشخە نەبوو. ژنێک بە خۆی و کراسێکی کورتەوە هات و داوای لە کارۆ وەرگرت ئاخۆ چیمان دەوێ: دوو

پێکی بلاک لێیبلی جۆنی واکەر بە سەهۆڵەوە. منیش "ئاو بەسەهۆڵەوە". ماسی و پەتاتەمان داواکرد، زۆریشی پێچوو تا بۆمان هات. کارۆ پێکی دیکەشی داواکرد. کاتێکیش ژنە پێشخزمەتەکە هاتەوە، پەرداخەکانی هەندێ بە توندی لە سەر مێزەکە دانان، بێ ئەوەی داوای لێبوردن بکا یان ئەوەی لێی ڕژا خاوێن بکاتەوە. من لە قاوەخانەکە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆرم بە خەرجداوە تا بێ خەوش خزمەتگوزاری پێشکەشی موشتەریەکان بکەم، بۆیە کە ئەوەم بینی هەندێ سەنگرامەوە، بەلام گوتم بەڵکو ئەم پێشخزمەتە نوێ بێ یان سەرکارێکی توند و زبری هەبێ.

"دەمەوێ خواردنەوە تایبەتەکەی تۆ تاقیبکەمەوە."

"باشترە لە خواردنەوەیەکی سووکترەوە دەست پێبکەی، تامێکی میوەیشی بێ دیسان باشتر."

منیش ئاماژەم بە خواردنەوەکەی ئەو کرد و گوتم: "لەو هەموو خەڵکە، تۆ وام پێم دەڵێی؟"

"ئاخر من ئەزموونم زیاترە لەتۆ."

"ئێ، بەلام چ سوودێکی هەیە ئەگەر خاوت نەکاتەوە؟"

ئەو پەنجەی بە برۆکانیدا، هێنا ئینجا گوتی: "تۆ ڕاست دەکەی."

ئاسمان وردە وردە بەرەو ڕەنگی ئەرخەوانی هەڵدەگەڕا.

"سەیرکە ئەو ژنە چەند بەڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ مەعمیلەکانی دیکە دەکا." بە دەم ئەم قسەیەوە ئاماژەم بۆ پێشخزمەتەکە کرد، ئێستا زۆر بە کەیفەوە لەگەڵ جووتەیەکی سەر مێزێکی نزیک لە

ئێمه دەدوا. پرچی ئەوان کەژەتر و پێستیشیان لە هی من و کارۆ ئاڵتر بوو. "ئێمە هەرگیز نابینە خەڵکی ئێرە."

"وا مەڵێ. ئەو ژنە نەوەک ئێمە یەکێک نییە سەر بە ئەوانەی ئێرە بێ، کەنەدی نەژادپەرست نین. سەیرکە." ئەوە بوو کارۆ ئاماژەیەکی بۆ ژنە کرد و بە شێوەزارێکی زۆر توندی ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە داوای "بۆم[191]"ی لێکرد.

پێشخزمەتەکە ڕەنگی بزرکا.

کارۆ گوتی: "کارپ بۆم[192]." بەر لەوەی ژنە ڕابکا و زەنگ بۆ پۆلیس لێبدا، کارۆ ئەوەشی بۆ قسەکەی پێشتر زیاد کرد:ئایرڕش کاسرپ بۆمب [193] . دەڵێی هەرگیز گوێت لێی نەبووە؟ زۆر باشە." دەنگی ڕای(٣)ی بە شێوەیەکی شانۆییانە گۆکرد.

بەر لەوەی ژنە پێشخزمەتەکە لێمان دووربکەوێتەوە دامانە قاقای پێکەنین. کارۆ بۆ خۆی چوو تا خواردنەوەکە بە دەستی خۆی بێنێ، نەوەک پێشخزمەتەکە تفی تێبکا. ئەو فێری کردم پێکێک کرێمی بایلیش تێکەڵ بە بیرەی گینێس بکەم و دەردەست هەڵیدەم. تامیشی وەک تاڵترین شوکولاتەی بە شیرە. ئەوە بوو بۆ ماوەیەک خۆم دایە دەست ئەو موزیکەی لێدەدرا.

کاتێکی بێدەنگییە هەراسانەکە درێژەی کێشا، پرسیم: " کەواتە ئەدی باوکت... مەبەستم ئەو چۆنە؟" دایکی کارۆ هەرگیز ناوی

---

[191] Bomb

[192] Car Bomb بە مانای بۆمبی ترومبێل دێت.

[193] Irish Car Bomb کۆکتێلێکی خواردنەوەی ئیرلەندییە.

نەدەهێنا، ئەمەش خەسڵەتێک بوو کارۆ بە میرات لێی وەرگرتبووەوە.

"ئەو دەڵێ خەریکی سەروسەودای بزنسە. لە شوێنێک لە دهۆک یان لە دوبەی. ئەو دەمێکە... زەنگی بۆ لێنەداوم.. تەنانەت نازانم چەندیش دەبێ... شەش مانگ زیاترە. ئەو هێشتا هیچی دەربارەی ژنە کوردەکەم نەبیستووە.." بە دەم ئەم قسەیەوە کارۆ ڕاستەوڕاست سەیری ناو چاوی کردم. "بەڵکو چیدی لەبارەی ئەو پرسیارم لێنەکەی؟" من هیچ شتێک نازانم، سێ ساڵە نەمبینیوە. سێ ساڵ زیاتریشە."

منیش سەیرێکی گۆشە سەرقاڵەکەی چێشتخانەکەم کرد. دەستەیەک لە ژنان لە تەمەنی سی ساڵەیاندا پێکەکانیان لە یەک دەدا و پێدەکەنین. پیاوە قات لەبەرەکانیش ئاماژەیان بۆ هاوکارەکانیان کرد و لەسەر نانخواردن کاروباری خۆیان ڕادەپەڕاند. جووتەیەکیش لە سەر مێزی تەنیشتمانەوە هەڵسان، بە هەندێ لەو نوکتانەی خۆیان پێکەنین، وایان کرد ئیرەیی بە بەختەوەری و دڵخۆشییان ببەم.

من پێویستیم بە وشەگەلێک هەبوو تا ئەو کەلێنە خاوەی کەوتبووەوە بەینمان پڕبکەمەوە و ئەوەش بزانم ئاخۆ گەورەبوون لە دووری باوکێکی دەوڵەمەند چۆنە، بەڵام خۆ ئەوکات کارۆش هەواڵی باوکم دەپرسێ، ئەمەش بابەتێکی ئازاربەخش بوو. لە کۆتاییدا دەفری خواردنەکان لەگەڵ بوتڵێک شەرابی شیرازیمان بۆ هات.

دیاربوو کارۆ چێژی لەو بێدەنگییە دەبینی، کەچی منیشی دەتۆقاند. "ئەریٚ تۆ دڵنیای لەوەی ئەو هەموو درۆیە شتە ڕاستەکە بوو کە کرا؟" ئیدی من لە حاڵەتێکی خرۆشان و دڵپڕییدا بووم.

"ئەریٚ پێتوایە مانەوە لە ئێران باشترین شت بووبێ؟ پێتوایە لەویٚ شتگەلێک هەبن بتوانین بە باشترین شت ناویان ببەین؟"

"کەواتە تۆ ناتەویٚ ڕاستی بە دایبابت بڵێی؟ یان لانی کەم بە دایکت؟"

"لەیلا، هیچ کەسێک ڕاستی ناویٚ. هەمووان ئەوەیان دەویٚ کە پێیان خۆشە بیبیستن و ئاسوودەیان دەکا."

فرێکمان لە شەرابەکە دا، بە بێدەنگی لە گڤ هزرە پەرشوبڵاوەکانمان ڕاچووبووین. قورسایی ئەو وشانەی نەگوتران دەیهاڕیم. پشتم بە کورسییەکەمەوە دایەوە، پەنجەکانم لە پشت سەرم لەیەک گرێدان. "دەی لەبارەی چیاوە بۆم بدویٚ، هەموو شتێک کە دواساتی بە یەکەوەبوونتان گوتبێتی." خۆ ئەگەر ئەمە دوا ژەمە خواردنی بە یەکەوەمان بێ، ئەوا دەمویست تەواوی بەسەرهاتەکە بزانم.

ئەویش ئاهێکی هەڵکێشا، ددانەکانی خۆی لستنەوە، دیسان ئاهێکی دیکەی هەڵکێشا. "من... من پێمگوت واز لە تۆمارکردنی دیمەنەکان بێنە، ئاخر مەترسیدار بوو، بەڵام ئەو وازی نەهێنا."

منیش یەکسەر هەڵسام. "بوەستە، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟" لەگەل هەڵسانەکەمدا پەرداخی شەرابەکەی خۆم ڕشت، لیٚ گوێم پێنەدا، ئەوە بوو شەرابی سوور بەسەر دەستەسڕەکە و قاپەکەم وەک ئەوەی پەڵەی خوێن بیٚ ڕژا.

کارۆش بە سەرسامییەوە تەماشای کردم. "ئێمە سەربازمان بینین بە تێلاوە دوای خەڵکەکە کەوتبوون. چیاش گوتی دەبێ ئێمە فیلمەکەیان بگرین و بۆ میدیای نێودەوڵەتی بنێرین، وەک ئەوەی ئەوان مشووری بخۆن. ئای لەو نەفرەتە، بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر کارەکەی و پێی وابوو جیهان دەهەژێنێ."

"من تێناگەم." خواردنەوەکە هزرەکانی لێ تێکدام و بە سەختی دەمتوانی لە وشەکانی کارۆ بگەم. "چیا بوو فیلمەکەی گرت؟ کەواتە بۆ بە تەلەفۆنەکەی تۆ گرتی؟"

ئەو ڕاستییەکەی وەها ڕوونکردەوە: "هی من کامێراکەی باشتر بوو. چیا بۆ فیلمگرتنەکە لێی وەرگرتم."

منیش سەرم بادا. "نەخێر."

"چی نەخێر؟ خۆ ئەمە جاری یەکەمی نەبوو بیکا. هەموو ئەو وێنانەی کە ئەو گرتبوونی لەو کاتەی بە یەکەوە دەردەچووین بە کامێرای تەلەفۆنەکەی من گیراون. خۆ تۆ ناڵێی لە بیرت نەماوە."

بەڵێ بیرم هاتەوە. هەڵبەتە بیرم هاتەوە. ڕاست و ڕەوان ئەو ساتەم بیرهاتەوە، لە چەندین گرتەدا و لەبەرچاوی مندا چیا داوای لە کارۆ کرد تەلەفونەکەی ئەو بەکاربهێنێ.

لەسەر کورسییەکەی خۆم هەڵسام و هەنگاوێک بۆ دواوە کشامەوە. "هەرگیز ئەوەت پێ نەگوتووم." هەستمکرد دەنگم دەلەرییەوە.

"تۆ ئەوەت نەزانیوە؟ خواش بە خوایەتی خۆی نەیدەتوانی ڕێگە بە براکەت بگرێ، کاتێ شتێک لە کەللەی دابا."

ویستم لەسەر مێزەکە هەڵسم و بڕۆم، بەڵام سەرم سووڕا، گێژییەکەم وای لێکردم دابنیشمەوە. بە دەستم پەستانم خستە هەردوو لاجانگە بە مووچڕکەکەم.

ئەویش سەری هێنایە پێشەوە و گوتی: "ئەرێ تۆ باشی؟"

نا باش نەبووم، قایشی کراسەکەم ڕاستکردەوە. "باشە بۆ چی پێت نەگوتم؟"

"پێموابوو پێویستی نەدەکرد. خۆ ناڵێی تۆ لەو کاتەوە هەر واتزانیوە هەموی بیرۆکەی من بووە." قامکەکانی بۆ سەر سینگی بردن و سیماشی تێکەڵەیەک لە سەرسامی و بەرگری لەخۆکردن بوو.

"تۆ ئەو ڕۆژە ئەو کەسە بووی چیات لەگەڵ خۆتدا بردە دەرەوە، دەشتزانی چوونەدەر چەند دژوارە. تۆ هەندێ ڤیدیۆی خۆتت نیشاندایین!" دڵۆپە کەفێک لە گۆشەی لێوم پەیدا بوو، نەشمسڕیەوە.

"بە دڵنیاییەوە تۆ دەزانی من ئەو جۆرە فلیمانەم بە خۆ نەدەگرت. ئەوە خۆکوژی بوو. ئاخر بە نەفرەت بێ، سەربازی زۆرمان لە دەوروبەر بوون. باش بوو دەستبەجێ تەقەیان لێنەکردین!" هەرگیز جنێوی وەام لە دەمی ئەو نەبیستبوو.

ترپەی دڵم نەیدەویست خاوببێتەوە. "خۆ ئەگەر شتەکانم پێ نەڵێی نابێ گریمانەی ئەوە بکەی هەموو شتێک بزانم. خۆ من فاڵگرەوە نیم."

قامکەکانی لە لێواری پەرداخە شەرابەکەی بەردەمی خشاند، سیرەیەکی لێوەهات. ڕوانینیشی بزرکابوو. "تۆ پاڵم پێوەدەنێی تا

ڕاستییەکە بە ئەوانی دیکەش بڵێم، تا هەموویان ڕووبەڕووی ڕاستییەکان بکەمەوە، کە وەک دۆزەخ ئازارم دەدا. سەیری خۆت بکە. ئایا ئەگەر ڕاستییەکەت پێ بڵێم، دەرەقەتی دێی؟"

منیش باسکەکانم لەسەر یەک دانان و گوتم: "بەڵێ دەرەقەتی دێم."

"کەواتە زۆر باشە... من سەد ڕۆژی ڕەبەقم لە چاوە زیندانێکی تەنیاییدا بەسەربرد. کەسیش نەیدەزانی. دایبابم پێیان نەزانی، ئێستاش نایزانن. ئاخر کە ئێستا ئەو ڕاستییانەیان پێ بڵێم، ئەوا لە ئازار زیاتر چ سوودێکی دەبێ بۆیان." کارۆ وای قسەدەکرد وەک ئەوەی من هەر لەوێ نەبم.

لە کاتی قسەکردنەکەدا وەستا؛ "فرمانمان پێکرابوو تەقەیان لێبکەین، بەڵام من چۆن دەتوانم من....؟

بە چاوی مۆڵەقەوە لێم ڕوانی، هەوڵمدا تێبگەم. "ئەو کاتەی تۆ و چیا گیران؟"

بریسکەیەکی پڕ لە چاویدا هەبوو. "نەخێر. من ئەوکات هەر زوو بەڕەڵڵاکرام و کەمێک دواتر بە زۆر کردمیانە سەرباز. بەڵام لە سەربازیی سەگبابێک خەبەری لێدام. گوتبووی ئەگەر کارۆ بۆی هەڵکەوێ لەبری تەقەکردن لە خۆپیشاندەران، لێ دەگەڕێ بۆی دەرچن. من ئەرخەیان بووم هیچ کەسێک گومانم لێناکات. خۆم بە ئەکتەرێکی باش دەزانی." ڕوومەتی چەپەی نیوە بزەیەکی کرد، پرچە ڕەشەکەشی چاوەکانی داپۆشیبوو.

وشە لە مێشکی مندا هەر وەک دووکەڵ لە دەرەوییەوە. لە ژێر فشاری ڕاستییە نوێیەکە، بە بێدەنگی زرێ و چەکە نەبیراوەکەم دانا.

من پارەی خواردنەکەم دا. ئەویش مشتومڕی لەسەر نەکرد. بەرەو تەرمینالی کەڵەکەکە ڕۆیشتین لەسەر تەختە کەسکەکان بە بێ قسەکردن دانیشتین. کەمێک دەلەرزیم، هەرچەندە شەوەکەش گەرم بوو.

ئای لەوە، خۆ من هەموو وەختەکە هەڵە بووم. ئەوە چیا بوو کارۆی تووشی گێچەڵ کردبوو، نەوەک بە پێچەوانەوە.

منیش بە زمانگیرانەوە گوتم: "هەر لەبەر ئەوەبوو ئەو هەموو کاتەی چیا لە زیندان بوو، پەیوەندیت پێوەنەکردم؟"

""بۆ پێت وایە چیدیکە بوو؟ لەیلا، هەر بە ڕاستی چۆن بیرم لێدەکەیتەوە؟" کارۆ ڕووی تێکردم. ئەوم وەها هاتە پێشچاو وەک ئەوەی ئەو شەوە دە ساڵ گەورەتر بووە. "ئای چەند شتی زۆر هەبوو تا پێت بڵێم..."

"ئەدی بۆ چی وات نەکرد؟"

"ئاخر هەرگیز ڕێکنەکەوت. تۆ هەمیشە هەر توورە بووی، هەمیشە لە ژێر جۆرەها فشاردا بووی. بیرمکردەوە هاوبەشیکردنی کوێرەوەرییەکەم بێ سوود دەبوو یا تەنیا هەر باری سەرشانی قورستر دەکرد." ئەو ئاوڕی دایەوە و بۆ دووری ڕوانی. "نەمدەزانی کە نایزانی براکەی تۆ ئایدیالیستێکی نەترس بوو، نەوەک من."

منیش هەراسانانە سەرم بەردایەوە. "ئێستا وشە زەلالەکانی تۆ دەبیستم، بەڵام شتەکان لە سەری مندا.... هەموو شتێک بە جۆرێک بوو کە تۆ ئەوت بە گرتن داوە، خۆشت ڕزگارکردووە؛ ئینجا ئەو کاتەی زۆر پێویستم پێتبوو، دەستبەردارم بووی. بەئەرک نەبێ، دەکرێ لە گۆشەنیگای منیشەوە لە شتەکان بڕوانی؟ دوای ئەوەی

ئەو کوژرا، تۆ دەرکەوتیتەوە و وەک فریادڕەسیش دەرکەوتی. تەنانەت ئەوەش بەدگومانییەکانی زیاتر کرد بەوەی خەریکی گوناهەکانت قەرەبوو دەکەیەوە. ئیدی سەرم بادا، نەمتوانی درێژە بە قسەکەم بدەم.

ئەویش دەموچاوی لەنێو هەردوو دەستیدا گرتبوو. "دوو مانگ دوای ئەوەی لە زیندان بەردرام، بینیم ناتوانم دەست بە خوێندنەکەم بکەمەوە. ئاخر نەمدەتوانی درێژە بە نمایشەکە بدەم. هەڵبەتە، ئەوەش واتای ئەوە دەگەیاند، کە بە زۆر هێنرابوومە ڕیز و لە یەکەی تایبەت[194] و دانرابووم، چونکە من کەڵەگەت بووم، ئەوانیش بڕیاریاندا دەبێ بچمە ڕیزی هێزی پاسەوانیی دەستەبژێر، کە مەشقیان لەسەر داپڵۆسینی خۆپیشاندەران پێکرابوو. لێ ئەمە لە توانای مندا نەبوو. ئاخر چۆن من دەبمە ئەو شتە؟ مەبەستمە بڵێم، چۆن کەسێک بە چەکەوە پەلاماری خەڵکی بێچەک بدا؟"

کاتێک چیرۆکی ئازار و ئەشکەنجەی بە چەند وشەیەکی کورت دەردەبڕی، دەنگی نووسا. لەودیو، لە ئاسۆی پشتی ئەو، تریفەی مانگ لە ئاوەکەی دەدا و دەبریقایەوە.

"کۆتاییەکەم بە هۆی پێشێلکردن و لاساری فەرمانەکان ئەوەبوو، بۆ ماوەی سەد ڕۆژی ڕەبەق بخرێمە زیندانێکی تاکەکەسی، تاکە یاوەریشم جرجێکی برسی بوو."

تۆ بڵێی هەستی زیندانێکی تاکەکەسی بۆ سەد ڕۆژ چی بێ؟ وێڕای ئەوەش، سێ مانگی لە دەستبەسەری لای دەزگای هەواڵگریی بەسەر برد، چونکە ڕێگەی دابوو برادەرەکەی فیلمی دیمەنی

---

[194] yegan-e-vizhe

کوشتاری دەوڵەت بگرێ. دایک و باوکی کارۆ هیچیان لەبارەی زیندانیبوونیەوە نەزانیوە، کەواتە بە بەراورد لەگەڵ ئەو هەموو ڕووداوەی پەردەیان بەسەردادرابوو، ساختەکردنی "هاوسەرێتیمان" درۆیەکی هێندە گەورە نەبوو.

کاتێک کەڵەکەکە بەرەو لەنگەرگای خۆی لار دەبووەوە، تریفەی مانگەشەو وێنەکانی بەرەو ئاسوودەییەکی ڕوونتر دەبرد. دیمەنەکە لە ناخی مندا هەستی نۆستالگیایەکی قووڵی دلۆڤانی بزواند وەک ئەوەی لەوەتەی هەیە ناسیبێتم.

کەڵەکەکە گەیشتە تەرمینالەکەی خۆی لە سەرەتای شەقامی بێی ستریت. بە پێ لە دەروازە ئاسنینەکە هاتینەخوار، دەست لەناو دەست و شان بە شان، پێشتر هەرگیز وەهامان نەکردبوو.

دیوارەکانی وێستگەکە کاتێک میترۆ نیوە بەتاڵەکە بە خێرایی بە نێو ژێرزەمین و بوبرە[١٩٥] تاریکەکاندا تێدەپەڕی، وێک دەهاتنەوە و لە یەک دەبوونەوە. کارۆش سەری لەسەر شانی من دانابوو، منیش سەرم لەسەر سەری ئەو، هەموو ئەو نەخشانە هەڵوەشانەوە کە پێشتر بە پەرۆشەوە لەهزری خۆمدا کێشابوون، خەونی خاتونێکی بەهێزی ئازاد و سەربەخۆ.

کاتێکیش گەیشتینە وێستگەی ڤیتار، گوتم حەز دەکەم ئەو مەودایە تا ماڵێ بە پێ بڕۆم. هێشتاش بەشێک لە من لە مانەوەی تەنیایی لە تاریکییدا زراوی دەچوو، بەڵام یۆنگستریت بایی خۆی خەڵکی لێ هەبوو، بایی ئەوەندە بە ئاسایش بوو تا مێشکم بێتەوە سەرخۆی.

---

[١٩٥] بوبرە: تونێل.

ئەویش گوتی: "لە ماڵێ دەتبینیمەوە. ئەگەر ویستت بۆ شوێنێک هەڵتبگرم، زەنگم بۆ لێدە." منیش باوەشێکم پێدا کرد و ئەویش بۆ یەکەم جار لێوەکانی لە سەر ملە ڕووتەکەم دانا.

لە سوپەرمارکێتێکی ئێرانی کارتێکی تەلەفۆنی نێودەوڵەتیم کڕی، کۆدەکەم خستە نێو تەلەفۆنەکەم و زەنگم بۆ ژمارەی تەلەفۆنی جوانە لێدا. پێویستم بەوە بوو هەواڵەکەی پێ ڕابگەیەنم، پێی بڵێم کارۆ چیای تووش نەکردووە هەروەها بە مەبەستیش منی پشتگوێ نەخستبوو. من لەوەدا گەمژە بووم، ئای چەند نابینا بووم.

زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدا و هەر لێیدا، بەڵام کەس تەلەفۆنەکەی هەڵنەگرت.

جارێکی دیکە ژمارەکەم لێدایەوە، یەک دوو جار کۆدەکەم بە هەڵە لێدا، پاشان زەنگ لێدانەوە دیسان هەر زەنگ لێدانەوە. من نامراد بووم لەوەی لە جوانە بپرسم ئاخۆ شتێکی ڕەوایە ڕێگە بە خۆم بدەم ئەم جارەیان بە تەواوی کارۆم خۆش بوێ، ڕێگە بدەم ئەو هەستەی ساڵانی ڕابردوو سەرئاو بکەوێ و ببێتە ڕاستی. ژنێکی تووڕە لە کۆتاییدا وەڵامی زەنگەکەی دایەوە، لێ جوانە نەبوو، گوتی جوانە لێرە باریکردووە و کەسیش نازانی بۆ کوێ چووە. هەروەها ئەوەشی وەبیر هێنامەوە، کە ئێستا لە ئێران بەیانییەکی زۆر زووەوە و ئیدی تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

نەمدەزانی لەو حاڵەتەدا چی بکەم. ئاخر پێویستم بەوە هەبوو دەستبەجێ قسە لەگەڵ یەکێک بکەم، کەواتە ناردنی ئیمێلێیش بۆ شلێر بەس نەبوو. دەبوو بە دەنگێکی بەرز قسەبکەم، قسە لەگەڵ یەکێک بکەم تا بڕوا بە دۆخە نوێکەم بێنم و هەرسی بکەم.

ئەوە بوو زەنگم بۆ دایبابم لێدا. دوا جار کە پەیوەندییم کردبوو بابە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، لێ هەر گوێی لە دەنگم بوو یەکسەر دایخستەوە. ئەم جارەیان دایکە وەڵامی دامەوە، باسی دارهەنار بە گوڵناری چرووپرەوەی بۆ کردم. ئیدی دایکە هەر باسی خۆی کرد، ئەوەی فەرامۆشکرد لێم بپرسێ ئاخۆ چۆن لەگەڵ ولاتێکی بیانی هەڵدەکەم و یان چوومەتە زانکۆ یان نا. "ئەرێ بابە لەگەڵ هەواری تازەی چۆنە؟"

"پێم وا نییە جارێکی دیکە ئەو کەیفی ساز ببێتەوە، بەڵام هێور و ئارامە. لێ چەندین ساڵە بەم شێوە کەیفخۆشییە نەمبینیوە. لێرە دۆست و برادەری هەن، برادەری سەردەمی منداڵی.

لێم پرسی تۆ بڵێی جوانە لە کوێ بێ. ئەویش گوتی باوکت لەو بڕوایە دایە جوانە خۆی گەیاندبێتە شلێری کچی لە رۆژئاڤا. من تەلەفۆنەکەم بە سینگمەوە نابوو، خواحافیزیمان لە یەک کرد. ئیدی بێهوودە بە سەر شەقامی یۆنگ ستریتدا رۆیشتم، لە نێو خەڵکیدا بە دوای سیمایەکی ئاشنادا دەگەڕام.

گەنجێک لە لای یانەیەکی شەوانە باوەشی بە کیژێکدا کردبوو، بە تاسەوە ڕایدەمووسی. پەنجەکانی کچەش پرچی کوڕەی ڕاکێشا و دەمیشی بۆ ماچەکەی کردەوە. ئیدی منیش دەستم بۆ تاکسییەک ڕاگرت.

## بەندی سی و نۆ

کارۆ لەبن پەتۆ شینەکەی پێخەفی، خۆی لوولدابوو، کراسە سپییەکەشی توند بە ماسولکەکانی سینگیەوە نووسابوو، کاتێکیش منی بینی چاوێکی لە جانتا داگیراوەکان و پاشان ڕاستەوڕاست نیگای لە بنمیچەکە کردەوە.

منیش لە تەنیشت پێخەفەکە وەستام. "کارۆ تۆ کەسێکی بە هەموو جۆرێک زۆر لە من باشتری. من ئەوەندە لە نێو ناسۆردا نغرۆ بووبووم، نەمدەتوانی هیچ شتێک یان هیچ کەسێکی دیکە ببینم. داوای لێبوردن دەکەم."

ئەو چاوی بڕیە چاوم و باوەشیشی کردەوە. منیش دانەویمەوە و دەستێکم لە سینگی دا.

ویستم بە دەمی کراوەوە گازی لێبگرم و بۆ خۆمی ببەم. ئەو تاسە لەپڕەم هەڕەشەی ئەوەیکرد جامی سەرم شەق بکا.

"کەواتە دەمێنیتەوە؟"

سەرم بۆ لەقاند.

چاوەکانی بۆ خەندەیەک بریسکانەوە. "ئیدی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە دەبینە ژن و مێرد؟"

"ڕۆژێکی دیکە." من وەهام پێگوت. "ڕۆژی دیکە، کاتم پێویستە."

ئینجا بە یەک تەکان هەڵسایەوە، قیت وەک ئەوەی لەسەر شەپۆل یاری بکا، هات و لای من لەسەر پێخەفەکە دانیشت.

"هەرگیز وەهام بیر لە تۆ نەکردووەتەوە، چاوەڕێی ئەوەت لێبکەم منت خۆشبویَ تا..." بە دەم ئەم قسەیە شانی هەڵتەکاند، ئینجا ڕستەکەی تەواوکرد: "تا چاکەی یارمەتییەکەم بدەیتەوە، لێ بە دڵنیاییەوە هیوام وابوو تۆ من وەک هەم بمناسی و خۆشت بوێم." ئینجا دەستی گرتم، بە هێواشی گوشی، پێدەچوو متمانەی پەیداکردبێ و بە ڕەوانیش بدوێ. "لەیلا، هەمیشە هەر خۆشم ویستووی. دیار بوو هەر تۆ بێ مەیل بووی."

"ئەرێ چییە شێت بووی؟ باشە بۆ چی هیچ شتێکت دەرنەبڕی؟"

ئەوەندە زۆر حەزم لە دۆستایەتی تۆ و چیا بوو، ترسام مەبادا بە داوای زۆرتر تێکی بدەم و بیشێوێنم. کاتێکیش ئامادەبووم خۆشەویستییەکەمت پێبڵێم، کێفەڕات بە دوای کێفەڕاتدا هات."

"ئێستاش دایکت پەسەندم ناکا."

"هەروەها هی تۆش من پەسەند ناکەن. خۆ ئێمە دەتوانین لە شوێنێکی دیکە بژین. پێویست ناکا لەم چاوە خانییەی ژێرزەمینەدا بژین. من لە ڤانکۆڤەر، لە سەنت جۆن، لە هەر شوێنێک حەزت لێی بێ بە دوای کاردا دەگەڕێم."

"خۆ ئەگەر...؟" ئەو ئارەزووەم بە سەردا زاڵ بوو، کە قەپاڵێک لە ماسوولکە دووسەرەکەی قۆڵی بگرم.

"ئەرێ هەر بە ڕاستگۆیی و بە کردەوە دەکرێ لە لۆمەکردنم لەسەر چیا بوەستی...؟" ئینجا بە دەستی یاری لەگەڵ قژم کرد. "ئاخر من هەموو ڕۆژێ ئەمە لە چاوتدا دەبینم. تۆ دەبێ بەڵێنی ئەوەم پێبدەی، هەر کاتێک لەگەڵم ناکۆک بووی، ئەم شتە بە چاوم دانەدەیەوە."

"ئەوەی ڕاستی بێ..." قسەکەی خۆم خواردەوە. "من هێشتا هەر غەمگینم، بەڵام لەوە تێگەیشتم نابێ لۆمەی تۆ بکرێ." خۆ دایکی ئەویش ژنێکی تەنیا و خاپینۆک و پەراوێزخراو بوو، کەچی هەرگیز نە خۆی و نە کەسانی دیکەشی نەپەژراند.

بەری دەستی گەیشتە سەر ڕوومەتم، منیش لێوم گەیاندێ و ماچێکم لێ کرد. ئینجا ئەو کەزیەکەی کردمەوە و دەستی تێوەردا و بە پەنجە ختووکەی پیستی سەری دام. ئیدی تەوێڵمان گەیشتنە یەک، ئینجا کەپوومان. "دەکرێ ماچت بکەم؟"

"کارۆ، بوەستە. من دەمەوێ لەگەڵ تۆ بم، هەر بە ڕاستی وەهام دەوێ، بەڵام ژیانیشم بۆ خۆم دەوێ. ئەوەش تاکە دەرفەتی منە بۆ ئەوەی دەستپێبکەمەوە."

ئەویش وەستا، لێوەکانیشی هەر بە چەند ئینجێک لە هی من دوور بوو.

"من بۆ خوێندنی فیلمسازی، داواکاریم پێشکەشی یەک دوو زانکۆ کردوون. ناتوانم خوێندکەم هەڵبوەشێنمەوە. نامەوێ چیدی بەدیهێنانی خەونەکانم دوابخەم."

"هەڵبەتە، هەڵبەتە." ئینجا پاڵی بە پشتەسەرمەوە وەنا و لە خۆی نزیک کردمەوە، منیش بۆ ماچێکی درێژ لاربوومەوە، تامی لێوەکانی ئەوم لە نێو ددانەکانم کرد، تامی ژیان و شیرینی. بۆ جارێک دژی مەیلم نەوەستامەوە و دەستم بردە بن کراسەکەی و بەسەر سمتیمدا هێنا. ئەویش لێوی بەرەو هێڵی چەناگە، ئینجا بەرەوخوار تا ئێسکی چەڵەمە هێنا.

منیش بە سرتەوە: هێواش. ئاخر حەزم لێبوو چێژی لێوەربگرم.

ئەویش بە زەردەخەنەیەک لە چاویەوە دیاربوو گوتی: "باشە."

بۆ ماوەیەکی درێژ یەکدیمان ڕامووسی. بە دەستێک کەمەری گرتم و دەستەکەی دیکەش ڕوومەت و ملم. بە سووکی دەستم بەسەر قۆڵیدا هێنا و چاوەکانیشم داخستن تا تیشکۆی تام بخەمە سەر لێوەکانی، بۆنە خۆش و نەرمەکەی دوای ڕیشتاشینەکەییم هەڵمژی. چاوەکانم کردنەوە تا بیسەلمێنم ئەمەش خەیاڵ و داڵغییەکی دیکە نییە. دیسان دامخستنەوە تا چاوەکانی سەرنجم لە سەر لێوەکانی دوورنەخەنەوە. بە پێچەوانەی کاراکتەری فیلمەکان و بە پێچەوانەی ئەو جووتە کوڕ و کچانەش لە سەر شەقامەکان دەمبینین، لە کاتی ماچکردنەکەدا ئەو چاوی کردبوونەوە، وەک ئەوەی بترسێ هەر کاتێ چاوی نووقاندن من ڕەشببمەوە و نەمێنم. هەستم بە گەرمی جەستەی کرد، گەرمایی هەناسەی تا دەهات هێورتر دەبووەوە. بەڵێ ئەمە بوو. ئەو ساتەی هەردووکمان تێنووی یەکدی بووین، بێ ئەوەی بە یەکدیش بزانین. ئیدی لە پڕ ماچەکانم وەستاند.

هەڵستام و هەستم بە گێژی و چێژ کرد. ئاخر پێستەکەم شەقی دەبرد، تفرەکەم[196] لە خۆمدا دەڕنی.

ئەوە بوو جلەکانم فڕێدان. ئەویش بنکراسەکەی داکەند و زنجیری دوولینگەکەی ترازاند. بە تویێ دەرپێی کورتەکەمەوە لەسەر ڕۆخی پێخەفەکە دانیشتم. دوای وچانێکی کاتی، کارۆ پاڵیخستم، ئینجا خۆی خزاندە سەرم. من لە کازیوەی ژیاندا بووم، لە دۆخێکی

[196] تفر: توێژ، کاژ. پێستی سەروو کە هەندی گیاندار دایدەماڵن و نوێ دەبنەوە. قەپێلک.

وا لەو مەودایەدا بە تاسەی کارۆوە بووم، بێ ئەوەی هیچ شتێک و هیچ کەسێکیش لەو دەورە بێ.

ئەوە بوو دەمە گەرمەکەی لەسەر لێوم گواستەوە بۆ سەر مەمکەکانم و ئینجا خوارتر بۆ سەر ناوکم. دەستیشی بەسەر ڕانم و لەوێوە بۆ ناو گەڵم گواستەوە. ئینجا مەمکدانەکەی لابرد ژێر مەمکی چەپمی ماچکردم. موچڕکێکی خۆشی پەڕییە بڕبڕەی پشتم و گڕ لە هەناوم بەربوو. دەرپێیەکەی خزاندم و بە شێنەیی لایبرد و زمانیشی گەیاندە نێوگەڵم.

بە دلۆڤانییەکی بێئەندازەوە چرپاندی: "خۆشەویستەکەم، ئەمە باشە؟"

لەوێ لەسەر پێخەفەکە، لە دەرەوە دەنگی باران، مانگی درەشاوەی تابان، ئەویش خەریکی من بوو، بە خۆم نەبوو پرچی ئەوم گرت و ڕامکێشا و لێوی خۆم گەستنەوە تا لە هاوار نەدەم. پاشان هەندێ خۆم لارکردەوە تا تەکان بدەمەوە، لێ ئەو هاتەوە سەرم، لێوی راموسیم، شانەکانی گرتم و چاوی لەچاو کردم و هەوڵیدا ڕێگەی لە نێومدا بکاتەوە. جەستەم توند و گرژ بوو.

"هەر کاتێک بتەوێ دەکرێ بوەستم." بە دەم ئەم قسەیەوە تەوێڵی ماچ کردمەوە ئینجا چاو، لێگەڕا ڕوومەت و ملم هەست بە گەرمی هەناسەدانەوەی بکا، بە ماچە نەرم و خۆشەکەی دەمارەکانی هێورکردمەوە و سەرتاپای جەستەم خاوبووەوە.

جارێکی دیکە چاوم کردنەوە. خەندەی بۆ کردم، چاوەکانی پڕ لە مشوورخواردنێکی بێ پێشینە بوون. سەر سینگم پڕی وردە خوناو بوو.

هەستمکرد ئەو لە ناوم دایە و جێی ددانیشم بە سەر باسکی بەجێمابوو.

ساتە گرژیەکەی ئازار، بە خۆشی چێژە لەبن نەهاتووەکە ڕەویەوە، ئەم هەستەش وەنەبێ هەر بە هۆی ئەوەوە بووبێ کە کارۆ لەگەڵ جەستەکەمدا کردی. ئاخر ژیان ئەوە بوو: ساتێکی کورتخایەنی شادی لە نێوان ناسۆرێک و ئەوەی بە دوایدا دێ.

ئەو لە کاتی گونجاوی خۆیدا کشایەوە و دەرپێ و فانیلەکەی کردنەوەبەر. منیش سەیری ئەو دڵۆپە خوێنانەی سەر چەرچەفەکەم کرد، کە نەریت وابوو هێمای نامووسی بوکە نوێیەکە بێ. ئەویش بە ئاماژە پێکردنەوە: "ئەمە هۆیەکی دیکەی ترسم بوو کە دەستت لێبدەم."

"تۆ خوێنت لێنەهات، کەواتە وای دادەنێم تۆ پاکیزە نەبوویت."

ئەو بزەیەکی کرد. "پێش ساڵێک لە ناسینی تۆ لە پەیوەندییەکدا بووم."

"ئەمەش شتێکی گرنگی دیکەیە کە لەبارەی تۆوە نەمدەزانی. ئەرێ هەرگیز بەسەر بانکێکت داداوە، تەرمێکت فڕێداوە؟"

ئەو لە سەر پشت ڕاکشا و منی بۆ سەر سینگی خۆی کێشکرد. "نەخێر. چاوەڕێ دەکەم ئەو شتە خۆشانە لەگەڵ تۆدا بکەم."

بەم شێوەیە بە تێکئاڵاوی لە چەرچەفەکان بە ڕاکشاوی ماینەوە. بە سەری پەنجەی گەمەی بە پرچم دەکرد، گوێم لەسەر دڵە بەخورپەکەی دانا. ئەوسا گوتم: "لەوانەیە ئێمە تاکە جووتە بین، ئەو هەموو کاتە وەستابین تا زەماوەندەکەمان بکەین."

ئەویش گوتی: "ئەرێ فێرە کوردیم دەکەی؟ پێویستە منداڵەکانمان بە زمانی دایکیان بنووسن و بخوێننەوە."

برۆم بەرزکردنەوە و گوتم: "منداڵ؟"

بە ئاسوودەیی، لە باوەشی یەکدیدا پێکەنین.

هەڵسام و بە ڕێڕەوەکەدا خۆم گەیاندە حەمامێ. ئاوی گەرمم کردەوە، چوومە نێو بانیۆکە. کاتێکیش چاوەکانم نووقاندن، چیا بە خەندەوە سەری بۆ لەقاندم.

"کارۆ!"

"بەڵێ گیانەکەم" کارۆ لە دەرکە بەدیارکەوت، قۆڵیشی نیشانەی ددانەکانمی بە سەرەوە بوو.

دڵنیا نەبووم لەوەی ئاخۆ چی دەڵێم. "من تازە لەوە گەیشتم، دوای ئەو هەموو شتانەی بەسەرمهاتوون، سەرەنجام من تەنها هەم. دەکرێ کۆتاییەکە بریتی بێت لە - هەم. بێگوێدانە ئەوەی -هەم - لە ڕستەکەدا چیی بەدوادا دێت. ڕاستییەکەی دەکرێ چیرۆکەکە هەر بە – هەم - کۆتایی پێ بێ."

سەری بەرزکردەوە، برۆکانی لە سەر ڕووی نیشانەی پرسیارێکیان کێشا. "باشە؟"

"مەبەستم ئەوەیە، پێویست ناکا بیر بکەمەوە کە من کوردم یان خوشکی چیام، ڕاستە؟ هەر تەنیا هەبم. تەنیا بڵێم ئەوە منم. خاڵ و سەری دێر. ئەرێ لە مەبەستەکەم دەگەی؟ تەنیا هەبوون."

برۆی بەرزبووەوە مۆڕەییەکەی نەما. "باشە" ئیدی هاوڕابوو. "تۆ هەیت. من هەم. خاڵ و سەری دێڕ." بۆ قوتوی هەویری ددانەکە

دانەویەوە خێرا کەفی لێوەهێنا. منیش پێکەنیم. یەکدیمان ماچ کردەوە. ئەو دەستی تەڕی گرتم، دەستی لەسەر لە نێوچاوان دام. ئاو و کەفەسابون لە مستمان هاتەخوارەوە.

خۆم شوشت و لە نێو بانێوکەی حەمامێ هاتمەدەر. کارۆ لەنێو دەرکە وەستا بوو سەیری دەکرد. کەفاو لە سەرمەوە دەڕژا و بە لاملمدا هاتەخوارەوە، هاتە سەر پەڕی مەمکی چەپەم، ئینجا لەوێشەوە بۆ سەر کاشییەکە. ئەو لاملی ماچ کردم و ئەو دڵۆپە ئاوانەی سەر ناوکیشی لستمەوە. منیش ڕووی سەر وشکەرەوەکەم لە ڕووی کردە وی.

تەمی سەر ئاوێنەکەم لادا. کیژەکە لە پشت ئەو هێڵانەی لەسەر تەمی ئاوێنەکەم کێشابوو، بریسکایەوە. لەگەڵ ئاوێنەسڕینەوەدا بە چرپەوە گوتم: "تۆ ئازادی! تۆ جوانیشی". کچەش خەندەیەکی پڕ بە دەمی بۆ کردمەوە.

لە ژووری نوستنێ کارۆ پاڵ کەوتبوو، پەلوپۆی لەسەر چەرچەفە بە پەڵەکە و قۆڵێکیشی بە سیسەمەکەدا شۆڕ بووبووەوە.

منیش لە نێو جانتاکاندا گەڕام. کاتێ کراس و دەرپێ جوان قەدکراوەکانم لێککردنەوە، گەیشتمە ئەو کتێبانەی لە ژێرەوە دامنابوون.

فایلەکە. بەڵێ فایلەکەم بە سینگەوە نا. ئیدی ئامادە بووم.

ژیان گوفەک[١٩٧] بوو. تۆ بڵێی چ شتێک بێ ئەو توانستە بداتە ئادەمیزاد تا پاشەڕۆ و زبڵ بە سەرچاوەیەکی بایەخدار بگۆڕێ و

---

[١٩٧] گوفەک: ئەو شوێنەی هەرچی پیسایی و زبڵە لێی فڕێدەدەن. بۆیەش زبڵدانم بەکارنەهێنا، چونکە زبڵدان زیاتر شتێک دەگرێتەوە، کە زبڵی تێدایە و سەریشی

چێژ لەو خونچە گوڵانە ببێنی، کە لەنێو زبڵدا دەبنەوە. یان لەوانەشە ژیان پەین بووبێ. ئەزموونمان لەسەر یەک کەڵەکە بوو، ببووە زەمینەیەکی لەبار، ئینجا گەرمایی ژیانیش و هەندێ تۆو کە لە تاریکییدا ڕوێنران، چەکەرەیان کرد و پشکووتن.

کارۆ دەستخەتە لارەکەی چیای خوێندەوە: "لە خۆبەڕێوبەرییەوە بۆ خۆلەناوبردن: دژبەرییەک لە ژیانی ژنانی کورددا.

"دەتوانی کۆمەک بکەی؟"

ئەو لە پشتەوە منی گرت، هەناسەی بەر پشتە ملم کەوت. "هەڵبەتە."

پاشەڕۆژ بە شادمانییە زۆروزەوەندەکەی خۆیەوە هی ئێمە بوو. ئیدی مانگی چواردەی منداڵیم کەوتە خەندە.

---

داپۆشراوە، کەچی نووسەر وشەی landfillای بەکارهێناوە، کە ئەو پارچە زەویەی زبڵی لێ ڕوودەکرێ تا چارەی دەکرێ.

## پاشبەند

پەلوپۆ لاواز و ناسکەکانی ئالان لەبن پەتۆیەکی ڕەنگ شینی ئاسمانیدا داپۆشرابوون و سێ سەرینی درابوونە بەر پشت و ملی. دەستەسڕی قەدکراو، بوتڵێک ویسکی، دەفرێکی پڕ لە پارچە سەهۆڵ، پاکەتێک لە حەب، هەر یەکێکیان ڕووبەرێکی لەسەر ئەو مافوورە گرتبوو، کە دایکی چەند دەیەیەک بوو چنیبووی. هاناش بە دەم جووینی پارچە کێکێکەوە لەسەر کورسییەکی دارینی ڕەنگ کاڵبووەوە، نەرمە جۆلانەی دەکرد و لەبەر قەڵەویش، ڕانەکانی بە هەردوولای کورسییەکەدا شۆڕبووبووەوە. لالەنگییەکی گەنیویش بۆنێکی ناخۆشی لێوەدەهات، کەسیش هەر گوێی نەدەدایێ.

ئالان و هانا بە دیار کەناڵێکی سەتەلایتی کوردییەوە دانیشتبوون، کە لە سوێدەوە پەخشی خۆی دەکرد. تەلەفزیۆنەکە ئەوەی ڕاگەیاند؛ هەرچەندە چیدی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیی داعش بەسەر هەندێ ناوچەی دیاریکراو لە سوریا و عێراقدا نەماوە، بەڵام شانە نووستووەکانیان لێرە و لەوێ درێژە هێرشی خۆکوژیانە دەدەن.

خۆر بە سەر ئاسمانی شاری هەڵەبجەدا درەوشاوە بوو. لەودیو پەنجەرەکەیانەوە، هەندێ لە گوڵە سوورە گەشەکان دەبریسکانەوە، گەڵای شێوە لاکێشەیی نەمامێکی بیست پێ بەرز خەریکبوو بە هێورەیی دەبووە هەنار. خانووە یەک نهۆمییەکەیان بەسەر پارکێکەوە دەیڕوانییە گۆڕەپانی گەمەی منداڵە کەمئەندامەکان، ئەوانەی دەیانتوانی بە کەم ئەندامێتیی خۆیان یاری بە کەلوپەلە

ڕەنگینەکانیان بکەن. ئەو منداڵانەی لە کاتی جینۆسایدەکەدا تووشی کیمیاوی بووبوون، ئێستاش بوونەتە دایبابی منداڵانی وا، کە بە کەمئەندامییەوە لەدایک بوون.

وێنەیەکی لە چوارچێوە گیراوی چیا، هی کاتی دەرچوونی لە خوێندن، بە دیوارەکەوە لە نێوان پێخەف و کورسییەکە هەڵواسرابوو. گوڵبەندێکیشی بە ملەوە کرابوو. لە گۆشەیەکی چوارچێوەکەدا، وێنەیەکی بچکۆڵە هەبوو، هی ڕۆژگاری منداڵی، کە دەستی دایبابی گرتبوو. لێ کاتێک یەکێک لێی نواڕیبایە دەیبینی لەبەر تەپوتۆز، وێنەکە کاڵ بووبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرنجی خاپینۆکانەی چیایان دەبینی، کە سەیری گۆشەی لای ڕاست دەکا. کیژۆڵەیەکی بچکۆلانە بە خۆی و تەنوورەیەکی خەتخەتەوە بە سەر پانتلۆنەکەیدا هاتبووەخوارەوە، بەڵام دیاربوو بە مقەسێکی کول بە خراپی بڕدرابوو. لە وێنەکەدا، نیگای ئالان هیچی پێوە دیار نەبوو، کەچی هی هانا شاناز بوو.

لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکە کەسانی قاتلەبەر تاوتوێی بایەخی ئایدۆلۆژیای ڕووبەڕووبوونەوەی پاش ڕزگارکردنیان دەکرد. ئەوەی بە شێوەیەکی باڵکێش لە شاشەکەدا پەخشکرا، ڤیدیۆی شار و گوندە وێرانکراوەکان بوو، لایەکی شاری دێرین و بیناسازییە هونەرییەکەی تەخت بووبوو، باڵەخانەی نیوەسوتاو، دیوارەکانیش بە چەشنی بێژینگ بە گوللە کون کون کرابوون، پشیلەیەکی سێ قاچ لە نێو تەپوتۆزی دارِماوی داروپەردوودا دەیمیاواند.

"هیچ شتێک نەگۆڕاوە." هانا بە دەم ئەم قسەیەوە لەسەر کورسییەکەی دانیشت و چەند جارێک هەژاندییەوە. ڕووی پڕ لە

هیوای منداڵە ئاوارەکان، ڕووی بە خەندەی شەرمنانە کاتێک چاوی کامێرای سەردانکەر دەچووە سەریان، بە تەواوی لەگەڵ دیمەنی دارمانەکان ناکۆک بوو، کە هەر چەند چرکەیەک پێشتر لێدرابوون. "ئێمە سەد ساڵ بەر لە ئێستا دەکوژراین؛ ئێستاش هەر دەکوژرێین. ئەوسا و ئێستاش ماڵوحاڵمان دەڕووخێنرێ. ئەوکات هاڕینی سەر و ئێستاش ڕووخاندنی ماڵ."

ئالان بە دەستەسڕێک ئارەقەی لە خۆی سڕی. ڕیشە پەرتە لاوازەکەی بە تەواوی سپی بووبوو. "ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟ جیهان بە خۆی پشتی بە کورد بەستووە تا داعشە بکوژەکان ببەزێنێ. کاتی خۆی باوک و مامەکانم پێشبینی ئەوەیان کردبوو."

هانا بە دوای چاویلکەکەی چاوی لە ژوورەکەدا گێڕا، هەستیکرد لە سەر ناوکەوەکە کەوتووە، بەڵام دوور بوو، پەنجە خرپنەکانی نەدەگەیشتنێ. ئەوە بوو دەستی دایە قوڵفی گۆچانەکەی. دیواری پشتەوەی پەڵەی جێ سۆبەی کۆنینەی دارانی پێوە بوو. هەموو قورسایی خۆی خستە سەر گۆپاڵەکە، بەرلەوەی دانەوێتەوە و چاویلکەکەی هەڵگرێتەوە هەنگاوێکی بۆ پێشەوە نا. لە کاتی هەوڵدان بۆ هەڵستانەوە چاوی نوقاند و نەفرەتێکیشی لە دەم دەرچوو. "ئەرێ ئەو کچە کەی دێ؟" تۆ گوتت سەعات ٥:٣٠ دێت، کەچی ئێستا ٥:٤٠ە. ڕەنگبێ تۆ خستبێتتە سەر کەناڵێکی هەڵە." ئیدی بە شەلەشەل گەڕایەوە سەر کورسییەکەی و هەر وردە کێکیشی لە پاش بەجێدەما. ئالانیش لە سەر جێگەی خۆی بە بێدەنگی بە سیلەی چاو تەماشای تەلەفزیۆنی کردبوو.

دەستەیەک لە نەوجەوانان ئامادەبوون لە پارکەکە یاریی دوو گۆلی بکەن، پێڵاوە نوێیەکانیان بە شاپلێدان لە تۆپ نمایشدەکرد، ئەمەش لەو کاتەیدا ڕاهێنەرەکان داوایان لێکردن مەشقی خۆ گەرم داهێنان بکەن.

هانا دەستێکی بۆ پرچی برد. پرچێکی پەرشوبڵاوی تێکەڵەی خۆڵەمێشی و خەنەی پرتەقاڵی و ڕەش. ئینجا دەستی بۆ کۆنترۆڵەکە برد، کە گۆشەیەکی لەسەر پێخەفی ئالان دانرابوو، ئەوسا کەناڵەکانی گۆڕی، کەناڵی کوردی زیاتر کە کلیپی موزیک و هەڵپەڕکێ و بەرنامەی سیاسییان لە ئەورووپاوە پەخشدەکرد.

پێشکەشکارە ناودارە ڕووگەشەکە وەهای لە مێوانەکەی پرسی: "کەواتە چی هانیدای ئەم فیلمە بە هێزە دروستبکەی؟" هەر لە دوای ئەم قسەیە، کامێراکە وەرسووڕایە سەر دەموچاوە بە بزەکەی میوانی بەرنامەکە. هانا دەمی لێ بەش بوو، پەنجەی لەسەر کۆنترۆلەکە لەرزی و دوگمەیەکی داگرت. کەناڵەکان ئۆتۆماتیکیانە گۆڕان، دیدارەکەی لێ ون بوو.

ئالان و هانا بۆ چەند چرکەیەک سەیری یەکدییان کرد، ڕوانینێکی درێژتر لەو هەموو ساڵانە و بە دوای سەلماندنیشدا گەڕان. کاتێ ئالان کۆنترۆلەکەی لە هانا وەرگرتەوە ئاگای لە دەست لەرزینەکەی ئەو نەبوو، دوگمەی کۆنترۆلەکەی داگرت و داگرتەوە، لەبەر پاترییە نیوەمردووەکەی بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نەدەدا و کەناڵەکانی نەدەگۆڕی.

کاتێ هانا دەموچاوی پێشکەشکارەکەی بۆ کورتە ساتێک بینی بانگی کرد: "ئەمەیە! ئەمە خۆیەتی. دەی بگەڕێوە، بگەڕێوە! بیدە من!"

"دەی، بۆ ساتێک بێدەنگ بە." بە دەم ئەم قسەیەوە ئالان بە باشی لە کۆنترۆلەکەی ڕوانی و توانی کەناڵەکە بدۆزێتەوە. بە ساڵاچوون دەموچاوی لۆچ و گرنج گرنج کردبوو.

"پەپوولە شەڕڤانەکان، چیرۆکی سێ ژنە کوردە. خەڵکانێک هەروەک من و تۆ؛ یەکێکیان لە قوتابخانە وازیهێنا، یەکێکیشیان خوێندکاری زانکۆ و ئەوی دیکەشیان دایک... بەڵام کاتێک دڕندەکان پەلاماری زێدەکەی ئەویان لە ڕۆژاڤا دا، وێڕای ئەو ڕاستییەی کە زۆرینەی خەڵکەکەی لە ناوچەی شەڕ هەڵاتن و باریان کرد، بە ماڵباتی ئەو ژنانە خۆشیانەوە... کەچی ئەوان مانەوە." چاویلکەی پێشکەشکارەکە هاتبووە خوارەوە تا سەر لێواری لووتی هاتبوو، ئاماژەی ئەوەی دەدا کەوتنەکەی لە ئانوساتدا بێ. "بە بێ هیچ ڕاهێنانێکی سەربازییانە، دەیانزانی ئەگەر هات و لە لایەن دوژمنەوە بگیرێن. ئەوا لاقەدەکرێن و بازرگانی سێکسیان پێوەدەکرێ، ئیدی ئەو ژنانە چوونە نێو جەنگێکی بێ بەزەیی..."

"تۆ هەی ژنی گەوج، دە لێگەڕێ با میوانەکەت قسە بکا." هانا بە دەم ئەم قسەیەوە دەستی ئەوەندە توند بە دەسکی کورسییەکەوە گرتبوو، جومگەی پشتەدەستی سپیپاتە بووبووەوە، بە ئۆقرەلێبڕاوییەوە چاوەڕێی دەکرد، کامیرای بەرنامەکە بچێتە سەر دەموچاوی میوانەکە.

لە دەرەوەش هاتوهاواری یاریکەران گەیشتبووە لوتکەی خۆی، ئاخر تیپێکیان گۆڵی خۆی کردبوو. بوک و زاوایەکیش لای نافورەی پارکەکە بۆ وێنەگرتن وەستابوون.

"کەواتە سێ ژن... بە هۆکاری تایبەت و سیاسی، ئەو ژنانە ئەگەر هاتبا و مشکێک لە ناندینەکەیان لێ دەرکەوتبا نەیاندەوێرا بیکوژن... کەچی بوونە شەڕڤان." پێشکەشکارە ژنەکە لەگەڵ قسەکە دەستی درێژدەکرد وەک ئەوەی وشەکانی بە وردەکارییەوە لێگرتبێ. "جانتا و کۆڵەپشتیان لەبری ئەوەی ماکیاژ و ئارایشتی تێدابێ، ئێستا پڕ لە نارنجۆک و فیشەکە. ئەوە فیلمێکە لەبارەی جەنگ و وێرانکاری و تەرم و نەخۆشی، هێشتاش..."

کامێرایەکە گرتەیەکی خێرای سیمای میوانەکەی نیشان دا، سەری بەردابووەوە سوورهەڵگەڕابوو. میوانەکە پەرچەمی هەبوو، پرچیشی لە پشتەوە بە قردێلەیەکی کەسک بەستبوو. بە دەمبوسیش پەپوولەیەکی لەسەر سینگی قایمکردبوو.

پێشکەشکارەکە ڕوومەتی خۆی خوراند و لەسەر کورسییەکەی هەندێک بۆ پێشەوە هات، هێشتا کامێرا هەر لەسەر ئەو بوو. "کاتێک جەنگ کۆتایی دێت و ژنە ئێزدییەکان ڕزگار دەکەن، ئەوان ژنوار ئاوەدان دەکەنەوە، ئەو گوندەی تەنیا هی ژنانە، ئەوەی بە خۆیان لگبن بە لگبن خانووەکانیان ڕۆناوە، داروبارەیان لێ چاندووە، فێرە بەکارهێنانی گژوگیای دەرمانی بوونە، لە گۆمە کراوەکان مەلەدەکەن، بە یەکەوە خواردن دروستدەکەن و بە یەکەوەش چاکدەبنەوە. ئەمەیان فیلمە هەرە باشە شیعرئامێزەکان بووە تا ئێستا بینیبێتم. نازانم چۆن وێنای بکەم؟ وەک خەونێک وابوو، زۆر جوان بوو، زۆریش هەستیار....

"شەڕڤانان، ئەو گۆرانییانەی دەیچڕن، یەکێک لەوان، دایکێکی کابانی ماڵ، شاعیرێکی نادیار، ها؟ ئەو دۆستایەتی و کێبڕکێیەی

نێوان ئەو ژنانە کە لە دەرەوەی مەیدانی جەنگدا شتێکی هاوبەشیان بە یەکەوە نەبووە، ئای هاوار چ مایەی دنەدانە. ئەم کاراکتەرانە، ئای کە خۆزاییانە چ کەسایەتییەکی کاریزماییان هەیە. پێموابێ پرسیارەکەی من ئەوەیە ئاخۆ تۆ چۆن هاوسەنگیی ئەو هەموو دژبەرییانەت ڕاگرتووە؟" بەرلەوەی دەرهێنەرەکە وەڵام بداتەوە، خانمە پێشکەشکارەکە، ئەو قسەیەشی بۆ زیاد کرد: "ئای چ بەرهەمێکی ناسک و هەستبزوێنە. لە میهرەجانی کاندا درێژترین چەپڵەی بۆ لێدرا، ئێستاش بۆ خەڵاتی باشترین دەرهێنەر بەربژێر کراوە... دەی لەبارەی ئەوەوە بۆمان بدوێ! تکایە فەرموو."

ئینجا کامێرا لە نزیکەوە چووە سەر ڕوخساری ژنێکی تەمەن سی ساڵە و پڕ بە شاشەکە نیشانی دا، کاتێک بزەی دەکرد چاڵی چەناگەی قوڵتر و جوانتر نیشان دەدا و بریسکەش لە چاویدا هەبوو. "فیلمەکە لەسەر بنەمای سەرکێشیی ڕاستەقینەی دەستەخوشکی منداڵیم شلێر، ڕۆنراوە. بۆ دروستکردنی فیلمیش بە ڕێگەی برایەکەمدا ڕۆیشتم."

هانا و ئالان لە خۆشییان و لە شانازییان دەستیان لە یەک ئاڵاند، سەیری گرتەی نزیککەرەوەی کیژەکەیان کرد، ئەو کیژەی چەندین ساڵە نەیانبینیوە. لەو کاتەوەی لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا لەبارەی فیلمە سەرکەوتووەکەیانەوە شتیان خوێندبووەوە، چاودێریی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنیان دەکرد بەڵکو ئاگاداری خشتەی بەرنامەی چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنەکەی بن.

"بەڵێ، چیا سامان. ئەلجەزیرە بە یەکێک لە کەسە هەرە کاریگەرەکانی ساڵی ٢٠١٠ی لەقەڵەم داوە."

"ئەو هێشتا هەر کاریگەرە، ئەوەی ئەو نوێنەرایەتیی دەکا کاریگەرە. دەسەڵات پێیوابوو -یان هیوایان وابوو- دۆزی چیا لەگەڵ ئەو پەتەی دەیخەنە ملی کۆتایی پێدێ..." لەیلا خوێزی خۆی قوت دایەوە. "بەڵام بە مردن، چیا و ئەوانەی وەک چیان نابەزێنرێن. کوشتن و لەناوبردن دادی دیکتاتۆران نادا، چونکە... چونکە ئەو ژان و ناسۆرەی بەر کۆمەڵگەی قوربانییەکە دەکەوێ، دەکرێ بە شێوازی جۆربەجۆر ببێتە سەرچاوەیەکی بەهێز بۆ داهێنانی هونەری یان بۆ چالاکی و بەرگری."

پێشکەشکاری تەلەفزیۆنەکە سەری بۆ لەقاند. "ئیدی ئەمە..."

"باندۆرەکە هەمیشە وەک یەک نییە." ئەمجارەیان لەیلا درێژەی بە قسەکەی خۆی دا. "خۆ هەر بە تەنیا ئەوە نییە، کە نیشتمانەکەمان داگیرکرابێ. خۆشەویستیشمان ڕفێنراوە. دەکرێ ستەمکاریی دنەی خۆوێرانکردنی بێئاگایی بدا. ئازار پێویستی بە ڕاییکردنە، بەو واتایەی پێویستی بە بناوانی دەرەکییەوە هەیە." لەیلا دەستێکی لەسەر ئەوی دیکە دانا، ئەڵقەیەکیش لە دەستی چەپەی دەبریقایەوە. "من قەرزباری براکەم و ئەوانی دیکەم، ئەوانەی فێریان کردین لە چەوساندنەوە باڵاتر بین و قوتمان نەدا. جاری وابووە خەریکبووە لە... لە شوێنێکدا دەستبەردار بم، بەڵام هەر قەرزباری ئەوم، نەوەک لەبەر ئاگایی و ئازایەتی، بەڵکو لەبەر ڕاستگۆیی و هەست و سۆزە سروشتییەکەی."

"بۆ براکەم... ئەو کەسەی..." پێشکەشکارەکە چەند پەڕەیەکی هەڵدانەوە و کامێراکەش زوومی کردبووەوە تا هەردووکیان لە چوارچێوەی شاشەکە دەربچن. "بەڵێ پێشکەشکردنەکە لێرەدا زۆر

ڕاست و دروستە. بۆ براکەم، بۆ چیا سامان، ئەو کەسەی دوای ئەوەی بە جەستە لەنێوماندا نەما، خۆشەویستییەکەی ئامانجی بە بەر ژیانی مندا کرد."

ڕوخساری لەیلا گەشایەوە، دەستیشی لەسەر گردی سگی دانا. فوستانە کەسکە دارستانییەکەی ڕێک لەگەڵ دۆخی سکیدا دەهاتەوە.

هانا بە گریانەوە گوتی: "ئەو دووگیانە!"

"کەواتە ژنانی فیلمەکەت پاڵەوان و شەڕڤانی ئازان و لە هەمان کاتیشدا ترسی زۆریشیان هەیە. بۆ چی ئەم هەموو شتە؟ با وا بڵێین، بۆ چی ئەوان لە ژیان گەورەتر نین؟"

ئالان بە سرتەوە: "هەمووی بەری خۆی هەبوو. ئەو هەموو قوربانیانە..." بە دەستیش توند بەتانییەکەی گرتبوو.

"چونکە من لە وێنەگرتنی سوپەرمرۆڤ بێزار بووم، هەروەک چۆن لە نیشاندانی قوربانیبوونیش. پێموایە ئێمەی کورد مێژووییەکی دووروودرێژمان هەیە تا قسەی لە بارەوە بکرێ. ئینجا دەوڵەتی ئیسلامیی هات، زیانێکی زۆری گەیاند، بەڵام واشی لە جیهان کرد بە هەڵوێستی خۆی لە بەرانبەر ئێمەدا بچێتەوە، خۆ ئەگەر ئێمە بە فریادڕەسی ڕاشکاویش نەزانێ ئەوا بە زرێ و قەڵغانی خۆیمان دەزانێ. ئێمە چیدی هەستناکەین پشتگوێخراوین. لێرەدا ڕێز هەیە، سەرسامبوون بە نەترسیی کورد و بەهاکانی یەکسانی جێندەری و ژینگە و دیموکراسیانەوە هەیە. لە ساڵانی نەوەدەکاندا، میدیای ڕۆژئاوایی ئێمەی وەک قوربانی ناساندبوو، گازباران و ئاوارە دەکراین. ئێستاش ئێمە وەک پاڵەوان نیشان دەدرێن. لەبەر بەرگریکردنمان لەوەی قڕنەکرێین بە تیرۆریست لە قەڵەم دەدراین،

ئێستاش بە ئاشتیپارێز. من بۆ ئەوە دەڕوانم ڕۆژێک بێ قسەمان لە دژ نەکرێ و هەروەها قسەشمان لە سەر کەوڵ نەکرێ. جیهان پێویستی بەوەیە وەک گەلێک بە خاڵی لاواز و بە هێزەوە پەسەندمان بکا. بۆ چەندین نەوەی کورد، ژیان دەستپێدەکرد و بە توندوتیژیش کۆتایی پێدەهات. هیوادارم ئەو ڕۆژگارە بەسەرچووبێ."

لەیلا جارێکی دی دەستی لەسەر گردی سگی دانایەوە، گەشبین و متمانەبەخۆبوو.

لە پارکەکەش هەراوزەنای زۆر بە هۆی گەیشتنی میوانانی زەماوەندەکەوە پەیدا بوو، ئیدی گۆرانی گوترا و شاییش بە بازنە کرا، دەسماڵی ئاڵووالاش ڕاوەشێنران.

"خانم سامان، دەی پێمان بڵێ، ئەرێ چ هەستێکت هەیە کە کوردی؟ ئەرێ تۆ پێیەوە شانازی؟"

"من پێیەوە شانازم؟ لەیلا چاوی لە چرای ستۆدیۆکە کرد. ساتێک بێدەنگی باڵی کێشا. ئەو سەری خۆی بادا. "شانازی وشەیەکی دروست نییە."

خانمە پێشکەشکارەکە دۆخی دانیشتنەکەی لەسەر کورسییەکە ڕاستکردەوە و بە چاوی مۆلەقەوە لە میوانەکەی ڕوانی.

"خۆم شانازی بە خۆمەوە ناکەم کە ژنیشم. هەروەها کە ئادامیزادیشم. ئاخر خۆم زەحمەتیم نەکێشاوە تا ببمە ئەوانە."

خانمە پێشکەشکارەکە چاویلەکانی لەچاو کردنەوە و لێوەکانی وێکهێنانەوە.

"لێ شادمانم بەوەی یەکێکم لەوان. شتەکەش، بۆ ماوەیەک، ماوەیەکی درێژ سامناکانە سەخت بوو، بەڵام فێربووم پێزانینم بۆ ئەوە هەبێ، کە مرۆڤێکم، ژنێکم و کوردیشم."

فرمێسکێک بە چاوی ئالاندا هاتەخوارەوە. نەشیسڕیەوە. لە جیاتی ئەوە لە یەکەم ئیمێلیدا، لە ناونیشانەکەیدا نووسی" کیژەکەم."

## سەرنجنامەی نووسەر

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و چەندین ڕێکخراوی مافەکانی مرۆڤ ڕاپۆرتی خۆیان لە سەر ئەوە داوە[١٩٨] کە کەمینەیەکی نەتەوەیی لە ئێران، مەبەستیان لە کوردە، زۆر جاران بوونەتە زۆرینە لە نێو زیندانییە سیاسییەکان و بە درندانەترین شێوەش ئازار و ئەشکەنجە دراون. ناوچەکانی کورد بە مەبەست هەر بە پاشکەوتوویی هێڵراونەتەوە، ئەمەش بووەتە مایەی ڕەگداکوتانی هەژاری و هەموو لێکەوتەکانی تراوما و ئەو کێشانەی بە دوای بەڵای هەژاری و نەدارییەوە هاتوون. هەروەها کوردستان زەنگی ئاگادارکردنەوەشە بەوەی زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتنی تێدایە. هەموو ئەو بەدڕەفتاری و پەلامارانەی کراونەتە سەر کورد، کە لەو ڕۆمانەدا ناویان هاتووە، ئەوسا چ لە ڕێی گرتەی تەلەفزیۆنی بێ یان لە ڕێی ڕاگەیاندنی ڕادیۆوە بێ یاخود وتە بە جۆش و پەرۆشەکانی بابە و گەڕانەوە بێ بۆ سەردەمی منداڵی، سەرلەبەریان ڕاستیی مێژوویین.

---

[١٩٨] “Special Rapporteur on the situation of human rights in the Islamic Republic of Iran,” UN Office of the High Commissioner for Human Rights, March ٥, ٢٠١٨, https://www.ohchr.org/EN/HRBodies/HRC/RegularSessions/Session٣٤/Documents /A_HRC_٣٤_٦٥_AUV.docx.

فەرزاد کەمانگەر، ئەو کەسەی بووەتە دنەدەری ئەم ڕۆمانە، مامۆستای من بوو. هەرگیز یەکیشمان نەبینیوە، ئەویش قەت منی نەناسیوە، بەڵام ئەو شتێکی بنگەیی لە نێو ناخی مندا وەرچەرخاند.

کاتێ ئێران ئەوی خستە زیندان، لە گوندێکی هەژاری کوردستاندا مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو، ئەویان بە لایەنگری پارتێکی بەرهەڵستکاری کورد تاوانبار کرد، کەواتە ئەو "دوژمن"ی خودا بوو. لەو کاتەشدا ڕابەری باڵای ئێران بە فەرمی نوێنەری خودا بوو لەسەر زەوی، کەواتە هەر بەرهەڵستکارییەکی دەوڵەت بە کفر دادەنرێ، ئیدی ئەمە تاوانێکە و سزاکەشی مردنە.

ویڕای حاشالێکردنێکی سەرسەختانەی تاوانبارکردنەکە، کەچی هەرگیز فەرزاد دادگاییەکی ڕێکوپێکی پێ ڕەوا نەبینرا. لەبری ئەوە لەسەر دەستی دەوڵەت ئەوپەڕی بەخشندەیی لە توندوتیژی و ئەشکەنجەدانێکی دڕندانەی ڕووبەڕوو کرایەوە. ئەو وەهای نووسی:

*لێمدرا چونکە کورد بووا، چونکە کورد بووم، چونکە تەلەفۆنە دەستییەکەم ڕینگتۆنێکی کوردیی لەسەر بوو. ئەوان دەستیان لە کورسی بەستمەوە ئینجا فشاریان خستە سەر پێتە هەستیار و وروژێنەرەکانی جەستەم... ئەوان بە زۆر جلیان لەبەردا داکەندم و هەڕەشەی ئەوەیان کرد بە گورز یان بە تێلا لاقەم بکەن ... ئەوان پێیەکانیان سندم کردم و کارەبایان لێدام.*

ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەوتی لە ڕاپۆرتی خۆیدا[١٩٩]، کە لەبەر چەندبارەی لێدان و کوتان و هەڵواسین و فەلاقەکردن و

---

[١٩٩] "One Year After Execution Kurdish Political Activists Still Persecuted," Amnesty International,

کارەبا لێداندا باسک و قاچی فەرزاد جەما بووبوون. هەروەها ڕێکخراوەکە وتەیەکی خەلیل بەهرامیانی پارێزەری وەک خۆی هێناوەتەوە، کاتێک ئەو لە دادگادا بەوە تاوانبارکرا گوایە "مەترسی بووە بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانی"، دادگاییەکەش لە پێنج خولەک زیاتری نەخایاند، دادوەرەکان حوکمەکەیان بە بێ هیچ ڕوونکردنەوەیەک داوە و بە تەواویش لە ژوورەکە چوونەتەدەرەوە. بەهرامیان گوتی: "بە ڕەهاییەوە هیچ بەڵگەیەک دژی کەمانگەر نەخرایەڕوو. لە ژیانی چل ساڵەی پێواژۆی قانونیانەی مندا، هەرگیز بەدواداچوونێکی دادگاییکردنێکی وەهام نەبینیوە."

لەو کاتەشدا من لە تۆرنتۆ بیرم لە سەربەستی و گۆشەگیرییەکەی خۆم لە تاراوگە دەکردەوە. زۆر لە ئامانجەکانم هاتبوونەدی، زەماڵەی خوێندنم لە زانکۆی ویندسۆرتا وەرگرت تا ماستەرنامە لە ڕشتەی نووسینی داهێنەرانە بخوێنم، کتێبی یەکەمی خۆشم واژۆدەکرد و لە دەزگای کۆچبەرانیش داوای کارم وەک کرێکارێکی کارامە و لێهاتوو دەکرد. هەرچەندە لەو بیرکردنەوەشدا نغرۆ بووبووم کە لە کەنەدا چاودێریم بە سەرەوە نییە، بەڵام هێشتاش پێموابوو بە تەواوی گوێم لێ ناگیرێ. هەرچەندە پێزانینم بۆ ئەو ماڵە هەبوو کە ئەو هەموو شتەی خستە بەردەستم، لێ هێشتاش واقم لەوە وڕدەما، کە لە بازاڕی کار و کەرتی پیشەسازیی چاپەمەنییدا لە سۆنگەی جیاخوازیی(دیسکریمینێیشن)دا پاڵم پێوە دەنرێ و فڕێدەدرێمە دەرەوەی بازنە. من چەندین کاری نیو دانە ڕۆژیم هەبوو، بە ئاستەم چاوەڕوانێکی تایبەتم بۆ دەگیرا یان کاتی

---

https://www.amnestyusa.org/one-year-after-execution-kurdishpolitical-activists-still-persecuted/.

نووسینم بۆ پەیدا دەبوو. ئەریٚ ڕازونیاز لە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە چییە؟ ئینجا من بەسەر ئەو نامەیەی فەرزاددا کەوتم، ئەو نامەیەی لە زیندانە شوومەکەدا نووسیبوو، لە ڕێگەی سۆشیال میدیاشەوە بڵاوبووەوە. منیش خوێندمەوە و دیسان خوێندمەوە.

*یەکێ (لە لێکۆڵەرەوەکان) لەسەر بنەمای ڕەگەزیی لێیدام، دووهەمیان لەسەر وشەکانم، سێهەمیشیان لەسەر ئەوەی گوایە من ئاسایشی نەتەوەییم خستووەتە مەترسییەوە، چوارەمینیشیان بۆ ئەوە ئەشکەنجەی دام ئاخۆ هاوار و بانگم دەگاتە دونیا.*

*لە هۆش خۆم چووم، پاشان لە چاوە زیندانەکەمدا بە ئاگا هاتمەوە. لە خۆمەوە لەقەم دەهاوێشت و لە هاوارم دەدا و بە خۆم دەگوتەوە ئەمە هێمای ژیانە. ئاخر هەموو نەوزادێک بە قیژە و هاوار سەردەردێنێ.*

ئینجا فەرزاد دەقێکی ناوازەی ئەحمەد شاملۆی شاعیری هێناوەتەوە: "چیا بە یەکەمین گاشەبەرد و مرۆڤیش بە یەکەمین ئازار دەستپێدەکا."

فەرزاد یەکێ بوو لەو بێ ژمارانەی بە دەستی دەسەڵاتدارانی ئێران ئازار و ئەشکەنجەی سامناک دراون. لێ ئەو یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەنانەی بەرگەی گرت و نەبەزی: "لە کۆتاییدا لێرە دەچمە دەرێ. ئەو پەپولەیەی دوێنێ شەو فڕیبووە ئێرە، بەختی خۆمی پێگوتم." ئەو ئازاری خۆی کردە شیعر و پابەند بە ئەندێشە و دالغەوە لە جێی خۆی مایەوە، ئەو شوێنەی هەوڵیاندا بەرلەوەی جەستەی لەناو ببەن گیان و دەروونی تێکبشکێنن. لە یەکێ لە نامەکانیدا نووسیبووی جارێکیان دوای لێدانێکی زۆر و بێتام

خەریکبوو لە خوێنی خۆیدا بخنکێ. ئینجا گوێی لە موزیکێکی کز بوو، دیاربوو لە نزیک زیندانەوەکە زەماوەند بوو. خۆ ئەگەر من لە شوێنی ئەو بام، وەهام بیردەکردەوە، باشە چۆن ئەو خەڵکە شایی و زەماوەند دەکا، لە کاتێکدا من ئەشکەنجە دەدرێم؟ هەمان ئەو خەڵکەی من لە پێناویاندا دەجەنگم؟ بەڵام نەخێر، ئەو بەم جۆرە بیری نەکردەوە. لە بری ئەوە، ئەو پەیوەست بوو بە موزیکەکە تا بە داڵغە لە جەستە کەساسەکەی خۆی بچێتەدەرەوە و هەر بە خەیاڵ خۆی لە جێگەی زاواکە دابنێ، ئیدی لەگەڵ بووکەخان شایی بکا، شاباش لەسەر شەرەفی هەموو ئەوانە لێبدا، کە گیانیان لە پێناوی ئازادی خستووتە سەر لەپی دەست و هەروەها بۆ هەموو ئەوانەی چاوەڕێ دەکەن لەگەڵ منداڵە ئازاکانیان یەکبگرنەوە، ئەوانەی ئێستا لە پشت شیشەبەندی زینداندا ترنجێنراون.

بەڵێ ئەو کەسە بوو فەرزاد کەمانگەر، هەر بەو شێوەیەش و هەر بە تەنیا خۆی، بە تەنیا لەگەڵ وشەکانی، دڵی ملیۆنانی بۆ خۆی ڕاکێشا و عەرش و قورشی دەسەڵاتی تیۆکراسی هەژاند، ئەو ڕژێمەی دنەی دابەشکردن و بێ ئومێدی و بێباکی دەدا. فەرزاد دەیزانی هەر جارێک کەسانی وەک ئەو هیوا لە دەست دەدەن، دەکەونە نێو گۆمی بەزەیی بەخۆداهاتن یان ترس باڵیان بەسەردا دەکێشی، بەم جۆرە چەوسێنەریش بەهێزتر دەبێ. فەرزاد کەمانگەر سەرەڕای بێتاوانییە ڕاشکاوەکەی -لەوانەشە لەبەر کاریگەریی و بەرگەگرتن- لە ٩ی ئاداری ٢٠١٠دا و لە تەمەنی سی ساڵیدا لە سێدارە درا. لەگەڵ ئەویش هەر یەک لە شیرین عەلەم هۆلی، فەرهاد وەکیلی، عەلی ئیسلامی و مەهدی ئیسلامیانیش لە سێدارە دران. بە پێچەوانەی قانونی ئێران خۆیشی،ماڵباتەکەی ئاگادار نەکرانەوە.

دوای لە سێدارەدان، دایکی فەرزاد لە چاوپێکەوتنێکدا لە ڕێی ئەنتەرنێتەوە کە منیش بینیم، گوتی: "ئای ئەو چ گیانێکی چاکی هەبوو. ئەو زۆر زۆر قوتابییەکانی خۆشدەویستن. بەهاریش وەرزی هەرە لەپێشی ئەو بوو. ئاخر ئەو لە بەهاردا لەدایکبووبوو." گریان قسەکانی پێ بڕی. منیش تێگەیشتم، کە هەر لە وەرزەی خۆشیدەویست کوژرا.

دوای ئەوەی هەواڵەکەم لە سپێدەی یەکشەمەدا زانی، گریام و بۆ چەندین سەعاتی دوورودرێژ هەر لە هەنسکم دەدا، هەستمکرد بەرۆکم گیراوە و ئازار دەدرێم، هەستم بە خۆ بە تاوانبارزانین کرد، ئاخر زیندانییە سیاسییەکان دەکوژران و منیش هیچم پێنەدەکرا، هەستم بە نامرادی دەکرد، کە ژنانی کورد لەبەر ئەوە ئاگر لە جەستەی خۆیان بەردەدەن تا لەو ژان وناسۆرەی تێیدان ڕزگاریان بێ، منیش لەو نێوەدا هیچم لە دەست نەدەهات.

کوشتنی فەرزاد لەسەر دەستی دەوڵەت وای لێکردم چەندین پرسیار لە مێشکمدا گینگڵ بخوا. ئەرێ من و تۆ چی بکەین کاتێ نەتوانین ڕووبەڕووی ئەو هەموو وێرانکارییە ببینەوە و نەشتوانین چاوی لێ بپۆشین؟ خۆ ئەگەر خۆم کۆبکەمەوە و لەبارەی کوردەوە بنووسم ئایا دەخوێندرێتەوە؟ من ئەوەم لە ئەمریکای باشووریش بەدیکرد، کە هەندێ ژیانی تایبەت لە ئەوانی دیکە باشتر دەنرخێندرێن. ئەرێ کێ گوێی لەو چیرۆکانە گرتووە؟

ژیانی کێ پارێزرا؟ پرسە بۆ کامە لەدەستچوو دانرا؟

تۆ بڵێی چی دەبوو گەر هاتبا و فەرزاد کەمانگەر لە زیندان ئازاد بووبایە و لەتاو گیانی خۆی هەڵاتبا و هەروەک ئالان کوردی لە دەریای ئیجەدا خنکابا؟

ئاخۆ چی دەبوو گەر هاتبا و لە ئۆقیانووسیش دەرباز ببا و پاشان لە مەڵبەندی کۆچبەران گل درابایەوە، تا لەوێ هەروەک بەهرۆز بۆچانی، نووسەری کتێبی *هیچ دۆستێک جگە لە چیاکان*، ئەوەی لە زیندانی مانوس نووسیبووی، شاهید بووایە بەسەر خۆکوشتنی لە ڕادەبەدەری پەنابەرانەوە؟

هێشتاش من ئەوە لە فەرزادەوە فێربووم، کە خۆبەدەستەوەدان بەدترین بیرۆکەیە. لەو بڕوایەدام، ئەگەر مرۆڤایەتی دڵپڕ بێ لە نایەکسانی، ئەوا ئێمە بۆ پێکهێنانی جڤاتێکی سەرتاسەری بەرەو پێشەوە دەڕۆین، جڤاتێک لە سەرووی ناسنامەی تەسک و هاوپەیمانییەتێکی چڕوپڕ و تۆکمە، کە بە بێ جیاکاری، بەها بۆ هەموو ژیانێک دابنێ. باشە چۆن دەگەینە ئەو حاڵەتە؟

وێژە ئەو هەستەمان لا دەچێنێ کە نامرۆڤەکان بکەینە مرۆڤ، بە قەولی جودیت بەتلەریش ژیانی نالەبار لە ڕێی ناسینەوەی هەست و نەستی مرۆڤایەتیمانەوە بگۆڕین بۆ ژیانێکی کەمتر نالەبار. وێژە وامان لێدەکا بە ئاگابین لەو بارودۆخەی هەزاران ساڵە شێوەی خۆی وەرگرتووە، بەو پێیەی ئەو کەسەی جیاواز دەردەکەوێ هاوتا دەکرێ بە مەترسی و هەڕەشە.

هەروەک گوتراوە، من وام بینی لەسەر شانی زەبەلاحێک وەستاوم. کاتێک کەسانێکی وەک کەمانگەر بێ کۆڵدان سەرسەختانە بۆ دادپەروەری تێکۆشاون، تەنانەت لە نێو سامناکترین زینداندا

هیوای خۆی لە دەست نەدا، کەواتە من وەک ژنێکی ئازاد وێڕای بێگانەفۆبیا[200]، دەکرێ زۆر شت بکەم. ئیدی کاتی ئەوە بۆ ناکامی و بەدگومانی، بۆ ترس یان نائومێدی لە ئارادا نەماوە.

دیسان دەستم دایەوە خامەکەم و ئیدی لەو کاتە دامنەناوەتەوە.

دەستم بە ڕەشنووسی ڕۆمانێک کرد، ئەمەی تازە خوێندتەوە، ڕۆمانێکە دەربارەی خوشک و برایەک و لەسەر شەرەفی یەکێک لە دۆستەکانم (چالاکوانێکی کورد کە لە ئێران بۆ ڕزگارکردنی گیانەکان ژیانی خۆی خستە مەترسییەوە) ناوم نا خوشک، شاکەس، لەیلا. لە هەمان کاتیشدا، تێکۆشام ڕێژەی خۆکوشتن لە نێو هەرێمی کوردانددا کەم بکەمەوە. من هەم بە قسە و هەم بە نووسین شتم لەسەر خۆ لەناوبردن بڵاوکردووەتەوە –بە نەتەوە یەککگرتووەکانیشەوە، ئەو ڤیدیۆیەی لەسەر ماڵپەڕەکەی من هەیە. هەروەها من لەگەڵ تیمێکی متمانەدار کار دەکەم، کە کار لەسەر فێرکردنی ڕێگرتن لە خۆکوشتن لە ئێران دەکا، بە شێوەیەک دوور بێ لە چاوی حکومەت، ئەو حکومەتەی دەیەوێ ئێمە بێ هیوا بین و بمرین.

ئەم ڕۆمانە بە دنەدانی بەرگرییەکەی فەرزاد کەمانگەر نووسراوە، بەڵام ئەوە نا کە هیچ لەیەکچوونێک لەگەڵ ژیانی تایبەتی ئەو و چیرۆکی ماڵباتەکەیدا هەبێ، هەمووی لە ئەندێشەوە داڕێژراوە. ئەندێشەش لاسایی ژیان دەکاتەوە، بەڵام لە ژیان

---

[200] Xenophobia بێگانە فۆبیا: واتە ترس لە بێگانە. واتە خەڵکی خۆجێیی متمانە بە کەسانی لایەد و بیانی ناکەن و لیان دەترسێن.

جیاوازە، پێویست بەوە دەکا بەسەرهاتە بە دوای یەکداهاتووەکان هۆکار و کاریگەرییان هەبێ. وا لە ڕۆمان چاوەڕوان دەکرێ ئاوەزمەندانە و خاوەن چارەسەر بێ.

هەر بۆ نموونە، تەرمی فەرزاد (هەروەک تەرمی زۆر لەوانەی لە سێدارە دران) بۆ بەخاکسپاردنێکی شایستە نەگەڕێنرایەوە. هەر کاتێک ماڵباتەکەی کوڵی غەریبییان هەڵبستێ، ئەوا سەردانی گۆڕێکی فەرمی دەکەن. ئەوان دەزانن ناوەکەی بەتاڵە. هەروەها ئەوەش دەزانن هەر پارچەیەکی هەرێمەکەیان دەکرێ گۆڕستانێکی نەناسراو بێ.

کەواتە ئەم کتێبە تەنیا مشتێکە لە خەروارێک. لەگەڵ ئەوەشدا، لەوانەیە بە ڕێکەوت نەبێ، کە کتێبەکە لە دەیەم ساڵیادی لەسێدارەدانیدا چاپ دەبێ. ستەمکاران یەک بە دوای یەکدا دەکەون. فەرزاد کەمانگەر و ئەوانەی وەک ئەویشن، بە نەمریی دەمێننەوە.

کۆتایی

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لەدایکبووە
- لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانوون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٧ـەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەورووپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- لە پاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزیش دەزانێ.
- لە ١٩٨٦ـەوە هەوڵی نووسینی داوە. تا ئێستا بیست کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان گوتار و لێکۆڵینەوەی قانونی و سیاسیشی بڵاوکردوونەتەوە.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١ - نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێهەم ڕۆژهەڵات ٢٠١٦.

٢ - مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.

٣ - داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر. چاپی دووەم ناوەندی ئاوێر ٢٠١٦ هەولێر.

٤ - کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنوورە دەستکردەکاندا، نووسینی: هیسەر لێهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.

٥ - وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.

٦ - ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆڵدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.

